د. زاهير سوران



# نەخۆشییە درمەکان

## نیشانەکان ، دەستنیشانکردن ، خۆپاراستن
## و
## چارەسەرکردن

چاپی دووەم 2006

د . زاهير سوران

# نەخۆشییە درمەکان

## نیشانەکان ، دەستنیشانکردن
## و
## چارەسەرکردن

چاپی دووەم
2006

نەخۆشییە درمەکان .
نووسینی د . زاهیر سوران .
پێداچوونەوەی : سەردار ئەمین .
دیسایینی بەرگ: شوان برایم چاورەش .
چاپی یەکەم : ساڵی 2004 سلێمانی- کوردستان .
لە سەر ئەرکی نووسەر لەچاپدراوە و بەخشراوە بە کتێبخانەی کولێژی پزیشکی زانکۆکانی کوردستان و پزیشکانی کوردی کەرکوك .
چاپی دووەم : ساڵی 2006 سلێمانی- کوردستان .
لە چاپخانەی بینایی – لە سلێمانی لە چاپدراوە .
ژمارەی سپاردن بە کتێبخانەی گشتی 387، ساڵی 2006.

ئەم كتێبە پێشكەشە بە گیانی ( شەنگین ) یەكەم كیژۆڵەی كوردی
قوربانی نەخۆشی ئەنفلوەنزای باڵندە لە باشوری كوردستاندا .

This book is dedicated to the memory of first Kurdish girl
(**Shangen**) who dead by Avian Influenza in south Kurdistan.

## ناوەرۆک

**پێشەکیی**

**خوێنەری بەڕێز !**

ئەم کتێبەی نێو دەستت ، رەنگە یەکەمین کتێب بێت بەزمانی کوری لەمەڕ نەخۆشییە درمەکان (Infectious Diseases) نووسرا بێت. پێش هەمووانیش بابەتەکە بۆ پزیشکو خوێندکاران تەرخانکراوە. ئەم کتێبە بەرهەمی زیاتر لە هەژدە ساڵان ماندووبوونو توێژینەوەو گەڕانە بەدوای سەرچاوەی نوژداری جیاوازدا. ئەوەی دەبێت لەیاد نەچێت ئەوەیە کەرۆژانە توێژینەوەی نوێ دەربارەی ئەم بابەتە دەکرێتو هەمیشەش گۆڕانکاری لەسەر چارەسەرو لایەنەکانی تری نەخۆشییەکان روودەدات، زانستی پزیشکیش هەمیشە لەپێشکەوتندایە.

هەرچەندە هەندێك گیروگرفتی خۆپاراستنو چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان چارەکراوە، بەلام لەزۆربەی وڵاتانی جیهاندا لە رووی خۆپاراستنەوە زۆربەی نەخۆشییەکان هەروا ماونەتەوە. نموونەش لەکوردستانی خۆماندا کەنەخۆشیی برۆسێلاو کۆلێراو گرانەتاو زەردووییە توندەکانو زۆربەی درمە ڤایرۆسییە تامیسکییەکانو چەندین نەخۆشیی دیکە بێچارە ماونەتەوە. ئەوەی شایانی باسە لەم ڕووەوە چالاکانە گەلێك هەنگاوی سەرکەوتووانە نراوە. وەلێ کێشە کۆمەلایەتی - ئابووریو لەسەروو هەمووشیانەوە کێشە سیاسییەکانی کوردستان وایکردووە کەتا ئەمڕۆ دانیشتووان بەدەست زۆر نەخۆشیی ڤایرۆسی، مشەخۆریو بەکتریاییەوە بنالێنن. هەروەها نابێت نەخۆشیی مەلاریا لەیادبکەین کەزۆر لەوڵاتانی جیهانی گرتووەتەوە بەتایبەتی ناوچەکانی دەوروبەری هێڵی ئیستیوا. هەروەها ئینفلوەنزا، ئەمیبیاو جیاردیاش رۆژانە لەبڵاوبوونەوەدانو تا ئیمڕۆ کۆنترۆڵ نەکراون. لەم ساڵانەی دواییدا هەوکردن بەڤایرۆسی HIV، نەخۆشیی ئەیدزو ئەو نەخۆشییە هەلپەرستانەی تووشی ئەیدزدار دەبن بوونەتە مەترسییەکی گەورە بۆ دانیشتووان (لە بەرنەبوونی کوتانێك یان دەرمانێك دژ بەو درمانە)و بگرە بوونەتە هۆیکی سەرەکیی مردنیش لەجیهاندا. هاوکات مانگانە بەردەوام زانیاری نوێ لەسەر زەردوویی جۆری (C, D, E, G) نووسراوەو ڤایرۆسە تامیسکییەکانو زەردوویییەکان دوو بەشی گرنگی نەخۆشییە درمەکانیان دروستکردووەو لەهەموو تەمەنێکدا مرۆ تووش دەکەن.

یەکێك لە گیروگرفتەکانی ئەمڕۆی پزیشکی تەندروستی بریتییە راهاتنو خۆگونجاندنی میکرۆبەکان لەگەڵ ئەو دەرمانانەی دژیان بەکاردەهێنرێنو هاوکات لەزۆربەی وڵاتە پێشکەوتووەکاندا نەخۆشییەکانی نێو نەخۆشخانە بوونەتە گیروگرفتێکی گەورەی دی.

پێویستە بڵێین کە هەندێك نەخۆشیی بەکتریایی بە هۆی دژە خۆرە (ئەنتی بایۆتیك) ەوە کەمبوونەتەوە، بەلام بەردەوام نەخۆشیی ڤایرۆسی نوێی دی سەرهەلدەدات. لەم 25 ساڵەی دواییدا ژمارەیەکی زۆر لە ڤایرۆسی نوێ کەدەبنە هۆی نەخۆشیی نوێ جوداکراونەتەوەو ناسراون.

لە سەرەتای ساڵی 2003 دا نەخۆشییەکی ڤایرۆسی نوێی ناسراو بە سارس (SARS) لەکیشوەری ئاسیادا بڵاوبووەوەو بگرە وڵاتی کەنەداشی گرتەوەو چەند هەزار نەخۆشێکی لەنێوبرد.

گیروگرفتێکی دی کەتووشی دانیشتووانی هەر وڵاتێك یان ناوچەیەك دەبێت بریتییە لەنەخۆشیی هێنراو import، (ئەو نەخۆشییانەن کەلەناوچەیەکەوە بەهۆی نەخۆشێکەوە لەکاتی گەشتو سەردان یان پەنابردندا نەخۆشییەك دەگوێزرێتەوە بۆ ناوچەیەکی دی یان وڵاتێکی دی، کە پێشتر ئەو نەخۆشییەی تیادا کەمبووە یان هەر نەبووە).

لەم کتێبەدا ئاماژەم بۆ چەند نەخۆشییەکی درم نەکردووە لەبەرئەوەی بەرای منو هەندێک لەشارەزایان لەم بوارەدا پێویستە لە بەشی تایبەتی خۆیاندا پسپۆڕی خۆیان چارەسەریان بکات، وەک هەوکردنی گورچیلەو میزەڵدانو میزەجۆ، نەخۆشیی دەردەباریکە، نەخۆشییە درمە زایەندییەکانو هەندێک پێستەسۆ.

من ئاماژەی ئەو نەخۆشییانەم کردووە کە زیاتر لەجیهانداو بەتایبەتی لە کوردستاندا بڵاونو چەندین ساڵە دەناڵێنین بە دەستیانەوە.

لە راستیدا زمانی کوردی زۆر دەوڵەمەندە بەڵام هەمیشە خۆمان هۆیەک بووین کەزیاتر زمانی داگیرکەرانی کوردستان بەکاربهێنین. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ قەدەغەبوونی زمانی کوردیو هاوکات زۆر کەس شانازی بەوەوە کردووە کەزمانی بێگانە دەزانێتو خۆی پێوەباداوە بۆ ئەوەی لای دوژمنان زیاتر خۆی پێ بەرێتە پێشەوە. بەڵام هەمیشە ئەوی بەتواناو زمانزان بووە رێگەی پێنەدراوەو هەموو ئاواتو بەرهەمەکانی لەناوچوون یان بێکەس ماونەتەوە.

منو هەزاران کوردی دی کەوەک من بیردەکەنەوە لەو باوەڕەداین کەپاش 12 ساڵان نیمچە ئازادیی ئیمڕۆی کوردستانی لێکدابڕاو. پاشتریش رزگاربوونی خوارووی کوردستان کاتی ئەوە هاتووە کەگرنگییەکی تایبەتی بەزمانی زانستیی کوردی بدرێت. گەر بێتو ئێمە زانستییانەو راستەوخۆ سوود لەزمانە ئەوروپاییەکان وەرگرین یان وەریان بگێڕینە سەر زمانی کوردی ئەوا سوودی زۆر زیاترە وەک لەو سەرچاوانەی کەزۆر جاران ناوەڕۆکە زانستییەکەی لەدەستداوە لەبەرئەوەی لەبەرژەوەندی لایەنێکدا یان رژێمێکدا بووە بۆیە من بەدەستی دووهەم دایان دەنێم.

هەمووشمان ئەو راستییە دەزانین کەکتێبی زانستی وزەو سووتەمەنی پێشکەوتنو گۆڕانکارییە زانستییەکانە بۆ رۆشنبیرکردنی هەموو نەتەوەیەک.

پێشم وانییە کەکتێبەکەم بێ کەموکوڕی بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیوام وایە توانیبێتم خزمەتێکی گچکەی نەتەوەکەمم کردبێت.

د. زاهیر سوران

پسپۆڕی نەخۆشییە درمەکان

ستۆکهۆلم/سوید، ساڵی 2004.

**پێشەکیی چاپی دووەم**

**خوێنەری بەرێز...**

نزیکەی دوو ساڵان لەمەوبەر بوو، چاپی یەکەمی ئەم کتێبە کەوتە نێو کتێبخانەکانی کۆلێژە پزیشکیەکانی کوردستانەوە . هەرچەندە کتێبەکە لە باری هونەرییەوە هەندێک کرچوکاڵی پێوە دیاربوو وەلێ جێی رەزامەندی زۆربەی زۆری خوێندکاران و دکتۆرەکان بوو . تەنانەت ژمارەیەکی زۆر لە خوێندەوارانی دەرەێی ئەو کۆلێژانەش تامەزرۆی ئەوەبوون کتێبێکیان دەست بکەوێت ، بەڵام چاپی یەکەم بەتیراژێکی کەم و تەنیا بۆ خوێنکارانی کۆلێژی پزیشکیوپزیشکانی شاری کەرکوک لە چاپ درابوو. پاش پێداچوونەوە و نانە بانی زانیاری پتر و دەوڵەمەندکردنی بە چەند نەخۆشییەکی ڤایرۆسی و بەکتریایی تازەکورەی وەک هێلیکۆباکتێر، کامپیلۆباکتێر، سییەسۆ بە RSV و ئەنفلوەنزای باڵندە ...تاد ، بە نیازی ئەوەی لە شێوازێکی رێکوپێکتردا بخرێتە بەر دەستی خوێنەرانییەوە و بەو هیوایەی لە رێگای نووسینی زانستیانەوە بتوانرێت دانیشتوان زێدەتر هۆشیاربکرێتەوە ، چونکە بەڵگەنەویستە کە هۆشیارکردنەوەی گەل بە زانستی سەردەم بۆ بەربەستکردنی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکان بە گشتی و نەخۆشییە درمەکان بە تایبەتی کە تا ئەمرۆ چارەسەری گونجاویان بۆ نەدیتراوەتەوە ، پێویستییەکی ژیانی ئێستامانە .

هەر لە روانگەی ئەوەی کە هۆشیاری بۆ مرۆڤ ئاسۆی روونی رێچکەی ژیانیەتی. بنچینەی پتەوی پێکهاتەی بیر ، رەوشت و کرداریيەتی، لەمیشەوە دەبێتە بەردی بناخەی کۆمەڵگایەکی تەندروست . بە واتایەکی دی هەبوونی هۆشیاری سەنگی مەحەکی بوون و سەرکەوتن و پێشکەوتنی هەر نەتەوەیەکە . هۆشیاریش زادەی پایەبەرزترین و ئاڵۆزترین سیستێمی مەتریاڵی مرۆڤە، کە ئەویش مێشکە... لەمیشەوە دەکرێت بێژین کە هۆشیاریی تەندروستی بەردەبازی گشت هۆشیارییەکانی دیکەی مرۆڤە . ساخی و دروستی تەن و لەشی مرۆڤ پابەندی شێواز و چۆنیەتیی خۆپاراستنە ، بە خۆپاراستن و چەند فاکتەرێکی دی دەتوانرێت تەنێکی دروست مسۆگەر بکرێت و بەریش لە نەخۆشییان بگیرێت .

د. زاهیر سوران

پسپۆڕی نەخۆشییە درمەکان

پسپۆڕی پزیشکی گشتی

ستۆکهۆڵم/سوید، ساڵی 2006.

**وتەیەك لە بری پێشەكیی**

**خوێنەری بەڕێز ...**

كتێبخانەی كوردی لە ئاست گەشە و پێشكەوتنی سەرچاوە و توێژینەوەی زانستیدا هەژارو كەم ژمارەیە، مەحاڵە بتوانین بێ نووسین . وەرگێران و توێژینەوە لە بوارە زانستییە جیا جیاكاندا ، كۆمەڵگای كوردی و سیستمی خوێندن و فێركردن لە قەیرانی دواكەوتوویی و چەق بەستوویی رزگار بكەین ، هەرگیز ناكرێ و بێ سەرمایەیەكی فیكری و زانستی ، لافی پێشكەوتن و مملانێ لێ بدەین لە ئاست میللەتانی تردا

دیارە بواری زانستی پزیشكی كە ئەمڕۆ لە جیهاندا بە هۆی شۆڕشی زانیاری و پەیوەندییەكانەوە ، چۆتە قۆناخێكی نوێوە و رۆژانە دەیان و سەدان سەرچاوە بە زمانە بیگانەكان دەبنە دیاری بە نرخ و پێشكەش بە ئایندەی مرۆ دەكرێن . لە كاتێكدا لای ئێمە زمانی كوردی لە ئاستی پێویستدا نییە و لە بوارە جیاجیاكانی زانست و مەعریفەدا تازە لە هەوڵ و چالاكی دایە و بەرەو ناساندنی خۆی هەنگاو دەنێت .

زمانی كوردی وەك زمانێكی زیندوو و خاوەن فەرهەنگێكی دەوڵەمەند، لە باشووری كوردستاندا بە پێی دەستووری نوێ ی ئێراق بۆتە زمانی ( رەسمی ) و پێویستە شانبەشانی زمانی عارەبی لە بواری زانستی و خوێندنی باڵا و كارگێڕی و نووسراوە نێو دەوڵەتییەكاندا بەكاربهێنرێ و دیارە ئەم برگەیە ، ئەركێكی گران و دڵسۆزانە ئەخاتە ئەستۆی هەر قەڵەمێك كە لە توانایدا بێت بە شێوازی ئەكادیمی و پسپۆڕی و شارەزایی خۆی ، چمكی نووسین و وەرگێڕانی لێ بكات بە لادا و كەلێنێك لە كتێبخانەی زانستی كوردی پڕ بكاتەوە .

ئەم بەرهەمەی بەڕێز د . زاهیر سوران كە بۆ جاری دووەم چاپ دەكرێتەوە دیارە چاپی یەكەمی وەك خۆی ئاماژەی پێ داوە ، لە لایەن خوێندكاران و خوێندەوارانەوە پێشوازی لێكراوە و هەر ئەوەش بۆتە هاندەری پوختەتركردن و لە چاپدانەوەی

ئەگەرچی كارێكی گرانە لە چەند دێرێكی كورتدا ،گرنگی و بایەخی ئەم كتێبە بخەمەڕوو ، بەڵام وێڕای دەستخۆشی لە نووسەر ، ئاماژە بە چەند هۆكارێك ئەكەم كە لەم كتێبەدا جێی سەرنجن :

ئەم بەرهەمە لە ریزی ئەو بەرهە دەگمەنانەدایە کە بە شێوازی زانستی نووسراون و نووسەر پێوەی ماندووبوومو زێدەتر لە هەژدەسالأن کاری تێدا کردووە ،
ئەمە نیشانەی خوولیاو خەمی زانستییانەی نووسەرە لەلایەك و لەلایەکی دی یەوە خواستی خزمەتکردنییەتی بە زانستی پزیشکی بە زمانی زگماك . لە دوو توێی ئەم کتێبەدا جارێکی دی بە چەندان دەستەواژەی کوردی ئاشنا دەبینەوە کە لە کوردەواریدا بۆ ناوی نەخۆشییە بەربڵاوەکان بەکارهاتوون و نەوەی نوێ بە ئاگادێنێتەوە کە لایان لێ بکەنەوە .

وەك لە ناوەڕۆکدا هاتووە، باس لە زۆرینەی نەخۆشییە درمەکان ( بەکتریاییەکان ، ڤایرۆسییەکان ، تێکەڵەکان ) و هۆکاری تووشبون و چارەسەرکردن کراوە ، دیارە بەدەر لەوەی هەوڵێکە بۆ هۆشیاری تەندروستی و بڵاوبوونەوەی زانیاری لە نێو کۆمەڵدا . دەرخستنی توانای زمانی کوردییە لە بواری نووسین و وەرگێڕاندا و تێگەیشتنە لە زمانی زانستی سەردەم و بواری پزیشکی کە دەکرێت لە سمیناروکۆنفراسە گشتییەکاندا زیاتر ئەو توانایە دەربخرێت .

بە هیواین ئەم بەرهەمە ، مژدە بەخشی سەرەتایەك بێت بۆ نووسین و وەرگێڕان لە هەموو بوارە زانستییەکاندا کە ئێمەی کورد تامەزرۆیانین و پێویستی زۆرمان پێیەتی . هەر بە زانست و روناکبیری بنەمای کۆمەڵگایەکی تەندروست و ئاسوودە و بەرهەمهێن دادەمەزرێت .

دکتۆر عەلی سەعید محەمەد
پسپۆری نەخۆشییەکانی هەناو
سەرۆکی زانکۆی سلێمانی
28.04.2006

# بەشی یەکەم

## نەخۆشییە درمەکان

1- پێشەکییەك بۆ نەخۆشییە درمەکان
2- هۆزانی
3- پرۆسێسی هەوکردن
4- قۆناخەکانی تووشبوون
5- کۆئەندامی بەرگری لەش
6- نیشانەکان
7- دەستنیشانکردن
8- پاکوخاوێنی
9- چارەسەرکردن

### 1- پێشەکییەك بۆ نەخۆشییە درمەکان

نەخۆشییە درمەکان بریتین لە کۆمەڵێك نەخۆشی، بەهۆی خۆرە (میکرۆب) هوە، وەك (ڤایرۆس، بەکتریا، مشەخۆر، کەروو (فۆنگ) بەئاسانی مرۆ توشی نەخۆشی دەکەن، زۆرجار خۆرەکان لە نەخۆشێکەوە دەگوێزرێنەوە بۆ یەکێکی دی.

**نەخۆشی**

بریتییە لە بارێکی تایبەت، کاتێك دەردەکەوێت کە ناهاوسەنگی نێوان خانەخوێ و میکرۆب ببێتە هۆی دروستکردنی برینی دیاریکراو.

**هەوکردن (سۆ)**

بریتییە لەچوونەوە ناوەوە، جێگیربوون، وەچە خستنەوەی خۆرە لەشانەیەکی لەشی گیانلەبەرێکی وەك (مرۆ، ئاژەڵ، رووەك)، وەلێ هەندێك میکرۆب نابێتە هۆی نەخۆشیی درم.

زۆرجاران لەوانەیە هەوکردن بێنیشانە بێت یان هێواش بێت و چەند ساڵێك بخایەنێت، وەك تووشبوون بە ڤایرۆسی HIV. زۆر پێویستە وشەی تووشبوون لە وشەی درم جیابکرێتەوە نابێت ئەو راستییەش فەرامۆش بکەین کەتێکەڵاوی لە گەڵ گیانلەبەرە نەخۆشەکە دەبێتە هۆی تووشبوون. هاوکات دەبێتە هۆی پەیدابوونی نیشانەی پاش تووشبوون، مەرج نییە هەموو تووشبوونێك تادار بێت، بەڵام (تا) بەرتەکی پاش درمە لە ئەندامی درمەکەوە کۆمەڵێك نیشانە دەردەکەون هەریەکەیان لەسەر هۆیەك بەندە.

**سەرنج** : هەموو نەخۆشییە درمەکان نەخۆشی هەوکردون ، بەڵام هەموو نەخۆشییە هەوکردوەکان درمی نین.

**تێبینی**: مەرج نییە پاش هەموو تووشبوونێك نەخۆشییەك دەربکەوێت، مەرجیش نییە هەموو نەخۆشییەك بە هۆی میکرۆبەوە بێت !!

**جۆرەکانی هەوکردن**

1) هەوکردنی کوتوپڕ. 2) هەوکردنی ناکوتوپڕ.

3) هەوکردنی بێنیشانە. 4) هەوکردنی تولانی.

**سووربوونەوە**

بریتییە لەدەرەنجامی بەرگری شانەکان لەشوێنی چوونە ناوەوەی میکرۆبەکەدا، سووربوونەوە چالاکترین ناوەندی بەرگرییەو سێ نیشانەی کلاسیکی هەیەو ئەمانەن:

1- سووربوونەوەی شوێنەکەو فراوانبوونی موولوولەکانی خوێن.

2- ئاوسانی شوێنەکە. (هەندێکجار سووربونەوە ژان دەکات)

3- گەرمی شوێنەکە.

**درم**

مەبەست لەو بارەیە کە میکرۆب لەسەر رووی پێست، شتومەك یان بەسەر کەلوپەلەوە هەیەو بەئاسانی لەئەنجامی پەیوەندی راستەوخۆ بەپێستەوە کەسی دووەم تووش دەبێت.

نیشانەی درمی هەموو نەخۆشییەك بەستراوە بە هەوکردنەوە، ئەمیش بەندە لەسەر چۆنیەتی گواستنەوەی خۆرەکان لە نەخۆشێکەوە بۆ لەشساخێك.

**جۆرەکانی گواستنەوە**

1- گواستنەوەی راستەوخۆ خێرایە، پاش پەیوەندیکردنی خوێن، ئەنتیجێن و زایەندەوە دەبێت.

2- گواستنەوەی ناڕاستەوخۆ – ئەمیش دەکرێت بەدوو بەشەوە:

- بەهۆی هەواوە (هەوای پیسبوو بە پرژە، شلە یان گەردیلەی تەپوتۆزی میکرۆباوییەوە).
- بەهۆی سەرچاوەی دی وەك (ئاو، لیك ، خۆراك، پیسایی، میز و کەلوپەل) ەوە
- هۆی نەزانراو

ئەوەی راستی بێت هەموو نەخۆشییە هەوکردوەکان (سۆییەکان) لە پلەی جیاوازدا درمین، بەمەدا بۆمان دەردەکەوێت کە جیاوازی بنچینەیی لە نێوان نەخۆشییە (هەوکردوەکان) سۆییەکانو نەخۆشییە درمەکاندا زۆر کەمە یان نییە، بەڵام زاراوەی نەخۆشییە درمەکان زێدەتر بەکاردەهێنرێت.

**خۆپاراستن**

هەموو ئەو راستییە دەزانین یەکێك لە بنەماکانی زانستی پزیشکی نەخۆشییە درمەکان بریتییە لەخۆپاراستن، لەبەرئەوە زۆر پێویستە ئەم قۆناغانەی خۆپاراستن رەچاوبکرێت:

1- خۆپاراستنی سەرەتایی

بریتین لەچۆنیەتی خۆپاراستن ،چاودێریکردنی نەخۆش، ئامۆژگاریی تەندروستی، خۆراك خواردنو پاکوخاوێنی.

2- خۆپاراستنی لاوەکی

بریتین لە زوو دەستنیشانکردن، چارەسەرکردن، رێنەدان بە ئالۆزبوون و تولکێشانی نەخۆشییەکە.

3- دوا خۆپاراستن

بریتین لەچارەسەرکردن گەڕانەوەی توانای کارکردنو توانای کۆمەڵایەتی.

## 2- مۆزانی

لە سروشتدا میکرۆبەکان پەیوەندی هەمیشەییان بەلەشی مرۆڤەوە هەیە، هەندێکجار پەیوەندییەکە باشەو جاری واش هەیە پەیوەندییەکە زیانبەخشە. کاتێک میکرۆبەکان خۆیان دەگەیەننە نێو شانەکانی لەشی مرۆ لەسەرخۆ یان خێرا زێد دەکەن و پاشتر دەبنە هۆی هەوکردن و کەتوپڕ یان هێدی هێدی نیشانەکانی نەخۆشییەکە دەردەکەوێت. ئەو میکرۆبانەی دەبنە هۆی هەوکردن بریتین لە ڤایرۆس، بەکتریا، کەڕوو، مشەخۆر (پرۆتۆزۆرو میتازۆر).

### ڤایرۆس

پێکهاتوویەکی زیندووی زۆر بچوکی جیاوازە، ڤایرۆسی پۆلیۆ (ئیفلیجی منداڵ) نزیکەی (20) نانۆمیترە بەمیکرۆسکۆپی ئەلەکترۆنی دەبینرێت، بەڵام ڤایرۆسی پۆکسی لەنێوان (250 – 300) نانۆمیتردایە.

### تایبەتمەندییەکانی ڤایرۆس

1- ڤایرۆس دیوارو کۆئەندامی ئەنزیمیان نییە. لەبەرئەوە ئەنتیبایۆتیک (دژەخۆرە) و چارەسەرکردنی کیمیایی کاریان لێناکات.

2- ڤایرۆس یەک جۆر ناوکی ئەسیدی RNA یان DNA یان هەیە.

3- ڤایرۆس توانای دابەشبوونیان نییەو بەخۆ لەبەرگرتنەوە زێدئەبن.

بە پێی جۆری ناوکە ئەسید ڤایرۆسەکان دەکرێن بەدوو کۆمەڵی گەورەو هەریەکێکیان لەچەند خێزانێک پێکهاتوون و هەر خێزانێکیش لە یەکێک یان لە چەندین ڤایرۆس پێکهاتووە، کە ئەمانەن:

1) کۆمەڵە ڤایرۆسی DNA، لەم خێزانانە پێکهاتووە:

- Poxiviridae
- Herpesviridae
- Adenoviridae
- Hepadnaviridae
- Papovaviridae
- Parvoviridae

2) کۆمەڵە ڤایرۆسی RNA، لەم خێزانانە پێکهاتووە:

- Paramyxoviridae
- Astroviridae
- Coronaviridae
- Togaviridae
- Flaviviridae
- Caliciviridae
- Filoviridae
- Bunyaviridae
- Retroviridae
- Picornaviridae
- Arenaviridae
- Rhabdoviridae
- Ortomyxoviridae

نابێت ئەو راستییەش لەیادبکەین کە ناوکە ئەسیدەکان هەڵگری زانیاری ئەندازەیی خانەکەن، کاتێک دژە ژیانەرەکان (ئەنتیجێنەکان) دەگەنە نێو خانە وەک مشەخۆریان لێدێت خانەکە تووش دەکەن.

### تایبەتمەندێتی ڤایرۆس

- ڤایرۆس لە 56 پلەی سەدیو لەماوەی 30 خولەکدا دەمرێت.
- هەندێک ڤایرۆس لەپلەی گەرمیی نزمدا مت دەبێت
- هەندێک ڤایرۆس لەمیشکیدا دەژین.
- ئیسەرو کلۆرۆفۆرم، تیشکی سەروو وەنەوشەیی ڤایرۆس ناچالاک دەکەن.
- ڤایرۆس بە ئەلدەهیلید، کلۆرین، ئایۆدین و هیدرۆجین پیرۆکسایدیش ناچالاک دەبێت.
- جگە لەڤایرۆسی زەردوویی و هەندێک لە ئینێترۆڤابرۆس نەبێت، ڤایرۆس کەم بەرگەی دەرەوە دەگرن.

**کاری ڤایرۆس لەسەر خانە**

- تووشبوونی خانە بە ڤایرۆس مانای مردنی خانەکەیە.

- ڤایرۆس خانە لەخانەیەکی ئاساییەوە دەگۆڕێت بۆ خانەیەکی تووشبو یان شێرپەنجەیی.

- ڤایرۆس لەخانەدا بەچالاکی دەمێنێتەوەو کاردەکاتە سەر فرمانەکانی.

- بە پێی جۆری تووشبوونەکە ڤایرۆس دەکرێن بەچەند خێزانێکەوە، کە ئەمانەن:

1- ڤایرۆسی سییەسۆ: بریتین لە Paragripalvirus,Adenovirus, Rinovirus, Gripalvirus

2- ئاربۆڤایرۆس (Arbovirus):

بریتین لە هەندێك ڤایرۆس دەبنە هۆی مێشکەسۆ (مەژی) و زەردە تا.

3- ڤایرۆسە زایەندییەکان:

بریتین لە ڤایرۆسی تامیسکی HSV-1, 2, 4, 5, 8 و HBV, HIV-1,2.

4- ئەو ڤایرۆسانەی راستەوخۆ دەچنە نێو لەشەوەو دەبنە هۆی هەوکردنی وەك زەردوویی B.

## بەکتریا

ئەوەی شایانی باسە پێش 100 ساڵان لەمەوبەر باسی ئەو تیۆرییە کراوە کە میکرۆئۆرگانیسم دەبێتە هۆی هەوکردن . بەڵام پێش ئەم مێژووە مرۆ پێی وابووە کە نەخۆشی تۆڵەسەندنەوەی خودایە لە مرۆڤ بە هۆی کارە خراپەکانییەوە . پاشتر لویس پاستۆر لە ساڵانی 1822- 1892 ئەو راستییەی سەلماند کە میکرۆئۆرگانیسم هەن بەڵام نابینرێن

نەشتەرگەری سکۆتلەندی ژۆزیف لیستر لە ساڵی 1867 دا سەلماندی کە مرۆ دەتوانێت رێگا لە بڵاوبونەوەی نەخۆشی بگرێت بە هۆی پاکوخاوێنی و دەستشتن و پاکژکردنەوەی کاربەدەستانی نەخۆشخانەکانەوە .

ئەوەی راستی بێت بەکتریا لەخانەی گەورە پێکهاتوون، نزیکەی 100 نانۆمیتر گەورەن، لە ڤایرۆس گەورەترن هەندێکجار بە چاو دەبینرێت

بەکتریا دیوای خانە سایتۆپلازما، ریبۆزۆم، کۆئەندامی ئەنزیمو پێکهاتووی ئەنتیجینی ئاڵۆزیان هەیە و بەرێگەی دابەشبوون زێد دەبن، چارەسەرکردنی کیمیایی و دژەخۆرە (ئەنتیبایۆتیك) لەناویان دەبات.

لە تاقیگادا بەکتریاکان شێوەیان زۆرە، هەندێکیان بەشێوەی (تۆپەڵ، کۆما،

جووت، هێشوویی) گردبوونەتەوەو دەبینرێن. بەکتریا لەخوێنو میزدا نییە. بەڵام هەر کاتێك بەکتریا بگاتە ئەو دوو شلەیە (بەتایبەتی نێو خوێن) مرۆ تووشی هەوکردنی کوتوپڕ یان ژەهراویبوونی دەکات.

بەکتریاکان دەکرێن بە دوو کۆمەڵەوە، کەئەمانەن:

1- بەکتریای گرامپۆزەتیڤ، پاش رەنگکردنو شتن رەنگی مۆرکراویان ناچێتەوە.

2- بەکتریای گرامنێگەتیڤ، پاش رەنگکردنو شتن رەنگیان سوور دەبێت.

هەر یەکێك لەم دوو کۆمەڵە دەکرێت بە دوو کۆمەڵی گچکە تری چیلکەیی (bacilli) و خڕ (cocci) وە ، کە ئەمانەن:

1) گرامپۆزەتیڤ کۆکای Gram positive cocci

2) گرامنێگەتیڤ کۆکای Gram negative cocci.

3) باسیلای گرامپۆزەتیڤ Gram postive bacilli.

4) باسیلای گرامنێگەتیڤ Gram negative bacilli.

**ئەمانیش لەچەند خێزانێکی گچکەتر پێکهاتوون و هەر خێزانێکیش لەچەند بەکتریایەك پێکهاتووە.**
**هەروەها جۆرەکانی:**

5) **مایکۆبەکتریاکان – باسیلی کوخ – باسیلی هانسێن.**
6) **لیپتۆسپیرۆس – سپی رۆکێتەکان – تریپۆنێما، لە زۆر وڵاتدا بڵاون.**

**تێبینی : زۆربەی بەکتریا ستافیلۆکۆکسەکان دەبنە هۆی برین و هەوکردنی سەر پێست پاش نەشتەرگەری و رووداو .**

## فونگ (کەڕوو)

**خۆرەی چەند خانەیین و بەمیکرۆسکۆپی ئاسایی دەبینرێن، نزیکەی پەنجا دانەیان مەترسیی ئەوەیان لێدەکرێت مرۆ تووشی نەخۆشی بکەن. ناسراوترین و بڵاوترینیان (کاندیدە)یە دەبێتە هۆی هەوکردنی ناوپۆشی (نێودەم و گولینك) پێست. کەڕوو بە دەگمەن دەبنە هۆی هەوکردنی کۆئەندامەکان یان هەوکردنی سەراپایی، وەلێ هەندێکجار دەبنە هۆی جۆرێك هەوکردن و دژایەتی زۆربەی دژە خۆرە (ئەنتیبایۆتیك) کان دەکەن.**

**مشەخۆر**

**خۆرەیەکی یەك خانەیین، لە بەکتریا گەورەترن و زۆربەیان ژیانێکی سەربەخۆ بەسەردەبەن، هەندێکی تریان ژیانێکی مشەخۆرییان هەیە، شێوە و قەبارەیان جیاوازە. پرۆتۆزۆر بە رێگەی زایەندی و نازایەندی (رێگەی نازایەندی دابەشبوونی ئاسایی یان دابەشبوونی فرەیی دەگرێتەوە) زێد دەبن.**
**تێبینی: لە پرۆتۆزۆردا دابەشبوون لە باری درێژیدا روودەدات ، وەلێ لە بەکتریادا دابەشبوون لە باری پانیدا دەبێت.**
**ئەمانیش دەکرێن بەچەند کۆمەڵێکی گچکەترەوە، کەئەمانەن:**

- **ریزۆپۆدیکان– دەبنە هۆی نەخۆشیی ئەمیبیایی.**
- **پلاسمۆدیۆمەکان– دەبنە هۆی نەخۆشیی مەلاریا.**
- **قامچیدارەکان– دەبنە هۆی نەخۆشیی جیاردیا، هەوکردنی تریهۆمۆناس ، دەردی تۆکسۆپلاسما و نەخۆشیی تریپانۆسۆم.**

**ئەوەی شایانی باسە تۆکسۆپلاسمای گۆندی دەبێتە هۆی نەخۆشیی سامناکی کۆئەندامی زاووزێ، چونکە تۆکسۆپلاسما دەتوانێت لە وێڵاش بپەڕێتەوە و کۆرپەلە نەخۆش بخات.**
**هەندێکجار دەرمانی دژە مشەخۆر بەکارە، هەروەها چارەکردنی کیمیایی رۆڵی باشی لە لەناوبردن و چارەسەرکردنیاندا هەیە. بەپێی شوێنی تووشبوون دەکرێن بەچوار کۆمەڵەوە، کە ئەمانەن:**

- **پرۆتۆزۆرەکانی ریخۆڵە – جیاردیا لامبلیا.**
- **پرۆتۆزەرەکانی خوێن – لیشمانیا و پلاسمۆدیۆم.**
- **پرۆتۆزۆرەکانی کۆئەندامی زاووزێ – تریهۆمۆناس**
- **.پرۆتۆزۆری شانە قوڵەکان – تۆکسۆپلاسما و پنێومۆسیستی کارینی.**

### کرمەکان (میتازۆر)

مشەخۆری فرەخانەیین، بەچاو دەبینرێن، وەك کرم دەبنە هۆی تالێهاتن و هەوکردنی سەراپایی. بەزۆری وەك کرمە پانەکان، کرمە دەزوویيەکان و هەندێکی دی لە ریخۆڵەدا هەن، بە گشتی چارەسەرکردنی کیمیایی ئەم کرمانە لەناودەبات.

*** مایکۆپلاسما**: میکرۆئۆرگانیسمی یەك خانەیین، نزیکەی 125 – 250 نانۆمیتر گەورەن ، لەم ساڵانەی دواییدا پاش ئەنجامدانی چەند لێکۆڵینەوەیەکی ورد مایکۆپلاسما لەڤایرۆسەکان جوداکرانەوە. زۆرجاران دەبێتە هۆی سۆی ڕاڕەوو بۆری هەناسەو سییەکان.

*** ریکێتسیما**: خۆرەی گچکەن قەبارەیان لە نێوان ڤایرۆس و بەکتریادایە ، 400 – 500 نانۆمیتر گەورەن . پێکهاتوویان وەك بەکتریایە، بە دابەشبوون زێدەبن و ئەنتیبایۆتیك لە ناویان دەبات .

*** کلامیدیا**: چەند ساڵێك لەمەوبەر وادەزانرا کۆمەڵەی کلامیدیا ڤایرۆسی گەورەن، بەڵام ئەمڕۆ پاش ئەوەی روونبووەوە کلامیدیا هەردوو ناوکە ئەسیدی RNA و DNA ی تیادایە سەلمێنرا ئەو تیۆرییە هەڵەبوو. ئەمانیش خۆرەی یەك خانەیین و 250 – 300 نانۆمیترن و ئەنتیبایۆتیك لە ناویان دەبات.

## 3- پرۆسێسی هەوکردن

مەبەست لەم زاراوەیە ئەوەیە چۆن دەتوانین چۆنیەتی تووشبوون و دەرکەوتنی نیشانە درمەکان لەشێوە جیاوازەکاندا بناسینەوە.

**1- هۆی سەرەتایی**: مەبەست لەچوونە ناوەوەو زێدبوونی میکرۆبی درە.

**گرنگترین هۆکارەکانی ئەمانەن:**

*** چڕی تووشبوون**: ژمارەیەکی زۆر لەمیکرۆب دەبنە هۆی نەخۆشییەك.

*** درێتی**: توانای میکرۆب کە بتوانێت لە لەشێکەوە بگاتە لەشێکی دی.

*** بەرگری لەش**: لەکاتی چوونە ناوەوەی میکرۆبدا خانەکان بەرگرییەکی کەم (بەگریی خانەیی) دەکەن.

*** درێ (ڤیرولێنت)**: پاش هەوکردن، ژمارەی میکرۆبەکان زۆر زێد دەکات لەوانەیە نەخۆشییەکی ترسناك دروست بکات.

*** توانای ژەهراویکردن**: توانای میکرۆب بۆ ژەهر دەرکردن وەك باسیلی وەناق و دەردەکۆیان .

*** توانای دژەژیان** (ئەنتیجینی): هەندێك میکرۆب پێکهاتەیەکی ئاسانیان هەیە. لەگەڵ چوونە ناوەوەی میکرۆبدا راستەوخۆ دژە تەن بۆ دەردەژیانی میکرۆبەکە دەردەکەون (کە رۆڵی سەرەکییان بەرگریکردنە) و هەندێکجار دەبنە هۆی فرەهەستیاری.

**2- لەشی مرۆ و ئەو میکرۆئۆرگانیسمانەی دەبێتە هۆی سۆ رۆڵیان لەدەرکەوتنی پرۆسێسی** هەوکردندا هەیە، چونکە هەردووکیان چەند میکانیزمێکی تایبەت یان نا تایبەتیان هەیە. بە مانایەکی دی پرۆسێسی هەوکردن شانبەشانی دوو هۆکاری تر (میکرۆب و زیندەوەرە تووشبووەکە) دەڕوات. زۆرجار هەردوو هۆکارەکە لەلای ترەوە (هۆکاری دەرەوە، فیزیکیی و کۆمەڵایەتی) فشاریان دەکەوێتە سەرو دەبێتە هۆی درەنگ یان گران دەرکەوتنی و نیشانەکانی هەوکردنەوەکە ونەخۆشییەکە.

**جۆرەکانی هەوکردن**

زۆرجار هەوکردن وەك نەخۆشییەکی هەستپێکراو لەلایەن نەخۆشەوە یان بینراو لەلایەن نوژدارەوە دەستنیشان دەکرێت، یان دەرکەوتنی هەندێك نیشانە وا لەو کەسە دەکات هەست بە نەخۆشی بکات. وەلێ لە هەندێك باری تردا مرۆ هیچ نیشانەیەکی نییە، ئەوسا لەش بەرگری بەرامبەر میکرۆبەکە دروست دەکات. هەندێك جاری دی مرۆ هەڵگری میکرۆبەکەیە بەڵام هیچ نیشانەیەکی کلینیکی تیادا نابینرێت.

**نیشانە سەرجێگەییەکانی هەوکردن**

***نیشانەی جێگەیی:** لەم بارەدا میکرۆبەکان لەئاستی شوێنی چوونە ناوەوەدا یان لە نزیکەوە دەمێننەوەو دەبنە هۆی دروستبوونی ئاوساوییەکی سوورهەڵگەڕاو، زۆرجار وەك دومەڵ بەئازارە.

هەندێکجاری دی میکرۆبەکان لەئاستی چوونە ناوەوەدا دەمێننەوەو بە ئاسانی خۆیان دەگەیەننە نێو سوڕدانی خوێن و دەبنە هۆی تێکچوونی باری گشتیی نەخۆش وەك لە وەناق و دەرەدەکۆیاندا دەبینرێت.

زۆرجار هەوکردن جێگەییە لەباری کوتوپڕەوە دەگاتە باری تولانی و دەبێتە هۆی هەوکردنی ئەندامەکە وەك لە مەرازەدا دەبینرێت.

گەر هەوکردنە شوێنییەکان تووشی رووداوی دی ببن ئەوسا میکرۆبەکە بەئاسانی دەگاتە نێو خوێن یان لیمف و دەبێتە هۆی زێدبوونی (بێشوماری) ژمارەی بەکتریاکە لەخوێندا کە بە Septicemia پیسبوونی خوێن ناسراوە.

* **نیشانەی سەراپایی:** میکرۆبەکان (پاش زێدبوونیان) لەنزیك ئاستی چوونە ناوەوەیانەوە خۆیان دەخزێننە سوڕدانی خوێنەوە، پاشتریش بەئاسانی خۆیان دەگەیەننە شانەو ئەندامەکان.

**نەخۆشییە درمەکان لە دوو شێوەدا دەبینرێن:**

1- **هەوکردن:** سەرەتا بەچەند سوڕێك و پاشتریش بەچەند قۆناخێکدا دەڕوات لەکۆتاییدا لەژێر کاری دەرماندا چاك دەبێتەوەو چەند پلەیەك بەرگری پاش هەوکردن بۆ لەش بەجێدەهێڵێت، گرانەتاو نەخۆشییە کوتوپڕە ڤایرۆسییەکان نەخۆشی سوڕین !

2- **ژەهراویبوونی خوێن:** جۆرێکی تایبەتی و ترسناکی هەوکردنە گشتییەکانەو لەم بارەدا نەخۆشییەکە زۆر ئاڵۆز دەبێت و دواخستنی چارەی تەواو ژیانی نەخۆش دەخاتە مەترسیی مردنەوە.

لەمێژەوە ئاشکرایە مرۆ و میکرۆئۆرگانیسمەکان هەردەم پەیوەندییەکی نائاساییان هەبووە، زۆر لەمیکرۆئۆرگانیسمەکان هێرش دەکەنە سەر بەرمەکانە (لەئامارێکدا دەرکەوتوە کەزۆربەی منداڵانی ژێر یەك ساڵ بەگەدەو ریخۆڵەسۆ دەمرن) ئەم راستییە لە وڵاتانی رۆژئاواشدا زێدەتر دیارە. هەروەها لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا زۆر گیروگرفتی خۆراك و ئامادەکردنی خۆراك بۆ منداڵ و پاکوخاوێنی و گیروگرفتی کۆمەڵایەتی، رامیاریی هەمەجۆر هەیەو هەر یەکەیان بە جۆرێك کاردەکاتە سەر نەشونمای منداڵ. پاش ئەوەی میکرۆئۆگانیسمەکان خۆیان دەخزێننە نێو لەشەوە هێدی هێدی یان راستەوخۆ دەکەونە کار بۆ زێدبوون و بڵاوبوونەوەیان تا بەشێکی زۆر لەخانەو ئەندامەکان تووشبکەن. ئەمە دەبێتە هۆی بێهێزی و لاوازبوونی کۆئەندامی بەرگری بەتایبەتی لیمفەخانەی جۆری T4.

ئەمەن رۆڵێکی گرنگ دەبینێت لەبەرگریی لەشدا، لەبەر ئەوەیە لەمنداڵیدا زۆربەی درمە ڤایرۆسییەکان مامناوەندین، وەلێ هەمان درم کە تووشی لاوێک دەبێت زۆرجار کوتوپڕترەو ئاڵۆزترە ئەمەش ئەو راستییە دەسەلمێنێت کەجیاوازی لەنێوان بەرتەکی منداڵو لاودا هەیە.

**بنچینەکانی دەستنیشانکردن**

ئەوەی شایانی باسە راستیی وتنی نەخۆش ئاوێنەی پزیشکە و هاوکات پێویستە پزیشکیش هەوڵبدات بەزووترین کات درمەکە یان نەخۆشییەکە دەستنیشان بکات ، سەرەتا پێویستە بیر لەم خاڵانە بکاتەوە:

1) ئایا نەخۆشییەکە لە هەوکردنەوە پەیدابووە یان نا؟ چۆن نیشانەکانی دەناسرێتەوە؟
2) کام جۆر میکرۆب (ڤایرۆس، بەکتریا، مشەخۆر، کەڕوو) هۆی نەخۆشییەکەیە؟
3) کام دەرمان میکرۆبەکە دەکوژێتو زیان لە نەخۆش نادات؟

## 4- قۆناخەکانی تووشبوون

لە کاتی چوونە ناوەوەی میکرۆئۆرگانیسمەکەوە تا چاکبوونەوە هەموو نەخۆشییەکی درم بەم قۆناخانەدا دەڕوات:

1- **ماوەی تووشبوون**: لەو کاتەوە دەست پێدەکات کەمیکرۆبەکە دەچێتە نێو لەشەوەو ژمارەیان زێدەکات.

**شوێنی سەرەکیی چوونەناوەوەی میکرۆبەکان:**

- بۆرییەکانی هەوا، پێشیان دەگۆترێت درمە هەوایەکان (سورێژە، مێکوتە).
- بۆری هەرس، پێشیان دەگوترێت درمەکانی هەرس (گرانەتا، بروسێلاو کۆلێرا).
- پێستو ناوپۆشەکان (مەلاریا، دەردەکۆپان، زەردوویی و تامیسک).

2- **ماوەی کڕکەوتن**: بریتییە لەماوەی نێوان چوونە ناوەوەی میکرۆب تا دەرکەوتنی یەکەم نیشانەی نەخۆشییەکە، ماوەیەکی بێدەنگەو لەسەرخۆ یان خێرا میکرۆبەکە لە لەشدا زێدەکات.

**شێوە جیاوازەکانی ماوەی کڕکەوتن:**

- کورت لە نێوان 1 – 7 رۆژدایە، وەک وەناق ، ئینفلۆەنزاو دیزانتری.
- مامناوەند لە نێوان 1 - 2 هەفتەدایە، وەک زەردوویە کوتوپڕە ڤایرۆسییەکان.

**تێبینی**: ماوەی کڕکەوتن زۆر گرنگە بۆ دەستنیشانکردنی کاتی درمەکە، هەروەها پێویستە بزانین ئایا نەخۆش پێشووتر پەیوەندی لەگەڵ یەکێکدا هەبووە کە گومانی هەمان درمی لێبکرێت.

**تێبینی: زەردوویی ڤایرۆسی جۆری A لە دوارۆژی ماوەی کڕکەوتندا درمییە.**

3- **دەمی دەرکەوتن**: مەبەست لەدەمی دەرکەوتنی یەکەم نیشانەی نەخۆشییەکەیە، زۆرجار لەسەرەتادا نیشانەکانی نەخۆشییەکە کوتوپڕ یان لەسەرخۆ دەردەکەون. نیشانەکانی ئەم ماوەیە ناتایبەتن، هەندێکجاری دی لە سەرەتادا هەندێک نیشانە دەردەکەون کەزۆر بەسوودن وەکو پنتەکانی کۆپلیک (Koplik) لەناوپۆشی دەمدا بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکە.

4- **ناسینەوەی نەخۆشییەکە**: لەم قۆناخەدا نیشانەکانی نەخۆشییەکە بە باشی دەردەکەون وەک تا، رەنگ بزرکان، هەرازە و سکچوون. لەوانەیە هەر لەم قۆناخەدا ئاڵۆزکارییەکانی نەخۆشییەکە دەربکەون وەک گەشکە، خوێنرێژیی هەوی، گرانەتا لە ریخۆڵەدا، لەم قۆناخەدا بەئاسانی نەخۆش کەسانی دی تووش دەکات.

5- کۆتـا : لـەم ماوەیـەدا سـوڕی نەخۆشـییەکە تـەواو دەبێـت، ئـەویش یـان بێنیشـانە بەجێهێشـتن چاکدەبێتەوە یـان نەخۆشـییەکە بـەرەوە درێژخایـەنی (لـە زەردوویـیە ڤایرۆسـییەکاندا جۆری چالاك یـان بـەردەوام) دەڕواتو بـەمردنی نـەخۆش کۆتـایی دێـت. زۆربـەی کـات چـاکبوونەوە لەسـەرخۆیە، لەوانەیـە نـەخۆش بەتـەواوی چـاك ببێتـەوە یـان کـەمێك مـاکی بمێنێـت وەك لـە مێشـکە پەردەسـۆدا دەبینرێـت. لەوانەشە چاکبوونەوە تـەنیا کیلینیکی بێـت، وەلـێ لـە تاقیگـادا میکرۆبەکـە هێشـتا لـە لەشـی نەخۆشـدا مابێت.

زۆرجار پاش چاکبوونەوە بەرگری لەشی نـەخۆش گـۆڕرانی بەسـەردا دێـت، لـە زۆربـەی نەخۆشـییەکاندا پـاش یەکـەم درم (بـەگریی پـاش درم) ی لـەش زێـدەکات، هـەروەها بـە پێـی جـۆری میکرۆبەکـەو نەخۆشییەکە بەرگری دەگۆڕێت.

**سەرچاوەکان**

**References**
1.Marin GH. Voiculescu. Boli infectioase inl trecut si in present. editura medicala. Bucurest 1987; 1:11-34.
2.A. Paunescu-podeanu. principalele clinice I practica medicala. vol 2. editura medicala.. Bucharest. 1983
3.Bals, M. introduction in Infectious Diseases. Med eds Bucharest 1958
4.Weinstein, L. Infection in Infectious diseases: retrospect and reminiscene, J Infc Dis 1974; 129, 489.
5.Voiculescu, M patologi actuala boli infectioase. prevalensa. profilatia, Editura life Bucurest 1978, 10. 433
6.Burnet Mc F. The natural History of infectious diseases. Cambridge. Universty press. London, 1953
7.Bulla, A, et l, Acute respiartory of infectious arewive. Bull Wld WHO 1978; 56,481
8.Jack S Remington and Jerome O Klein. Infectious diseases of the fetus newborn infant. 4th eds W B Saunders company, USA, 1995
9.Standford T. Shulman Introduction to infectious diseases. In Infectious diseases 5th eds USA 1997
10 J. Willis Hurst. Medicine for the practicing physician. Section 8. infectious diseases, 3ed eds, Butterworth-Heinemann, USA 1992
11 Feigin, R D and Cherry, J D . eds Text book of pediatric infectious diseases, 3rd eds. Philadelphia. W.B Saunders CO., 1992.
12.American Academy of Pediatrics 1994 red book Report of the Commettee on infectious Diseases 23rd ed. EIK Growe, IL: American Academy of pediatrics, 1994
13.Moselio Schaechter. Gerald Medoff and Barry I Eisentein Mechanisms of Microbial Diseases, second edition William & Wilkins 1993
14.Iwarson-Norrby, Infektionsmedicin epidemiologi, klinik och terapi Säva Förlag, Lund Sweden 1998
15.Mary Kay Kindhauser. Global defence against the infectious disease threat, Geneva.WHO/CDS/2003 15.
16.www.karolinska.se © 050620

## 5- کۆئەندامی بەرگری لەش

بـریتین لـەو پێکهاتووانـەی دەتـوانن و ڕۆڵیـان لەبـەرگریکردن لەئەندامـەکان و پێکهاتووەکـانی لـەش دژی هۆکاری تێکچوون (ئەنتیجێن، ناهاوسەنگی و میکرۆئۆرگانیسم) دا هەیە.

مرۆ 2 جۆر کۆئەندامی بەرگری هەیەو ئەمانەن:

1- کۆئەندامی بەرگری نێوخوێن:

لەچەند جۆرێکی خڕۆکە سپییەکان (لمیفۆسایتەکان) پێکهاتووە، کە بەرگریی گشتی دروست دەکەن.

2- کۆئەندامی بەرگری نێوپۆشەکان:

ئەم کۆئەندامە لە ئاستی نێوپۆشەکانی لەشدا هەیە، بەرگریی جێگەیی دروست دەکەن.

**شێوه سروشتییەکانی بەرگری دژی میکرۆب**

**گومانی تێدا نییە لەشی ئادەمیزاد لەچەند کۆئەندامێك پێکهاتووه (هەر کۆئەندامێك لەچەند ئەندامێك پێکهاتووه) و هەریەکەیان بەشێوەیەکی تایبەتی و رێکوپێك پارێزگاری لەش دەکەن و دژی میکرۆبە زیانبەخشەکان دەجەنگن.**

**بەرگرییە سروشتییەکان**

1- بەرگریی میکانیکی: لە(پێست، نێوپۆشەکان، پەردە لینجەکان و موو) پێکهاتووه.

2- خانە قەپگرەکان: خانەی قوتدەری جێگیر و سوڕاوەن.

3- کۆئەندامی تەواوکەر (compliment).

4- هۆکارە بایۆکیمیکییەکان: (ئینترفێرۆن، گلاندی پرۆستات، پۆلیپێپتید، لاکتین، هۆرمۆن، توخم، تەمەن).

5- کۆئەندامی بەرگری: (لیمفۆسایتەکان، دژەتەن، ئیمونۆگلۆبولینەکان... تاد).

**1) بەرگریی میکانیکی**

**پێست، گرنگترین بەربەستی سروشتییە کە رێگانادات میکرۆب بچێتە نێو لەشەوە، چونکە چینی دەرەوەی شانەی پێست ماددەی کیراتینی تێدایە کە لەخۆیدا بەربەستێکەو بەرگەی ژەهرو ئەنزیمی میکرۆبە زیان بەخشەکان دەگرێت. هەروەها پێست ژمارەیەك گلاندی ئارەقرژێنی تێدایە کە ئارەق و ماددەی تری زیانبەخش (لەش دروستی دەکات) فڕێدەداتە دەرەوە. هاوکات ئارەقی مرۆ ماددەی وای تێدایە کەچالاکیی میکرۆبەکان رادەگرن. هەروەها پێست جۆرێك ترشەلۆکی چەوری تێدایە کەمیکرۆب دەکوژن.**

**لە گەڵ ئەمەشدا هێشتا دووجۆر میکرۆب (ستافیلۆکۆك و سترێپتۆکۆك) هەر دەتوانن لەزاری گلاندی ئارەق و ئاشین یان دومەڵەوە بچنە ناوەوە ببنە هۆی سووربوونەوە یان هەوکردن.**

**نێوپۆشەکان، سەر رووی نێوپۆشەکان بەپەردەی لینج داپۆشراوە، وەك پەردەی نێوپۆشی لووت، گوێ، گەروو و گەدەو ریخۆڵەکان. پەردەکە مادەیەکی لینج دەردەدات کە رێگا لەگەشەی میکرۆبەکان دەگرێت، هاوکات پەردەکە وەك بەرگرێك وایە رێگا بەهەموو جۆرە مادەو تەنێکی بێگانە نادات بچنە نێو شانەکانەوە.**

**تیسك و موو، هەندێك لە پەردەی سەر رووی نێو پۆشە لینجەکان مووداون، بوونی موو یەکێکە لەرێگاکانی بەرگری و رزگاربوونە لەگەردیلەی ورد و میکرۆب و گیانەوەرە بێگانەکان.**

**هەروەها موو لەسەر پێست، لە کونە گوێ و نێو لووتدا بەرگرێکی ترن بۆ رێگاگرتن لەچوونە ناوەوەی میکرۆب بۆ نێو لەش.**

**تێبینی: فرمێسك ژمارەیەکی زۆر ئەنزیمی خانەی (لایزۆزۆم) ی تێدایە کە ئەنزیمی بەکتریاکوژی تێدایە نێوپۆشی چاو پاك دەکاتەوە.**

**هەروەها لەنێو شلەو چڵمی نێو لووت. لیك و زەرداوی خوێن (سیرەمی خوێن) و شلەی نێو هەناویشدا لایزۆزۆم هەیە**

2) خانە قەپگرەکان

ئەم کۆئەندامە لەو خانە قەپگرانە دروستبووە کە بە هۆی گەندە پێکانیانەوە خۆیان لەمیکرۆب نزیک دەکەنەوەو گەمارۆیان دەدەن و دەیانقۆزنەوەو تێکیان دەشکێنن و لە کۆتاییدا هەرسیان دەکەن.

هەڵلوشین بریتییە لەبەرتەکی بەرگری ناتایبەتی لەش بەرامبەر تەنی بێگانە.

ئەوەی راستی بێت لەساڵی 1884دا میسینکۆف لەسەر میکانیسمی هەڵلوشینی نووسیوەو دەبێژێت کە هەڵلوشین کۆنترین بەرتەکی بەرگریی زیندەوەرە. هەر کاتێك میکرۆبێك چووە نێو لەشەوە بۆ ئەوەی بەملاولادا بڵاونەبێتەوە خێراخڕۆکە سپییەکان لەدەوری کۆدەبنەوەوتۆڕێکی ریشاڵ لە فایبرین دروست دەبێت و شلەی پلاسماش لە موولوولە خوێنەکانەوە دەپاڵێورێنە ناویانەوەو گەمارۆیان دەدەن و پاشتر خانە قەپگرەکان بەتەواوی بەسەریاندا زاڵدەبن.

خانە قەپگرەکان دوو جۆرن:

- خانە قەپگرە گچکەکان

مۆخی ئێسك راستەوخۆ دروستیان دەکات، بەکۆمەڵی دەنکۆڵەدارەکان ناسراون، هەمیشە رۆڵی پاسەوان دەبینن، بەتایبەتی خانەی ترشخواز، تفتخوازو هاوتاکان کە 70٪ خڕۆکە سپییەکان پێك دەهێنن.

- خانە قەپگرە گەورەکان

نێوی خانە گەورەکان لەئەندامێکەوە بۆ ئەندامێکی تر دەگۆڕێت:

- لە خوێندا پێیان دەوترێت مۆنۆسایت = تاکەخانە.
- لە جگەردا پێیان دەوترێت خانەی کۆپفەر.
- لە بەستە شانەکاندا پێیان دەوترێت هیستۆسایت.
- لە ژێرکۆڵە گلاندا تەنیشتە خانەولەسپڵدا پێیان دەوترێت پلدارە خانەی Dentiritic. ئەوەی جێی سەرنجە خانە دەنکۆڵەدارەکان و بێدەنکۆڵەکان زۆر هەستیارن بۆ لەناوبردنی میکرۆب، نەك تەنیا لە خوێندا بەڵکو لە نێو هەموو خانەو بەشەکانی لەشدا.

3) کۆئەندامی تەواوکەر

ئەمیش وەك کۆئەندامەکانی تر رۆڵی گرنگ لە بەرگریکردنی لەشدا دژی میکرۆب دەبینێت و لە 25 پرۆتین پێکهاتووە کە لەسیرەمی خوێندا هەن و چالاکن. پرۆتینەکان بە هۆی چەند ئەنزیمێکەوە چالاك دەبن و دەبنە هۆی:

- ناسینەوەی دژەتەنەکان و لەناوبردنی خانە ئەنتیجێنەکان.
- هەژاندنی لیمفەخانەی جۆری B تا دژە تەن دروست بکەن.
- گەمارۆدانی میکرۆبی نەخۆشی.
- لە ناوبردنی هەندێك میکرۆئۆرگانیسم.
- راستەوخۆ لەناوبردنی خۆرەی جۆری مێنیگۆکۆك و گۆنۆکۆك (بەکتریای سوزەنك)، کە لەناو خانەدا دەژین.

4) هۆکارە بایۆکیمیکییەکان

(کریات) لەساڵی 1977دا ئاماژەی بەو پێکهاتووە پۆلیپێپتیدانە کرد. کەپرۆتینی گچکەی دروستکراوی خانە چالاکەکان بەتایبەتی لیمفۆسایت، بەشداری وەڵامدانەوەی خانەکان دەکەن و رۆڵیان لەکۆئەندامی بەرگری و سایتوکینەکاندا هەیە.

ئەوەی شایانی باسە سایتۆکینەکان بەشدارن لە:
- ئینتەرفیرۆنی ئەلفا و بێتا و گامادا.
- ئینتەرفیرۆنی 1 (ئەلفا و بیتا)، 2، 3، 4 (فاکتۆری هەژاندنی خانەکانی B) هەروەها ئینتەرفیرۆنی 5و 6.
- فاکتۆری لەناوبردنی شێرپەنجە (ئەلفا و بێتا).
- فاکتۆری هەژاندنی (ئینترلیوکینی 3).
- سایتۆلایزین.
- فاکتۆری گەورەبوون و گەشەکردن.
- فاکتۆری متکەر (Suppersso).

**ئینتەرفێرۆن**

(ئیسحاق و لیندێمان) لەساڵی 1957دا ئینتەرفێرۆنیان (ماددەیەکی کیمکی) دۆزییەوە.

کاتێك ڤایرۆسێك دەچێتەوە لەشەوە خانەکانی راستەوخۆ ئینتەرفێرۆن دروست دەکەن کە رۆڵی گرنگی لەبەرگری ناتایبەتی ئۆرگانیسمدا هەیە. هەرگیانەوەرێك ئینتەرفێرۆنی تایبەتی خۆی هەیە. وەلێ بە جۆرە ڤایرۆسێك تایبەت نین. بەڵکو ئەوان هەرچی ڤایرۆسێکیان دی هەوڵ دەدەن بیکوژن.

**ئینتەرفێرۆن 2 رۆڵی گرنگی هەیە:**

- لە گەڵ ڤایرۆسدا دەجەنگێت تاکو لەش دژەتەن دروست دەکات و میکرۆبەکە لەناو دەبات.
- زێدبوونی ڤایرۆس رادەگرێت.

لە نەخۆشی ئەیدزدا ئینتەرفێرۆن زۆر نزم دەبێتەوە و کارە بەسوودەکانی زۆر کەم دەبنەوە یان نامێنن.

**گلاندی پرۆستات**

رژاندنی پرۆستات لە نێردا رۆڵێکی گرنگ لە کوشتنی بەکتریای نێو گلاندەکەدا دەبینێت، بۆیە میزڵدانی نێرینە کەمتر تووشی نەخۆشی دەبێت وەك لە مێوینە.

**پۆلیپێپتید**

کۆمەڵە ماددەیەکن راستەوخۆ لەپرۆتین وەرگیراون، دەتوانن گەلێ میکرۆب لەناوبەرن. لەم ساڵانەی دواییدا پۆلیپێپتیدەکان لەپیشەسازی دەرمانی بەکتریاکوژدا بەکاردەهێنرێت.

**لاکتین**

ماددەیەکی پرۆتینییە لەشیری دایك و مانگادا هەیە و دژی هەوکردنی مەمك و گەرووی منداڵی تازە لەدایکبوو کاردەکات، هەروەها کار دەکاتە سەر بەکتریای سترێپتۆکۆکەس.

**هۆرمۆن**

هۆرمۆنەکان (کەم یان زۆر) کاردەکەنە سەر بەرگریی لەش دژی میکرۆب . کەمبوونی هۆرمۆنی ئینسولین دەبێتە هۆی نەخۆشی شەکرەو رێگا بۆ هەوکردن بە بەکتریا تەزبیحی و هێشوویی و کەڕووەکان خۆش دەکات.

**توخم**

بۆ نموونە نێرینە زێدەتر تووشی فەرەنگی دەبێت وەك لەمێوینە، هەروەها مێوینە زێدەتر تووشی تریهۆمۆناس دەبێت وەك لە نێرینە.

**تەمەن**

ئەوەی راستی بێت تەمەن کارێکی گەورە دەکاتە سەر بەرگریی مرۆڤی بەساڵاچوو و منداڵ وەك لە لاو. منداڵ زۆر بەرگری بەکتریاکان دەکات، وەلیّ کەمتر بەرگری درمە ڤایرۆسییەکان دەکات وەك لەڤایرۆسی ئاولەو سورێژەو گوێرەپەدا دەبینرێت.

**ئینتەرلیۆکینەکان**

ژمارەیەك پێکهاتوون لەکاتی هەوکردنی کوتوپڕدا لەلایەن خانەی قەپگرەوە دەرئەدرێن و چەند جۆرێکیان هەیە کەئەمانەن:

- ئینتەرلیۆکینی 1: لە قۆناغی کوتوپڕی هەوکردندا کەم دەکاتەوە، ژمارەی خانە هاوتاکان زێدەدەکات، هەروەها دەبێتە هۆی چالاکبوونی ئینتەرلیوکینی 2و خانەکانی B و هەندێك خانەی تر.
- ئینتەرلیۆکینی 2: لیمفۆسایتی T دروستی دەکات (لە ئەیدزدا زۆر کەم دەبێتەوە چونکە ڤایرۆسەکە لیمفۆسایتەکانی T لەناودەبات).
- ئینتەرلیۆکینی 3: وەك فاکتۆری هەژاندن کاردەکات.
- ئینتەرلیۆکینی 4: کۆئەندامی بەرگری (داکۆکی) و خانەکانی B دەهەژێنێت تا IgE، IgG دروست بکات.
- ئینتەرلیۆکینی 5: خانەکانی B دەهەژێنێت تا IgM، IgG دروست بکات.
- ئینتەرلیۆکینی 6: خانە کانی B دەهەژێنێت تا ئیمونۆگلۆبولین دروست بکات.

**5) کۆئەندامی بەرگری**

هەموو دەزانین کۆئەندامی بەرگری رۆڵی سەرەکیی لەبەرگریکردنی دژی میکرۆبدا دەبینێت، کۆئەندامی بەرگری لە 2 جۆر پێکهاتوو درووستبوە کەئەوانیش لیمفۆسایتەکانن. ئەمانیش جۆرێکن لە خڕۆکە سپییەکان و ئەرکی سەرشانیان تایبەتە بە بەرگریکردنی لەش دژی ئەنتیجینەکان و ئەمانیش دوو جۆرن:

**1- لیمفۆسایتی B**

لەمۆخی ئێسکدا دروست دەبن و خوێن دەیانگوێزێتەوە بۆ سپڵ و گرێ لیمفاوییەکان، گرنگترین ئەرکیان دروستکردنی دژەتەنە و بەپێی جۆری هۆکارەکان (فاکتۆرەکان). ڤایرۆس، ئەنتیجینی بەکتریا چالاك دەبن و هەروەها ئەم جۆرە لیمفۆسایتانە دەبنە هۆی دروستکردن و بەرهەمهێنانی 5 جۆر لە ئیمونۆگلۆبولین، کە بریتین لە: کۆمەڵێك پرۆتین و لەخوێندا هەن و وەك دژە تەن رۆڵی پاسەوان دەبینن. فرمانی ئیمونۆگلۆبولینەکان زۆر ئاڵۆزە چونکە مژادی بنەڕەتی پێکهاتەی وەرگرەکانن.

**جۆرەکانی ئیمونۆگلۆبولین:**

**1- ئیمونۆگلۆبولینی (IgG)**

نزیکەی لە70٪ی سەرجەمی هەموو ئیمونۆگلۆبولینەکانن. یەکەمجار پاش هەوکردن IgG دەردەکەوێت و پاشتر تا رەوینەوەی باری توندی نەخۆشییەکە دەمێنێتەوە، وەلێ هاوکات IgM نزمدەبێتەوە.

ئەوەی راستی بێت تا ئێستا سەلمێنراوە کەتەنیا IgG لەدایکەوە بەوێڵاشدا دەپەڕێتەوەو خوێن دەیگەیەنێتە کۆرپەلە (بەتایبەتی پاش 24 هەفتەی سکپڕی) پاش لە دایکبوون بەرگرییەکی 3-5 مانگی دروست دەکات. ئەم ئیمونۆگلۆبولینە چوار جۆرن و بریتین لە IgG4، IgG3، IgG2، IgG1 کاری سەرەکییان بەرگری دژی میکرۆبە.

**2- ئیمونۆگلۆبولینی (IgM)**

نزیکەی لە 5-10 ٪ی هەموو ئیمونۆگلۆبولینەکان، یەکەم جۆری دژە تەنن (وەک وەڵام) زوو لەکاتی هەوکردندا دەردەکەون و پاشتر نزم دەبنەوە و تا بەتەواوی نامێنن. لە گەردیلەیەکی گەورە پێکهاتووەو 2 جۆرن و رۆڵیان لە بەرگری دژی میکرۆبدا هەیە.

**3- ئیمونۆگلۆبولینی (IgA)**

لە نێو سیرەمی خوێن، فرمێسک، شلەی نێوپۆشی بۆرییەکانی هەناسەدان و ریخۆڵەدا هەیەو هاوکات رۆڵی گرنگیان لەبەرگری دژ بەمیکرۆب و هاوسەنگکردنی ژەهری بەکتریاکاندا هەیە (یەکەم هێڵی بەرگری دژی هەوکردنن) و 2 جۆری (1، 2) یان هەیە .

**4- ئیمونۆگلۆبولینی (IgD)**

رۆڵی گرنگی لەناسینەوەی ئەنتیجینە تایبەتەکاندا هەیە.

**5- ئیمونۆگلۆبولینی (IgE)**

رۆڵی گرنگی لەبەرتەکی هەستیاریدا هەیە .

**کاری ئیمونۆگلۆبولینەکان**

- ناسینەوەی ئەنتیجینی میکرۆبەکان و پێکەوەلکان.
- راستەوخۆ کاردەکەن و ژەهری بەکتریا هاوتادەکەن.
- کۆئەندامی تەواوکەرو هەڵلوشین چالاک دەکەن.

**لە یەکەم وەڵامدانەوەدا:** (لە یەکەم پەیوەندی نێوان ئەنتیجین و لەشدا) ، پاش 7-10 رۆژ دژە تەنەکان لەنێو خوێندا دەردەکەون و هەفتەکانی داهاتوو بە بەرزی دەمێننەوە.

**لە دووەم وەڵامدانەوەدا:** (دووبارە پەیوەندیکردنەوەی لەش لەگەڵ ئەنتیجیندا)، لە 1-3 رۆژدا دژە تەنەکان دەردەکەون و لە چەند رۆژێکدا زۆر بەرز دەبنەوە.

**2- لیمفۆسایتی T**

لە مۆخی ئێسکدا دروست دەبن و دەبنەمۆی دروستبوونی بەرگریی خانەیی پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان هەردوو لیمفۆسایتەکەدا هەیە

**بەپێی کاریان 4 جۆر لیمفۆسایت هەن ، کەئەمانەن:**

- کوژەر = LT3 رۆڵی لەسەرکوتکردن و کوشتندا هەیە.
- یاریدەدەر = LT4 رۆڵی لەهەژاندنی لیمفۆسایتی T و وەڵامدانەوەی بەرگریی سۆزیدا هەیە.
- بیرەوەری = LT5 لەوەڵامدانەوەی بەرگریی ناوەنجیدا بەتوانان و دووبارە ئەنتیجینەکان دەناسنەوە.
- راگرەکان = LT8 توانای راگرتنی وەڵامدانەوەی سۆزییان هەیە.

**خانە کوژەرەکان** Killer cell:

ئەنتیجین دەناسنەوەو بەدژە تەن دەوریان دەگرن و خانەکان تێکدەشکێنن.

**خانە کوژەرە سروشتییەکان** Natural Killer:

خانە شێرپەنجەییەکان تێکدەشکێنن.

**کۆئەندامی بەرگری 2 میکانیزمی هەیە کەئەمانەن:**

- میکانیزمی بەرگری ناتایبەت (سەربەست لە ئەنتیجین).
- میکانیزمی بەرگریی تایبەت (بەدستکەوتوو).

**ئەوەی راستی بێت هەرچەندە هەر دوو کۆئەندامی بەرگری (نێوپۆشەکان‌و نێوخوێن) جیاوازن‌و هەر یەکێکیان بەجۆرێکی تایبەت بەرگری لە لەش دەکات، هاوکات پەیوەندییەکی زۆر بەهێزیشیان بەیەکەوە هەیە.**

**بەرتەکی بەرگری**

**لە کۆئەندامی بەرگریی نێوپۆشەکان‌و نێوخوێندا 2 جۆر بەرتەکی جیاوازی بەرگری بۆ خانەکانی T‌و B هەیە کەئەمانەن:**

- بەرتەکی سەرەتایی کۆئەندامی بەرگریی خانەکانی T (بەرتەکی دواکەوتوو).
- بەرتەکی سەرەتایی کۆئەندامی بەرگریی خانەکانی B (بەرتەکی ئێستاکە).
- بەرتەکی لاوەکی کۆئەندامی بەرگریی خانەکانی T.
- بەرتەکی لاوەکی کۆئەندامی بەرگریی خانەکانی B.

**1- بەرتەکی سەرەتایی کۆئەندامی بەرگریی خانەکانی T**

**لە ئەنجامی بە یەك گەیشتنی لیمفۆسایتەکانی T‌و ئەنتیجێنەکاندا لیمفۆسایتی هەستیاری تایبەت دروست دەبێت، دەگاتە گرێ لیمفاوییەکان، لەوێدا 2 جۆر خانە دروست دەکات یەکێکیان ئەنتیجینەکان دەناسنەوەو ئەوی تریان دەگاتە خوێن‌و لێپرساوی دروستکردنی ئاوێتەی دژەتەن ئەنتیجین** cmoplex antigen-anticorp **ی هەیە.**

**2- بەرتەکی سەرەتایی کۆئەندامی بەرگریی خانەکانی B**

**هەر کاتێك ئەنتیجێنێك دووبارە دەگاتەوە نێو لەش، ئەوسا بەرتەکی کۆئەندامی T زۆر بەهێزترو چالاکتر دەبێت، چونکە پاش هەموو چالاك بوونێك ژمارەیەکی زۆری خانە (ناسەرەوەکان) دەڕژێنە دەرەوە.**

**3- بەرتەکی لاوەکی کۆئەندامی بەرگریی خانەکانی T**

**هەر کاتێك ئەنتیجێنێك چووە نێو لەشەوە هەڵدەلوشرێت و هەرس دەکرێت.**

**4- بەرتەکی لاوەکی کۆئەندامی بەرگریی خانەکانی B**

**هەر کاتێك ئەنتیجێنێك دووبارە گەیشتەوە نێو لەش ئەوا خانە ناسەراوەکان زوو دەیانناسنەوەو هاوکات (گەر بەراورد بکرێت لەگەڵ دەرکردنی رێژەی دژەتەندا لە کاتی یەکەم پەیوەندیکردندا) ئەوەش دەبێتە هۆی دەرکەوتنی دژە تەنێکی زۆر.**

**هەژاندنی کۆئەندامی خانەکانی B**

**لە ئەنجامی هەژاندنی ئەم خانانەدا لەپلاسماوە دژەتەنی تایبەتی دژ بەئەنتیجێنەکە دەکرێتە دەرەوە کەئیمونۆگلۆبولینن. سەرەتا جۆری IgM دروست دەبێت پاشتر ژمارەیەکی زۆری IgG یش دەردەکەوێت.**

**خانە ناسەرەوەکان: ئەو خانانەن کەبیریان بەهێزەو پاش چاکبوونەوەی یەکەم هەوکردن دەتوانن هەمان ئەنتیجێن، کەدووبارە دێتەوە نێو لەش، بناسنەوە.**

ئەو نەخۆشییانەی لەکاتی ناتەواویی لیمفۆسایتی B و Tدا تووشی مرۆ دەبن:

| ناتەواوی لیمفۆسایتی B | ناتەواویی لیمفۆسایتی T |
|---|---|
| ناتەواوی لەگەڵ لەدایکبووندا | لەگەڵ لەدایکبووندا |
| مایلوما | HIV و ئەیدز |
| لیمفۆما | لیمفۆما |
| بەکتریا کەپسولەدارەکان | بەکتریای نێو خانەکان |
| پنیومۆکۆکەکان | مایکۆبەکتریاکان |
| هیمۆفیلوس ئینفلونزا | لیستیریا |
| ئینتێرۆڤایرۆس | هێرپس ڤایرۆس |
| | ئینفلونزا |
| | رۆتا ڤایرۆس |
| کاندیدەس | کاندیدەس |
| ئەسپێرجیلیۆس | کریپتۆکۆکس |
| | پنیومۆسیستی کارینی |
| جیاردیا | تۆکسۆپلاسما |
| | سترۆجیلۆیدیس |

**دژەتەن**

بریتییە لەو پرۆتینەی لەئەنجامی هەژاندنی ئەنتیجینەوە دژ بەتەنی بێگانە دەردەکەوێت و توانای دروستکردنی بەرتەکی ئەنتیجینییان هەیە.

**ئەنتیجین**

بریتییە لەو پرۆتینەی دەبێتە هەژاندنی لەش و دەتوانێت دژەتەن دەربکات کە بە تەنێکی بێگانە دەناسرێت و ئەویش بەرتەکێکی تایبەتی هەیە.

**سەرچاوەکان**

د.زاهیر سوران، چەند راستییەك دەربارەی نەخۆشیی ئەیدز، گۆڤاری مامۆستای کورد، ژ 28 ل 57-65 ، 1996.

**References**

1 Borton F. Hayneset al. The Immune System. In. Harrisons. principles of internal Medicine. 1991: 76
2 Clark SC et al. Lymphocytes. In Fundamental Immunology. WE Paul (ed). New York Raven 1984
3.Marrack P, Kappler J: The T cell receptor. Scince 238: 1073. 1987
4.Stites DP et al (ed): Basic and Immunology, 5th ed Los Gatos CA Lange Medical Publications.1984
5.Ivan M. Rott, Encyclopedia of Immunology, Academic press. 1992
6.Michael M. Frank et al. Samters Immunologic Diseases, Fifth Edition. Vol 1 1995.
7.Edmund C. Tramout and David L Hoover. General nonspecific host defence mechanisms. In Infectious Diseases (4th Edition) Mandell, Douglas and Bennetts 1995, vol PP 35-130.
8 Fredrick P. Heinzel, Antibodied Mandell. Douglas and Bennetts In Infectious Diseases 4th eds. 1995. 36-57.
9.Peter Densen. Complement. Mandell. Douglas and Bennetts In Infectious Diseases 4th eds. 1995. 58-78
10.A. R. Bardwell, IgG and IgA. Subclasses in Disease. First Edition The Binding site UK 1995.

## 6) نیشانەکان

### 1) تا (2.1)

ئەوەی شایانی باسە لەهەمو کاتێکدا (تا) نیشانەیەکی گرنگی چەند نەخۆشییەك بووە. تالێهاتن ئەنجامی شێواندنی مەڵبەندی رێکخستنی گەرمییە (دەکەوێتە ژێر لانکەی مەژییەوە) بە هۆی کاری هەندێك گەرمی دروستکەرەوە.

ئاسایی گەرمی لەشی مرۆ (36.6 بۆ 37.2) پلەیە، بەڵام ئاسایی پلەی گەرمیی نێو دەم لەنێوان 36 – 37 پلەدایە. ئەوەی جێی سەرنجە پلەی گەرمی بەرەبەیان لە پلەی گەرمی پاش نیوەڕوان نزمترە. (تا) خۆی لەخۆیدا نەخۆشی نییە. بەڵام وەك دەرکەوتووە زۆرجار نیشانەی گەلێك نەخۆشییە.

زۆرجار لەسەرەتادا (تا) نیشانەیەکی هاوبەشی نەخۆشییە درمەکانە. لە 5٪ی بارەکاندا هۆی تا هەوکردن نییە وەك لەنەخۆشیی فرە هەستیاریی شێرپەنجەو نەخۆشی کۆئەندامیدا دەبینرێت.

لەوانەیە (تا) بە دەگمەن لە نەخۆشییە کوتوپڕەکاندا دەربکەوێت یان بێئەوەی هەستی پێبکرێت هەبێت وەك لەزەردوویە ڤایرۆسییەکاندا یان لەمرۆی بەساڵاچوودا هەیە.

زۆرجار تا لەسەرخۆو بێ هەستپێکردن لەنەخۆشییە تولانییەکاندا (بەردەوام) وەك نیشانەیەك دەردەکەوێت. لە هەندێك نەخۆشییدا تالێهاتن تاکە نیشانەی نەخۆشییەکەیە، لەم بارەدا پێویستە رۆژی دووجار تا بپێورێت و نەخۆش تێستی تاقیگایی بۆ بکرێت.

- لەساڵی 1592 گالیلۆ گالیلی گەرمیپێوی دروستکرد.
- سانتۆریۆ لە 1612دا گەرمیپێوی لەنێو ئامێرەکانی نەخۆشخانەدا بەکارهێنا.
- پزیشکی ئەڵمانی ڤاندرلیخ لە 1868دا یەکەم باسی لەسەر (تا) نووسی.

لە کاتی تا ی تولانیدا (زێدە لە 7 رۆژ)، بێنیشانەی تر پێویستە تادار لەنەخۆشخانەدا بهێڵدرێتەوەو گومانیش لەگرانەتا، دەردەباریکە، زراوەسۆ یان سۆی کەناڵی میزو زاووزێ یان نەخۆشیی کۆئەندامی بکرێت. هەر کاتێك نیشانەی تری هەوکردن دەرنەکەوێت نابێت دەرمانی دژی تا بە نەخۆش بدرێت، چونکە دەرمانەکە تا دەشارێتەوەو پزیشك بە هەڵەدا دەبات و دەبێتە خۆی درەنگ دەدۆزرێتەوەی سەرچاوەی تا . زۆرجار ئاڵۆزکارییەکانی سۆ کە دەردەکەوێت ئەوسا پەی بەنەخۆشییەکە دەبرێت و لەم بارەشدا بەزیانی نەخۆش دەگەڕێتەوە.

لەبەرئەوەی تالێهاتن نیشانەیەکی گرنگی هەوکردنە. پێویستە پزیشك بەزووترین کات هەست بەو نەخۆشییانە بکات کە لەگەڵ تالێهاتندا تێکەڵ دەبن، پشتگوێیان نەخات وەك (تا + هەوکردنی کۆئەندامی هەناسەدان، تا + مەرازە، تا + سی یە سۆ، تا + گەورەبوونی لیمفەگرێکان، تا + هەوکردنی کۆئەندامی هەرس و گەدە، تا + زەردبوونی رووخسار، تا + گەورەبوونی سپڵ، تا + گەورەبوونی جگەر... تاد). لەو نەخۆشییانەی سەرەوەدا پێویستە هەمیشە نەخۆش لەماڵەوە یان لەنەخۆشخانەدا جودابکرێتەوەو تێستی تاقیگایی بۆ بکرێت. بەزووترین کات بەدەرمان چارەسەری نیشانەی سۆکە بکرێت تا رێ لەبڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە بگرێت. هاوکات زۆر پێویستە پزیشك گومان لەهەندێك هەوکردنی دی بکات و بەشوێنیاندا بگەڕێت و هەوڵبدات لەرێگای بۆچوونی خۆی و پزیشکی ترەوە هۆکەیان بدۆزێتەوەو دەستنیشانیان بکات وەك هەوکردنی مەرازە، گوێ، کەناڵی زراو، بۆری میزو

کۆئەندامی زاووزێ، گەر ئەو هەوکردنانەی سەرەوە دەستنیشان نەکرێت، ئەوا زۆرجار ئەو هەوکردنانە پزیشك بەهەڵەدا دەبات! هەرچەندە پێشتر ئاماژەی ئەوەمان کرد کە تالێهاتن نیشانەیەکی گرنگ و سەرەکی هەوکردنە . تا لە نەخۆشییە درمەکاندا (سوود لە سەرچاوەی ژمارە 1 و 5 وەرگیراوە)

**تالێهاتن لە نەخۆشییەکانی هێڵی ئیستیوادا**

- هەوکردنە پرۆتۆزۆرییەکان - Protozoal infections
- مەلاریا
- دومەڵی ئەمیبیا - Amebiases Abscess
- لیشمانیای نێو سك - Visceral Leishamniases
- نەخۆشیی خەوی ئەفریقایی - Trypanosomiasis
- نەخۆشیی تریپانۆسۆمیای ئەمێریکایی - Ghagas Disease

**تالێهاتن لە نەخۆشییە بەکتریاییەکاندا**

- گرانەتا (تایفۆید) و پاراتایفۆید
- سالمۆنێلای ژەهراوی
- بۆرێلیا - Lyme Disease
- لێپتۆسپیرۆسس - Leptospiros
- تای چوار بەروو (تای Q) - Q fever
- مێشکە پەردەسۆ، بروسێلا، پنێومۆنیا، دەردەباریکە... تاد

**تالێهاتن لەنەخۆشییە کرمەکاندا**

- سیستۆسۆمیای کوتوپڕ = Katayama Fever
- فیلاریای لیمفەکان = Lymphatic Filariasis
- تۆکسۆکاریاسیس - Toxocariases
- فاسیولای جگەر - Fasciolia Hepatic

**تالێهاتن لەنەخۆشییە ڤایرۆسییەکاندا**

- ئینفلوەنزا
- تای سەنگەر Dengue
- زەردەتا - Yellow fever
- مێشکەسۆ
- تای خوێنبەربوون Hemorrhage Fever (Lassa, Ebola, Marburg)
- هەوکردنی HIV, EBV, CMV
- هەوکردنی Parvovirus B19

**تێبینی**: توێژیاران دەبێژن کە (تا) رۆڵی گرنگی لەبەرگریکردنی لەشدا (دژی بەکتریاو ڤایرۆس) دا هەیە. وەلێ هەندێکجار نەخۆش تادار بووە. بەلام تا ئەمڕۆ سەرچاوەی تا نەزانراوە یان نازانرێت. ئەم دیاردەیە لەساڵانی هەشتاکانیشدا بینراوە کاتێك Knockaet DC و هاوەڵەکانی لەنێوان 1980 – 1989دا توێژینەوەیەکی نوێیان لەسەر 199 تادار کرد (12).

بەلام لەچەند توێژینەوەیەکدا روونکراوەتەوە کە تالیهاتن دەبێتە هۆی زیندبوونی ڤایرۆس و هاوکات دەبێتە هۆی هەژاندنی ئینتەرفیرۆن و بەرزبوونەوەی خرۆکەی سپی و کرداری هەڵلوشین. ئەوەی راستی بێت تای بەردەوام یان تولانی لە (دەردەباریکە، سۆ بەڤایرۆسی HIV و بروسێلا) دا دەبینرێت.

**2) گۆڕانی رەنگ و شێوەی پێست**

پێست، گەورەترین و ئەستوورترین و ئالۆزترین رووپۆشە خانەیەو لە دوو چین پێکهاتووە، کە ئەمانەن:

- (توێژ) رەق و تەنکە.
- (بن توێژ)، نەرم و ئەستووره سەلکی (پیازەی) موو و چەوری تێدایە. ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر رەنگ و شێوەی پێستدا دێن زۆر یارمەتی پزیشك دەدەن بۆ دەستنیشانکردن. بەلام زۆرجار ئەو گۆڕانانە وەکو پەڵەی (لێنتی) لە گرانەتادا، پەڵەی سوور لەمێشکەپەردەسۆدا بە دەگمەن دەبینرێن.

- گۆڕانی سەر پێست نێونراوە بە (ئێکسانتیم - Exanthem).
- گۆڕانی نێوپۆشەکان نێونراوە (ئێتانتێم -Etanthem)، ئەم گۆڕانانە شێوەو جۆری جیاوازیان هەیە وەکو خاڵی سوور (قرمزی)، لیر، بڵق، قنچکەو پێست هەڵدان. هەندێکجار (وەك لەسورێژەدا دەبینرێت) لەئەنجامی پەنجە خستنە سەریاندا پەڵەکان ونەبن، وەلێ (لە رەشە گرانەتادا) پەڵە سورەکان لەژێر پەستانی پەنجەدا ون نابن. هەر کاتێك بەشێکی لەش پەڵەی سووری هەمیشەیی لەسەر دەرکەوت، وەك لەسوورەتادا دەبینرێت، ئەوانە پێیان دەوترێت (ئێریتێم - Erythema).

لەسوورەتادا پەڵەی سوور لەسەر پێست پەیدا دەبێت، پێکهاتووەکان رەقن و لەوانەیە زۆر گچکە یان گەورە بن بەتایبەتی لە کاتی خوراندنی خورشتدا زۆر گەورە دەبن.

** زۆرجار بڵق تەنیایە یان بە کۆمەڵ لەسەر پێست یان لەسەر ناوپۆشەکان دەردەکەوێت و شلەیەکی روونی تیادایە (دڵۆپە شەونم) وەك لەمێکوتەدا دەبینرێت.

** بڵقی کێمی، لەجیاتی شلەیەکی روون بڵقەکان کێم و زووخاویان تیادایە وەکو لەسوورێژەی ئەڵمانیدا دەبینرێت.

** توێخ هەڵدان، پاش هیشکبوونەوەی بڵقەکان پێستی سەر بڵقەکان هەڵدەدات.

- مەرازە: یەکێکە لەنەخۆشییە درمە بڵاوەکان، پێویستە هەمیشە (لەکاتی تێڕوانینی نەخۆشدا) پزیشك سەیری نێوپۆشی نێو زار (گەروو، مەلاشوو، زمان و پووك) بکات، گەر نەخۆش گیروگرفتی قووتدانی خۆراکی نەبێت، ئەوا پێویستە سەیری رەنگ و قەبارەی مەرازە بکرێت.

- نەخۆشی هەناسەدان: دەستنیشانکردنی هەوکردنی رارەوی سەرەوەی هەناسە (لووت و گلاندەکانی ئەملاولای گەروو)، هەروەها کۆکەو تف و بەڵغەم فرێدانیش زۆر گرنگن چونکە سۆی بۆریەکانی هەناسە بڵاوەو بەهەوادا دەگوێزرێتەوە.

- نەخۆشی گەدەو ریخۆڵەکان: پاش ئەوەی میکرۆب بەگەدەو ریخۆڵەدا دەچێتە ناوەوە، ئەم رارەوە دەسووتێتەوە.

لەم بارەدا پێویستە نەخۆشییەکان لەگەڵ سکچوونی کوتوپڕدا جیابکرێتەوە، ئەویش بە تێستکردنی جۆر، قەبارە، شێوە، رەنگ، بۆن و پێکهاتووی (بڵقی، خوێنی ، ئاوی ، خۆراکی، کێمی) پیساییەکە.

زۆرجار رەنگ و شێوەی پیسایی دەستنیشانی نەخۆشییەکە دەکات وەك: پیسایی خوێناوی و کێماوی، شێوەی دیزێنتریان هەیە.

– باری بێ پیسایی و لیکاوی. لە دیزانتری بەکتریایی و شێرپەنجەی ڕنکە دا دەبینرێت. لە کۆلێراو ڕیخۆڵەسۆی ستافیلۆکۆکەسدا پیسایی شێوەی ئاوی برنجی هەیە.
– ڕەنگ زەردی: لە 59٪ ی هۆی زەردی ڕووخسار دەگەڕێتەوە بۆ زەردوویيە ڤایرۆسییە کوتوپڕەکان.
(ڕەنگ زەردی: بریتییە لە زیادبوونی مادەی بیلیرۆبین لە نێو زەرداوی خوێنداو نیشتنی لەپێستو سپێنەی چاودا).
– مێشکە پەردەسۆ: گەر بتوانرێت بەزوویی سۆکە دەستنیشان بکرێت ئەوا زۆر بەسوودی نەخۆش دەگەڕێتەوە چونکە یەکێکە لەو بارە دژوارە ئاڵۆزانەی کە تووشی نەخۆش و هاوکات پزیشك دەبێت.
3) سکچوون
بریتییە لەپیسایی (ژمارەیەکی زۆر) کردنی خێراخێرای کەم یان زۆری نەرم لە کۆمەوە. هەندێك جار پاشماوەی خۆراکی هەرس نەکراوی لەگەڵدایە (زۆرجار نابینرێت) وەلێ هەندێکجار لەژێر میکرۆسکۆپدا دەبینرێت. هەندێکجاری دی ئازار، پێچ پیاهاتنی سك و گیروگرفتی هەرسی تری لەگەڵدایە. ئەوەی ڕاستی بێت هۆی سکچوون زۆرە، گرنگترینیان کە تایبەتە بەباسەکەمان ژمەری میکرۆبەکان و خودی میکرۆبەکانن کەدەبنە هۆی هەوکردن، بەدمژین، پێچی ناوسك وهۆی هەرس نەکردنی خۆراك (نەستنەدراو بۆ مژین) و هەندێکجاریش دەبێتە هۆی بەلەفبرە.
گرنگترینیان ئەمانەن:
بەکتریاکان
– ستریپتۆکۆکەس، ستافیلۆکۆکەس، سالمۆنێلا، ئیشیریا، شیگێلا، کامپیلۆباکتێر، کلۆسترۆدیۆم.
ڤایرۆسەکان
– ئینترۆڤایرۆسەکان، کۆکساکی A1، A20، B2 و ECHO جۆری سێری 2، 9، 11، 16.
– ڕۆتاڤایرۆس 4 جۆری سێری هەیە. – نۆرڤالك ڤایرۆس 3 جۆری هەیە.
– کالیس ڤایرۆس ، کۆرونا ڤایرۆس ، ئەدینۆڤایرۆس.
پرۆتۆزۆرەکان
– ئەمیبیا، جیاردیا، بالانتیدیۆم، بلاستۆسیت، کیپتۆسپۆریدیۆم.
کەڕووەکان
– کاندیدە
هەروەها ڤیبریۆی کۆلێراو بەکتریای کوخ (نەردەباریکە) زۆرجار دەبنە هۆی سکچوون. لەزۆربەی نەخۆشییەکاندا گەر بێت و سکچوون تای لە گەڵدابێت ئەوا هۆی سەرەکی سکچوون دەگەڕێتەوە بۆ نێوپۆشەسۆی ڕیخۆڵە
– لە دیزانتری باسیلی (سالمۆنێلا و شیگێلا) دا، نەخۆش نزیکەی 5– 20 جار دادەنیشێت و هەندێکجار سکچوون خوێن، کێم، لینجی و کەمێك پیسایی لە گەڵدایە.
– لە دیزانتری ئەمیبیاییدا، سکچوون هێواش دەردەکەوێت، نزیکەی 5 – 30 جار دانیشتن نەخۆش ناڕەحەت دەکات، پیسایی نەخۆشی بەدەگمەن خوێن، کێم یان لینجی لەگەڵدایەو لەوانەشە بەپێچەوانەوە نەخۆش گیراوە.

- لە كۆلێرادا، سكچوون بێ ئازارەو لەپڕ دەردەكەوێت، لەوانەیە رشانەی لەگەڵدا بێت (سكچوون پیسایی لەگەڵدا نییە). رۆژانە نەخۆش نزیكەی 15 - 20 جار دادەنیشێتو رەنگی پیسایی‌یەكەی سپییە یان وەك ئاوی برنج وایە.

4) رشانەوە

بریتییە لە كردنەدەرەوەی ناواخنی گەدە لە دەمەوە بە شێوەی تەوژم.

هێڵنجدان:

برتییە لەهەستكردن بەبارێكی نائاسایی ناخۆش كە بە تەواوی ناواخنی گەدە نایەتە دەرەوە بەڵكو مرۆ كەمێك هەست بەترشی گەدە دەكات كە دێتەوە نێو زار. ئەوەی راستی بێت هێڵنجدان و رشانەوە پەیوەندییەكی توندیان بەیەكەوە هەیە (زۆر جار تێكەڵن) وەلێ هەندێكجار بەجودا دەردەكەون. هۆی دەركەوتنی هەردوو نیشانەكە زۆرن بەلاّم ئەوەی تایبەتە بە باسەكەمان ئەوەیە كە رشانەوە لەم نەخۆشییانەدا دەردەكەوێت:

- زەردوویی كوتوپڕی ڤایرۆسی، پاش ژەهراویبوونی خۆراك ، مێشكەپەردەسۆی ڤایرۆسی لە ریخۆڵەو گەدەسۆدا.

- سوورەتا، كۆكە رەشە، تای پاراتایفۆئید، مەلاریا، دەردەبارێكەی سییەكان.

پێویستە نەخۆش لە شێوەو ژمارەو چۆنیەتی دەركەوتنی رشانەوە (لەپڕ، پێش خۆراك خواردن، پاش خۆراك خواردن، 2-3 كاژێر پاش خۆراك خواردن، زۆر یان كەم) پزیشك ئاگاداربكات. هەروەها پێویستە نەخۆش بە ئاگابێتو بزانێت هێڵنج پێش یان لەگەڵ رشانەوەیە یان رشانەوە بێ هێڵنجە وەك لە (مێشكەپەردە سۆ، گوێ سۆ، كرمداری، مشەخۆری ریخۆڵە، شێرپەنجەی مەژی) دا دەردەكەوێت .

لە لایەكی ترەوە پێویستە سەیری رشانەوە بكرێتو بزانرێت ئایا خۆراكی زۆر لەگەڵدایە، لینجیی زۆرە، ئاوییە، پیسایی، كێم یان خوێنی لەگەڵدایە، هەروەها بۆنو تامی چۆنە (ترشە، تاڵە، زراوییە یان بۆنی هێلكەی پیسی لێدێت... تاد). هەروەها چەند نیشانەیەكی تر هەن لە هەوكردنی كۆئەندامی هەناسەدا دەردەكەون،

گرنگترینیان ئەمانەن:

- پرژەی پژمینو كۆكەو تفو بەڵغەم كردنە دەرەوە بەپێی شێوە، كەمیو زۆریو رەنگی بەڵغەم زۆر جۆرن.

- ئێش (ئازار)، ئەمیش كەم یان زۆر لەگەڵ نیشانەی تری هەوكردندا وەك لەكاتی سكچوون یان ژانەسەر لەمێشكەپەردە سۆدا هەوكردنەكە لە یەكێكی تر جیاوازە، بۆ نموونە لەكاتی سكچووندا پێچ بە سكی نەخۆشدا دێت. هەندێكجار وەك لە ئینفلوەنزادا دەبینرێت ماسولكەكانی لەشی نەخۆش ژان دەكاتو لەش دادەهێزرێت. لە سییەسۆو بۆرییەسۆدا لە كاتی هەناسەداندا سنگی نەخۆش (قەفەزەی سنگ) ژان دەكات.

وەلێ لە سۆی كۆئەندامی میزو زاووزێدا ئازار لەشێوەی كزانەوەدایە، هەندێكجار شلەی لینج یا شلەیەكی بۆگەن لە بۆری میز كردنەوە یان لە گولینك دێتە دەرەوە.

5) کۆکە

بریتییە لە دیاردەیەکی ئاسایی هەناسەدانو لەسەر بە زۆر کردنە دەرەوەی هەواو کردنەوەی کونی گەروودا بەندە کە دەنگێکی تایبەتی لە گەڵدایە.

کۆکە نیشانەیەکی زۆر گرنگە بەتایبەتی لە نەخۆشی کۆکەرەشەدا زۆر باش دەبینرێتو دەبیسترێت.

منداڵ تووشی کۆکەیەکی گیراو دەبێت. منداڵ بێدەنگەو بە ئارامە لەپڕ هەناسەدانەوەی درێژدەبێتەوە (دەنگی کەڵەشێر)، زۆرجار نیشانەکە دووبارە دەبێتەوەو نەخۆش بەتەواوی ماندوو دەکات. پاشان رووخسار شین دەبێتەوە، هەندێکجار منداڵ زمانی خۆی دەگەزێت یان میز بەخۆیدا دەکات (وەك لە کاتی فێ لێهاتندا)، لە کۆتایی کۆکەدا تفو بەڵغەمێکی زۆر لەزار دێتە دەرەوە هەندێکجاری دی منداڵ دەرشێتەوە.

هەرچەندە منداڵ ماندووە، بەڵام بەئارامە تا دەرکەوتنی لێهاتنەوەی (Crisis) داهاتوو. پێویستە پزیشك لەکاتی دەرکەوتنی کۆکە ئاگادار بکرێت (نەخۆش شەو یان رۆژ دەکۆکێت، کۆکە هیشکە یان تەڕە، دڵۆپە خوێنی لەگەڵدایە یان نا) چونکە وەڵامدانەوەی دروستی پرسیارەکان زۆر یاریدەی دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکە دەدەن.

6) گەورەبوونی لیمفەگرێکان

گەورەبوونی لیمفەگرێ نیشانەیەکی گرنگی نەخۆشییە هەوکردوەکانە و زۆرجار نەخۆش هەستیان پێدەکاتو هەندێکجاری تر پزیشك لەکاتی تێڕوانیندا دەستنیشانیان دەکات بەپێی (گەورەو گچکەیی، نەرمی ورەقی یان بەئازاری) زۆرجار نموونەی خانەیی لیمفەگرێ زۆر یاریدەدەری دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکە دەکەن.

ئەو نەخۆشییانەی دەبنە هۆی گەورەبوونی لیمفەگرێکان :

* ئاوسانی گشتی لیمفەگرێکان

- تووشبوون بە مۆنۆنونکلیۆز (ڤایرۆسی EBV) ، نەخۆشیی ماچ.
- سوورێژەی ئەڵمانی.
- تووشبوون بە سیتۆمێگاڵو ڤایرۆس– سوورێژە ، لیمفەگرێی پشت مل، بن هەنگڵ گەورە دەبن.
- تۆکسۆپلاسما، لیمفەگرێی پشت مل، لا مل گەورە دەبن
- دەردەباریکە ، (ئاوسانی لیمفەگرێ نیشانەیەکی گرنگی دەردەباریکەیە) ، قۆناخی دووەمی فەرەنگی ، تووشبوون بە HIV و ئەیدز.

* ئاوسانی شوێنی لیمفەگرێکان

1) ئاوسانی لیمفەگرێی لامل:

- نەخۆشیی ڤایرۆسی -- مۆنۆنونکلیۆس
- پۆلی (کۆمەڵە) ی ستریپتۆکۆکەس جۆری A ، وەناق.
- نەخۆشیی کاڤاساکی. ئاوسانی لیمفەگرێ لە دەردەباریکەدلردا (بەتایبەتی کاتێك تووشی HIV دەبێت).

2) ئاوسانی لیمفەگرێی پشت مل:

- هەوکردنی بەکتریایی (وەك نیشانەی شوێنی سووربوونەوە دەردەکەوێت) سوورێژەی ئەڵمانی.

3) ئاوسانی لیمفەگرێ:

- لە کاتی هەوکردنی ستریپتۆکۆکی جۆری A دا دەردەکەوێت.
- تامیسکی کۆئەندامی زاووزێ.

4) ئاوسانی لیمفەگرێی بنڕان.

- فەرەنگی سەرەتایی (یەکەم فەرەنگی).
- لیمفۆگرانۆلۆمای زایەندی.
- تامیسکی کۆئەندامی زاووزێ.

## ترسناکترین نیشانەکان لە منداڵدا بریتیین لە :

**# بەرزی پلەی گەرما (تا) ، رەنگی و پەڵەی سەر رووخسار، مل رەقی (منداڵ ناتوانێت چەناگەی بدات لە ژێر مل و سەر سنگ) ، پلەی بە ئاگایی (بە ئاگا ، کەم بە ئاگا ، بێئاگا) ، هەناسەدان ، رشانەوە ، سکچوون و ئاڕامی .**

**سەرچاوەکان**


**References**

1.A. Paunescu-Podeanul . Principele pentru practica medicala , editura medicala, Bucurest. 1984;688-712, 714-22.
2.Marin GH. Voiculescu. boli infectioase, vol 1, editura medicala, Bucurest 1989; 67-86.
3.Aktins, E, et al., Fever In The Inflamatory proceses, ed. 1-a, vol 111, Acad. Press, New York. 1974.
4.Dianarello, CH, et al., Fever, In Cescils Text Book of Medicine, ed a 27-a, W.B Saunders Co N. Y.
5.Wilson, Braunwald, Isselbacher, Petersdorf, Martin. Fauci, Rott. principles of internal medicin, vol 1. 12 th edition, pag 129.
6.Simon Purice, Medical Clinic, vol 1. All Edition 1993, 70-84.
7.Joans A. Schulman, Fever of unknow origion-long duration. J Willis Hurst, In Medicine for the practing physician third eds 1992. 8-3 269-271
8.Rafael Jurado and John E McGowan, Fever appearing in a hospitalized patient, J Willis Hurst, In: Medicine for the practing physician third eds. 1992. 8-5 261-273
9.Thomas F. Sellers, Fever J Willis Hurst. Medicine for the practing physician third eds 1992, 8-5: 261-273
10.Shulman JA. Schlossberg D Handbook for diferential diagnosis of infections diseases vol 212 New York, appleton-Centry-Croffts 1980.
11.Mc Clug HJ. Prolonged fever of unknow origin in children Am J Dis Chil 1972; 124 544.
12.Knockaert DC et al., fever of unknow origin in 1980 An update of the diagnostic spectrum Arch Intern Med 1992;152:51.
13.Atkins E and Bodel P Clinical fever Its history manifestations and pathogensis Fedproc, 1992:38.57.
14.Petersdorf F. fever of unknow origin an old friedn revistied Arch inter Med 1992:152.21
15.Philip A. Mackowiak Fever, bvasic mechanisms and management. Second Edition. Lippincott-Raven 1997
16.Ted Lankester, Setting Up Community Health Programmes, UK 1992
17.Arif R Sarwari &Philip A Mackowiak, Patogenesis of Fever. Infectious Diseases Edited by Donald Armstrong &Jonathan Cohen, vol 1 section 3, chapter 1, Mosby, USA 1999
18.Wendy Armstrong &Powel Kazanjian Fever of unknown origin in the general population and in HIV-infected persons, Infectious Diseases Edited by Donald Armstrong &Jonathan Cohen, vol 1 section 3, chapter 3, Mosby, USA.1999


## 7) دەستنیشانکردن

**زۆربەی زۆری نەخۆشییە درمەکان لە مرۆوە یان لەگیانەوەرەوە دەگوێزرێتەوە بۆ مرۆو پاشتریش مرۆ بە رێگای تر دەبێتە هۆی گواستنەوەو بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە لەهەموو وڵاتانی جیهاندا یاسای تایبەتی تەندروستی (دەربارەی راگەیاندن و ئاشکراکردنی نەخۆشییە درمەکان بەمەبەستی جوداکردنەوەو دابڕینی نەخۆش لەخێزان و کەسوکاری نزیک و کۆمەڵگا) دانراوە بەهیوای کۆنترۆڵکردن و رێگرتن لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە و هاوکات دانانی سنوورێك بۆ رێژەی مردن .**

**نیشانەكان**

پێویستە ئەو كەسانەی تووشی نەخۆشییە درمەكانی وەك مێكوتە، سوورێژە، ئاوڵە، بروسێلا، گرانەتاو كۆلێرا دەبن لەنەخۆشخانەدا یان لەماڵەوە جودا بكرێنەوە تا بەیاریدەی نیشانە دەرەكییەكانی سەر پێست (بلّق و زیپكەو لیر)و تێستەكان، دەستنیشانی نەخۆشییەكە بكەین.

ئەوەی راستی بێت هەندێك جار لەنەخۆشییە درمەكاندا یان هەوكردنی تری وەك سوورەتا ، كۆكەڕەشە، رەشە گرانەتادا نیشانەكان ئەوەندە بەباشی دەردەكەون زۆرجار پزیشك راستەوخۆ دەرمانی دژی نیشانەكانی نەخۆشییەكە دەدات بەنەخۆش و هیچ پێویست ناكات چاوەڕێی ئەنجامی تێستەكانی تاقیگا بێت. هەندێكجاری دی وەك لەباری دومەڵ، ئاشێن و هەوكردنی گوێی ناوەڕاستدا نەخۆشییەكە دەردەكەوێت بەئاسانی دەستنیشان دەكرێت و زۆرجار پێویستە نەشتەرگەر چاریان بكات.

**لەكاتی دەستنیشانكردندا ئەم پرسیارانە سەرهەڵدەدەن:**

- ئایا نەخۆشییەكە لە هەوكردنەوە پەیدا بووە یان نا؟
- كام جۆر میكرۆئۆرگانیسم بووەتە هۆی نەخۆشییەكە؟
- كام دەرمان میكرۆئۆرگانیسمەكە دەكوژێت یان دەیكاتە دەرەوەی لەش؟
- مێژووی نەخۆشییەكە، مەبەست لەو زانیارییانەیە كەنەخۆش بە راستی و رێكوپێكی دەیدات بە پزیشك، لێرەدا وەڵامی ئەم پرسیارانە بۆ دەستنیشانكردن بە سوودە:
  - كەی مرۆ پەیوەندی بەنەخۆشێكی ترەوە كردبوو، كەهەمان نیشانەی نەخۆشیی ئێستای هەبووە؟
  - مێژووی سەردان بۆ ناوچەیەك یان شوێنێك كە ئەو جۆرە نەخۆشییەی تیادا بڵاوبووبێت.

**تاقیگا**

مەبەست لەتاقیگا ئەنجامدانی تێستی (بەكتریایی، ڤایرۆسی، مشەخۆری) لە رێی سیرەمی خوێن، تف و بەڵغەم، شلەی نێو كونەلووتەكان، خوێن، میز، پیسایی، نموونەی ناوپۆشەكان، نموونەی شلەی پەتەكە دەمار Lumbar puncture (CSF) نموونەی خانەیی یان نمونەی هەموو شلەیەكی نێو لەش بۆ دۆزینەوەی هۆی نەخۆشییەكە یان دەرخستنی دژەتەنی میكرۆئۆرگانیسمەكە.

1) تێستی راستەوخۆی میكرۆسكۆپی: بۆ دەستنیشانكردنی پلاسمۆدیۆم (دڵۆپە خوێنی ئەستوور) بۆ ئەو میكرۆئۆرگانیسمانە بەكاردەهێنرێت كە قەبارەیان گەورەیە.

2) میكرۆسكۆپی ئەلەكترۆنی: ئامێرێكی زۆر بەسوودە بۆ جوداكردنەوەی ڤایرۆسەكان.

3) تێستی زەرداوی خوێن: بۆ دەستنیشانكردنی دژەتەنی میكرۆبەكان.

4) ناسینەوە یان پێوانەی ئەنتیجینی میكرۆبەكان.

5) تێستی شلەی كۆئەندامی میز و زاووزێ: واتە تێستكردنی میز و شلەی نێو گولینك و سپێرم، بۆ دەستنیشانكردنی نەخۆشییە درمە زایەندییەكان و گورچیلەسۆ ، هەوكردنیمیزئۆشەكان(راڕەوی میز) یان بۆ دەستنیشانكردنی هێلكەدانەسۆ و بۆریەسۆی هێلكەدان یان بەشەكانی زامال (پاشكۆ، لەش، مل و زاری زامال) بەسوودە.

6) تێستی DNA: ئەم تێستە سەركەوتوانە بۆ ڤایرۆسی تامیسكی 1، 2، 4،5 و ڤایرۆسی زەردوویی B، ئینتێرۆڤایرۆس، ئەدینۆڤایرۆس، ڤایرۆسی تەپ خاڵ، رۆتاڤایرۆس، ڤایرۆسی پاپیلۆم، HIV و مایكۆپلاسماو چەندین بەكتریای وەك سالمۆنێلا و شیگێل و ئیشریا كۆلای بەكارهێنراوە.

7) چاندن: له زۆربەی نەخۆشییە درمەکاندا تەنیا چاندن دەتوانێت جۆری میکرۆئۆرگانیزمەکە لەخوێن، میز یان پیسایيدا دەستنیشان بکات.

هەروەها تێستی لیك یان شلەی نێو (گولێنك) کیلەك مێوینەو شلەی نێو بلّق و زیپکەو دومەل توانيويانە سەرکەوتووانە ئەنجامی باش بەدەستەوە بدەن.

8) تێستی بەرگریزانی.

9) تێستی ڤايرۆسزانی.

10) تێستی PCR = (Polymerase Chain Reaction) ¤

11) تێستی تانوپۆی بەرگری (Immunology)

12) تێستی (Nucleic acid hybridization) پوختەکردنی ئەسیدی ناوکی

13) ئێکسبەرداری توێتوێی نەخشاندنی کۆمپیوتەری (ComputedTomography) یان نەخشاندن بەدەگە شەپۆل بەرێژەیەکی زۆرباش توانيويانە دەستنیشانی دومەڵ و هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە. بەتایبەتی سییەسۆ، مێشکەسۆو دومەڵ بکەن.

14) لە مرۆڤی لەش ساخدا پرۆتینی (C Reactive Protein = CRP) *

## * تێستی PCR

نابێت ئەو راستییەمان لە بیر بچێت کە پێشکەوتنی زانست توانيويەتی گەلێك کەلێن پڕبکاتەوە. ئەوەی لێرەدا گرنگەو ئەمەوێت ئامارەی بۆ بکەم بریتییە لە تێستی PCR. دەتوانین بلێین کەئەم تێستە توانيويەتی بە باشی جێگەی خۆی بکاتەوە و لە زۆر کاتدا بووەتە تەواوکەری زۆربەی ئەو تێستانەی کە لەتاقیگادا دەستنیشانی میکرۆئۆرگانیسمەکان دەکەن. هەرچەند توێژینەوە لەقۆناخی سەرەتایی دایە وەلێ بەهۆی ئەم تێستەوە توانراوە ماوەی دەستنیشانکردنی میکرۆئۆرگانیسمەکان کەم بکرێتەوە هەرچەندە لەهەندێك باردا خەرجییەکی زۆری تێدەچێت تەنیا لەپێناو زوو دەستنیشانکردن و زوو چارەسەرکردندایە کەهەمیشە بەسوودی نەخۆش دەگەرێتەوە. بۆ نموونە هەرچەندە ماوەی زیادبوونی Mycobacterier, Mycoplasma Pneumonia هاوکات Chlamydia لە تاقیگادا زۆر دەخایەنێت وەلێ تێستی PCR توانيويەتی ئەو ماوەیە زۆر کەم بکاتەوەو زیاتر لەئەنجامەکان دلْنیامان بکات.

ئەمرۆ دەتوانرێت تێستی PCR بۆ ئەم میکرۆئۆرگانیسمانە بەکاربهێنرێت:

Candida albicanis, Chlamydia Trachomatis, Chlamydia Pneumonia, Mycobacterium tuberculosis, Mycoplasma Pneumonia, Legionella, E. coli, MRSA, Bordetella Pertusis, Borrelia.

لە بواری ڤايرۆسزانيدا PCR بەچەند رێگایەکی نوێ گۆرانکاری بەسەردا هێنراوە تا سوودی زیاتری لێوەربگیرێت بۆ نموونە لەکاتی چارەسەرکردنی ئەنتیڤايرۆسدا دەتوانین DNA-RNA بپێوین.

هاوکات تێستی PCR لە گەڵ رێگای تری وەك Antigen diagnosis, Virus culture و Serology دا بەکاردەهێنرێت.

ئەوەی شایانی باسە سێرەم و پلاسماو شلەی CSF زۆر لەبارن و هەستدارترن بۆ تێستی PCR وەك لەکاتی Virus culture.

دەتوانین بلێین هەمیشە لەماوەی 1-3 رۆژدا وەلامی تێستەکان دەردەکەوێت، وەلێ لەهەندێك باری تایبەتیدا ماوەکە دەگاتە هەفتەیەك.

شلەی CSF لە کاتی Meningitis & Encephalitis بەهۆی ڤایرۆسی HSV-1 & 2 تێستی PCR زۆر زۆر هەستدارترە لەوانی دی.

هەروەها لەکاتی دەرکەوتنەوەی Herpes Meningitis دا دەتوانرێت DNA HSV-2 لە شلەی CSF دەستنیشانبکرێت.

بۆ دەستنیشانکردنی پەردەسۆ بە Enterovirus دەتوانرێت کۆمەڵێك تێستی تایبەتی PCR بەکاربهێنرێت کە کارەکە زۆر ئاسانتر دەکات.

لە کاتی سۆی CMV دا دەتوانرێت ڤایرۆسەکە لەمیزدا جیابکرێتەوە. بە هەمان تاقیکردنەوە تێستی PCR دەتوانێت لەماوەیەکی کەمتر ئەنجام بەدەستەوە بدات.

لە کاتی زەردوویی B, C و سۆی HIV دا تێستی PCR ئەنجامی خێراو باشتری بە دەستەوەداوە.

دەتوانین بە هۆی PCR دەستینشانی ئەم ڤایرۆسانە بکەین:

Enteroviruses, HSV - 1 & 2, VZV, CMV, EBV, HHV-6, Parovirus B19, Human Polyoma virus, H C V, Calicivirus & HIV.

لەم ساڵانەی دووایدا توانراوە گۆڕانکاری وا بەسەر ئەم تێستەدا بهێنرێت تا بۆ دەستنیشانکردنی مەلاریا وکلامیدیای تراخۆماش سوودی لێ هەبێت .

*** تێستی CRP "C- Reacive Protein"**

یەکێکە لەتێستە گرنگە ئاسانەکان، پێویستە لەیەکەم 30 خولەکدا بۆ قەبلاندن‌و دەستنیشانکردنی هەموو سۆیەك (Infection) ئەنجام بدرێت. لە ساڵی 1930 دا (William Tillett & Thomas Francis) لە ئینستیتوتی (Rockefeller) لە نیویۆرك ئەم تێستە دۆزرایەوە .

لە نێو سێرەمدا لە ژێر 10 mg/L دەوەیە لە سۆی بەکتریاییدا زۆربەرزدەبێتەوە سەروو 200 mg/L . لە منداڵدا ڕێژەی دەستنیشانکردن بەم پێوانەیە نزیکەی 20 mg/L بەلام لە گەورە ساڵاندا لە نێوان 50-70 mg/L .

سەرچاوەکان

**References**

1.Mikronytt, nr.3 Sep. 2000, information från mikrobiologiska universitetes- laboratorierna Stockholm
2.Mikronytt, nr.2 April 2001, information från mikrobiologiska universitetes- laboratorierna. Stockholm.
3.Mikronytt, nr.2 Maj 2002, information från mikrobiologiska universitetes- laboratorierna Stockholm
4.James J. Plorde., The diagnosis of infectious disease. In Harrisons Principles of internal medicine. 1991; 80.454-59.
5.Jack S. Remington and Jerome O. Klein, infectious diseases of the fetus newborn infant. 4th eds W B Saunders company, USA, 1995.
6.Ted Lnakester, Setting Up Community Health Programmes. UK 1992
7.Standford T. Shulman. Introduction to infectious diseases, In: Infectious diseases 5th eds. USA. 1997
8.Jan Rollof, Jonas Bläckberg. bakterier. virus, parasiter en klinik handledning- studentlitteratur. Sverige.1994

## 8- پاکوخاوێنی

یەکێکە لەو زاراوانەی ڕۆژانە هەر یەك لە ئێمە چەندان جار بەکاری دەهێنێت بێنەوەی کەمێك لە ناوەڕۆکەکەی ورد ببینەوە . ئەز حەز دەکەم زانستییانە لەمەڕ ئەم بابەتە گرنگەی تاك و کۆمەڵی نێو کوردستان بنووسم کە زۆر وەلاوەخراوە وبگرە بۆتە هۆی بڵاوبوونەوەی هەندێك نەخۆشی و هاوکات زیانێکی گەورەیە بۆ تەندروستی دانیشتوان و پیسبوونی ژینگەی کوردستان .

زۆربەی زۆری پسپۆرانی بەشی پاکوخاوێنی ئاماژە بەو راستییە دەکەن کە رۆژانە مرۆ دەستەکانی چەندان جار بە ژمارەیەك میکرۆب (مایکرۆئۆرگانیسم) واتە بەکتریا ، ڤایرۆس ، پاراسیت و تەنانەت کرمیش پیس دەبێت . لەبەر ئەوە زۆر باشە هەمووان پاکوخاوینی تاك ، نێومالْ ، دەرەوەی مالْەکان ، باخچەو شوێنی کارەکانیان بپارێزن .

**گرنگترین سەرچاوەکانی بەکتریا**

**1- دەستەکان**

ئەوەی راستی بێت چەندان رێگاو مێتۆدی جودا هەیە و مرۆ بە ئاسانی دەتوانێت بەکاری بهێنێت و سوودیان لێوەربگرێت و بە هۆیانەوە ئاگاداری تەندروستی خۆی بێت و لەشساخ وکامەران چەندان سالْ بژێت بێئەوەی تووشی نەخۆشی ببێت. هەرچەندە زۆر کەس دەبێژێت کە رۆژانە چەند جارێك دەستەکانیان دەشۆرن وەلیْ روون بۆتەوە کە ئەو جۆرە دەست شتنانە هێشتا کەمە .

لەبەر ئەوەی لەم سالانەی دوواییدا زۆرجاران مرۆ بەیانیان ، نیوەڕوان یان ئێواران نان یان خۆراکی جیاواز (نان ، سەوزە ، پەتاتەی سوورەوە کراو ، گەس ، کەباب.. تاد) لە نێوان ژەمە سەرەکییەکاندا بە دەست دەخوات . زۆربەی زۆری دانیشتوانی کوردستان کاتێك دەستەکانیان دەشۆرن کە پیس بێت ، وەلیْ کاتێك مرۆ دەست بۆ گۆشت دەبات یان سەلاتە ئامادە دەکات هەرگیز بیر لە دەست شتن ناکاتەوە بەو جۆرەش پاکوخاوێنی وەلاخستووە . گەر بێت و سەیری ئامارێکی سوێدی بکەین دەبینین کە سالانە نزیکەی نیو ملیۆن کەس بە هۆی خۆراك خواردنی پیسەوە تووشی ژاراوی بوون دەبن و بە پەلە دەگەیەنرێنە بەشی فریاگوزاری نەخۆشخانەکان ، هەندێکیان بە هۆی خۆراکی مالْەوە و ئەوانی دی بە هۆی خۆراکی ریستۆرانەکانەوە تووش دەبن . هۆی زۆربەی زۆری ئەو ژاراوی بوونانەش دەگەرێتەوە بۆ بەکتریا و ڤایرۆس بە دەستەکانەوە. پسپۆرانی سوێد دەبێژن لە ژێر نینۆکەکاندا نزیکەی 8 ملیۆن میکرۆب هەیە وەلیْ زۆرباشە مرۆ رۆژانە چەند جارێك دەستەکانی بە سابوون و ئاو بشۆرێت بە مەرجێك زێدەڕوویی نەکات (ئەوسا دەبێتە هۆی نەخۆشییەکی دەروونی) !

لەبەرئەوە پێویستە مرۆ رۆژانە :

- پێش و پاش نان یان چێشت خواردن دەستەکانی بشۆرێت .
- پاش چوونە سەر ئاودەستخانە دەستەکانی بشۆرێت
- کاتێك لە سەرکار دەگەرێتەوە مالْەوە دەستەکان بشۆرێت

ژمارەی ئەو میکرۆبانەی دەگەنە دەستەکانی مرۆ زۆرن وەلیْ گرنگترینیان ئەمانەن : سالمۆنێلا ، ستافیلۆکۆکەس ، کەڕوو ، ژاراوی بوونی خۆراك بە بەکتریا ، ئەنفلوەنزەی گەدە ، کرم ، ستافیلۆکۆکەس ، ڤایرۆسی زەردوویی جۆری A و تۆکسۆپلاسما ... تاد .

ئەمانە لە لایەك لە لایەکی ترەوە زۆر پێویستە دایکوباوك مندالْەکانیان فێربکەن و رایان بهێنن بۆ ئەوەی پێش نانخوارن و پاش چوونە سەر ئاودەستخانە دەستەکانیان بە سابوون و ئاو بشۆرن و نینۆکەکانیشیان ببرن و باش کورتی بکەنەوە . توێژینەوەیەکی سوێدی ئاماژەی پێدەکات کە 5 خولەك پاش شوشتنی دەستەکان سەرنجدراوە کە هێشتا هەر ژمارەیەکی زۆری بەکتریا بە دەستەکانەوە ماوە .

**2- نێو دەم و ددانەکان**

پاش دەستەکان ، زۆر پێویستە بە پێی توانا مرۆ ئاگاداری ددانەکانی بێت و پاش هەموو ژەمێکی چێشتخواردن پاك بیان شۆرێت و باشترە پاش چا یان قاوەخواردنەوەش جارێك بشۆردرێت یان کەمێك ئاو لە نێو دەم رابدرێت لەبەر ئەوەی کلۆربوون یان هەوکردنی پووك هۆیەکی سەرەکییە و مرۆ تووشی نەخۆشی دەکات . هەندێك جار لە ئەنجامی کەمتەرخەمی دا مرۆ چارەسەری کلۆری ددانی ناکات ئەوسا لەوانەیە بەکتریاکە بگاتە پەردەپۆشی دڵ ومرۆ تووشی نەخۆشی بکات .

**3- کەلوپەل و یاریەکانی باخچەی منداڵان .**

لە زۆربەی زۆری وڵاتانی جیهاندا ئەو کەلوپەلانەی کە رۆژانە منداڵانی باخچەی ساوایان یاری پێ دەکەن و فڕێ دەدەنە ناو خاکوخۆڵ و ئاو یان منداڵ گازی لێ دەگرن سەرچاوەیەکی لە بارە بۆ زێد بوون و بڵاوبوونەوەی بەکتریا بە تایبەتی جۆری سترێپتۆکەکەس کە دەبێتە هۆی مەرازە یان ژانگردنی گەروو ، هاوکات ڤایرۆسی هەڵامەت و ئەنفلونزەش بە ئاسانی لە نێومنداڵانی باخچەکاندا بڵاودەبێتەوە . بە مەبەستی رێگرتن لە بڵاوبوونەوەی بەکتریاو ڤایرۆس پێویستە کارمەندانی باخچەکان ئەو کەلوپەل و یاریانە بشۆرن و پاشتر بە پاکژکەر (ڤیسپرتۆ) پاکژ بکرێت .

**4- ئاودەستخانەکان**

ئاودەستخانە یەکێکە لەو گیروگرفتانەی لە دوو لاوە زیانی بە دانیشتوانی کوردستانی گەیاندووە

- ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوان تووشی داکەوتنی نێوپۆشی رێکەو لەوانیە بەشێك لە ریخۆڵە ئەستورەی داکەوێت لەبەر ئەوەی لە کاتی دانیشتندا بە چیچکانەوە قورسی مرۆ یان پاڵەپەستۆی نێو سك پاڵ بە دیوارەکان و نێوپۆشی کۆمەوە (رێکە) وە دەنێت دەیانهێنێتە خوارەوە .
- هەندێك جار هۆکارێکی رێگەخۆشکەرە تا پزدانی ئافرەتی قەڵەو داکەوێت .

جالەبەر ئەو دوو هۆیە وای بە باش دەزانم کە هەمووان ئاگاداری ئەو دوو خاڵەبن و هەوڵ بدەن لە بری کۆنەکان ئاودەستخانەی نوێ دابنرێت و بۆ تارەت گرتن یان کۆم پاککردنەوە سۆندەیك لە نزیکترین بەلووعەوە ببەسترێت و بەکاربهێنرێت .

**5- چێشتخانە (ئاشخانە) ماڵەوە یان ریستۆرانت**

جگە لە دەستەکان سەرچاوەیەکی باش و لەبار بۆ گەشەکردن و زۆربوونی میکرۆب بریتییە لە چێشتخانە (مەبەست لەو شوێنەیە کە چێشتی تیادا ئامادەکرێت) جا گرنگ نییە لە ماڵەوە بێت یان لە دەرەوە . زۆرجاران تێبینی کراوە کە شێداری و کەروو کەلوپەلی تەختەی چێشتخانەکانی داپۆشیوە ، هەندێك جار سەلمێنراوە کە ژمارەیەك لە بەکتریای سالمۆنێلا ، ئێشیریا کۆلای ، ئینتەرۆباکتێر و ستافیلۆکۆکەسیشی تیادا دۆزراوەتەوە .

**6- زبڵ فڕێدان**

یەکێك لەو دیاردە نامۆ و ناشارستانییە زیانبەخشانەی کۆمەڵگای کوردەواری بریتییە لە فڕێدانی زبڵی نێو ماڵ ، ریستۆرانتەکان و دوکان بۆ بەر دەرگای دەرەوە یان بۆ پشتی ریستۆرانەکان بێئەوەی لە کیسەی نایلۆن دا کۆبکرێتەوە و پاشتر بخرێتە ئەو شوێنانەوە کە شارەوانی دابینی دەکات .

زۆربەی زۆری دانیشتوانی کوردستان تەنیا گرنگی و بایەخ بە نێو ماڵ دەدەن وەلێ کۆڵان ، باخچە و شوێنی کارەکانیان پاك راناگرن وا دەزانن کەس بە سەر شەقامەکاندا ناڕوات یان کەس ناچێتە نێو باخ و باخچەکانەوە !! ئەمەش دیاردە یەکی دزێوە و هاوکات فرە زیان بەخشە بە تەندروستی مرۆ، ئاژەڵ ، باڵندە و ژینگەی کوردستانیش .

7- پێکان

پسپۆرانی بواری پێست لە گەلێك وڵاتدا گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە بایەخدان بە پێکان (پێست ، نینۆکەکان و نێوان پەنجەکان) زۆر بەسوودە . لەبەرئەوەی بێ گۆرەوی ، گۆرەوی شێدار یان تەڕ رێگە بۆ پەیدابوون و دەرکەوتنی کەڕووی نینۆك ، نێوان پەنجەکان و بن و پاژنەی پێکان خۆش دەکات . یەکێك لەو گیروگرفتانە کە ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتانی کوردستان تووشی دەبن بریتییە لە بەکارهێنانی سەرپێ (نەعل) و ئەمەش دەبێتە هۆی قڵیشاندنی بن یان پاژنەی پێ و کە پاشتر دەبێتە شوێنێکی لەبار بۆ کەڕوو یان بەکتریا و هەوکردن .

8- سەرجێگە ، بەتانی ، بەرگی لێفەوسەرینی نەخۆشخانەکان

هەمووان دەبینین کە لە نەخۆشخانەکانی کوردستاندا نەبێت لە هەموو دنیادا سەرجێگەو بەرگی سەرین و بەتانییەکان سپییە ، ئەمیش لەبەرئەوەی رەنگی سپی سمبولی پاکوخاوێنی و نەخۆشخانەیە ، گەر سەرجێگەی نەخۆش سپی بێت ئەوا بە ئاسانی دەشۆردرێت هاوکات دەتوانرێت بە شلەی کلۆر ئەو قوماشە سپیانە لە 60-70 پلەی گەرمی دا بکوڵێنرێت( *) و بشۆردرێت واتە پاکژبکرێت کە مەبەستی سەرەکییە لە خۆپاراستن لە بەکتریا یان ڤایرۆسی نێو نەخۆشخانەکان .

گەر بێت مرۆ کەمێك زێدەتر و زانستییانە ئاگاداری پاکوخاوێن ئەو شوێن و کەلوپەلانە بێت ئەوا هەمیشە لەشساغ و کامەران دەبێت بە مەرجێك کاربەدەستانی شارەوانیش پاکوخاوێنی کۆڵان ، شەقام و باخچەکان فەرامۆش نەکەن و ئەرکەکانی سەرشانیان بە رێکوپێکی ئەنجام بدەن .

سەرنج :

( *) کوڵاندن لە پلەی 60-70 ی سەدی دا بەکتریاکان و ڤایرۆسەکان دەکوژێت .

( **) بۆ پاکوخاوێنی نێو نەخۆشخانەکان بنواڕە MRSA .

سەرچاوەکان

1.www.expressen.se © 060120
2.www.aftonbladet.se © 060115
3.www.msn.se © 060125
4.www.goggle.se © 060150

## 9) چارەسەرکردن

**ئەوەی شایانی باسە گرنگترین جۆری چارەسەرکردنەکان بریتین لەسیرەمی بەرگری، ئیمونۆگلۆبولین، کوتان، دەرمان، چارەسەرکردنی ناتایبەت زۆر لەمێژە لەچارەسەرکردنی نەخۆشییە درمەکاندا ژمارەیەکی زۆر (بەرهەم)ی بایۆلۆجی بەکاردەهێنرێت کەکاری تایبەتو نا تایبەتیان لەسەر میکرۆئۆرگانیسمەکان هەیەو ئەمانەن:**

- **سێرەمی بەرگری .**
- **ئیمونۆگلۆبولین .**
- **هەندێك کوتان بە مەبەستی چارەسەرکردن بەکاردەهێنرێت.**
- **دەرمان (ئەنتیبایۆتیك، ئەنتیڤایرۆس، ئەنتیفونگ و ئەنتیپاراسیت).**

**پێش دەرکەوتنی ئەنتیبایۆتیكو چارەسەرکردنی کیمیکی، سیرەمی بەرگری (زنجاو) یەکەم بەرهەم بووە کە لەهەندێك درمە سوّدا (واتە دژی ژەهری میکرۆب) وەك سێرەمی دژی وەناقو ئاولە بەکارهێنراون.**

**- لەسالانی هەشتاکانەوە ئیمونۆگلۆبولینەکان (گاماگلۆبولین) بەتایبەتی ئیمونۆگلۆبولینی تایبەتی مرۆ دژی دەردەکۆیانو سوورێژە بەکارهێنراون.**

**- ئەمرۆ ئیمونۆگلۆبولینەکان شوێنی هەندێك لەو سێرەمانەی پێشوویان گرتووەتەوە (بەتایبەتی لەچارەسەرکردنی دەردەکۆیانو دەردە هاری)دا لەبەر بەکاریو بیّ وەییان زێدەتر بەکاردەهێنرێن. چەند سالێکیشە ئیمونۆگلۆبولین کە لەشێوەی دەرزیدا بەرهەمهێنراونو لەخوێنهێنەر یان لە ماسولکە دەدرێت و ئەنجامی باشیان هەیە.**

**ئیمونۆگلۆبولین لەم حالەتانەدا بەکاردەهێنرێت:**

**1- لە چارەسەرکردنی نەخۆشیی ناچووستی دژەتەندا:**

- **کەمی گاماگلۆبولینی زگماکی جۆری** (Burton)
- **لەکاتی نەمانی بەرگریی تایبەتدا (100– 300 ملگم/ کگم کێشی لەش دەدرێت بە مرۆڤ، دەتوانین لە 4 – 10 رۆژدا دووبارە بکرێتەوە).**

**2- لە چارەسەرکردنی ئیمونۆگلۆبولینی تایبەتدا:**

- **دژی دەردەکۆیان (بۆ دەردەکۆیانو برینی دەردەکۆیانی بەکاردێت).**
- **لە تەپخالو مێکوتەی قورسدا بەکاردەهێنرێت**
- **دژی دەردەهاری (خۆپاراستنی دەردەهاری)**

**3- لە سۆکوتوپرەکاندا:**

- **ژەهراویبوونی خوێن** – Septicemia.
- **خوریەی ژارین** – Shock septic.
- **سییە سۆ** – Pneumonia.
- **ناویۆشەسۆ** – Peritonitis.
- **مێشکە پەردەسۆ**– Meningitis.

لەم هەلومەرجانەدا گاما یان ئیمونۆگلۆبولینە پێوانەییەکان لەخوێنێهەرەوە دەدرێت بەنەخۆش ئەمیش دەبێتە هۆی زێدبوونی بەرگریی ناتایبەتو هاوکات بەکتریا لەکاردەخات.

(ئەوەی راستی بێت سەلمێنراوە کاتێك بەکتریا ئەرژێتە نێوخوێنی ساوا، گەر لەخوێنهێنەرەوە 150–300 ملگم/ کێشی لەش ئیمونۆگلۆبولین بدرێت بەساوا ئەوا دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی رێژەی مردن).

**4- ئەو کەسانەی مەترسی تووشبوونی نەخۆشییان لێدەکرێت:**

- نەخۆشیی دەماریو دەروونی. - شێرپەنجە. - بەرتیشك کەوتوو (تیشکی رۆژ یان تیشکی چارەسەرکردن). - ئاوبەنگی جگەر.

ئیمونۆگلۆبولین رۆڵیان لەچارەسەرکردن یان پارێزگاریکردنی دژی هەوکردندا هەیە، هەروەها کاتێك مەترسی بۆگەنکردن لەکارێکی نەشتەرکاری دەکرێت پێویستە بەکاربهێنرێت.

**5- نەخۆشیی کاواساکی (Kawasaki) :**

**6- بۆ خۆپاراستن :**

- بەهێزکردنی بەرگریی لەش دژی میکرۆب.
- گەر میکرۆب بچێتە نێو لەشەوە ئەم دژە تەنانە بەپێی توانایان تێکیان دەشکێنن.

**کوتان (پێکوتە)**

لەم سالانەی دواییدا گرنگییەکی زۆر بەدروستکردنی کوتان دژی ئەو نەخۆشییانە دراوە کە تائەمڕۆ چارەیان ناکرێت یان دەرمان نییە بۆ ئەوەی رێژەی تووشبوونو مردن کەم ببێتەوە.

هەرچەندە ئەمڕۆ ئەو خەونە نەهاتووەتەدی تا کوتانی دژی ڤایرۆسی هێرپیسو زەردوورییەکانو ئەیدزو زۆربەی نەخۆشییە ڤایرۆسییەکان دروست بکرێت، وەلی لەم بوارەدا سەرکەوتنی گەورە بەدەست هاتووە چونکە هەرچۆنێك بێت ئەم چەند کوتانەی خوارەوە لەبەردەستدایە تا مرۆڤ خۆی پێ بکوتێت:

- سیرەمی ئیمونۆگلۆبولین: Centeon, Berrglobin, Gammaglobulin, Gammanorm.

یان:

- سیرەمی ئاسایی ئیمونۆگلۆبولین: Endobulin Gammagard, Gammonative, No Rimmun, Octagam, Plyglobulin, Sandoglobulin
- ئیمونۆگلۆبولینی دژی دەردەکۆپان، مێکوتەو تەپخاڵ، زەردوویی B و سیتۆمێگالۆڤایرۆس Megalotecyt هەیە.

**نابێت بە هیچ جۆرێك ئەم پێکوتانە بدرێت لە خانمی دووگیان لەبەرئەوەی لە ڤایرۆسی زیندوو دروستکراون :**

1- پێکوتەی دژی مێکوتە (varilrix).
2- پێکوتەی دژی گوێرەپە (mumps)
3- پێکوتەی دژی سورێژە (measles=Rubeola).
4- پێکوتەی دژی سورێژەی ئەڵمانی(german measles=Rubella)

**ئەم پێکوتانە تەنیا لە کاتێکدا دەدرێت بە دووگیان کە مەترسی تووشبونی لێبکرێت دەنا مەترسی ئەوەی لێدەکرێت دووگیان یان ئاوڵەمە تووشی مەترسی بکات :**

1- پێکوتەی دژی دەردەباریکە (BCG)
2- پێکوتەی دژی زەردەتا

3- پێکوتەی دژی ئینفلوەنزا
4- پێکوتەی دژی پنیومۆکۆکەس
5- پێکوتەی دژی رابیا (نەردە هاری)
6- پێکوتەی دژی زەردوویی جۆری B
7- پێکوتەی دژی (Japans Encephalitis)
8- پێکوتەی مێشکەپەردەسۆ (Meningitidis)
9- پێکوتەی گرانەتا (Typhim Vi, Vivotif)

**پێویست ناکات ئەم پێکوتانانە بدرێت بە خانمی دووگیان:**

1- **پێکوتەی دژی** (tick-borne encephalitis=TBF). **(لە ڤایرۆسی مردوو دروستکراوە)** .
2- **پێکوتەی دژی هیمۆفیلیس ئینفلومنزا جۆری B (Hib).**
3- **پێکوتەی دژی کۆکە رەشە (دەبێتە هۆی کۆکە)** .

**پێکووتە (لە سوێد بەکاردەهێنرێت)** (7و25):

**پێکووتە دژی سۆ بەکتریاییەکان، ئەمانەن:**

**پێکووتە دژی کۆلێرا، بەنێوی Dukoral لەدەمەوە دەدرێت بەمرۆڤ.**
**پێکووتە دژی هیمۆفیلیس ئینفلۆنزا B. بەنێوی Hibtiter, Act-HIB,PEDVAX-HIB**
**پێکووتە دژی هیمۆفیلیس ئینفلومنزا B. وەناقو دەردەکۆپان واتە سیانە DT-HIB دوو دەرزییە.**
**پێکووتە دژی مێشکەپەردە سۆ، Meningovax A + C دوو دەرزییە.**
**پێکووتە دژی کۆکە رەشە Diphteria Tetanus toxids acellular Pertusis واتە (DT aP)**
**پێکووتە دژی سۆبە پنێومۆکۆکەس Pneumovax. Pun-Imune هەردوو پێکووتەکە لەشێوەی دەرزیدایە.**
**پێکووتە دژی دەردەباریکە (BCG) ئەمیش لەشێوەی دوو دەرزیدایە (ئەمێریکاییەکان زۆرکەم ئەم دەرزییە لەخۆیان دەدەن).**
**پێکووتە دژی گرانەتا Vivotif, Typhim یەکەم لەدەمەوە وەردەگیرێت و ئەوی تریان دەرزییە.**
**پێکووتەی Pentavac دژی دەردەکۆپان، وەناق، کۆکەرەشە، ئیفلیجی منداڵ و هیمۆفیلیس ئینفلومنزا بەکاردەهێنرێت.**

**پێکووتە دژی سۆ ڤایرۆسییەکان، ئەمانەن:**

**پێکووتە دژی ئینفلومنزا Begrivac, Fluarix, Fluvirin, Fluzone, Influva, Vaxigrip هەموویان لەشێوەی دەرزیدان.**
**پێکووتە دژی زەردوویی A، نێوی Havirx ە.**
**پێکووتە دژی زەردوویی B. هەردووکیان Engrix-B, H-B-Vax لەشێوەی دەرزیدان.**
**پێکووتە دژی سووریژە، نێوی Virivac لەشێوەی دەرزیدا هەیە.**
**پێکووتە دژی شەپەڵەداری (ئیفلیجی)ی منداڵی بەنێوی Imovax Polio وەك دەرزی هەیە.**
**پێکووتە دژی مێکووتە، بەنێوی Varilrix لەشێوەی دەرزیدا هەیە.**
**پێکووتە دژی زەردەتا، بەنێوی Arilvax لەشێوەی دوو دەرزیدایە.**
**پێکووتە COMVAX TM لەساڵی 1991ەوە (لەئەمەریکا) بۆ منداڵ دژی Haemohpilus influenzae type B و زەردوویی B بەکاردەهێنرێت (3 ژەمی دەرمانەکە لە 2 ، 4 و 12 – 15 مانگیدا دەدرێت بەمنداڵ).**

هەمووومان باش دەزانین لە ئەنجامی کوتانەوە هەندێك نەخۆشی تەمەنی منداڵی زۆر کەم بوونەتەوە و هاوکات ئەمڕۆ کوتانی دژی زەردوویی جۆری A ، نەخۆشی مێکوتە (Varicella) , Tick borne Encephalitis (زەردەتا) شدا هەیە .

ئەمڕۆ ژمارەیەکی زۆر توێژینەوە لە سەر کوتانی دژی ڤایرۆسی HIV, Rotavirus, Papilloma ش لە ئارادایە و گەیشتونەتە قۆناخی تاقیکردنەوەی کلینیکی . پێکوتەی نوێ بە نێوی پێکوتەی چارەسەری (vaccine therapy) بە هیوای زێدکردنی بەرگری لەش دژی ڤایرۆسی HIV وزەردوویی B و ڤایرۆسیHerpes لە ژێر تاقیکردنەوەدایە .

**تێبینی**: لەکاتی کێم و زوخاوی هەوکردنی سێ بەندە، نێوپۆشی هەناو، هێلکەدانەسۆی زامالْ و برینی کێم کردوودا باشتر وایە مرۆڤ بکوترێت.

لەسایەی ئەم دەرمانەوە کە پێشتر ئامارەمان پێکردن (گەر بەراورد بکرێت لە گەڵ ساڵانی سی، چل و پەنجاکاندا) تا رادەیەکی زۆر رێژەی نەخۆشبوون و مردن کەمبووەتەوە و هەندێك نەخۆشیش هەر نەماون یان مەترسییان زۆر کەمبووەتەوە.

**مێژوو**(8)

- فلیمینگ لە1929دا کاری پەنسلینی دۆزییەوە.
- مێتس و کلارێر لە 1935دا سولفامید Prontosil یان دۆزییەوە کەئەنجامی باشی لەچارەسەرکردنی هەوکردنی سترێپتۆکۆکدا هەبوو، پاشتریش لەلایەن دۆمەگك دژی Erysipelas بەکارهێنرا.
- پاش ساڵی 1940 پەنسلین لەلایەن چیان و فلۆری و هاوڕێکانیانەوە بەکارهێنرا.
- پاش ساڵی 1944 پەنسلین بە زۆری بەکارهێنراو لە 1950دا پەنسلین خرایە دەرمانخانەکانەوە.

**چارەسەرکردنی کیمیکی** (8)

- بابش لەساڵی 1885دا باسی چارەسەرکردنی کیمیکی کرد.
- فلیمینگ لەساڵی 1889دا زاراوەی ئەنتیبایۆتیك و سیمبیۆزەی بەکارهێنا.
- ئێمێرك و لوف لەساڵی 1898دا piocianoza یان بەکارهێناوە، کەئەمڕۆ بەکتریاکوژن.
- ئێهریە لەساڵی 1891دا مێتسیلی شینی وەك دژە مەلاریا بەکارهێنا
- لە ساڵی 1903دا تریپانی سوور لەچارەسەرکردنی تریپانیسۆمیازۆدا بەکارهێنراوە.
- لە ساڵی 1910دا دەرمانی Germanin وەك دژی فەرەنگی بەکارهێنرا.
- لە ساڵی 1946دا یەکەم دەرمانی دژی پلاسمیۆدیۆم هاتە کایەوە.

**بەپێی جۆری میکرۆئۆرگانیزمەکان دژە میکرۆبەکان دەکرێن بەم بەشانەوە:**

1) دژی زیندەییەکان 2) دژە ڤایرۆسەکان 3) دژە کەڕوو

4) دژە زیندە گچکەکان 5) دژە کرم.

**دژە – ئەنتی**

**1- دژە زیندەییەکان (ئەنتیبایۆتیك)**

بریتین لەکۆمەڵێك دەرمان، ناسراون دەبنە هۆی لەناوبردن یان سستکردنی کاری بەکتریاکان. ئەوەی راستی بێت هەموو دژە زیندەییەکان بەرێگایەکی کیمیکیی تایبەت کاری خۆی دەکاتە سەر میکرۆبە جا ئەوەتە بەکتریاکە ناچالاك دەکات یان ئەوەتە دەیکوژێت.

**کاری سستکردن**: دەرمانەکە ناهێڵێت میکرۆبەکە زێدبکات و لەئاستی خۆیدا رایدەگرێت.

**کاری میکرۆب کوژ**: دەرمانەکە میکرۆبەکە دەکوژێت.

پێویستە لە کاتی چارەسەرکردنی نەخۆشییە درمەکاندا بەوردی و کارامەییەوە چارەسەری درمەکان بکرێت، هاوکات پێویستە گرنگییەکی تایبەت بەمنداڵی تازە لەدایکبوو (ساوا یان ناتەواو) بدرێت. لەبەرئەوەی هەمیشە پێویستە منداڵ بکێشرێت و بەپێی کێشی لەشی دەرمانی بدرێتێ و تێستی هەستداریشی بۆ بکرێت. هەروەها پێویستە چارەسەری سۆکانی سکپڕ بکرێت و ماتماتیکانە تەمەنی ئاولەمە بقەبلێنرێت و بەپێی جۆری هەوکردنەکە (کارو جۆر)ی دەرمان مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت گەر دەستنیشانکرا ئاولەمە تووشی هەمان هەوکردن بووە.

**گرنگترین دژە زیندەییەکان** (8)

**ئەوەی شایانی باسە بەپێی کاریان (لەسەر بەکتریاکان) ئەنتیبایۆتیکەکان دەکرێن بەچەند گرووپێکەوە کەهەر یەکێکیان کاری تایبەتی خۆی هەیە گرنگترینیان ئەمانەن:**

**Penicillins. Cephalosporins and Cephamycins.** Tetracyclines. Aminoglicosides Macrolides Clindamycin and Lyncomycin. **Co-trimoxazole and Sulphonamides** Antituberculous drugs Antileprotic drugs. Other antimicobial drugs

**کاری ئەنتیبایۆتیکەکان**

- ڕێگە لە دەرکردنی ئەنزیمی دیواری بەکتریاکان دەگرێت.
- خانەی بەکتریا بریندارەکات بێئەوەی زیان بە خانەی لەش بگەیەنێت .
- ڕێگە لە دەردانی پرۆتینی بەکتریا دەگرێت.
- ڕێگە لە ناوکە ئەسیدە دروستکراوەکان دەگرێت.
- ڕێگە نادات بەکتریاکان زێد و گەورە بن.

**پێویستە لەکاتی چارەسەرکردندا ئەم بنەمایانە لەبەرچاوبن:**

- تەمەن (ئایا نەخۆش گەورەیە یان منداڵ). گەر نەخۆش گەورەساڵان و ژن بێت پێویستە هەمیشە پرسیاری سکپڕێتی لێبکرێت
- کێشی نەخۆش (پێویستە هەمیشە پێش چارەسەرکردن منداڵی نەخۆش بکێشرێت).
- فرمانی گورچیلە (پێویستە دڵنیابین کە گورچیلە ئاسایی کاردەکات و نەخۆش ئاسایی میز دەکات).

**ئەنجامی تاقیگایی**

- جوداکردنەوەو ناسینەوەی میکرۆبەکە لەخوێن، شلەی مێشک و پەتکە دەمار، لە بۆری هەرس و لەنێو میزدا.
- تێستی هەستیاری بۆ دژە زیندەیی بۆ میکرۆبە جوداکراوەکە (پێویستە بۆمان روون ببێتەوە کام دەرمان بەکتریاکە دەکوژرێت).
- هەروەها زۆر گرنگە بتوانرێت ڕادەی دژە خۆرەی نێو سیرەمی خوێنی نەخۆش بزانرێت. بەگشتی پاش جوداکردنەوەی بەکتریاکە لەنێو خوێن و شلەی مێشک و پەتکە دەماردا پێویستە:

- دژە خورە: ئەنتیبایۆتیکی دژی کۆکەس گرامپۆزەتیف: پەنسلین، ئۆکساسیلین، ریفامپیسین، ستڕێپتۆمایسین، کانامایسین، جێنتامایسین، کۆلیستین، تۆبرامایسین، کۆتریمۆکسازۆڵ و کلۆرامفێنیکۆڵ بەکاربهێنرێت

- بۆ لەناوبردنی میکرۆبی چیلکەیی گرامنێگەتیف: ئەمپیسیلین، سێفالۆسپۆرین، تێتراسایکلین، سترێپتۆمایسین، کانامایسین، جێنتامایسین، کۆلیستین، تۆبرامایسین، کۆتریمۆکسازۆڵو کلۆرامفێنیکۆڵ بەکاربهێنرێت.
- ئەنتیبایۆتیکی دژی بەکتریا بێ باییەکان: پەنسیلین، ئێریترۆمایسین، کلیندامیسین، مێترۆنیدازۆڵ، لینکۆمیساینو کلۆرمفێنیکۆڵ بەکاردەهێنرێت.
- ئەنتیبایۆتیکی دژی میکرۆبە جوداکراوەکانی بۆرییەسۆی میز: سپرۆکسین، نیترۆفورانتۆین، ترمیتۆپرین، سولفامید، کۆتریمۆکسازۆڵ، کلیندامایسینو جێنتامایسین بەکاربهێنرێت.
- ئەنتیباتیۆتیکی دژی بەکتریای دی، وەك چیلکەیی پایۆسیانیك، کاربێنیسیلین، جێنتامایسین، تۆبرامایسین، ئەمیکانیسینە، سکۆلیستینە، سێفالۆسپۆرین لە نەوەی سێیەم زۆر بەکاربهێنرێت.

**بنەماکانی چارەسەرکردن**

1) پێویستە بێ هەڵە نەخۆشییەکە دەستنیشان بکرێت.
2) پێویستە بڕیار لەسەر چارەسەرکردن بدرێت.
3) هەڵبژاردنی ئەنتیبایۆتیك بەپێی:

- جۆری نەخۆشییەکە (کوتوپڕە، مامناوەندییە، لەسەرخۆ یان تولانی یە).
- پێویستە تا دەتوانرێت یەك دەرمان هەڵ ببژێررێت بۆ چارەسەرکردن. (لەکاتی پێویستدا بۆ زێدکردنی کاری دەرمانەکە پێویستە دوو یان سێ دەرمان تێکەڵ بکرێت).
- بە پێی شوێنی نەخۆشییەکە، تەشەنەکردنی بەکتریا (پیسبوونی خوێن)، ناوپۆشەسۆی دڵ، ڕێڕەوی نەخۆشییەکە، ئەنجامی تێستی تاقیگایی هەر یەکەیان بەجودا سەیر دەکرێتو پاشان دەرمان بەکاردەهێنرێت.
- پێویستە پاش تێستی هەستیاری بۆ دەرمان چاودێری دەرمانەکە بکەین ئایا دەرمانەکە بە نەخۆش دەکەوێت؟ ئایا دەرمانەکە ماکی کەمە یان زۆرەو کامانەن.

4) پلانی چارەسەرکردن بەپێی: کاری دەرمانەکە، کاتی ژەمەکان، خێرایی دەستپێکردنو ماوەی چارەسەرکردن بەندە.
5) لەکاتی پێویستدا دەبێت بەنەشتەرگەری چارەسەری ئەندامەکە بکرێت.
6) زۆرگرنگە پزیشك هاریکاری لەگەڵ تاقیگادا بکات.

لەم ساڵانەی دواییدا زۆرجار ئاماژە بۆ پەیدابوونی بەرگریی بەکتریا دژی دەرمان کراوەو گیروگرفتی گەورەی بۆ نەخۆشو پزیشکیش پەیداکردووە نێوی MRSA ی لێنراوە.

**بەکتریا دوو جۆر بەرگری هەیە:**

- بەرگری سروشتی، باسیلی گرامنێگەتیفی (ئێشیریاکۆلایو مایکۆپلاسماو بەکتریای تر) بەرگرییان بەرانبەر پەنسلین هەیە.
- بەرگریی دەستکەوتوو. ئەمیش لەوانەیە لەسەرەتای چارەسەرکردندا یان لەکاتی چارەسەرکردندا دەربکەوێت.

**میکانیسمی بایۆکیمیکی بەرگریی بەکتریا دژی ئەنتیبایۆتیك:**

- ناچالاك کردنی ئەنزیمی ئەنتیبایۆتیکەکان.

- گۆڕاندنی شێوەی پەڕینەوەی دەرمان لەدیواری پرۆتینی بەکتریا (دەرمان دەبێتە هۆی تێکدانی پێکهاتووی دیوارەکە).

- تێکدانی ناوەندیی نێوان خانەکان.

**چۆنیەتی کەمکردنەوەی بەرگریی بەکتریا دژی ئەنتیبایۆتیك:**

- پێویستە بەپێی پلان دەرمان بدرێت بە نەخۆش.

- بەکارنەهێنانی دەرمان وەك خۆپاراستن یان بۆماوەیەکی درێژ (هەندێك جار دەبێتە هۆی ئەوەی بەکتریاکە بەرگری پەیدا بکات MRSA).

- پێویستە هەمیشە پاش چاندنی میکرۆبەکەو بەپێی نیشانەکانی نەخۆشییەکە بەکتریاکوژەکان بەکاربهێنرێت.

- پێویستە لەکاتی چارەسەرکردندا کۆنترۆڵی ئەنتیبایۆتیکەکان بکرێت.

- جوداکردنەوەی ئەو نەخۆشانەی میکرۆبەکەیان بەگریی دژی ئەنتیبایۆتیك هەیە.

- هەوڵبدرێت ئەنتیبایۆتیکی نوێ بەکاربهێنرێت.

لێرەدا نامەوێت نێوی سەدان ئەنتیبایۆتیکی بازرگانی بهێنم کەرۆژانە لەچارەسەرکردندا بەکاردەهێنرێت، وەلێ پێویستە گرنگترینیان بناسین و بەپێی کاری بەکتریاکوژی یان بەکتریا سستییان بەکاریانبهێنین.

**ئەنتیبایۆتیکە بەکتریاکوژەکان:**

پەنسلینی G,V، سێفالۆسپۆرینەکانی نەوەی سێیەم (Cefuroxim, Cefotaxim) یان Imipènem، سترێپتۆمایسین. کانامایسین، نیۆمایسین، جێنتامایسین، پارۆمۆمایسین، کۆلیستاین، پۆلیمیکسایین و پریتلینامیسایین... تاد.

**پەنسلینی دەستکرد:**

ئەمۆکسیل، ئەمپیسیلین، فلۆکاساپین. ساماسایکلین، تێتراسایکلین، ڤایبرامایسین... تاد.

**بەکتریاسستکەرەکان:**

کلۆرامفێنیکۆل، کاربۆمایسین. نۆڤابایۆسین، لینکۆمایسین، کلیندامایسین، سولفامید، ڤیۆمایسین... تاد.

**بەکتریاکوژی هەمەجۆر:**

تریمێتۆپریم - سولفامۆکسازۆل - تریمێتۆپریم. هەروەها پێویستە هەمیشە پزیشك (پاش چاندنی بەکتریاو تێستی هەستیاری بۆ دەرمانەکان) دەرمان هەڵبژێرێت.

**تێبینی:** دەتوانین لەکاتی سییەسۆدا رۆژانە 1.5 گم حەبی پەنسلینی V، سێ جار بدەین بەژنی دووگیان.

تێبینی:

نابێت بە هیچ شێوەیەك ئەم دەرمانانە بدرێت بە خانمی دووگیان یان لە کاتی شیرداندا

Tetracyclin (vibramycin ,doxycyclin ,doxyferm)
Imipenem (tienam)
Chloramph enicol (succinet ,chloromycetin)
Trimetoprim (trinam)
Sulfa/Trimetoprim (bactrim)
Clindamicyn (dalacin)
Aminoglycosides (amikacin, gentamicin, netilmicin, tobramycin)
Fluorocinoloner (ciprofloxacin, norfloxacin, ofloxacin, grepafloxacin, trovafloxacin)
Metronidazole (tinidazol , fasigyn)

## 2- دژەڤایرۆسەکان (ئەنتیڤایرۆس)

بریتین لەو دەرمانانەی کە دژی ڤایرۆس بەکاردەهێنرێن. ئەوەی شایانی باسە نزیکەی 50 ساڵ پاش دروستکردنی ئەنتیبایۆتیك بیر لە دروستکردنی ئەنتیڤایرۆس کرایەوە و ئەم بیرۆکەیەش لە ساڵی 1960 دا ئەنجامدرا . بەڵام لەم 20- 30 ساڵانەی دواییدا زۆر چالاکانە هەنگاوی سەرکەوتوانە لە بواری ڤایرۆسزانی و دروستکردنی دژە ڤایرۆسدا نراوە و زۆر ئەنجامی باشیی بەدەستهێناوە . ئەمەش بۆتە هۆی دانانی سنورێك بۆ بڵاوبونەوەی نەخۆشییە درمە ڤایرۆسییەکان تاکو زێدتر بڵاونەبنەوە و بتوانرێت رێگای نوێ بۆ چارەسەرکردن دابنرێت .

هەرچەندە ئەو دژە ڤایرۆسانەی لەپاش ساڵانی هەشتاوە کەوتوونەتە کار ناتوانن ڤایرۆس بکوژن وەلێ تا رادەیەك کار دەکەنە سەر راگرتنی بڵاوبوونەوەی ڤایرۆس و تارادەیەکیش زیندبوونی ڤایرۆس رادەگرن و ناهێڵن ڤایرۆسەکە خانەکانی دی لەش تووش بکات. (2)

ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە هەرچەندە زانست و تەکنەلۆژیا لەبواری پزیشکی و دۆزینەوە و دروستکردنی دەرماندا زۆر پێشکەوتووە، لەگەڵ ئەوەشدا رۆژانە گیروگرفتی نوێ دێتە رێی زانست و تەندروستی. بۆ نموونە کاتێك ڤایرۆسێکی نوێ دەستنیشان دەکرێت پێویستە چەند ساڵێك بەباشی (لەهەموو روویەکەوە) توێژینەوەی لەسەر بکرێت کەچۆن دەبێتە هۆی دەرکەوتنی نیشانەکان و نەخۆشیی نوێ.

هۆی دروستکردنی ئەنتیڤایرۆس دەگەڕێتەوە بۆ:(2)

- ڤایرۆس بە ئاسانی لە نێوناچێت .
- ڤایرۆس پێویستی بە خانەیە بۆئەوەی وەك مشەخۆربژی و خۆی پێ زیندبکات .

پاش ئەوەی ڤایرۆس دەچێتە نێوخانەوە ئەوسا وەك ماکینەیەك بۆئەنجامدانی پێویستییەکانی خۆی خانەکە بەکاردەهێنێت .

**ئەوهۆیانەی ناهێڵن ڤایرۆس لەناوبچێت :**

– هەندێك ڤایرۆس پاش یەكەم هەوكردن لە نێوخانەكەدا ئەمێنێتەوە و پاشتر ئەچێتە باری متییەوە . لەم بارەدا ڤایرۆسەكە دەتوانێت بە ئاگابێتەوە چالاك ببێتەوە و نیشانە سەرجێكەییەكان دەربكەونەوە .

– ئەو ڤایرۆسانەی لەنێوخانەدان بە هیچ جۆرێك ئەنتیڤایرۆس كاریان تێناكات ، هاوكات كۆئەندامی بەرگری لەشیش ناتوانێت لە ناویان ببات .

ئەوەی شایانی باسە لەم ساڵانەی دوایدا زیاتر لە 30 دەرمانی نۆی وەك ئەنتیڤایرۆس پەسەندكراو بەكاردەهێنرێت . هەرچەندە دەرمانەكە ڤایرۆسەكە ناكوژێت بەڵام ئەنتیڤایرۆسەكان دوو سەركەوتنی باشیان ئەنجام داوە وەك :

– باشكردنی باری نەخۆش

– درێژەدان بە ژیانی نەخۆش (نەخۆشەكە درەنگتر دەمرێت) .

ئەم راستییەش لە كاتی چارەسەركردنی ئەیدز و زەردوویی جۆری C دا دەبینرێت . لە ساڵی 1983 دا یەكەم ئەنتیڤایرۆس بە نێوی (Acyclovir= Zovirax) پەسەندكرا تا دژی ڤایرۆسی نەخۆشی ئەیدز بەكاربهێنرێت . پاشتر روون بووەوە كە هەمان ئەنتیڤایرۆس دەتوانێت خۆلەبەرگرتنەوە (كۆپیكردن) ی كۆمەڵەڤایرۆس تامیسك رابگرێت تا ژمارەیان زێدنەكات .

بۆ یەكەمجار لە ساڵی 1987 دا دەرمانی (Retrovir=Zidovudin) وەك یەكەم ئەنتیڤایرۆس دژی ڤایرۆسی HIV بۆ بەكارهێنان پەسەندكرا .(2)

پاش دەستنیشانكردنی ڤایرۆسی HIV گرنگییەكی زۆر وتایبەت بە ڤایرۆسەكان دراوە (بەكتریاكان كەمێك پشتگوێ خراون).

لەبەر ئەم هۆیەشە هەندێك سۆی بەكتریایی وەك (دەردەباریكە) سیل جارێكی دی سەریانهەڵداوەتەوەو سەرلە نوێ جیهانی گرتووەتەوەو بووەتەوە بە گیروگرفتێكی گەورەی دانیشتووان.

**گیروگرفتەكانی رێی چارەسەركردن :**

ئەوەی شایانی باسە هەمووكاتێك لە كاتی چارەسەركردندا پزیشك تووشی هەندێك گیروگرفت دەبێت جا گرنگ نییە هۆی درمەكە چ جۆرە ڤایرۆسێك بێت ، گرنگترینیان بریتییە لە :

– ناتەواوی لە چارەسەركردندا

– پەیدابوونی بەرگری ڤایرۆسی دژی ئەنتیڤایرۆسەكانە .

– پەیدابوونی ماكی دەرمانەكە .

**سەرچاوەكان**

References
1.Rekommendationer, behandling av kronisk hepatit C hos vuxna och barn, information nr.6, okt Stockholm 1999, s 5-7.
2.Rekommendationer, behandling av kronisk hepatit C hos vuxna och barn, information nr 4, jul Stockholm 2001, s 5-9.
3.Ingrid Uhnoo, antivirallekämedels möjligheter och begränsningar, Medicament nr 2, mars, stockholm 2003, s 24-29
4.Ingrid Uhnoo, läkemedel mot virus –vad finns och vad behövs?, Medicament, nr 3, april

**بۆ سوێی سیتۆمێگالۆ ڤایرۆسی چاو:** (7، 14، 20)

- دەرمانی Ganciclovir (5 ملگم/ کگم کێشی نەخۆش لە12 کاژێردا، ڕۆژانە لەماوەی 1 کاژێردا لەگەڵ ئاوی دڵۆپاودا) بۆ 12-14 ڕۆژ دەدرێت بە نەخۆش.
- دەرمانی Foscarnet (60 ملگم/ کگم کێشی نەخۆش لە12 کاژێردا، ڕۆژانە لەماوەی 21 کاژێردا لەگەڵ ئاوی دڵۆپاودا) بۆ 12-14 ڕۆژ دەدرێت بەنەخۆش.
- دەرمانی (Zovirax) Acyclovir دژی تەپخاڵ، سیتۆمێگالۆ ڤایرۆس و تامیسکی ئەندامی زاووزێ بەکاردەهێنرێت.

لە مێکووتەی منداڵدا: ڕۆژانە 20 ملگم/ کگم کێشی لەش تا 800 ملگم (لەدەمەوە) بۆ 5 ڕۆژ دەدرێت بەنەخۆش.

لە مێکووتەی گەورەدا: ڕۆژانە 500 ملگم/ مەتر دووجا/ کاژێردا بۆ 7-10 ڕۆژ دەدرێت بەمێکووتەدار.

لە تەپخاڵدا: ڕۆژانە 10 ملگم/ کگم/ کێشی لەش/ هەر 8 کاژێری (لە 1 کاژێردا لەگەڵ ئاوی دڵۆپاودا) بەخوێنهێنەردا دەدرێت بە نەخۆش.

لەتەپخاڵی ئاساییدا: ڕۆژانە 5 جار 800 ملگم/ بۆ 7-10 ڕۆژ دەدرێت بە نەخۆش.

یان: دەرمانی Famcyclovir (لەدەمەوە) ڕۆژانە 250-500 ملگم/ بۆ 10 ڕۆژ.

**بۆ تامیسکی کۆئەندامی زاووزێ :** (13، 19)

بۆ یەکەم هەوکردن خەپڵەی Acyclovir 200 ملگم، ڕۆژانە 5 ژەم یان 400 ملگم/10 ڕۆژ دەدرێت بەنەخۆش.

لەکاتی سەرهەڵدانەوەدا خەپڵەی Acyclovir 200 ملگم، ڕۆژانە 5 ژەم یان 400 ملگم/5 ڕۆژ دەدرێت بە نەخۆش.

کاتێك ڤایرۆسی تامیسك دەگاتە مێشك خەپڵەی Geavir یان Valtrex ئەنجامی باشیان داوە بەدەستەوە. لە هەوکردنی درێژخایەندا، خەپڵەی Acyclovir 400 ملگم، یان 200 ملگم بۆ 10 ڕۆژ دەدرێت بە نەخۆش.

**بۆ ئینفلوەنزای A** (13)

- خەپڵەی Amantadine ڕۆژانە 100 ملگم بۆ ماوەی 5 ڕۆژ دەدرێت بە نەخۆش.
- خەپڵەی Rimantadine ڕۆژانە 200 ملگم بۆ ماوەی 5 ڕۆژ دەدرێت بە نەخۆش.

**بۆ سییەسوێی سایتومێگالۆڤایرۆس:**

- دەرمانی Ganciclovir (5 ملگم/ کگم کێشی نەخۆش لە 12 کاژێردا.ڕۆژانە لە 1 کاژێردا لەگەڵ ئاوی دڵۆپاودا بەخوێنهێنەردا Imunoglobulin، بۆ 12-14ڕۆژ دەدرێت بە نەخۆش.

**بۆ ڤایرۆسی HIV:**

سەیری چارەسەرکردنی سۆ بە HIV بکە.

**3- دژەکەڕووەکان** (18،19)

ئەوەی شایانی باسە لەساڵی 1903ەوە دژەکەڕووەکان بەکاردەهێنرێن، پاشتریش لە 1940دا چەندین دژەکەڕووی تر بۆ چارەسەرکردنی (جێگەیی و سەراپایی) پێست و هەوکردنی کەڕوویی قژو نینۆك دروستکران و ئەمڕۆ بەکاردەهێنرێت.

گرنگترینیان دەرمانی Nystatin (Mycostin, Nilstat, Generic) کە دژی کاندیدیایەسی بەکاردەهێنرێت.

لە کاتی بۆقڕەدا: ڕۆژی 3 جار 5-10 ملیلیتر دەدرێت لەرێی دەمەوە هەروەها دەرمانی Terbinafine و Drisofluvin یش دژی کاندیدیایەسی گولینکدا پێویستە (14 ڕۆژ) بدرێت بەنەخۆش.

لەم ساڵانەی دواییدا ژەمی 400 گم دەرمانی Fluconazole (Diflucan) Ketoconazole, Intraconazole (sporanx) بۆ چارەسەرکردنی بۆقژە، پێست یان بۆ خۆپاراستن لێی بەکارهێنراوەو ئەنجامی باشی داوە بەدەستەوە.

**4- دژە مشەخۆرەکان**

ئەم کۆمەڵە دەرمانە دژی زیندەگچکەکانو کرمەکان هێلمیتس بەکاردەهێنرێن، هەروەك ئاشکرایە ئەو دوو پۆلە خۆرەیە بەشێکی گرنگی نەخۆشییە درمەکان پێکدەهێنن کەزۆریەیان لە کوردستاندا بلاون وەك ئەمیبیا، مەلاریا، جیاردیا، ئەسکاریسو بەلهارزیا... تاد.

لە ساڵانی 1976- 1980دا بەباشی روون بووەوە کە (میترۆنیدازۆڵ) لەچارەسەرکردنی هەوکردنی (ئەمیبیاو جیاردیاو تریهۆمۆناسی گولینك) دا سەرکەوتووانە ئەنجامی باشی بە دەست هێناوە.

**تێبینی**: زۆر پێویستە لەکاتی چارەسەرکردنی ژنی سکپڕدا گەر سکپڕ گیروگرفتی گورچیلەو جگەری هەبوو وردبین و بەئاگابین.

**چارەسەرکردنی ناتایبەت**

ئەوەی گرنگەو پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێت ئەوەیە کە یەکەم هەنگاوی پێش چارەسەرکردن (بەپێی توانا) ناسینەوەو جوداکردنەوەی جۆری میکرۆبەکەیە. چونکە هەموو دەرمانێك کەم یان زۆر زیان لە لەش دەداتو زۆرجار ماکی لێدەرنەکەوێت. هەرچەرندە زۆرجار لەشی نەخۆش توانای چاکبوونەوەی خێرای نییە وەلێ هەندێکجار چارەسەرکردنی خێرا پێش دەرکەوتنی ئالۆزبونەکانی درمەکە نەخۆش لەمردن رزگار دەکات.

زۆرجار پێویستە چارەسەری نەخۆشیو نیشانەکانی درمەکە لەبەشی فریاگوزاریی نەخۆشییە درمەکاندا بکرێت، بۆ ئەوەی رێڕەوی درمەکە نەگاتە بارێکی وا خراپ کەپاشتر چارەسەرکردنی سەخت ببێت یان چارەسەرنەکرێت. زۆر پێویستە لە درمی خۆراکی ژەهراوی، کۆلێراو دەرنەکۆیاندا زوو چارەسەری هۆی نەخۆشییەکە بکەین دەنا نەخۆش دەمرێت. لەنەخۆشییە ڤایرۆسییەکاندا پێویستە بەرگریی ناتایبەتی لەش بە ئیمونۆگلۆبولین، ئینترفیرۆنو هەژێنەری داکۆکی بەهێز بکرێتو بهەژێنرێت. هاوکات هەوڵبدرێت هەوکردن چارەسەربکرێتو ناهاوسەنگی ئاوو کانزاکان ڕاست بکرێتەوەو نیشانە کوتوپڕەکان بڕەوێنرێتەوە. راستی وتن لەگەڵ نەخۆشداو دڵدانەوەی دەروونیی نەخۆش هاوکات هێمنکەرەوەکان کارێکی باشیان هەیە لەسەر باری دەروونیو کۆمەڵایەتی نەخۆش.

**پارێزکردن**

ئەوەی راستی بێت پارێزکردن زۆر کارناکاتە سەر درم ، وەلێ لەوانەیە کاربکاتە سەر رێڕەوی درمەکە. گەر نەخۆش خۆراکی بەسوودو پڕ ڤیتامینو پرۆتینو کالۆری بخوات ئەوا لەش وزەی زۆری دەبێتو لەکالۆری پەکی ناکەوێتو بەپێچەوانەشەوە پەکی دەکەوێت.

**زیندەپاڵ**

درمی سەخت دەبێتە هۆی رۆژانە بەفیڕۆدانی (زێدەتر لە 14 گرام) پرۆتینی نێومیز (لەمرۆڤێکی گەورەی خۆراك نەخۆردا).

**پرۆتین**

**لە کاتی نەخۆشییە درمەکانـدا نـەخۆش پێویسـتی بـەپرۆتینی زۆر هەیـە چـونکە چـاوگێکی باشـە بـۆ ئینترلیۆکینی 1، بە پێچەوانەوە بەدخۆراکی پرۆتین دەبێتە هۆی کەمبوونـەوەی لیمفەخانـەکان و کرداری هەڵلوشین و ئیمونۆگلۆبولینەکان و تەواوکەر (کۆمپلیمێنتەکان)**

**ئەوەی راستی بێت تادارێك رۆژانە پێویستی بە 2- 3 لیتر شلە هەیەو لەکاتی پێویستدا دەبێت ئەم رێژەیـە زێـد بکرێـت، هاوکـات پێویسـتە چـاودێری هێنـدی میـز بکرێـت، هـەروەها زۆرجـار پێویسـتە ناتەواویی کالسیۆم و سۆدیۆم و پۆتاسیۆم راست بکرێتەوە.**

**چارەسەرکردنی نیشانەکان**

**سەرەتا پێویستە بەزووترین کات (تا) نزم بکرێتەوە (ئەسپرین و پاراسیتۆل... تاد دەدرێـت بەنـەخۆش)، پاشتر ئازاری ماسولکەو ژانەسەرو رشانەوەو کۆکە چارەسەردەکرێت، بەپێی جۆری سکچوون و هۆکەی هەوڵبدرێت ژمارەی سچکوونەکان کەم بکرێتەوە.**

**چارەسـەرکردنی سـووربونەوە: پێویسـتە لەسـەرخۆو بـە وردی چارەسـەر بکرێـت و لـەم بـارەدا هەمیشـە دەرمانی کۆرتیزۆن و نزیکەکانی زۆر بەسوودن.**

**کۆرتیزۆن**

**بریتییـە لەمادەیـەکی تایبـەتی، سەرگورچیلە گلانـد بەرهـەمی دەهێنێـت. ئـەم مادەیـە لەسـاڵی 1949دا دۆزراوەتەوە، بۆ هێمنکردنەوەی ئازاری رۆماتیسم (باداری) بەکاردەهێنرێت**

**ڤیتامینەکان**

**بـریتین لـەمادەی زۆر پێویسـت و بەسـوود، بـەڵام پێویسـتە هەمیشـە زۆرخـۆری یـان کـەمخۆری نـەکرێت چونکە لەهەردوو بارەکەدا ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ زیانیـان پێدەگات و دەبێتـەهۆی دەرکـەوتنی هەندێك نیشانەو نەخۆشی (1).**

**بۆ نموونە زێدی**

**ڤیتامین A :**

**دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن، کاری گورچیلە دەشێوێنێت، گۆڕانکاری پێست و نینۆك، وەرینی موو، ئازاری ئێسك سەرهەڵدەدات.**

**ڤیتامین B3:**

**دەبێتە هۆی برینداربوونی گەدە، ترشەڵۆکی گەدە، رووتانەوەی مووی سەر، ئاڵۆش، سووتانەوەی بۆری جگەر، گیروگرفتی لێدانی دڵ.**

**ڤیتامین B6:**

**دەبێتە هۆی بێهێزی، سووتانەوەی بۆرییەکانی خوێنی مەژی، کەمبوونەوەی ئۆکسجین.**

**ڤیتامین C:**

**دەبێتـە هـۆی دروسـتبوونی کالسـیۆم و ئەسـتووربوونی نێوپۆشـی بۆریـەکانی خـوێن، دروسـتبوونی خانـەی شێرپەنجەیی.**

**ڤیتامین D:**

**دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی کالسیۆم، فشاری خوێن، دروستبوونی بەردی گورچیلە.**

**ڤیتامین K:**

دەبێتە هۆی تێکشکانی خوێن، زەردوویی منداڵی تازە لە دایکبوو.

**لەگەڵ ئەمەشدا کەمی ڤیتامینەکان دەبنەهۆی دەرکەوتنی نیشانە یان نەخۆشی وەك: بۆ نموونە کەمی**

**ڤیتامین A:**

دەبێتەهۆی شەوکوێری، چاوکزی، زیپکە لەسەر پێست، هیشك هەڵگەڕاندنی پێست، بەرگەنەگرتنی هەوکردن.

**ڤیتامین B:**

دەبێتەهۆی نەخۆشیی بەری بەری، بێهێزی، گۆڕانکاریی پێستو ماسولکەکان بەگرانی دەجوڵێنەوە.

**ڤیتامین C:**

دەبێتە هۆی لێوقڵیشان، هەڵامەت، کەمخوێنی، گەرووەسۆ، سیپەسۆو گەشەنەکردنی منداڵ.

**ڤیتامین D:**

دەبێتەهۆی نەخۆشیی ئێسکەنەرمەو دواکەوتنی گەشەکردن.

**ڤیتامین E:**

دەبێتەهۆی نەزۆکی، سووتانەوەی گلاندەکانی کۆئەندامی زاووزێ، ددان رەشبوونو تێکشکانی خوێن.

**ڤیتامین K:**

دەبێتە هۆی خوێن نەگیرسانەوە، بەئاسانی خوێنبەربوون.

**سەرچاوەکان**


1- د. زەنون موحەمەد پیرباردی. پێشەکییەکی دەرمانزانی. دانشگای بەغدا، سالی 1986. لاپەڕە 197- 199.

2- د. زاهیر سوران . چارەسەری درمە ڤایرۆسییەکان . گۆڤاری هەتوان. ژمارە 12 . ل 14-18 ، 2003.


## سوودی خۆراك لە كاتی هەوكردندا

ئەوەی راستی بێت هەر یەكێك لە ئێمە رۆژانە چەند ژەمێك خۆراك ولە نێوان ژەمەكانیشدا خۆراكی جۆراوجۆر دەخوات وبەشێش وەك سەرچاوەیەكی وزە سوودی لێوەردەگرێت لە بەرئەوەی كۆئەندامی بەرگری لەش بەردەوام پێویستی بە مادەی بەسوودە بۆ ئەنجامدانی فەنكشنەكانی لەش. بۆ ئەوەی مەترسی هەوكردن كەمبكرێتەوە پێویستە مرۆ ئاگاداری ژەمەكانی خۆراك خواردنی بێت . هەرچەندە لە كاتی هەوكردندا بە تایبەتی ئەنتیبایۆتیك یان بە گشتی دەرمان گرنگترین بەشی چارەسەركردنە وەلێ نابێت رۆڵی خۆراك و ئاویش لە بیر بكرێت . لەوانەیە بە هۆی سەختی سۆكەوە نەخۆش نەتوانێت خۆراك بخوات یان ئیشتیهای خۆراك خواردنی كەم ببێتەوە (بە تایبەتی لە كاتی سۆتادارەكاندا) یان نەمێنێت وەك لە كاندیدەی نێو دەمدا و دوا قۆناخی نەخۆشی ئەیدزدا بەڵام باشتر وایە تا نەخۆش دەتوانێت برێكی باش خۆراك بخوات . كاتێك نیشانەكان دەرەوێنەوە یان سۆیەك بەرە وچاكبوونەوە دەڕوات ئەوسا كۆئەندامی بەرگری لەش لە سەرخۆ و بە باشی دەكەوێتەوە كار و مرۆڤیش بە باشی خۆراك دەخوات .

**هاوكات پێویستە:**

1- بەرێكوپێكی نەخۆش 3 ژەم ونێوان ژەمەكان خۆراك ومیوە بخوات.

2- نەخۆش ئاگاداری مۆدێلی قاپ بێت و بەم شێوەیەی خوارەوە لەو قاپەدا رێژەی پرۆتینی ژەمەكانی خۆراك دیاری بكرێت :

- یەك بەش لە سێ بەش (1/3) ی قاپەکە پەتاتە ، سپاگێت و برنج بێت .
- یەك بەش لە دوو بەشی قاپەکە گۆشت ، ماسی، هێلکە و فاسۆلیا بێت .
- دوا بەش سەوزە ، تەماتە ، گەنمەشامی، کاهوو، کەوەر و تەرەتیزە بێت .

3- ئەو نەخۆشانەی کێشیان کەمە رێژەیەکی زێدەتر لە پەتاتە و سپاگێتییان بدرێتێ .

4- خۆراکی جۆراوجۆر بە نەخۆش بدرێت بۆ ئەوەی سوود لە گشتیان وەربگرێت .

## سەرچاوەکان


**References (2)**

1.Adam Finn/ Stanley A. Plotkin , Immunization In: Harrisions Principles of internal medicine, 1001;80:272-78.
2.Standford T. Shulman John P. Phair, Lance R. Peterson, John R. Warren, Infectious Diseases, 5th eds. 1997.
3.James J. Plorde. The diagnosis of Infectious Diseases,. In: Harrisons, principles of internal Medicine, 1991.
4.Jack S. Remington and Jerome O. Klein, Infectious diseases of the fetus newborn infant, 4th eds. W.B. Saunders company, USA, 1995.
5.J. Willis Hurst, Medicine for the practicing physcian, Section 8, infectious diseases, 3ed eds, Butterworth-Heinemann, USA 1992.
6.Robert C. Moellering, Jr. Principles of anti-Infective Therapy. Mandell, Bennett and Bolin. IN: Infectious Diseases, 4th eds, 1995; 12:199-212.
7.Sten Iwarson, professor/överläkare, infektionskliniken, sahlgrenska universitetssjukhuset, SU/Östra. Göteborg, Rose-Marie Carlsson, med.dr. överläkare, avd imunologi och vaccinologi, ISM, stockholm. Fass 2003, vaccinationer och reseprofylax sida 1825-1829
8.Marin GH. Voiculescu. Infectious Diseases. Medical Edition. 1991; 54:pp 9.Weekly Epidemiological Record WHO/no. 5,7,9 1997. Geneva.
10.Fredric G Hyden Antiviral agents, In: Mandell. Bennett and Dolin, principles and practice Infectious Diseases 1995;32:411-445.
11.Katabitra E et al. 1X intenatinal conference on AIDS. Abstract po-B26-2056. Berlin, 1993.
12.Chemello L et al. Treatment of cronic hepatitis C with diffrenet regimes of interferon alpha -2b (abstract 196) Antiviral Res. 1993;20148.
13.Oxford JS, Gilbraith A. antiviral activity of amantadine: A review of laboratory and clinical data. Pharmacol Ther, 1980; 11:181.
14.Balfour, HH et al. Acyclovir treatment of varicella in otherwise healthy adolscents, J Pediatr 1992; 120:627-33.
15.Wallace MR et al. Treatment of adult varicella with oral acyclovir. Ann Interm Med 1992;117:358-63
16.Committee on infectious diseases The use of oral acyclovir in otherwise healthy chldiren with varicella. Pediatrics. 1993;91:647-6.
17.Bean B et. Al., Acyclovir therpay for acute herpes zoster, Lancet, 1982;2 118-
18.John E. Bennett, Antifungal agents. In: Mandell. Bennett and Dolin. principles and practice Infectious Diseases 1995; 401-410.
19.Malcom D. Richarson and Elisabeth M Johnson. the pocket Guide to fungal infection, First published 2000. by pfizer. UK.
20.Handläggning av Cytomegalovirusinfektioner. Rekommendarioner.
information, årsgång 12.Nr.7/8. december 2001 Från läkemedelverket
21.Kwon-Chung KJ, Bennett JE. Medical mycology Pheladelphia. Lea & Febiger, 1992.
22.Whitley RJ et al., Acyclovir. A decade later N Eng J Med 1993; 361-650-4
23.Allan R. Tunkel, Topical antibacterials. In Mandell, bennett and Dolin, principles and practice Infectious Diseases 1995;29:381-89.
24.Andreassi L, Flori L. pharmacologic treatement of burns. Clin Dermatol. 1992;9:453-8.

# بەشی دووەم

## نەخۆشییە بەکتریاییەکان

1- سۆستریپتۆکۆکەسەکان (سورەتا، پەمبەتا، مەرازە ، ئاگرە)
2- سۆستافیلۆکۆکەسەکان (بەرگری لە ئەنتیبایۆتیك ، خوێنی بەکتریایی)
3- کۆکە ڕەشە
4- سییەسۆکان
a- سییە سۆی بەکتریایی
b- سییە سۆی ڤایرۆسی
c- سییە سۆی مایکۆپلاسما
d- سییەسۆی لیگوینێلا

## 1- سۆ ستریپتۆکۆکەسەکان

ئەوەی ڕاستی بێت ئەم سۆیانە بڵاوترین و ناسراوترین هەوکردنەکانن کە زۆرجاران تووشی گچکەو گەورە دەبن و هەندێکجاریش دەلنە هۆی مردنی نەخۆش . بریتین لە کۆمەڵە بەکتریایەکی شێوە بازنەیی یان هێلکەیی گرامپۆزەتیف زۆرجاران مرۆ تووشی هەوکردنی سوك یان سەخت دەکەن گرنگترینیان کۆمەڵی (A ، B، C، G) .

- ستریپتۆکۆکەسی کۆمەڵەی A
- ستریپتۆکۆکەسی کۆمەڵەی B (بەپەیوەندی زایەندی وڕاستەوخۆدا دەگوێزرێتەوە)
- ستریپتۆکۆکەسی کۆمەڵەی C
- ستریپتۆکۆکەسی کۆمەڵەی G

هەمووجۆرەکان دەبنە هۆی سییە سۆ، پێستە سۆ، نێوپۆشەسۆ و مەرازە ، گرنگترینیان ئەمانەن:

1- سورەتا
2- پەمبەتا
3- مەرازە
4- ئاگرە
5- سییە سۆی ستریپتۆکۆکەس (سەیری سییە سۆکان بکە) .

هاوکات بەکتریاکە دەتوانێت ببێتە هۆی هەوکردنی گوێچکە وخوێنی بەکتریایی ومێشکپۆشە سۆ.
گرنگترین ئاڵۆزکارییەکانی ئەم جۆرە بەکتریایە بریتییە لە تای کوتوپڕی ڕێوماتیسمی و گورچیلە سۆی کوتوپڕ .

# سورەتا

نەخۆشییەکی درمی کوتوپڕە و لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا ناسراوە .

**هۆزانی**

هۆی نەخۆشی سورەتا بەکتریای (Group A Streptococcus) یە. یەکێکە لە بەکتریا گرنگە نەخۆش بەخشەکانی مرۆڤ. لێرەدا تەنیا باس لە جۆری A یان دەکەین کە نزیکەی 60 جۆری هەیە. ناسینەوەی جۆرە سێرەوییەکان زۆر گرنگە بۆ ناسینەوەی مەترسیی ژەهرەکە.

**مێژوو**

- سیدێنهام لەساڵی 1676 دا سورەتای لەنەخۆشییە تادارەکانی دی جوداکردەوە.
- بێری و بابش لەساڵی 1893 دا هۆی سورەتایان دیاری کرد.
- (دیک) لەساڵی 1921-1923 داژەهری بەکتریاکەیان دەستنیشانکرد و تێستی (دیک) ی دروست کرد.
- پاش جەنگی جیهانی دووەم سورەتا لەجیهانا بڵاوبۆتەوە و ژمارەیەکیشی پێمرد.
- لەساڵی 1940 ەوە تا ئەمڕۆ نەخۆشییەکە مەترسی مردنی لێناکرێت.

**پەتازانی**

سورەتا لەهەموو جیهاندا بڵاوە, هەروەها لە کوردستاندا بە ڕێژەیەکی گۆڕاو دەردەکەوێت، نەخۆشییەکە زێدەتر تووشی منداڵی ژێر دە ساڵان دەبێت ، بە دەگمەن تووشی ساوای گچکە (ژێر یەک ساڵ) دەبێت. سورەتا لەکاتی ساردبوونی ئاووهەوادا (پایز، زستان و سەرەتای بەهاردا) دەردەکەوێت ، بەو جۆرە هەر 5 یان 10 ساڵ جارێك نەخۆشییەکە دەر دەکەوێتەوە. نەخۆشییەکە زێدەتر لە گوندەکاندا بڵاودەبێتەوە ، وەلێ لە شارەکاندا هەندێك جۆری سێرەمی بەکتریاکە زۆر هێواش بڵاودەبێتەوە. گەر ئاوڕێك لە مێژوو بدەینەوە دەبینین کە لە ساڵەکانی 1898 و 1915 دا سورەتا نزیکەی 1-2 ساڵان بڵاوبۆتەوە و ژمارەیەکی زۆریش بە نەخۆشییەکە مردون . لە ساڵانی 1920و1939 دا هەر جارەی کە بڵاوبۆتەوە 5-6 ساڵی خایاندووە و ژمارەیەکی دیکەش مردون . لە ساڵانی 1946 و 1964 دا بۆ ماوەی 2-3 ساڵ سەر لەنوێ بڵاوبۆتەوە. کوڕان زێدەتر تووشی سورەتا دەبن وەك لە کچان.

**ڕێگاکانی گواستنەوە**

- پەیوەندی ڕاستەوخۆ، بەهۆی هەواوە، درمی هەوایی ناسراوە.
- ناڕاستەوخۆ، جاروبار بەهۆی کەلوپەلی تازە بەکارهێنراوی نەخۆشەوە کە بەکتریاکەی پێوە بێت دەگوێزرێتەوە.

هەندێکجار منداڵەکانی نێو خێزانێك یەکتری تووش دەکەن ، گەر نەخۆشییەکە بەهۆی بۆری هەرسەوە بگوێزرێتەوە (شیر و بەرهەمەکانی) ئەوا زۆر خێرا بڵاودەبێتەوە

**نەخۆشیداری**

ئەوەی ڕاستی بێت بەکتریاکە لە ئاستی شوێنی چوونە ناوەوەدا زێد دەکات بەتایبەتی لەئاستی نێوپۆشی گەروودا ودەبێتە هۆی هەوکردنی ئەوشوێنە.

هەندێکجار بەکتریاکە لەناستی هەوکردنەکەدا ژەهر دەردەدات و پاشتر دەڕژێتە نێوخوێنەوە دەبێتە هۆی تەنینەوەو دەرکەوتنی بارێکی دژواری درمەکە.

**نیشانەکان**

ماوەی کڕکەوتنی بەکتریاکە لە نێوان 3 -6 رۆژدایە یان لە نێوان1 -10 رۆژ دایە. نەخۆشییەکە لەپڕ بەتا (39-40 پلە) دەست پێدەکات ، هەندێك جاری دی لەسەرخۆ دەردەکەوێت. لێرەدا مەرازەکان دەئاوسێن و ژان دەکەن و سورن ، رشانەوە و ژانە سەریش نەخۆش بێزار دەکەن. هەندێك جار پرتەی دڵ خێرا دەبێت ، پەستانی خوێن نزم دەبێتەوە ، باری گشتی نەخۆش دەگۆڕدرێت.

**ماوەی پێش پەڵەکان**

نزیکەی 36-38 کاژێر دەخایەنێت ، هەندێك جار نێوپۆشی نێودەم سورە و هێدی هێدی سپی- شیری دەنوێنێت ، واتە تووشی بۆقژە دەبێت. نیشانە گرنگەکانی نێو دەم ئەمانەن: پاشی گەروو، نەرمە مەلاشوو ، ئالووەکان سورن و وەك ئاگر دەگەشێنەوە. هەندێکجار گەندە پەردەیەك (وەك گەندە پەردەی وەناق) دروست دەبێت ، هەندێکجاری دی گەر میکرۆبی دی بەشداری درمەکە بکات ئەوا لاڕەشە دروست دەکات.

**زمان**

سەرەتا ، سەری زمان سورە بەلام ناوەڕاستی زمان سپیە و چونکە مادەیەکی کرێمی سپی لەسەر دەنیشێت و پوپیلە گچکە سورەکانی سەر زمان (زمانی سپی بڕپلو) یان (زمانی شیلکی سپی) دروست دەکەن ، پاشتر لە یەکەم رۆژدا لەسەری زمانەوە دەرەوێتەوە و نزیك بنکەی زمان دەبێتەوە ، لە 4-5 رۆژدا کرێمی سپی سەر زمان دەڕەوێتەوە و نامێنێت و سوری و گەشی زمان دەگەڕێتەوە. لە 5-6 رۆژی درمەکەدا رەنگی زمان تاریك دادێت کە بە (زمانی پشیلە) ناسراوە.

لەبارە قورسەکاندا نەخۆش تووشی گیروگرفتی جوین و قووت دان دەبێت و لەوانەیە برین لەسەر نێوپۆشی نێو دەم و زمان دەرکەوێت کە بۆنێکی ناخۆشی لێدێت.

**ماوەی گۆڕانکاری پێست**

لەم ماوەیەدا پێست چەند پێکهاتوویەکی گچکەی رەنگ سوری لەسەر پەیدا دەبێت ، بە تایبەتی لەژێر مل و سنگ سك دا و پاشتر پەلەکانی سەرەوە و خوارەوە دەگرێتەوە. ئەم بارە 1-2 رۆژ دەخایەنێت و گشت لەش دەگرێتەوە ، پاشتر وەك هێڵی خوێنبەر دەردەکەوێت ، ئەوەی راستی بێت خاڵە سورەکان لەسەر رووخسار دەرناکەون بەلام رووخسار دەئاوسێ کە بە (رووخساری تایبەتی سورەتا) ناسراوە.

**ماوەی دەرکەوتنی پەڵەکان**

لەم ماوەیەشدا تا بەرزە و لە 5-10 رۆژدا نزم دەبێتەوە ، پاشتر دڵ زێد لێدەدات ، بەلام گوێمان لە لێدانی نییە. نزمبوونەوەی پەستانی خوێن ، جگەر کەمێك گەورە دەبێت و میزیش کەم دەبێتەوە. لە 7- 10 رۆژدا پاش دەرکەوتنی نیشانەکان پەڵەکان توێخ فڕێ دەدەن ، سەرەتا لەملەوە دەست پێدەکات ئەم کاژە سپییە و لەشێوەی ئارد دایە.

(هەندێك جار توێخ فڕێدانەکە 2-3 هەفتە دەخایەنێت).

**جۆرە کلینیکییەکانی سورەتا:**

- جۆری سوك ، بێ توێخ هەڵدان و کەم نیشانەیە.
- جۆری مامناوەندی ، وەك ئەوەیە لەسەرەوە باسکرا.
- جۆری قورس ، لەپڕ نیشانەکان دەردەکەون زۆرجار پەڵەکان شین دەبنەوە یان خوێنرێژی دەردەکەوێت ، بەڵغەم خوێناویە و ڕشانەوەش هەس ، نیشانەی دەروونی و دەماری (گەشکە ، نائارامی ، لە هۆش خۆچوون) و سستی سوڕانی خوێنیش دەردەکەوێت.

**ڕێڕەوی سورەتا**

بەپێی بڵاوبوونەوەی بەکتریاکە ڕێڕەوی درمەکە دەگۆڕێت ، سورەتای ئەمڕۆ جۆرێکی باشە و ڕێژەی مردن زۆر کەم بۆتەوە و هاوکات بە ئەنتیبایۆتیك درمەکە چارەدەکرێت.

**ئاڵۆزكارییەکان**

گەر سورەتا لە کاتی خۆیدا چارەسەر نەکرێت ئەوا لە 15-25 رۆژدا ڕێڕەوی درمەکە توند دەبێت و ئەم ئاڵۆزكاریيانە دەردەکەون:

- بۆکردن: لەهەموو ئاهەمواریەکی سورەتا بڵاوترە و دەبێتە هۆی گوێچکە سۆ و ناوپۆشە سۆی دڵ، پەردەی مێشك، کێمکردنی پەردەی مێشك، دروستبوونی دوومەڵی مێشك. هەندێکجار بەکتریاکە دەتەنێتەوە و دەگاتە خوێنبەر و هەناو پۆش و دڵ و سی و جگەریش ئەسووتێتەوە.
- ژاهراوی بوون ی ناوپۆشەسۆی دڵ ، گورچیلە ، جگەر و جومگەکان.
- جومگە سۆی کوتوپڕ و گورچیلە سۆ.

**دەستنیشانکردن**

- نیشانەکان ، ئاڵووکەوتن + ڕشانەوە و پەڵەی گچکەی سور. رووخساری تایبەتی سورەتا و زمانی پشیلە . - تێستی هەستیاری دیك.
- ئەنجامدانی تێستی سێرەمی بۆ دۆزینەوەی سترێپتۆکۆکەس.
- لە سەرەتای نەخۆشییەکەدا تێستی PCR زۆر بەرز دەبێتەوە.

**چارەسەرکردن**

- جوداکردنەوەی نەخۆش بۆ ماوەی 7 رۆژان ، حەواندنەوەو خۆپاراستن لە سەرما پێویستە .
- بەپێی نیشانەکان خۆراك و دەرمان دەدرێت بە نەخۆش.

**دەرمان**

پەنسیلینی G باشترین دەرمانە دژی سترێپتۆکۆکەسی سورەتا. پێویستە رۆژانە 800 هەزار یەکە یان یەك ملیۆن یەکە بۆ 10 رۆژان بدرێت لە ماسولکەی نەخۆش. لە کاتی پێویستدا بە پەنسیلین V تەواو دەکرێت. گەر نەخۆش نەیتوانی پەنسیلین لەخۆی بدات ئەوا پێویستە 20-40 ملگم ئیریترۆمایسین / کگم کێش نەخۆش لە 24 کاژێردا و بۆ ماوەی 10 رۆژان بدرێت بە نەخۆش .

## پەمبەتا

یەکێکە لە هەوکردنە گرنگەکان زۆرجاران تووشی پێست دەبێت و بە Erysipelas ناسراوە ، بەڵام هەندێك جار نیشانەی هەوکردنی گشتی لە گەڵدایە .

**هۆزانی**

هۆی نەخۆشییەکە دەگەڕێتەوە بۆ بەکتریای (Group B Streptococcus Hemolytic A) . نزیکەی 83 جۆر بەکتریای سترێپتۆکەس هەیە

**پەتازانی**

پەمبەتا نەخۆشییەکی زۆرکۆنە وبە ڕێژەی جیاواز لە هەمووجیهاندا بڵاوە . ئەوەی راستی بێت زۆرجاران پاش نەشتەرگەری ، برراوی یان برین لە سەر (پا) هەوکردنەکە دەبینرێت. زۆرجاران پوزو ژێر ئەژنۆی نەخۆش سوور هەڵگەڕاوە و ئاوساوە هەندێك جاری دی بەکتریاکە ژمەری خۆی دەردەدات کە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی نیشانەکان .

نەخۆشییەکە زیاتر لە بەهارو پایزدا و لە گەورە ساڵاندا دەبینرێت و بە دەگمەن لە منداڵ و هەرزەکاردا دەبینرێت.

**ڕێگاکانی گواستنەوە**

– راستەوخۆ، بە هۆی پریشکی لیکی نێۆدەمەوە مرۆ تووش دەبێت .

– ناڕاستەوخۆ ، لە ڕێگای هەواوە بە هۆی کەلوپەلی بەکتریاوییەوە دەبێت .

شوێنی چوونە ناوەوەی بەکتریاکە بریتییە لە برینی سەر پێست یان ناوپۆشەکان ، پاش هەوکردنەکە لەش بەرگری دژی باکتریاکە پەیداناکات لەبەرئەوە زۆرجار پەمبەتا دەردەکەوێتەوە .

**نیشانەکان**

ماوەی کڕکەوتنی بەکتریاکە لە نێوان 1-3 رۆژدایە و بە دەگمەن دەگاتە 8 رۆژان . مرۆ لە پڕ لەرزێکی توندی لێدێت (شەقەی ددانی دێت) . تالێهاتن لە نێوان 39-41 پلەدایە ، هێڵنجدان و رشانەوەش دەبینرێت زۆرجار باری گشتی نەخۆش خراپە . لە تێڕوانینی پزیشکدا لیمفە گرێکان پەنماون . هەندێکجار لە چەند کاژێرێکدا یان لە 2 رۆژدا گۆرانکارییەکانی سەر پێست دەردەکەون و بەئاسانی تەشەنە دەکات . هەمیشە نیشانە کلاسیکەکانی سووربونەوە وەك پەنماوی ، سوورهەڵگەراندن ، ئازارو گەرمی شوێنەکە دەستنیشان دەکرێت

زۆرجاران پەمبەتا لە ژێر ئەژنۆدا دەردەکەوێت . پێستی لێوارەکان ی شوێنەکە سوورهەڵدەگەڕێت لە سەر پا سپییە و لەسەر رووخسار پەمبەیەکی کاڵی مەیلەوسپییە . ئازاری شوێنەکە لە شێوەی پاڵەپەستۆیدایە . گەر بەکتریاکە زوو ژمەرەکەی دەربدات ئەوا باری نەخۆش زۆر خراپ دەکات و لەوانەیە نەخۆش نەتوانێت لە سەر پێ بوەستێت و بکەوێت . هەندێکجار نیشانەکان زۆر سادەن و پزیشك بە ئاسانی دەستنیشانی پەمبەتا دەکات

**شوێنی پەمبەتا**

- پەلەکان بە تایبەتی قاچ (ژێر ئەژنۆ) بە هۆی ناتەواوی سوڕدانی خوێنی خوێنهێنەرەکانی پا .
- ڕووخسار، بە دەگمەن لەسەر شان و باڵەکان دەردەکەوێت .

**ڕێرەوی پەمبەتا**

زۆربەی زۆری بارەکان پزیشك بە دەرمانی پەنسیلین کۆنترۆڵی نەخۆشییەکە دەکات ، هەندێکجار لەبەرخراپی رەوتی نەخۆشییەکە پێویست دەکات نەخۆش لە نەخۆشخانە بمێنێتەوە تا قۆناغە کوتوپڕەکە دەڕەوێتەوە . ڕێژەی مردن زۆر کەمە یان دەگمەنە .

**هۆکارە یاریدەدەرەکان**

- ناتەواوی سوڕدانی خوێنهێنەرەکانی پا .
- پەنمانی لیمفە گرێکان .
- نەخۆشی شەکرە .
- مەی خۆری (ئەلهۆلیست)
- هۆکاری شوێنی ، پێڵاوی تەنگ ، برینی خوێنهێنەرەکان ، پێستە سۆ، برینی نینۆك و قەڵەوی .

**ئاڵۆزکارییەکان**

- شوێنی ، مردنی شانە ، گانگرێنە و ئاشین .
- گشتی ، ژارین ، هەوکردنی لیمفەگرێکان ، گورچیلەسۆ ، پەردەسییەسۆ .

**دەستنیشانکردن**

- نیشانەکانی سەرەوە و تێڕوانینی پزیشك .
- پێوەری CRP زۆر بەرزە و هەندێکجار دەگاتە سەروو 200 دانەوە .

**چارەسەرکردن**

زۆر ئاسانە و لە چەند ڕۆژێکدا پەنسیلین لە شێوەی دەرزی یان حەبدا دەدرێت بە گەورەساڵان 1 گم ڕۆژانە 3 جاران لە 10 ڕۆژدا نەخۆش چاك دەکاتەوە . گەر نەخۆش پەنسیلینی پێنەکەوت ئەوا دەرمانی ئێریترۆمایسین ی دەدرێتێت . زۆرجاران لە ڕێگای برینی کۆنەوە پەمبەتا جارێکی دی دەردەکەوێتەوە .

**سەرچاوەکان**

**References**

1.Jan Rollof; Jan Bläkberg, bakterier, virus, parasiter en klinisk hand ledning. studentlitteratur, sverige 1994.
2.Christian Jourp, från hud-och mjukdelsinfektioner, etiologi, diagnostik och behandling Sverige, landstingen, 2000. 38-41.
3. Eriksson B, et al. Erysipelas, clinical and bacteriological spectrum and serological aspects Cli. Infec. Dis. 1996;23:1091-98.
4.Iwarsson –Norrby, infektionsmedicin. klinik och terapi. Säve Forlag 1998. 447-450

# ئاڵووکەوتن (مەرازە)

یەکێکە لەو نەخۆشییە کوتوپڕ درمە سۆییانەی لەقۆناخێکی ژیاندا جارێك یان چەند جارێك تووشی مرۆڤ دەبێت. جاری وا هەیە مرۆڤ ناچار دەبێت تا بەنەشتەرگەری دەریان بێنێت ، گەر هەوکردنەکە چارەسەر نەکرێت ئەوا لەدوا رۆژێکی (نزیك یان دووردا) مرۆ دووچاری ئاڵۆزکارییەکانی سۆکە دەبێت. لە نێو کوردەواری دا نەخۆشییەکە بە زاراوە عارەبییەکەی (لەوزەتێن) زێدتر ناسراوە ، میکرۆئۆرگانیسم بە گشتی و بەکتریا بە تایبەتی دەبنە هۆی هەوکردنەکە.

پرۆسێسی هەوکردنەك تایبەتە بە مەرازەکانی نزیك کونە لووت ، کونە گوێ و شانەی لیمفاوی ناوچەکە. مەرازەکان گرنگییەکی تایبەتییان هەیە و زۆر بەسودن بۆ مرۆڤ چونکە دژی میکرۆب رۆڵی پاسەوان دەبینن ، لەکاتی هەوکردندا درمێتییان زۆر بەرزە چونکە لەوانەیە ژەهری بەکتریاکە بگاتە دڵ ، گورچیلە ، جگەر و کۆئەندامی ناوەندی دەمار ئەوسا بارێکی تایبەتی دژوار بۆ نەخۆش دروست دەکات.

**هۆزانی**

- **بەکتریا 50٪ یان بریتین لە:**

– بەکتریای ستریپتۆکۆکەس هیمۆلیتیکەس بیتا نزیکەی 60 جۆریان هەیە ، جۆرەکانی A و ڤیریدانس یان زۆر بلاون.

هەروەها بەکتریای پنیومۆکۆکەس ، مینینگۆکۆکەس ، بەکتریای وەناق ، سالمۆنێلای گرانەتا ، باسیلی کوخ و ترێپۆنێمە پالیدیۆم بەدی کراون.

- **ڤایرۆس 20–30٪ (لە منداڵدا)، گرنگترینیان ئەمانەن:**

– ئەدینۆڤایرۆس – نزیکەی 41 جۆر لەم ڤایرۆسە هەیە و جۆرەکانی 1-7، 14 و 21 زۆر ناسراون.

– ڤایرۆسی کۆکساکی – نزیکەی 30 جۆری هەیە.

– ئێکۆڤایرۆس – نزیکەی 34 جۆری هەیە.

– رینۆڤایرۆس ، ڤایرۆسی تامیسکی ، مێکوتە وسورێژەی ئەڵمانی.

– ڤایرۆسی ئینفلوەنزا.

- **کەڕووەکان بریتین لە:**

کاندیدە و لێپتۆتریکس هەروەها چەندان بەکتریا و ڤایرۆسی دیش هەن کە دەبنە هۆی مەرازە.

**پەتازانی**

سەرچاوەی مەرازە مرۆڤی نەخۆشە ، هەروەها مرۆڤی لەش ساخ هەڵگری میکرۆبەکەیە. درمی مەرازە زۆر بەرزە و لەوانەیە هەموو کەسێك لە تەمەنێکی ژیانیدا تووشی نەخۆشییەکە ببێت. قەڵەبالغی ، ئاوو هەوای سارد و شێدارو هەندێك نەخۆشی هۆکاری یارمەتی دەری دەرکەوتنی مەرازەن.

جۆرەکانی مەرازە (بە پێی دەرکەوتنیان):

1- یەکەم مەرازە .

هۆی راستەوخۆ گواستنەوەی درمەکە هەوایە (لە نێوان لاواندا). بە دەگمەن بە رێگای هەرسدا دەگوێزرێتەوە .

هۆکارە یاریدەدەرەکانی هەوکردنەکە بریتین لە:

- کەمبوونەوەی بەرگری جێگەیی و گشتی (لە ژێر رۆڵی ئەو شوێنەی تێیدا دەژی).

- پیسبوون و کێمکردنی بەکتریایی، لەوانەیە زۆرجار ببێتە هۆی ئاڵۆزکردنی رێڕەوی درمە ڤایرۆسییەکانی مەرازە.

2- مەرازەی نیشانەیی

لەم بارەدا مەرازە وەك نیشانەی نەخۆشییەکی درمی دی وەك وەناق و گرانەتادا دەبینرێت. هەندێك مەرازە لەئەنجامی کاری کیمیکیدا پەیدا دەبن وەکو کاری پاکژکەرەوەکان یان ئەو دەرمانانەی کاردەکەنە سەر ناوپۆ شەکان.

تێبینی: زۆرجاران مەرازە وەك نەخۆشییەك یان وەك نیشانەی نەخۆشییەکی لاوەکی لە گەڵ نیشانەی جیاوازدا دەردەکەوێت.

نیشانەکان

مەرازەی ڤایرۆسی

لە کاتی هەوکردنی ڤایرۆسی دا مەزارەکان چەند نیشانەیەکی مامناوەندی گشتییان هەیە. سەرەتا نەخۆش هەست بە هیشکبوونەوەی نێو گەروو، گەورەبوونی لیمفەگرێکان دەکات ، ئەو گۆڕانانەی بەهۆی ڤایرۆسەوە (جگە لە ڤایرۆسی لیمفۆترۆپ) بەسەر ناوپۆشەکاندا دێن ئەمانەن:

- سووربوونەوە ، ئاوسان و پەیدابوونی خاڵی سووری بڵقاوی یان خوێناوی لەسەر ناوپۆشەکان.
- هەندێکجار نەخۆش گیروگرفتی بۆریەکانی هەوای سەرەوەی (لووتگیران ، ئاو بە لووتدا هاتنە خوارەوە ، لەش داهێزران) هەیە. مەرازە ڤایرۆسییە کان بێ دەرمان‌وچارەکردن چاکدەبنەوە ، ڤایرۆسی کۆکساکی دەبێتە هۆی برینداربوونی مەرازە و دەرکەوتنی هەندێك نیشانەی دی.

مەرازەی بەکتریایی

هەموو جۆرەکانی سترێپتۆکۆکەس هێمۆلیتیکەس بێتا جۆری A دەتوانێت ببێتە هۆی مەرازە.

زۆرجار نەخۆشییەکە لەپڕ دەردەکەوێت ، نیشانەی گشتییەکانی بریتین لە: لەرزوتا ، ژانە سەر و ئازار (لە کاتی جوین و قووتدانی خۆراکدا) دەست پێدەکات ، لە منداڵدا هەندێکجار رشانەوەشی لەگەڵدایە.

نیشانە تایبەتییەکانیش بریتین لە:

- نەخۆش ناتوانێ خۆراك قووت بدات هەندێکجار وای لێدێت ناتوانێت بە هیچ جۆرێك خۆراك بخوات.
- زۆرجار تەنگەنەفەسی و گۆڕانی دەنگی نەخۆشیش دەبیسترێت.

- ژانکردن و هەوکردنی لیمفەگرێکان.

**جۆرەکانی مەرازە (بەپێی رەنگ و شوێنیان):**

**1- مەرازەی سوور:**

**تایبەتە بە هەوکردنی بەکتریای سترێپتۆکۆکەس هیمۆلیتیکەس بێتا.**

**2- مەرازەی پەنماو:**

**زۆرجار هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ بەکتریای سترێپتۆکۆکەس هیمۆلیتیکەس بێتا. لەم جۆرەدا یەك لای مەرازە دەئاوسێت ، رشانەوە، هەناسەسواری و بێتوانایی قووتدان و گەورەبوونی لیمفەگرێکانیشی لەگەڵدایە. هەندێکجار پێکهاتووی دروستبووی سەر مەرازەکان دەتەقێن و لەوانەیە ببنە هۆی خنکاندنی منداڵی گچکە. لەبەرئەوە باشتر وایە لەکاتی دەرکەوتنیاندا بە نەشتەرگەری بکرێتەوە و کێمو زوخاوەکەی لێدەربهێنرێت.**

**3- مەرازەی نزیك کونە لووتەکان:**

**لەم بارەدا ساوا تای لێدێت و دەنگی گڕ دەبێت ، شلەیەکی خەستی کێماوی بەلووتیدا دێتە خوارەوە ، ساوا خۆراکی بۆ قووت نادرێت. لەکاتی تێڕوانیندا بە ئامێری (رینۆسکۆپ) کوونە لووتەکان پەنماون و کێمیان کردووە ئەوەی راستی بێت لەبەر گیراوی کونە لووتەکانە کەبەرمەمکانە ناتوانێت شیر بخوات.**

**4- مەرازەی سپی:**

**زۆرجار هۆی سەرەکی ئەم هەوکردنە سترێپتۆکۆکەس هیمۆلیتیکەس بێتایە ، ئەم جۆرە بەرەو کێموزوخاوکردن دەڕوات و زۆرجاریش لیمفەگرێکان ژان دەکەن.**

**5- مەرازەی درۆزنە پەردە:**

**ئەم جۆرە هەوکردنە دەبێتە هۆی گەورەبوونی قەبارەی مەرازەکان و لیمفەگرێکان لەگەڵ دەرکەوتنی بارێکی ژەهراوی گشتی و زۆرجار ئەم بارە وەکو نەخۆشی وەناق دەردەکەوێت.**

**6- مەرازەی بریندار:**

**لەم جۆرەدا مەرازەکان بریندار دەبن ، رووپۆشی سەر مەرازەکان وون دەبن و نامێنن ، زۆرجار برینەکە دەبێتە هۆی خوێن بەربوون و بەهۆی خوێن بەربوونەوە نێودەم بۆگەنی لێدێت. هۆی دی کە دەبێتە هۆی ئەم جۆرە مەرازەیە بریتییە لە فەرەنگی لاوەکی ، بەکتریای کوخ (مایکۆبەکتریا) یان شێرپەنجەی مەرازە.**

**7- مەرازەی گرانەتایی Duguet:**

**ئەم جۆرە لەکاتی نەخۆشی گرانەتادا دەردەکەوێت ، بێئازارە و شێوەی هێلکەیی یەو رەنگی سپییە.**

**ئالۆزکارییەکان**

- **ناوچەیی گوێچکەسۆ، ماستویدە سۆ ، کێمکردن. لەمەرازەی Ludwig دا لیمفەگرێکان کێم دەکەن.**
- **پاشتر – هەوکردنەکە دەبێتە هۆی نەخۆشی پاش مەرازە یان هەوکردنی پاش سترێپتۆکۆکەس وەك هەوکردنی کوتوپڕی گورچیلە و جومگەکان.**

• هەندێکجار سۆی کوتوپڕی وەك پرۆسێسێکی بەرگری لە 2-5 هەفتەدا (پاش ئاڵووکەوتن) دەردەکەوێت، زۆرجارسترێپتۆکۆکەس لەخوێنەوە خۆی دەگەیەنێتە پەردەی ناوەند و ناوەوەی دڵ و مرۆ تووشی رۆماتیسمی دڵ دەکات.

• هەندێکجاری دی 2-4 هەفتە پاش هەوکردنی مەرازە (بە سترێپتۆکۆ کەس هێمۆلیتیکەس بێتای جۆری 12) گورچیلە سۆی کوتوپڕ پەیدا دەبێت. بەکتریای سترێپتۆکۆکەس زۆر بڵاوە و زێدتر تووشی منداڵ و گەورە دەبێت.

**دەستنیشانکردن**

1- نیشانەکانی پێشوتر، زانیاری دەربارەی گواستنەوەی میکرۆئۆرگانیسمەکە.

2- تێستی خێرای نێوپۆشی ناو گەروو ،، چاندنی خوێن و میز یش پێویستە.

3- پێویستە تێستی سێرەوی بەکتریایی و تێستی ڤایرۆسی لەبیرنەکرێت.

**چارەسەرکردن**

1- چارەکردنی جێگەیی مەرازە ، غەرغەرە کردن بەچای رازیانە و دەرمانی تایبەتییەوە دەبێت.

2- چارەکردنی نیشانەکان ، بەکارهێنانی دەرمانی دژی تا و ئازار و خۆراك خواردن زۆر گرنگە.

3- دەرمانیش بۆ لەناوبردنی بەکتریاکان بریتییە لە دەرزی پەنسیلین بەم شێوەیە:

• دەرزی پەنسیلینی G بۆ 2 و 3 رۆژ و پاشتر بەخەپلەی پەنسیلین V تەواو دەکرێت.

• لەکاتی هەستداری لە پەنسیلین پێویستە هەر 6 کاژێرێك 400 ملگم خەپلەی ئێریترۆمایسین بۆ 5-6 رۆژان بدرێت بە نەخۆش.

• پاش مانگێك پێویستە جارێکی دی تێستی تاقیکایی نەخۆش بکرێت بۆ دڵنیابوون لەنەمانی میکرۆبەکە ، دەنا پێویستە جارێکی دی و بە (بێنزانتین پەنسیلین) چارەی مەرازە بکرێت.

**خۆپاراستن**

- لەکاتی هەوکردنی مەرازەکاندا زۆر پێویستە مرۆۆ مەرازەدار ماچ نەکات یان لێی دوور بکەوێتەوە.
- پاکوخاوێنی نێو دەم و گەروو و مەلاشو زۆر پێویستە.

**سەرنج :**

**ئەو کەسانەی کە ئازارشکێنی Novalgin=Metamizol بەکاردەهێنن زۆر مەترسی ئەوەیان لێدەکرێت تووشی هەوکردنی گەروو بین بەلام بە شێوەیەکی زۆر ترسناك !!**

**سەرچاوەکان**


**References**

1.Yow, M. Group B. streptococci serious Treat to the Neonate. J Amer Med Ass.
2.Group B streptococci in the newborn. Lancet 1977, 1 520.
3.Rapid detection of beta-hemolytic streptococci. Lancet 1986, 1 247
4.Group A. Beta- hemolytic streptococci skin infections in a mart-packing plant MMWR 1986, 35, 629.
5.Carol J. Baker and Morven S. Edwards Group B Streptococcal infections. In. Infectious Diseases of the fetus newborn infant, 4th eds. W B Saunders Company 1995, 26: 980-1028

# ئاگرە

ناسراوترین درمە پێستە سوێە لە نێو منداڵدا زۆر بڵاوە و زۆر بە ئاسانی چارەسەردەکرێت . بۆ یەکەمجار لەساڵی 1860 دا لە لایەن Dunn و Fox باسی لێوەکراوە .

**هۆزانی**

هۆی برینەکانی سەر پێست دەگەڕێتەوە بۆ بەکتریای سترێپتۆکۆکەس ی جۆری بێتا هێمۆلیتیکی A ن . هەندێکجاری دی بەکتریای ستافیلۆکۆکە سی ئاوریۆس دەبێتە هۆی برینەکان .

**رێگاکانی گواستنەوە**

– راستەوخۆ، کاتێك مرۆ پەیوەندی لە گەڵ برینەکەدا دەبێت بە مەرجێ شلەی نێو برینەکە بەر شوێنێکی لەشی مرۆ بکەوێت

– ناڕاستەوخۆ، لە رێگای بەکارهێنانی کەلوپەلی یاریکردنی منالەوە دەبێت

**نیشانەکان**

ئەوەی شایانی باسە نەخۆشییەکە زیاتر تووشی منداڵی باخچەی ساوایان و قوناخی سەرەتایی دەبێت . هەندێکجار منداڵی نەخۆش دایکوباوك و خوشکوبراکانی تووش دەکات .

سەرەتا لەسەر پێست منداڵ چەند پەڵەیەکی وردی سور دەردەکەوێت و پاشتر بلۆق دروست دەبن کە شلەیەکی تیادایەو بە پەردەیەکی زۆر تەنکی ناسك داپۆشراوە . برینەکان (وەك لە مێکوتەدا کەمترن) تەنیا لەسەر پێست بڵاودەبنەوە و مەیلەو زەردن بە تایبەتی لەملاولای کونە لووتەکان و لێوەکان و لالغاوەدا دەبینرێت . جاری وا هەیە لەسەر نەرمە ماسولکەی سك و ران و سمت دەردەکەوێت تیرەکەیان نزیکەی 2 سم دەبێت.

**رێڕۆی برینەکان**

ئەوەی راستی بێت برینەکان زۆر بە ئاسانی چارەسەر دەکرێت جاری وا هەیە برینەکە بە ئاو و سابون دەشۆردرێت وبە دەرمانی پاکژکردنەوە برینەکان چاکدەبنەوە ، هەندێکجاری دی پەنسیلین زۆر بەکارە . ئەم جۆرە برینانە بە هیچ جۆرێك شوێنەوار پاش خۆی بەجێناهێڵێت .

**چارەسەرکردن**

هەمیشە لە ژێر کاری کلیندامایسین ، Flukloxacillin=Cefamox,Pencillin V ، ئێریترۆمایسین و تێتراسایکلین دا ساڕێژ دەبن . گەر پاکوخاوێنی فەرامۆش بکرێت ئەوا زۆر مەترسی هەڵدانەی برینەکان دەکرێت .

**سەرچاوەکان**

References
1.Alan Bisno., Streptococcal Infections., In: Harrisons Principles of Internal Medicine, 12th eds 1991. 101 563-69
2.Leo Flamholc, Exantemsjukdomar, infektionkliniken, Malmö, Wellcome. 1994
3.Iwarson-Norrby, infektionsmedicin, epidemiologi, klinik och terapi, 1995
4.Donald Armstrong, Jonathan Cohen, infectious Diseases, vol 1 Mosby 1999
5.Jan Rollof, Jonas Bläckberg, Bakterier, virus, parasiter en klinisk handledning. Studentlitteratur Sweden. 1994. 105-111

## 2- سۆ ستافیلۆکۆکەسەکان

ئەم کۆمەڵە بەکتریایەش کۆمەڵێکی زۆر ناسراوی نەخۆشیدارین لە شێوەی هێشودان ، ژمارەیان زۆرە بەڵام بڵاوترینیان کە مرۆڤ تووشی نەخۆشی جیاواز دەکەن ئەمانەن : S.capitis, S.saprophyticus, S.epidermis, S.aureus. کە دەبنە هۆی پێستە سۆ ، خوێنی بەکتریایی ، سییە سۆ، ریخۆڵەسۆ ، برینە سۆ، ئێسکە سۆ .. تاد ، گرنگترینیان ئەمانەن :

1- **پەمبەتا** (سەیری پێشوتر بکە) .

2- بەرگری دژی ئەنتیبایۆتیك MRSA .

3- **خوێنی بەکتریایی** ( سەیری بەشی پێنجەم بکە) .

4- **ریخۆڵە سۆی بەکتریایی** (بریتین لە سۆی ریخۆڵەکان بەم بەکتریایە) .

5- **سییە سۆی ستافیلۆکۆکەس** (سەیری سییە سۆکان بکە) .

## بەرگری دژی ئەنتیبایۆتیك

تووشبون بە ستافیلۆکۆکەسی ئاوریۆس ناسراو بە MRSA یەکێکە لەو بارودۆخە دژوارانەی کە رۆژ بە رۆژ زیاتر دەبینرێت و ڕووبەڕووی نەخۆش و پزیشك دەبێتەوە. ستافیلۆکۆکە زەردەکان کە بەکتریایەکی گرامپۆزەتیفە دژی ئەنتیبایۆتیکی Methicillin واتە پەنسلین رادەوەستێت و بگرە زۆریەی زۆری سێفالۆسپۆرینە نوێیەکانیش ناتوانن لەناوی ببەن. بۆ دەستنیشانکردن پێویستە نموونە بە نیازی چاندن لەم شوێنانە وەربگرێت:

- بەشی پێشەوەی کونە لوتەکان.
- لاڕان و ناوگەڵ.
- برین، گۆڕانکارییەکانی پێست (بڵق، سووربوونەوە ، کێمکردن).
- ئاستی سۆندەی نەشتەرگەری و تاڵمیز یان بۆری هەناسەدان.
- میز، گەر نەخۆش تاڵمیزی بەکارهێنا لەبەر گیروگرفتی میزکردن.
- لە تاقیگادا بە هۆی تێستی PCR ەوە دەتوانین S. Aureus دەستنیشان بکەین.

پاکوخاوێنی رۆڵی سەرەکی دەبینێت لەبەربەستکردن و بڵاونەبوونەوەی ئەم جۆرە ستافیلۆکۆکەسە.
ئەم بەرگری لەخۆکردنەی ستافیلۆکۆکەس دژی ئەنتیبایۆتیك بووەتە هۆی ئەوەی تا پۆزەتیف بێت ئەوا پێویستە نەخۆش جودابکرێتەوە و رێگەی پێنەدرێت بچێتەوە ماڵەوە . هەندێکجار نەخۆش ماوەیەکی زۆر لە نەخۆشخانەدا دەمێنێتەوە، جا لەبەر ئەوە پێویستە:

- پزیشك و پەرستار و هەموو ئەو کەسانەی هاتوچۆی نەخۆش دەکەن یان چارەی نەخۆش دەکەن زۆر ئاگاداری خۆیان بن و جلی تایبەتی لە بەربکەن تا بەکتریاکە بە ژوورەکانی تردا بڵاونەکەنەوە.

- نەخۆش لەژوورێکدا جودابکرێتەوەو لێپرسراوانی پاکوخاوێنی یان کۆنترۆڵی نەخۆشییە درمەکان ئاگادار بکرێت لێی.
- بەهیچ جۆرێك پزیشكو پەرستار موستیلە، کاژێر، بازن لەدەست بکەن.
- پزیشك هەمیشە بەروانکەی پلاستیکی تایبەتی یەك جاران بەکاربهێنێت.
- چارەسەرکردنی MRSA زۆر گرانەو دەتوانین بڵێین نییە.
- ئەو کەسانەی لەو بەشەدا کاردەکەن پێش سەردانو پاش سەردانی نەخۆش دەستو پەنجەکانیان بە ئەلکهۆل پاکژبکەن.

نابێت ئەو راستییەشمان لەیادبچێت کەهیچ جیاوازییەك لەنێوان تووشبوون بەم بەکتریایە ئەگەر MRSA بێت یان نا نییە ؟ لە هەندێك باردا دەرمانی Fucidin + Rifampicin یان دەرمانی Vancomycin ئەنجامی باشیان داوە بە دەستەوە. تێبینی:

- دەرمانی Methicillin ئەنتیبایۆتیکێکە لە تاقیگادا دژی ستافیلۆکۆ کەسەکان بەکاردەهێنرێت.
- ئەو کەسەی جارێك تووشی MRSA ببێت بە هەڵگری بەکتریاکە دەدرێتە قەڵەم.
- هەر کاتێك ستافیلۆکۆکەس بەگری لەخۆی بکاتو لەتاقیگادا دەرمانی Isoxazolylpenicillin نەتوانێت ستافیلۆکۆکەس لەناو ببات ئەوسا نێوی MRSAی بۆ بەکاردەهێنرێت.

لە کۆتایی ساڵی 2003 دا پاش کۆبونەوەی ساڵانەی Infectious Disease Society of America (IDSA) کۆمپانیای (pfizer) ی دەرمان رایگەیاند کە لە ئەنجامی توێژینەوەکاندا بۆیان روونبۆتەوە کە دەرمانی Zyvoxid (linezolid) ئەم جۆرە ئەنتیبایۆتیکە کە سەر بە کۆمەڵە دەرمانی ئۆکسازۆلیدینۆنەکانە زۆر لە دەرمانی ڤانکۆمایسین بە کارترە بە مەرجێك لە رێگای خوێنهێنەرەوە و بۆماوەیەکی کورت بدرێت بە نەخۆش . بەم جۆرە دەتوانین بەشێکی زۆری ئەم جۆرە هەوکردنە چارەسەر بکرێت (5).

**سەرچاوەکان**

References
1.Andersson G, sergentedt M, Sundberg I, et al (red) Handbok för hälso-och sjukvårdsarbete, Landstings förbundet,Stockholm 1994.
2.Iwarson-Norrby,infektionsmedicin, epidemiologi,klinik och terapi Säve Förlag 1995 Göteborg Sida 92-94.
3.Läkemedels boken, 2003-2004, infektioner, antibiotika, sidan 52 apoteket, Sverige
4.Information, från läkemedelverket, årsgång 13. Nr 47. 2002. sidan 93-96
5.Diekema D. And Jonas R . Oxazolidinone antibiotics. Lancet 2001, vol 358 1975-82.

## کۆکە رەشە

یەکێکە لە نەخۆشییە درمە توندەکانی کۆئەندامی هەناسە، بەتایبەتی لە وڵاتە ڤێنکەکاندا، لەشاردا زێدەتر بڵاوە. لە هەندێك وڵاتدا نەخۆشییەکە گیروگرفتێکی گەورەی تەندروستی دانیشتوانە بە تایبەتی لەنێو منداڵی 1-8 ساڵاندا و تا ئەمڕۆش کۆکە رەشە نەخۆشییەکی ترسناکە بە تایبەتی کاتێك شیرەخۆرە تووشی بەکتریاکە دەبێت.

**هۆزانی**

هۆی سەرەکی کۆکە ڕەشە بەکتریای Bordetella pertussis یە زۆرجاران کورتکراوەی (BP) ی بۆ بەکاردەهێنرێت، سەر بە کۆمەڵی گرامنێگەتیڤی کۆکەس و درێژی لەنێوان نیو- یەك میکرۆندایە.

ئەوەی ڕاستی بێت 3 جۆر بەکتریای کۆکە ڕەشە هەیە و ئەمانەن:

B. Bronchiseptica, B. Parapertussis, B. Pertussis ، هەرچەندە بەکتریاکە ناچێتە نێوخوێنەوە بەڵام ژەهری بەکتریاکە ڕۆڵێکی گرنگ لە دروستبوونی نەخۆشییەکەدا دەبینێت چونکە نێوپۆشی کۆئەندامی هەناسە شوێنی چوونە ناوەوەی بەکتریاکەیە. پاش ساڵی 1960، کۆکە ڕەشە زۆربڵاوبۆتەوە بێئەوەی بەکتریای (BP) جوداکرابێتەوە. هاوکات چەندجۆرێکی سێرەمی ئەدینۆڤایرۆسی 1, 2, 3, 5, 6 دەستنیشانکراوە بەمەدا دەردەکەوێت کە لە وانەیە ڤایرۆسی تریش ببێتە هۆی کۆکە ڕەشە. کچان زێدەتر تووشی کۆکە ڕەشە دەبن وەك لە کوڕان.

**مێژوو**

- بایلۆو لەساڵی 1578 دا یەکەمجار لەپاریس لەسەر نەخۆشییەکەی نووسیوە.
- پاشتر سێدنی هام هۆی نەخۆشییەکەی نێونا پێرتوسس.
- بۆردێت لەساڵی 1906 دا ئەو بەکتریایەی جوداکردەوە کەدەبێتە هۆی کۆکە ڕەشە.
- لەم 30 ساڵانەی دوایدا پێکوتەی دژی نەخۆشییەکە بۆتە هۆی کەمبوونەوەی ڕێژەی مردن و نەخۆشکەوتن. بەڵام تا ئەمڕۆ کۆکە ڕەشە بۆ منداڵە نەکوتراوەکان (تەمەنیان لەژێر 2 ساڵانەوەیە) هەر ماوە.

**پەتازانی**

نەخۆشییەکە لەهەموو جیهاندا بڵاوە بێجیاوازی شوێنی جوگرافی و ئاوو هەوا، بەتایبەتی لە بەهارو زستاندا زێدەتر بڵاوە ، مرۆهەڵگری بەکتریاکەیە. ئەمڕۆ نزیکەی 50 ملیۆن کەس دووچاری نەخۆشییەکەن و ساڵانە نزیکەی 350 هەزار کەسیش بەنەخۆشییەکە دەمرن. ساڵانە لە ئەمێریکا نزیکەی 5000 - 6000 کەسی تۆمارکراو تووشی نەخۆشییەکە دەبن .

**ڕێگاکانی گواستنەوە**

بەکتریاکە ڕاستەوخۆ بە هۆی پرژەی پژمین یان کۆکەوە دەگوێزرێتەوە ، نەخۆشییەکە هێجگار درمە بە تایبەتی کاتێك بەکتریاکە لەسەر ڕووی ناوپۆشەکانی بۆریەکانی هەناسەیە. پاشتر مەترسی درمی کەم دەبێتەوە یان نامێنێت ، ئەوەی ڕاستی بێت درمی لە حەوتەم ڕۆژی تووشبوونەوە بەردەوامەو نزیکەی 3-4 هەفتە دەخایەنێت لەیەکەم پەیوەندی کردنییەوە بە نەخۆشەوە بەرەمەکانە (بەتایبەتی لەیەکەم هەفتەی ژیاندا) تووش دەبێت، چونکە بەرەمەکانە دژەتەنی دژی بەکتریاکە لە وێڵاشی دایکەوە وەرناگرێت. زۆربەی منداڵان پێش ئەوەی بچنە قوتابخانەی سەرەتایی تووشی نەخۆشییەکە دەبن ، لەوانەشە گەورەش تووش ببێت . هەرچەندە پاش تووشبوون بەکتریاکە بەرگری لەنێو لەشدا دروست دەکات و لەوانەیە مرۆڤ جارێکی دی تووشی نەخۆشییەکە ببێتەوە.

**نیشانەکان**

ماوەی کرکەوتنی بەکتریاکە لە نێوان 7 10 ڕۆژدایە، ناوەندی ماوەکە نزیکەی 21 ڕۆژە. ماوەی هاوبەشی نەخۆشییەکە لە تووشبوونەوە تا چاکبوونەوە شەش هەفتەیە. ماوەی دەرکەوتنی نیشانەکان

7-14ڕۆژە و سەرەتا نەخۆشییەکە بەسوکە کۆکە، لووت گیران، نەمانی ئارەزووی خواردن دەست پێ دەکات. بەرەبەیان و شەو نەرمە کۆکەیەکی هیشك لەسەرخۆ نەخۆش وەرس دەکات، هەرچەندە باری نەخۆش باشە بەڵام دەرمانی دژی کۆکە کارناکاتە سەر کۆکەی نەخۆش. پاشتر قۆناخی گەشکە دەردەکەوێت کە 2-4 هەفتە دەخایەنێت و کۆکەی کوتوپڕ نیشانەی سەرەکی نەخۆشییەکەیە. هەندێك پزیشك نیشانەکان دەکەن بەم چەند قۆناخەی خوارەوە:

1- قۆناخی هەوکردن ، نزیکەی 10 ڕۆژ دەخایەنێت ، نیشانەکان بریتین لەسووربوونەوەی لووت ، خوێنتێزانی گەروو، پژمین ، سوکە کۆکە ، تا، ئارەقە و لەش داهێزران.

2- قۆناخی کۆکەی کوتوپڕ، کۆکەیەکی توند نەخۆش دەگرێت و پاش هەموو کۆکینێك دەنگێکی وەکو قوقەی کەڵەشێر لە کۆتایی کۆکەکەوە دەبیسترێت. زۆرجاران لەکاتی کۆکەدا نەخۆش دەمی زۆر دەکاتەوە و زمانیش دەردەهێنێت.

هۆی شین بوونەوەی رووخساری منداڵ لەکاتی کۆکەدا دەگەڕێتەوە بۆ کەمبوونەوەی ئۆکسجین لەخوێنی موولوولە خوێنەکانی رووخساردا و هەندێکجار نەخۆش تووشی گەشکە دەبێت. بە گشتی نەخۆش (منداڵ) بێهێز و لاوازە، هەندێك منداڵ لە ئەنجامی توندی کۆکەکەدا قوڕ دەبن، یان میز و پیسایی بەخۆیاندا دەکەن. جاری وا هەیە نەخۆش لە 24 کاژێردا 20-30 جار تووشی کۆکەی توند دەبێت و هەر کۆکەیەك چەند چرکەیەك و 2-4 خولەکە دەخایەنێت.

**جۆرەکان بە پێی سووکی و توندی کۆکە ڕەشە:**

1- سووك ، لە گەورە و پیردا دەبینرێت

2- مامناوەندی ، ژمارەی کۆکەکان کەمترە و نەخۆش نزیکەی 20 جار لە ڕۆژێك دا دەکۆکێت و جاروباریش دەڕشێتەوە.

3- کوتوپڕ ، لە 24 کاژێردا نەخۆش 50-60 جار دەکۆکێت.

4- ترسناك، لەم جۆرەدا نەخۆش تووشی نزگەرەیەکی زۆر و گەشکە دەبێت.

**ئاڵۆزکارییەکان**

1- ئاڵۆزکارییە میکانیکییەکان ، گۆڕانی پەستانی نێو کەللەسەر ، ناوسك ، نێوەمناو، لەوانەیە ببێتە هۆی پچڕاندنی بۆریەکانی خوێن و خوێنبەربوونی مێشك ، نێوپۆشەکان و سنگ یان لەوانەیە ببێتە هۆی خوێن دانیشتن.

2- ئاڵۆزکارییەکانی هەناسەدان ، بۆریەسۆی پارەوەی سەرووی هەناسە ، گیروگرفتی گۆڕینەوەی ئۆکسجین و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و گیروگرفت لە هەناسەداندا.

3- مێشکەسۆ یان کۆئەندامی ناوەندی دەمار بە بەکتریای وەناق.

4- زۆرجار لووت و گوێ و گەروو دەسووتێنەوە.

5- گەر کۆکە ڕەشە بەباشی چارەسەرنەکرێت ئەوا لەوانەیە ببێتە هۆی چیکڵدانەسۆ.

**دەستنیشانکردن**

- نیشانەکانی نەخۆشییەکە ، بەپێی شێوەی کۆکە لەمنداڵدا.
- جوداکردنەوەی باکتریاکە بە ڕێگای سێرۆزانی PCR وە .

- تاقیگا، بەرزبوونەوەی ژمارەی خرۆکە سپییەکان (40- 60 هەزار/ملم سێجا) ، هەروەها بەرزبوونەوەی ٪80 لە لیمفەخانەکان.

**تێبینی**: زۆرجار بەرزبوونەوەی خرۆکە سپییەکان و لیمفەخانەکان لە بەرمەمکانەدا ئاساییە و نیشانەی نەخۆشی نییە!!

- چاندنی شلەی کونەلووت و نێو دەم بۆ دەستنیشانکردنی بەکتریاکە.
- جوداکردنەوەی بەکتریای شلەی ناو گەروو بە رێگەی ناوەندی Bordet-Gengou.
- تێستی ELISA زۆر بەسوودە.
- تێستی DNA hybridization یارمەتی دەستنیشانکردن دەدات.
- تێستی Florescent antibody test بۆ دژەتەنی DAF antibody لە چەند کاژێرێکدا ئەنجام دەدات بەدەستەوە.

**چارەسەرکردن**

- پێویستە نەخۆش لە ژوورێکی خاوێندا بحەوێتەوە و زوو زوو هەوای ژوورەکە بگۆڕدرێت ، چەند ژەمێکیش خۆراک بخوات.
- رۆژانە 40-50 ملگم / کگم کێش خەپلەی ئێریترۆمایسین بە 4 ژەم دەدرێت بە نەخۆش.

**تێبینی**: نابێت رۆژی 2 گرام زیاتر بدرێت بە نەخۆش ، هەروەها ئەمپیسیلین و تێتراسایکلین بەسوودن.

- دەرزی ئیمونۆگلۆبولین ئەنجامی باشی داوە بەدەستەوە (هەندێ توێژەر).
- پێویستە دەرمانی دژ بەکۆکە و رشانەوە بدرێت بەنەخۆش
- نابێت دەرمانی هێمن کەرەوەکان بە نەخۆش بدرێت چونکە لەوانەیە نەخۆش بخنکێنێت.

**خۆپاراستن**

- پێویستە نەخۆش جودابکرێتەوە و هەمیشە کەلوپەلی بەکارهێنراوی پاکژ بکرێت.
- پێویستە خۆراکوخواردنەوە بەرێکوپێکی بدرێت بەنەخۆش.
- زۆر پێویستە دەمولووت و گەرووی نەخۆش پاك بکرێتەوە و خاوێنیش رابگیرێت.

**پێکووتە**

کووتانی سیانەی (وەناق- کۆکە رەشە- دەردەکۆیان) بەم شێوەیە لە منداڵ دەدرێت:

- لە تەمەنی سێ مانگیدا 1 دەرزی لەماسولکەی منداڵ دەدرێت.
- پاش 30 رۆژ دەرزیەکی دی لەماسولکەی منداڵ دەدرێت.
- نزیکەی 30 رۆژ دوای دووەم دەرزی، یەك دەرزی دی لە منداڵ دەدرێت، بۆ بەهێزکردنی یەکەم کوتان لە تەمەنی 6 مانگیدا نیو ملیتر DTP لە منداڵ دەدرێت.

جارێکی دی بە مەبەستی بەهێزکردنی بەرگری لەش لە تەمەنی 18 مانگیدا نیو مللیلیتر DTP لەمنداڵ دەدرێت.

**تێبینی**:

**لە ئەمێریکا لە تەمەنی 2 مانگی و 4 مانگی و 6 مانگی دا کوتانی سیانەی لە منداڵ دەدرێت .**

**DTP** = Diphtheria and Tetanus Toxoids with pertussis vaccine.

**سەرچاوەکان**

References:
1.**Adam finnet al., Immunization**, In: Harisson, principles of internal medicine. Vol 1, 1991, 472-477.
2.**Andrescu, Viorica., Bordetella genus**., In. Medical Microbiology, Medical Edition. 1985
3.**Elisabet Reizenstein, Laboratory diagnosis of Bordetella** infection Karoliniska Institute, CDC Sweden. 1996.
4.**Ware, ST. Management of Whooping Cough**, Lancet, 1977, 11, 872.
5.**Taindel, CI. Whooping Ccough**, In: Infectious Diseases, Didac and Pedag Edition, 1980; pp 178-185.
6.**Standford T. Shulman et al.** The biologic and clinical basis of Infectious Diseases. Fifth eds. USA. 1997.
7.**Erik L. Hewlett., Bordetella Species**., In: Principles and practices of infectious diseases, 1995; 209. 20. 2078-84.
8.**Aoyama T, Takeuchi Y, Gota A, et al.**, Pertussis in adult Am J Dis Chil. 1992; 146: 163.
9.**Brone CV, et al., Epidemiology of pertussis**, Atlanta, 1977. J Pediatr. 1981. 98. 362
10.**Wardlaw AC, parton R, eds**. Pathogenesis and Immunity in pertussis, New York, John Wiley & sons; 1988.
11.**CDC. Recommended childhood** immunization schedule United States, MMWR, 1996; 45: 35-8.
12.**CDC. Recommended childhood** immunization schedule United States, MMWR, 1997; 2:35-3911.
13.**A-Paunescu-Podeanu, Principles for Medical Practics**., Vol 111 . Med Ed 1984.
14.**Melvin I. Marks and Jerome O. Klein**. Bacterial infections of respiratory tract. In Infectious Diseases of the fetus **newborn infant, 4th eds**. W. B. Saunders Company 1995; 22 891-898.
15.**Vaccination in the schoolage**, Vaccine AB., Sweden. 1996

# سییە سۆکان

**بریتین لە کۆمەڵێك نەخۆشی هۆی سەرەکییان میکرۆبی نەخۆشی بەخشە ، سییەکان تووشی سووربونەوە ، ئاوسان و سۆ دەبێت. ئەوەی شایانی باسە زۆرجاران سییەکانی مرۆڤ (بەتایبەتی لە وەرزە ساردەکاندا) دەکەونە بەر شاڵاوی میکرۆئۆرگانیسمەکان و تووشی سۆ دەبن. هەندێك پسپۆر سییەسۆکان دەکەن بە 4 گروپی سەرەکییەوە کە ئەمانەن : سییەسۆکانی نێو نەخۆشخانە ، دەرەوەی نەخۆشخانە ، سییەسۆکانی ئەو کەسانەی بەرگری لەشییان نزمبۆتەوە وئەو سییەسۆیانەی لە رێگای هەڵمژینەوە مرۆ تووشی دەکەن .**

**جۆرەکانی سییەسۆ** (13)

- سییە سۆی بەکتریای پنێومۆکۆکەس .
- سییە سۆی بەکتریای سترێپتۆکۆکەس 25-45٪ .
- سییە سۆی بەکتریای ستافیلۆکۆکەس .
- سییە سۆی بەکتریای هێمۆفیلوس ئینفلوەنزا 3-5٪ .
- سییە سۆی مایکۆپلاسما 5-10٪ .
- سییە سۆی ڤایرۆسی .
- سییە سۆی فونگی .
- سییە سۆی پنێومۆسیستی کارینی.
- سییە سۆی باسیلە گرامنێگەتیفەکان .
- سییە سۆی کلامیدیای Pneumoniae 1-3٪ .
- سییە سۆی کلامیدیای psittaci 1-3٪ .
- سییە سۆی لێگیۆنێلا 2-4٪ .
- سییە سۆی مایکۆبەکتریا (دەردەباریکە- سیل) .

ئەوەی شایانی باسە لەوسییە سۆیانەی سەرەوە تەنیا باسی گرنگترینیان دەکەین (a,b,c,d) وەلیٰ بە گشتی باس چارەسەرکردنی زۆربەیان دەکەین .

## سییە سۆی بەکتریایی

هۆی سەرەکی ئەم سییە سۆیە ئەمانەن: پنیومۆکۆکەس ، ستافیلۆکۆکەس ، ستریپتۆکۆکەس، کلیبسێلا، سالمۆنێلا، هایمۆفیلوس ئینفلوەنزا، کلوستریدۆم ، پسیۆدومۆناس ئایرۆجینۆس . زۆرجاران نەخۆش تەمەنداره (شەکرەدار، کۆکەدار ، ئەلکهولیستە) یان بەرگری لەشی زۆر کەمبۆتەوە و مرۆڤ کوتوپڕ نەخۆش دەکەوێت ، لەرز و تای لێدێت.

**گرنگترین نیشانەکان**

ئێهاتن ، سنگ ئێشان ، هیشکە کۆکە ، هەناسە سواری و تێکچوونی باری گشتی نەخۆش (ژانەسەر، لەش داهێزران ، بێخولقی). سییەسۆ بەکتریایەکان تەنیا لەچەند بارێکی تایبەتدا درمین دەنا درمی نیین.

**چارەسەرکردن**

بەپێی بۆچوون و قەبلاندنی جۆری درمەکە چارەسەر دەکرێت بۆ نموونە:

دژی پنیمۆکۆکەس ، بڕی 800 ملگم – 1 گم × 3 ژەم بۆ10 رۆژان دەدرێت بە نەخۆش. یان Erythromycin 2 ژەمی 500 ملگم (2–3 گم) رۆژانە بۆ 2 هەفتە دەدرێت بە نەخۆش.

- دژی ستریپتۆکۆکەس ، پەنسیلین لە رێگای دەم یان دەرزییەوە زۆر بە کارە .
- دژی ستافیلۆکۆکەس ،باشترە سیفالۆسپۆرینەکانی Cephalotin, Cefaman, Cefazolin, Cefuroxim لە شێوەی دەرزیدا بدرێت لە نەخۆش . هاوکات کلیندامایسین زۆر لەوانەی سەرەوە بەکارترە .
- دژی Haemophilus influenzae ، رۆژانە 3 ژەم 500 ملگم ئەمۆکسیسیلین دەدرێت بە نەخۆش.
- هەروەها دەتوانین دەرمانی (Cefuroxim (Zinacef بەکار بهێنین
- دژی Chlamydia ، رۆژانە 2 ژەم 500 ملگم Erythromycin بۆ 2–3 هەفتە دەدرێت بەنەخۆش.
- دژی Legionella ، رۆژانە 2 ژەم 500 ملگم Levofloxacin بە (iv) ، بۆ 3 هەفتە دەدرێت بە نەخۆش.
- دژی M. catarralis ، رۆژانە 500 ملگم Erythromycin بۆ 10 رۆژان دەدرێت بە نەخۆش.

## سییە سۆی ڤایرۆسی

ئەوەی شایانی باسە هەندێك ڤایرۆس لەمنداڵدا (Para influenza virus types 1, 2, 3, Influenza A virus) و لەگەورەدا (Influenza A. B virus Adenovirus types 4, 7) هێرش دەکەنە سەر کۆئەندامی هەناسەو سییەکان دەسووتێننەوە. زۆرجاران نەخۆشییەکان (نەخۆش لاوەکین) یان ئەنجامی تووندبوونی سییەسۆی ڤایرۆسی دی وەك مێکوتە یان سورێژەن.

بەگشتی نیشانە هاوبەشەکان بریتین لە: تالیهاتن ، لەش داهێزران ، هەندێك نیشانەی کۆئەندامی هەناسە. ژمارەی ئەو ڤایرۆسانەی جیاکراونەتەوە و ناسراوەتەوە زۆرن و تا ئێستا نازانرێت ئایا هەموویان دەبنە هۆی هەوکردن یان نا؟

**پەتازانی**

ئەوەی راستی بێت بڵاوی درمە ڤایرۆسییەکانی سییەکان بەندە لە سەر بڵاوی جوگرافی جۆری ڤایرۆسەکە لەو ناوچەیەدا، هەروەك لەڤایرۆسی ئینفلۆینزادا دەبینرێت. زۆرجاران هەوکردنی ڤایرۆسی لە قوتابخانە و سەربازگاکاندا بەرێژەی لە 50-80 ٪ دەردەکەوێت و هەندێکجاریش بڵاوی درمەکە لەسەر جۆری ڤایرۆسەکە بەندە. درمی ڤایرۆسەکان بەرزە ، بەرگری پاش درمەکە تایبەتە بە جۆری ڤایرۆسەکە و هەندێکجار ماوەیەکی کورت دەخایەنێت.

**نیشانەکان**

هەرچەندە هۆی سییە سۆی ڤایرۆس جیاوازن بەڵام زۆربەی زۆری نیشانەکانی سییە سۆی ڤایرۆس وەك یەکن. لە 65 ٪ ی بارەکاندا نیشانەکان لەپڕ دەردەکەون بەڵام وەك درمە بەکتریایەکان زۆر کوتوپڕ نین .

یەکەم نیشانەی لووت گیران، ئاوهاتنە خوارەوە بەلووتدا دەردەکەوێت. نیشانەی سەرەکی ئەم جۆرە درمانە بریتییە لەتای بەرز و نزم ، گیروگرفت لە هەناسەداندا، کۆکە نەخۆش ماندوو دەکات هیشك و بێ بەڵغەمە ، ژانکردنی گەرو ئازاری سنگ دەردەکەوێت ، تالیهاتن 1-2 هەفتە دەخایەنێت و هەندێکجار لە دوو هەفتە زیاترە و پاشان هێدی هێدی دەڕەوێتە و (لەمنداڵدا) نیشانەکانی تریش نامێنن ، هەندێکجار منداڵ تووشی هەناسە سوارییەکی توند و بەهێز دەبێت ، رووخسار شین هەڵدەگەڕێت یان نیشانەی پەردەسۆی مێشك دەبینرێت.

**تێبینی: نەخۆش تووشی هەناسە سواریی و شین بوونەوەی رووخسار نابێت ، هەرکاتێك ئەم دوو نیشانەیە دەرکەوت ئەوا دەبێت بزانین سۆکە بەکتریاییە و کێمی کردووە.**

**ئاڵۆزکارییەکان:**

بریتین لەکێمکردن (لەمنداڵ و بەرەممەکانەدا دەبینرێت).

**دەستنیشانکردن**

نیشانەکان ، ئێسکبەرداری ، نیشانەکان زۆر یاریدەی دەستنیشانکردن دەدات.

- لە تاقیگادا دەتوانرێت هۆی درمەکە جیابکرێتەوە بەڵام زۆرجاریش پێویست ناکات.

**چارەسەرکردن**

لەبەرنەبوونی دەرمانی ڤایرۆس کوژ ئەوا پێویستە ئەم خاڵانە لەبیر نەکەین:

- دەرمانی دژی تا و کۆکە و هێمن کەرەوەکان زۆر بەسوودن بۆ نەخۆش.
- هەندێکجار پێویستە خۆراك و ئاوی دڵۆپاو، ڤیتامین و سەرچاوەی وزە (کالۆری) بەخوێنهێنەردا بدرێت بە نەخۆش.

- تەنیا لەکاتی کێمکردندا ئەنتیبایۆتیك (دژە میکرۆب) بەکار دەهێنرێت.

**خۆپاراستن**

- بەکارهێنانی گاما گلۆبولین بە مەبەستی بەهێزکردنی لەش.
- پشت گوێ نەخستن و ئەنجامدانی بنەماکانی خۆپاراستنی گشتی دژی نەخۆشییە درمەکان.

## سییە سۆی مایکۆپلاسما

یەکێکە لە درمە کوتوپڕەکانی کۆئەندامی هەناسەدان ،چوار سەدە لەمەوبەر نێوی یەکەم هەوکردنی ناتایبەتی سییەکانی لێنرابوو. پاش جوداکردنەوەی مایکۆپلاسما گرنگی سییە سۆ بە مایکۆپلاسما دەرکەوت لە بەرئەوەی زۆرجار درمەکە سییەکان دەگرێتەوەونیشانەی سییەسۆی تایبەتی هەیە.

**هۆزانی**

ئەوەی راستی بێت مایکۆپلاسمای سییەسۆ ، ئەوانی دی میکرۆبێکی بچووکی یەك خانەین و شێوەیان زۆرە وەك ئەلقەیی، دەنکدار، چیلکەیی... تاد.

مایکۆپلاسماکان دیواری خانەیان نییە، بەڵکو تەنیا ناسکە پەردەیان هەیە کە بە میکرۆسکۆپی ئەلەکترۆنی دەبینرێت و تیرەیان لەنێوان 125-150 نانۆمیتردایە.

**تایبەتمەندییەکانی مایکۆپلاسما**

- مایکۆپلاسما دیواری خانەیان نییە و لە دیواریش دروست نەبووە (لە چاو بەکتریادا).
- پێویستییان بەخانەی زیندە نییە بۆ زێدبوون (لە چاو ڤایرۆسدا).
- هەردوو ناوکە ئەسیدی DNA, RNA یان هەیە (لە چاو ڤایرۆسدا).
- تێتراسایکلین ، ئێریترۆمایسین و دۆکسیسیلین مایکۆپلاسما دەکوژن.

**جۆرەکانی مایکۆپلاسما**

پۆلی (Mollicutes) سێ خێزان دەگرێتەوە کەئەمانەن:

- خێزانی Mycoplasmataceae.
- خێزانی Acholeplasmataceae.
- خێزانی Spiroplasmataceae.

**پەتازانی**

سییە سۆکە لەهەموو جیهاندا بڵاوە، هەندێکجار تەشەنە دەکات. هۆی لە 14-15 ٪ سییەسۆکان مایکۆپلاسمایە و لەزستان و بەهاردا زێدەتر دەر دەکەوێت ، هەندێك جار 10 جاران لە سییەسۆی بەکتریایی زێدەترە ، سەرچاوەی درمەکە مرۆڤی نەخۆشە یان هەڵگری مایکۆپلاسمایە.

**رێگاکانی گواستنەوە**

- راستەوخۆ، لە رێگای پرژەی نێو دەمەوە بەهەوادا دەگوێزرێتەوە .
- بە دەگمەن بە هۆی کەلوپەلی پیسی تازە بەکارهێنراوی نەخۆشەوە دەگوێزرێتەوە.

**درمی**

درمەکە زۆر بەرزە گەر لەخێزانێکدا یەکێك نەخۆش بێت (بەتایبەتی منداڵ) ئەوا لە 80-85 ٪ ئەوانی دی تووش دەکات. ماوەی درمی نزیکەی 10 رۆژە ، هەندێکجار 3-4 هەفتەیە. پاش تووشبوون مرۆڤ بەرگریەکی کورت یەك ساڵ ، چەند ساڵێك دروست دەکات و لەوانەشە هەوکردنەکە دەربکەوێتەوە.

**نیشانەکان**

ماوەی کرکەوتنی هەوکردنەکە لەنێوان 8-12 رۆژدایە ، سەرەتا نەخۆشییەکە وەك ئینفلونزا (بە دەگمەن لەپڕ نیشانەکان) لە ئاستی بۆریە هەوایەکانی سەرەوەدا دەردەکەوێت ، پاشتر سی پۆشەکان تووش دەکات. زۆرجاران تەمەنی نەخۆش لەژێر 50 ساڵانەوەیە.

**ماوەی دەرکەوتن:** تالێهاتن (38-40 پلە) ، لەرز (مامناوەندیە) ، سەرەتا 2-3 هەفتە هیشکە کۆکە (100 ٪) و پاشتر شێدارە و بەڵغەماوییە، نەخۆس هەست بە ماندووبوونی زۆردەکات (تواناى کارکردنی نامێنێت) . بەدەگمەن 10 ٪ بەڵغەم (گروێسك) ەکە خوێناوییە ، ژانەسەر (زۆر توندە) ، شێوانی باری گشتی نەخۆش (74 ٪) سوکە ئازار (45 ٪)، گرانی قووت دان (40-50 ٪) ، لووت گیران ، ژانەسەر ، ئازاری سنگ (25-70 ٪). هەناسە سواری (لە منداڵدا) زۆر توندە . لە پرسیارکردن و تێروانیندا پزیشك هەندێك نیشانەی دی (کە یاریدەی دەستنیشانکردنی کلینیکی نەخۆشییەکە دەکەن) دەست دەکەوێت.

**رێڕەوی نەخۆشییەکە**

بە گشتی باشە و هەندێکجار مەترسییەکانی هەوکردنی دەمار و خوێن دەردەکەوێت ، گەر لەکاتی خۆیدا هەوکردنەکە بە ئەنتیبایۆتیك چارەسەر نەکرێت ئەوا ماوەیەکی درێژتر دەخایەنێت یان لە 1 ٪ دا نەخۆش دەمرێت.

**جۆرەکانی**

- زۆربەی بارەکانی هەوکردنەکە مامناوەندین یان هەندێکجار گرانە. هەندێك جاری دی ئەندامەکانی دی دەگرێتەوە ، وەك:
- چیکڵدانۆسۆی مایکۆپلاسمی.
- لووەسۆی لای گەروو.
- لە 25 ٪ پێست، خوران و بلۆق و لیر دەردەکەوێت، (دەردی ستیڤن – جۆنسۆن).
- لە 14-45 ٪ جومگە سۆ.
- گوێچکەسۆ.
- لە 4-5 ٪ دڵ، ناوپۆشەسۆی دڵ.
- لە 14-44 ٪ نیشانەی گەدە و ریخۆڵە، زەردوویی، پەنکریاسەسۆ دەردەکەوێت.
- لە 5-7 ٪ نیشانەی دەماری (مێشکە پەردەسۆ، مێشکەسۆ، ئیفلیجی دەمارەکانی کەللەسەر، ئیفلیجی دی).

**دەستنیشانکردن**

- نیشانەکانی درمەکە (ماندوویەتی نەخۆش) نیشانەی سەرجێیی.
- تێستی سیڕۆزانی PCR دەتوانێت لە ماوەی 1-2 رۆژدا دەستنیشانی مایکۆپلاسما بکات.
- بەرزبوونەوەی دژەتەنی تایبەت دژی مایکۆپلاسما.
- رێگای چاندن بە تێستی ئیمیونوفلوریسنت مایکۆپلاسما دەناسێتەوە.
- تێستی ELISA و تێستی سیڕۆزانی بۆ مایکۆپلاسما.

**چارەسەرکردن**

- چارەسەرکردنی نیشانەکان.
- چارەسەرکردنی نیشانەکانی دەرەوەی سییەکان (گەر دەرکەون).
- بڕی 500 ملگم دەرمانی Erythromycin ، 2 جاران بۆ 10 رۆژان دەدرێت بە نەخۆش.

دەرمانی Doxyferm (Doxycylin) یەکەم رۆژ 2 حەپلەی 100 ملگم و پاشتر رۆژی 1 حەپلە بۆ 8 رۆژان دەدرێت بەنەخۆش.

**خۆپاراستن**

**لە بەرئەوەی نەخۆشییەکە درمییە زۆر پێویستە (لەماڵەوە یان لە نەخۆشخانەدا) نەخۆش جودابکرێتەوە گەر لەخێزانێکدا یەکێک تووش بوو ئەوا پێویستە هەمووان تێتراسایکلین بە مەبەستی خۆپاراستن بخۆن.**

**جیاوازی نێوان سییەسۆ بە پنێومۆکۆکەس و سییەسۆ کانی دا:**

| **هەوکردن بە پنێومۆکۆکەس** | **هەوکردن بە مایکۆپلاسما و کلامیدیا** |
|---|---|
| نەخۆش تەمەندارە | تەمەنی لەنێوان 15-45 ساڵاندایە |
| لەپڕ نەخۆش تایەکی بەرزی لێدێت | هێدی هێدی نیشانەکان دەردەکەون |
| لەرزووتا | ژانەسەر ، سووربوونەوەی نێولووت و گەروو و قورگ دەر دەکەوێت |
| کۆکەیەکی مەیلە و تەڕ | هیشکە کۆکە |
| بەرزبوونەوەی خڕۆکە سپییەکان (لیۆکۆسایتەکان) | بەرزبوونەوەی خڕۆکە سپییەکانی خوێن |

**لە کاتی دومەڵی سییەکاندا تەنیا بۆری هەوابین (Brohoscopy) دەتوانێت دەستنیشانی ئاشینەکە بکات.**

**لە سوکە (دومەڵ) ئاشیندا: رۆژانە 3 × 3 گم Benzathine penicillin G یان 3 × 600 ملگم Clindamycin لەخوێنهێنەرەوە دەدرێت بەنەخۆش.**

**لەدومەڵی سەخت دا: هەردوو دەرمانەکەی سەرەوە لەخوێنهێنەرەوە دەدرێت بەنەخۆش.**

**سییە سۆی منداڵ بە پێی تەمەن :**

- تەمەن لە نێوان 0-1 مانگاندا بەکتریای ستریپتۆکۆکەسی جۆری B
- تەمەن لە نێوان 15 رۆژ و 12 مانگاندا بەکتریای C.trachomatis
- تەمەن لە نێوان 6-12 مانگاندا ڤایرۆسی Respiratory syncytial virus (RSV) .
- تەمەن لە نێوان 2 مانگان و 4 ساڵاندا بەکتریای S.aureus .
- تەمەن لە نێوان 6 مانگان و 5 ساڵاندا بەکتریای H.influenza

- تەمەن لە نێوان 1-15 ساڵاندا بەکتریای پنیۆموکۆکەس .
- تەمەن لە نێوان 5-15 ساڵاندا بەکتریای مایکۆپلاسما .
تێبینی: بۆ سییە سۆی پنیۆمۆسیستی Jiroveci بکە .

**سەرچاوەکان**

References
1.Stephen G. Baum., Mycoplasma pneumoniae and a typical pneumoniae: In Principles and practices of infectious diseases, Vol 1, 1995; 161: 1704-1713.
2.Chanock RM. Mycoplasma infection in man., N. Eng. J. Med 1965; 273 1199
3.Foy HM, Aleksander ER. Mycoplasma pneumoniae diseases in childhood. Avd Pediatr. 1969; 16: 301.
4.Wallace A. Clyde, Jr. Mycoplasma Infections., In: Harrisons Priciples of Internal Medicine, 12th eds. 1991; 104: 763-65.
5.Broughton RA: Infectious due to mycoplasma pneumoniae in childhood. Ped Infec. Dis J 5: 71. 1986.
6.A-Paunescu-Podeanu., Principles for Medical Practics., Vol 11., Med eds 1984
7.Noah ND. Mycoplasma pneumoniae in the United Kingdom., 1967; 73 Br Med. J. 1974; 2: 544.
8.Baum SG., Mycoplasma infections. In: Wyngaarden JB. Smith LH Jr, Benneett Jc. Eds Cecil text book of Medicine. 19th ed. Philadelphia: WB Saunders 1992; 1615.
9.Ponka A. Carditis associated with Mycoplasma pneumoniae infection Acta Med. Scand 1979, 11: 1.
10.Furiolij. Et al. Mycoplasma pneumoniae infection. Manifestation. Arch Feac Pediatr. 1985; 42 313.
11.Mansel JK et al. Mycoplasma pneumoniae. Pneumoniae Chest 1989. 95-639
12.Åke Örtqvist, Jonas Hedlund, pneumoni, Empyem och Lungabscess-Handlaggning av vuxna pneumonipatienter. Inf. Klin. KS. 010103 (Instruktionspärmen).
13. Iwarson-Norrby, Infektionsmedicin, Epidemiologi, klinik, terapi, Sverige 2004.

## سییە سۆی لیگیۆنیلا

سییە سۆیەکی بەکتریاییە بە هۆی بەکتریای لیگیۆنێلاوە . باکتریاکە سەر بە گرووپی گرامنێگەتیڤەکانە ، هەواییە (بە هۆی هەواوە دەگوێزرێتەوە) ، شێوەیەکی چیلکەیی هەیە . تا ئەمڕۆ 40 جۆری هەیە و نزیکەی 57 جۆری سیرەمی لێ ناسراوەتەوە . گرنگترینیان کە مرۆ تووشی سییەسۆ دەکات بریتییە لە بەکتریای Legioella Pneumophila (واتە ئەوەی سییەکانی خۆش دەوێت) . ئەوەی شایانی باسە یەکەمجار لە ساڵی 1977 دا لە سەر بەکتریاکە نووسراوە . هەرچەندە بەکتریاکە لە سروشتدا هەیە و لە نێو خۆڵ و ئاودا دەژی بەڵام بە هۆی ئاوەوە بڵاودەبێتەوە .

- تەمومژی گەرماوکە بە بەکتریاکە پیس بووبێت هۆی سەرەکی تووش بوونە. بەڵام گەر مرۆ ئاوی پیسبوو بخواتەوە ئەوا مەترسی نییە بەڵام مەترسییەکە لە هەڵمژینی هەوای پیسبوو بە بەکتریاکەدایە .
- بەکتریاکە لە سەرخۆ دەمرێت .
- لە پلەی 40 دا باش دەژێت و زێددەکات .
- لە پلەی 50 دا چەند کاژێرێك دەژی .
- لە پلەی 60 دا نزیکەی 10 خولەك دەژی .
- لە پلەی 70 دا یەك خولەك دەژی .

گەر مرۆ چەند رۆژێك (لە هاویندا) ماڵەکەی بە جێبهێڵێت و بەلوعەکانی ئاوی ماڵەکە بگیرێتەوە و پاشتر کاتێك دەگەڕێتەوە بەلوعەکان دەکاتەوە (بەکتریاکە لە دەمی بەلوعەکاندا زێدیان کردووە) لە گەڵ یەکەم دلۆپدا بەکتریاکە دەچێتە نێو هەواوە و لە گەڵ هەناسەوەرگرتندا مرۆ بەکتریاکە هەڵدەمژێت پاشتر دەگاتە سییەکان سۆی پێ دەکەن .

مردن

هەرچەندە تا ئەمڕۆش بە باشی چارەسەری سییەسۆکە دەکرێت و ئەنتیبایۆتیک بەکتریاکە دەکوژێت بەڵام ڕێژەی مردن دەگاتە لە 10-15٪ .

تووشبون

بە گشتی ماوەی کرکەوتنی بەکتریاکە لە نێوان 5-6 ڕۆژدایە و هەندێک جار دەگاتە 2-10 ڕۆژ . مرۆ لە ڕێگای هەناسە وەرگرتنەوە لە هالاوی ئاوی ماوە (قەتیسماو) ی نێو دەمی بەلوعەی ماڵەکانەوە دەگاتە سییەکان . ئەو کەسەی تووشی ئەم سییەسۆیە دەبێت ڕاستەوخۆ یەکێکی دی تووش ناکات و تا ئەمڕۆ هەڵگری تووڵانی سییەسۆکە تۆمارنەکراوە . گەر مرۆ لە ڕێگای ئاوەوە تووشی باکتریاکە ببێت ئەوا مەترسییەکەی ئەوەندە نییە وەك لە ڕێگا هەواییەکەی .

نیشانەکان

سەرەتا نەخۆش تایەکی بەرزی بەهێزی لێدێت ، ژانەسەر و ژانە ماسولکە شی لە گەڵدایە .

زۆرجارنەخۆش تووشی سکچوون دەبێت . هەندێک جار نیشانەکانی سییە سۆکە زۆر توندن بە تایبەتی کاتێک تووشی مرۆیەك دەبێت کە بەرگری لەشی زۆر نزمە .

دەستنیشانکردن

- ناسینەوەی بەکتریاکە لە نێو شلەی نێو بۆرییەکانی هەوادا یان دۆزینەوەی ئەنتیجێنی بەکتریاکە لە میزی نەخۆشدا .
- لە ڕێگای تێستی PCR و ئیمونۆفلۆرێسچێنت ەوە دژەتەنی دژی باکتریاکە دەناسرێتەوە .

چارەسەرکردن

هەرچەندە تا ئەمڕۆ هیچ کوتانێك دژی ئەم سییە سۆ بەاکتریاییە نییە بەڵام ئەنتیبایۆتیکی کاریگەر هەیە و بەکتریاکە لە نێو دەبات گرنگترینیان بریتین لە سێفالۆسپۆرینەکان ، پەنسیلین ، تێتراسایکلین و ئێریترۆمایسین . نابێت ئەو ڕاستییەشمان لە یاد بچێت کە هەرچەندە ئەنتیبایۆتیك بەکتریاکە دەکوژێت وەلێ لەوانەیە سییە سۆکە مرۆ بکوژێت .

خۆپاراستن

پێویستە پاش گەڕانەوە بۆ ماڵەوە ڕاستەوخۆ ئاوی نێوبەلوعە بەکارنەیەت بەڵکو دەبێت کەمێك ئاوی لەبەر بڕوات پاشتر بەکاربهێنرێت و لە کاتی کردنەوەی بەلوعەکەدا سەریش بەسەر بەلوعەدا شۆر نەکرێتەوە تا ئەو هەوایەی یەکەم جار لە دەمەکەوە دێتە دەرەوە هەڵنەمژرێت ، پێویستە پێش کردنەوەی بەلوعەکان دەمەکانیان بە پاکژکەر پاك دەکاتەوە .

سەرنج

جۆرێکی دی نەخۆشییەکە هەیە و بە (تای پۆنتیاك) ناسراوە ، نیشانەکانی وەك ئینفلوەنزا وایە .

سەرچاوەکان

1.www.smi.se © 050520.09.35.
2.www.who.int. © 050510. 09.09.
3.www.cdc.gov © 050412. 12.33.
4.www.boverket.se © 050405.14.45.

# بەشی سێیەم

## نەخۆشییە بەکتریاییەکان

1- دەردەکۆپان
2- ڕەشەگرانەتا
3- لاڕەشە (گانگرین)
4- بروسێلا (تای مالتا)
5- وەناق
6- گازگرتنی گیانەوەر

## دەردە کۆپان

یەکێکە لە نەخۆشییە درمە بەکتریاییە کۆنەکان بە ڕێژەی جیاواز لە کوردستاندا بلاوە. زاراوەی پزیشکی نەخۆشییەکە لە نێوی لاتینی Tetanus وەرگیراوە بە مانای گرژبوون دێت . دەردەکۆپان نەخۆشییەکی درمی نییە .

**هۆزانی**

بەکتریاکە بەنێوی کلۆسترۆدیۆم تیتانی لەخێزانی Bacillaceae یەو سەر بەکۆمەڵی گرامپۆزەتیڤە. بەکتریاکە بزێزو و لە شێوەی دەرزی سەرخڕدایە و زۆر بەرگەی سروشت دەگرێت ، بەساڵ لە ڕووناکیدا دەژی و تەنیا مانگێك بەرگەی ڕووناکی ڕۆژ دەگرێت. میکرۆبە چیلکەییەکە (باسیلێکە) 2 مانگ بەرگەی ئەلکهول و پاکژکەرەوەکان دەگرێت. بە کولاندن لە 100 پلەی سەدی دا نزیکەی چارەکە کاژێرێك دەژێت. بۆ دلنیابوون بە کولاندن لە 120 پلەی سەدی دا بەکتریاکە لە 15 خولەکدا دەمرێت. بەکتریاکە ژەهرێکی زۆر بەهێز دەردەدات (چارەکێك یان نیو ملگم مرۆڤ دەکوژێت) و زۆر کاردەکاتە سەر کۆئەندامی دەمار. نابێت ئەو ڕاستیەشمان لەیاد بچێت کە بەکتریاکە بەزۆری لەخاکو خۆڵ، باخچە، تەپو و تۆزی شەقامەکانیشدا هەیە. بەکتریاکە لەشوێنی چوونە ناوەوەی دا (لە دەمی برینەکەدا) زێد دەبێت و توانای ئەوەی نییە هێرش بکاتە سەر بەشەکانی تری لەش !.

**مێژوو** (2، 8)

- نەخۆشییەکە لەسەردەمی (هیپۆکرات) و (ئەریتایۆس) هوە ناسراوە.
- چارلس بێل لەساڵی 1824 دا بە وێنە باسی سەربازێکی پیشاندا کەدەردەکۆپانی بوو.
- پۆلاند لەساڵی 1851 دا 72 نەخۆشی تۆمارکراوی راگەیاند.
- لە ساڵی 1884 دا لەتاقیگادا گۆش کرا.
- ولیام گۆێرس لەساڵی 1888 دا هەوکردنی کۆئەندامی دەماری پیشاندا کە نیشانەی سەرەکی سۆکە گرژبوونەوەی ماسولکەکانی لەشی نەخۆش بوو.
- کیتاساتۆ شیباسابورۆ لەساڵی 1889 دا لەئینستیتوتی پاکوخاوێنی-بەرلین میکرۆبەکەی (باسیلەکەی) جوداکردەوە.

- فابیر لەساڵی 1890 دا ژەهری باسیلەی دۆزییەوە.
- بیرهنگ و کیتاساتۆ لەساڵی 1890 دا دژە ژەهری باسیلەکەیان جودالکردەوە.
- رۆواکس و ڤایلارد لەساڵی 1893 دا سیرەوی دژی دەردەکۆپانیان بۆ خۆپاراستن بەکار هێنا.
- رامۆن لەساڵی 1925 دا پرۆگرامی بەرگری چالاکی دەردەکۆپانی ئەنجام دا کەبووە هۆی کەمبوونەوەی رێژەی مردن لە جیهاندا.

**پەتازانی**

دەردەکۆپان لەهەموو جیهاندا بڵاوە و بەپێی بڵاوی بەکتریاکە نەخۆشییەکە بڵاوبۆتەوە، بەڵام لەناوچەکانی هێڵی ئیستیوادا زێدەتر بڵاوە. ئەو شوێنانەی زیاتر ئاژەڵی تێدا بەخێودەکرێت مەترسی لە ناوچەکانی دی زێدەترە.

ئەوەی راستی بێت نەخۆشییەکە زێدەتر لە نێوان مانگی مای- سەپتەمبەر
دا دەردەکەوێت چونکە لەو مانگانەدا ئاووهەوا گەرمترە ، ئێستاش بەلایەنی کەمەوە ساڵانە ، یەك ملیۆن کەس تووشی دەردەکۆپان دەبێت. واتە لەهەر 100 هەزار کەس 18 کەس تووشی بەکتریاکە دەبن. رێژەی مردن لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا دەگاتە نزیکەی لە (20 ٪) بۆ هەر 100 هەزار کەس.

**رێگاکانی گواستنەوە**

- پەیوەندی راستەوخۆ لەگەڵ خاك و تەپۆتۆزی پیس بوو بە بەکتریاکە.
- یان چوونە ناوەوەی بەکتریاکە لەبرینی پیس و ناوپۆشەکانەوە (بە تایبەتی برینی قوڵ لەکاتی جەنگ دا).

**نیشانەکان**

ماوەی کرکەوتنی باسیلەکە لە نێوان 3-30 رۆژدایە و زۆرجار ماوەی کرکەوتنی باسیلەکە لەسەر کوتوپری سۆی دەردەکۆپان بەندە ، واتە تاماوەی کرکەوتنی بەکتریاکە کورت بێت ئەوا دەردەکۆپان کوتوپرترە. هەندێکجار لەپڕ یان هێدی هێدی ئەم نیشانانە لە نەخۆشدا دەردەکەوێت. لەئاستی برینەکەدا نەخۆش هەست بە سووربوونەوەی برینەکە دەکات ، خەواڵوویی نەخۆش شپرزە دەکات ، گرژبوونی ماسولکەکان واله نەخۆش دەکات کە نەتوانێت دەم بکاتەوە.

پاش ئەم نیشانە گرنگە هەموو ماسولکەکانی لەشی نەخۆش گرژدەبێتەوە. رووخسار شێوەی پێکەنینێکی زۆرلێکراوی وەردەگرێت (گرژبوونی چرچەکانی ناوچەوان ، نیوەی پێڵوی سەرەوەی چاو و ئەم لاولای دەم داخراوە). گرژبوونەوەی ماسولکەکان زۆر بەئازارن و دەبێتە هۆی گرژبوونەوەی ماسولکەی گەروو، زێدبوونی ژمارەی لێدانی دڵ، هەناسەدان تووشی گیروگرفت دەبێت . لەم بارەدا رووخساری نەخۆش شین دەبێتەوە ، هەندێك جار لەبەر کۆبوونەوەی لیك و تفی نێو گەرووەوە نەخۆش خەریکە بخنکێت.

زۆرجاران ماوەی نێوان تاوی گرژبوونەکان کورتە یان درێژە ، و لەکاتی گرژبوونەکاندا نەخۆش بە ئاگایە. هەندێکجاری دی لە کاتی گرژبوونی ماسولکەکاندا نەخۆش زمانی خۆی دەگەزێت. هەندێکجاری دی نەخۆش تووشی گرفت دەبێت ، بەسەخت میزی بۆ دەکرێت ، ئارەقە دەکاتەوە و هەندێکجاریش تای لێدێت.

**جۆرەکانی دەردەکۆپیان**

- دەردەکۆپیانی گشتی، لەم بارەدا گەر گرژبوونەوەکە گشتی بێت کوتوپڕی نەخۆشییەکەش زێدەترەو لە 48 کاژێر کەمتردا گرژبوونەوەکان دەردەکەوێت . ئەمیش شێوەیەکی کوتوپڕ ، سوك و نیمچەکوتوپڕ وتولانی هەیە.

- دەردەکۆپیانی تازەبوو ، یەکێکە لە شێوە کوتوپڕە ترسناکەکانی نەخۆشییەکە ، هەندێکجار بەکتریاکە لە پەتکی ناوکەوە (پاش ناوك بڕین) دەچێتە ناوەوەو منداڵی تازە لەدایکبوو تووش دەبێت. باسیلەکە لە 3-15 رۆژدا کرداکەوێت ، بەرەمەکانە ناتوانێت دەمی دابخات و مەمك بمژێت ، لە پڕدا نیشانەکانی دیش پەیدادەبن. لە 50-90 ٪ ی ئەو منداڵانەی کە تووشی باسیلەکە دەبن دەمرن.

- دەردەکۆپیانی شوێنەکە ، گەر باسیلەکە هەموو ڕوومەت بگرێتەوە ئەوا کاردەکاتە سەر دەماری ڕووبزوێن (ژمارە 7) و دەبێتە هۆی ئیفلیجی دەمارەکە و ماسولکەکانی ڕوومەت. هەندێکجار باسیلەکە دەماری چاو دەگرێتەوە و دەبێتە هۆی ئیفلیجی چاو.

لەساڵی 1917 دا Berard و Lemiere لەسەر جۆرێکیان نووسیوە کە باسیلەکە مێشك دەگرێتەوە پاشتر نەخۆش تووشی گیروگرفتی دەروونی دەبێت.

**تێبینی:**

**پاش تووشبوون نەخۆشییەکە بەرگری هەمیشەیی لە لەشدا بەجێ ناهێڵێت لەبەرئەوە لەوانەیە مرۆ دووبارە و سێ‌بارە تووشی دەردەکۆپیان ببێتەوە.**

**دەستنیشانکردن**

- بەپێی نیشانە گرنگەکان ، ڕووخساری بە زۆر پێکەنیناوی و بوونی برینێك دەتوانرێت دەستنیشانی دەردەکۆپیان بکرێت.

- باسیلەکە بەچاندن جودا دەکرێتەوە. (لە 100 / میکرۆب جیاناکاتەوە).

**ئاڵۆزکارییەکان**

- جێگیرنەبوونی پەستانی خوێن و لێدانی دڵ.

- سییەسۆو گیروگرفتی بۆری هەرس.

- تێکچوونی ئێسك ، بەتایبەتی خواربوون یان شکاندنی ئێسکی بڕبڕەی پشت.

**ڕێژەوی دەردەکۆپیان**

گەر نەخۆشییەکە لە کاتی خۆیدا چارەسەر نەکرێت ئەوا ڕێژەی مردن (لە وڵاتانی جیاوازدا) دەگاتە نێوان 41-70 ٪، لە ئەوروپادا ڕێژەکە 33-45 ٪ ، لە ئەمێریکادا ڕێژەکە لە نێوان 45-55 ٪ دایە. کاری ژەهری باسیلەکە لەسەر کۆئەندامی ناوەندی دەماری نەخۆش ، ناهاوسەنگی شلەی لەش ، تووشبونی خوێن ، کەمبوونەوەی ئۆکسجینی نێوخوێن و زێدبوونی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دەبێتە هۆی مردنی نەخۆش بە خنکاندنی میکانیکی.

**چارەسەرکردن**

هەرچەندە لەم ساڵانەی دواییدا گۆڕانکاری زۆر لەچارەسەرکردنی دەردە کۆپاندا کراوە ، تائەمڕۆ ڕێژەی مردن زۆر نەگۆڕاوە. پێویستە چارەسەکردن بە پێی (سووك، مامناوەندی یان کوتوپڕ) ی بێت، هەروەها پێویستە لە جۆری مامناوەندی و کوتوپڕدا نەخۆش لە نەخۆشخانە چارەسەربکرێت.

لەم بارانەدا پێویستە ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبیر نەکرێت:

1- کردنە دەرەوەی بەکتریاکە لە لەش تاوەکو نەهێڵێن زیاتر ژەهر دەربدات.

2- هاوسەنگکردنی ژەهری بەکتریاکە بەدژە ژەهر.

3- هێمنکردنەوەی نەخۆش و دامرکاندنەوەی گرژبوونی ماسولکەکان.

4- پاککردنەوەی گەروو و بۆریەکانی هەوای نەخۆش.

5- پڕکردنەوەی ناتەواوی لەش بەشلە ، ئاو ، ڤیتامینەکان و کانزاکان.

**دەرمان**

پێویستە نەخۆش لەژوورێکی بێدەنگ و ئارامدا دابنرێت و هیچ شتێك نەخۆش وەرس نەکات. پاشان سۆندەیەکی باریك لەکونی لووتەوە دەکرێت ناو گەدە بۆ خۆراك وەرگرتن ، هاوکات پێویستە تاڵمیز لە کونی میزی نەخۆشدا دابنرێت تاکو نەخۆش بە رێکوپێکی و بێگیروگرفت میز بکات.

هەروەها پێویستە نەخۆش رۆژ و شەو لە ژێر چاودێری پزیشك و پەرستاردا بێت و هەرگیز نابێت نەخۆش بەتەنیا بەجێ بهێڵرێت. پێش هەموو دەرمان بەکارهێنانێك پێویستە سێرەوی دژی ژەهری باسیلەکە بدرێت بەنەخۆش ، ئەویش دەرزییەکی 2- 3 هەزار یەکەیی بۆ منداڵ و دەرزییەکی 20 هەزار یەکەیی بۆ گەورە. هەندێك پزیشك وا پێشنیار دەکەن دەرزیەکی 10 هەزار یەکەیی لەخوێنهێنەرەوە بدرێت بە نەخۆش چونکە هێشتا ژەهری سەرخانەکان نەنیشتووە و لەخوێندا دەجوڵێت بەو هیوایەی ژەهرەکە هاوسەنگ بکرێت.

باشتر وایە تێستی فرەهەستیاری دژی ژەهر بکرێت ئەوسا یان لە ماسولکەوە یان لەخوێنهێنەرەوە دەرزیەکە بدرێت لە نەخۆش. دەرزی ئیمونۆگلۆبولینی تایبەتی دژی دەردە کۆپان بەخێرایی ژەهری باسیلەکە هاوسەنگ دەکات بۆیە پێویستە دەرزییەکی 3-6 هەزار یەکەیی لە ماسولکەی نەخۆش بدرێت. پێویستە لە 24 کاژێردا 2- 4 ملیۆن یەکە پەنسیلین لەماسولکەی نەخۆش بدرێت. هەروەها پێویستە هەموو 6 کاژێرێك (ماوەی 10 رۆژان) یەك ملیۆن یەکە پەنسیلین لەخوێنهێنەری نەخۆش بدرێت. گەر پێویستی کرد ئەوا دەتوانرێت ئەنتیبایۆتیکی دی لە گروپی Cephalosporin بدرێت لەنەخۆش.

**هێورکەرەوەکان**

ڤالیۆم زۆر بەسودە بۆ نەخۆش ، چونکە دەبێتە هۆی هێمن کردنەوە و کەمبوونەوەی کوتوپڕی گرژبوونەوەی ماسولکەکان . دەتوانرێت 40-80 ملیگرام فینۆباربیتاڵ لەماوەی 24 کاژێردا لەگەڵ ڤالیۆمدا بدرێت بە نەخۆش.

گرنگترین کار کە زۆرجار پێویستە ئەنجام بدرێت بریتییە لە کونکردنی بۆری هەوا لە ئاستی ملدا تا نەخۆش بە ئاسانی هەناسە بدات و بە باشی بۆریەکانی هەوا پاك بکرێتەوە و هەروەها ئۆکسجینیشی پیادا بکرێتە نێو سییەکان، پێویستە: رۆژانە 3-6 لیتر شلەی خۆراکی و ڤیتامین و ئاوی کانزایی بدرێت بە نەخۆش. رۆژانە 3000 کالۆری وزە بدرێت بە نەخۆش تا جێی ئەو وزە لەناوچوونەی پێشووی پێ پڕبکرێتەوە. لە چارەسەرکردنی تازە بوودا پێویستە پزیشك زۆر وریا بێت و خۆراکیش بە منداڵ بدرێت.

**خۆپاراستن**

له زۆربەی وڵاتاندا ئەمڕۆ کوتانی سیانە (D.T.P) لە تەمەنی منداڵییەوە دژی وەناق و دەرەدەکۆپان و کۆکە ڕەشە لە منداڵ دەدرێت.

تێبینی: پاش تەمەنی 3 ساڵان کوتانی دەرەدەکۆپان بەکارناهێنرێت. لە تەمەنی سکوزای خانمان و لەکاتی برینداری دا نەبێت.

**سەرچاوەکان**

References:
1.Elias Abratyn, Tetanus. In: Harissons principles of internal medicine. 1991; 577-79
2.Marin GH. Voiculescu,. Infectious Diseases, vol 2, Med Ed Bucharest 1990
3.A Schffler and I. Altekruger: medical microbiology and Immunology, Stuttgart 1992.
4.Abram S. Benson: Editor,. Control of communicable Diseases in Man. 15th eds. 1990
5.Thomes P. Bleck,. Colstridum Tetani,. In: Priciples and Practice of Infectious Diseases, 4th eds 1995; 2173-78.
6.Iwarson-Norrby, Infektionsmedicin, epidermiologi, Klinik och terapi, Stockholm 1998.

## ڕەشە گرانەتا

دەردێکی توندی ناهەمواری ترسناکە ، زۆر زوو بڵاودەبێتەوە.

**هۆزانی**

بەکترپایەکە بەنێوی Richettisa Prowazeki و درێژی نیو تا دوو مایکرۆن دەبێت. ڕەشە گرانەتا نەخۆشی وڵاتانی سارد و فێنکە، لەو مانگانەدا پەیدا دەبێت کە لەبەرسەرما خەڵکی دەخزێنە ژوورێکەوە ، لە وڵاتانی گەرمدا یا نییە یان زۆر کەمە چونکە خەڵکی زوو زوو خۆیان دەشۆرن و لەدەرەوە دەخەون و گەرماش ئەسپێ دەکوژێت. هەرچەندە نەخۆشییەکە لەزۆربەی وڵاتانی جیهاندا نەماوە، بەڵام تا ئەمڕۆ جار جار چەند کەسێك تۆمار دەکرێت. لە مێژوودا زۆرجاران نەخۆشییەکە بۆتە مەینەتی و مردنی ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوان. لە ناوەڕاستی سەپتەمبەری 1995 دا کۆریای باشور سنوری خۆی لەگەڵ کۆریای باکووردا داخست چونکە لە کۆریای باکوردا ڕەشەگرانەتا بڵاوبۆوە و زیاتر لەهەزار کەس مردن و زیاتر لە هەزاری دی تووشی بەکتریاکە بوون. ڕەشەگرانەتا نەخۆشی جەنجاڵی‌یە بە تایبەتی لە شارە گەورەکان، لە نێو لەشکردا و لە دەمی جەنگ دا زێدەتر بڵاودەبێتەوە. هەژاری و ماندوویێتی هۆی یارمەتیدەری بڵاوبوونەوەی ئەم دەردەن.

**مێژوو**

- یەکێکە لەنەخۆشییە هەوکردوەکان کە بە درێژایی مێژوو کارەساتی دڵتەزێنی بەسەر مرۆڤدا هێناوە.
- فراکاستۆریوس لەساڵی 1546 دا یەکەمجار لەسەر نەخۆشییەکەی نوسی.
- نیکۆلی لەساڵی 1909 دا سەلماندی ڕەشەگرانەتا بەهۆی ئەسپێوە بڵاودەبێتەوە.
- چەند ساڵێك پێش جەنگی یەکەمی جیهانی دەستنیشانی بەکتریاکە کرا.
- لە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەمدا زیاتر لە 3 ملیۆن کەس بە نەخۆشییەکە مردن.
- لە جەنگی دووەمی جیهانی دا نەخۆشییەکە کەمێك بڵاوبۆوە.
- لەساڵی 1968 دا 12 وڵات ڕایانگەیاند کەنەخۆشییەکەیان تیا دەرکەوتووە.

**ڕێگاکانی گواستنەوە**

لەساڵی 1909 دا نیکۆلی ڕایگەیاند کە:

(گەر ئەسپێ نەبێت بەکتریاکە بڵاونابێتەوە. جا گرنگ نییە ئەسپێی سەر بێت یان ئەسپێی بەر). هەندێک توێژیار دەبێژن گوایە لەرێگەی هەواوە بەکتریاکە (لەتاقیگەدا) دەگوێزرێتەوە. ئەوەی تووشی نەخۆشییەکە ببێت (منداڵ یان گەورە) بەرگری پاش هەوکردنەوەکە لە لەشییدا بەجێدەهێڵێت.

**نیشانەکان**

ماوەی کرکەوتنی بەکتریاکە لەنێوان 10-14 ڕۆژدایە یان لە نێوان 1-2 هەفتەدایە. سەرەتا لەپڕ تایەکی بەرز پەیدا دەبێت، ژانسەر، لەرز و موچڕکە رشانەوە، دەست و پێ ژانکردن دەردەکەوێت. زۆرجار بەکتریاکە کاردەکاتە سەر مێشك و لێکدانەوە و دەبێتە هۆی بێهێزی و ژانکردنی ماسولکەکانی لەش، زمانی نەخۆش بەڵغ دەگرێت و بۆر دەبێت و پاشتریش رەش دەبێت. نێو دەم بۆگەن دەکات و هاڵاوی دەمیش ناخۆشە. نەخۆش ئارەزووی خواردنی نامێنێت ، تینوێتی ، گرفت ، کەمبوونەوەی میزکردن و تۆخ بوونەوەی رەنگی میز، سووربوونەوەی چاو و رووخسار، گچکە بوونەوەی بیلبیلە، لووت پژاندن ، بزرکاندن ، بێخەوی و گوێی نەخۆش دەزرنگێتەوە ، لەچوارەم و پێنجەم رۆژی تادا پەڵەی سوری بازنەیی (لەسەرەتادا) لە بن باخەڵ و پاشتر سەرسنگ و سك دا دەردەکەوێت تا دێت نیشانەکان بەهێز تر دەبن. لە دووەم هەفتەدا ژانسەرو بزرکاندن کەمدەبێتەوە ، لاوازی و بێهێزی و بێخەوی لەزێدبووندایە ، لەشی نەخۆش بۆنی مشکی لێدێت ، نەخۆش بە تەواوی چاوی هەڵنایە ، بێتاقەتە و زمانی دەلەرزێت (نەخۆش ناتوانێت بە هیچ جۆرێك زمان دەربهێنێتە دەرەوە) ، بێنەوەی بەخۆی بزانێت نەخۆش لە هۆش خۆدەچێت و خۆی پیس دەکات. لە دەوروبەری 14 مین رۆژدا لەپڕ تا و بزرکاندن نامێنێت و نەخۆش باش دەنوێت ، زمان و پێست تەڕ دەبێتەوە ، نەخۆش هەر لاواز و بێهێزە. منداڵ زووتر چاك دەبێتەوە وەك لەپیر ، لەزۆربەی بارەکاندا لە 35 ٪ ی ئەو کەسانەی تەمەنیان لە نێوان 35-40 ساڵدان دەمرن ، بەڵام لەسەروو ئەم تەمەنەوە بە رێژەیەکی زێدەتر دەمرن.

**ماکەکان**

بەکتریای رەشەگرانەتا دەبێتە هۆی: گوێچکەسۆ ، تەنیشت ملەقۆرتە گلاند ، ئاڵووکەوتن ، ژەهراوی بوونی خوێن ، هەروەها دەبێتە هۆی سووتانەوەی دەمار و خوێن بەربوون.

**شێوەکانی رەشەگرانەتا**

بەپێی تەمەن ، باری نەخۆش ، ژینگە ، جۆری بڵاوبوونەوەکە نەخۆشییەکە لە گەلێك شێوەدا خۆی دەنوێنێت.

**شێوەکانیش ئەمانەن**

- رەشەگرانەتای بەهێز: نەخۆش بە توندی ژەهراوی دەبێت و لەماوەیەکی کورتدا دەمرێت.
- رەشەگرانەتای مام ناوەندی، پەڵەسورەکان بەباشی دەرناکەون و خۆیان دەشارنەوە.
- رەشەگرانەتای سوك ، لەمنداڵ و کوتراودا دەبینرێت و لە کوتراودا نابێتە هۆی مردن.

**دەستنیشانکردن**

نیشانەکانی نەخۆشییەکە دەتوانن بیسەلمێنن کە نەخۆشییەکە رەشە گرانەتایە ، گەر بێتوو نیشانەی بڵاوبونەوەی بچێتە سەر (بوونی بەکتریاکە) ئەوا زۆر باشترە.

- تێستی بەرتەکی سێرەمی Weil-Felix یان بەرتەکی Kudicke-Steuer زۆر بەسودن.
- تێستی PCR یش بەسودە.
- لەتاقیگادا بە هۆی 3-5 ملیلیتر لەخوێنی نەخۆشەوە بەکتریاکە جودادەکرێتەوە ، (باشتر وایە لە 7-8 رۆژی نەخۆشییەکەدا بێت) ، خوێنی نەخۆش لەشێوەی دەرزی دا دەدرێت لە کۆبادا (جۆرێکە لەمشك) و پاش 7-12 رۆژ کۆباکە (چەند رۆژێك تووشی تایەکی 40-41 پلەی سەدی دەبێت) ئەمەش بۆمان دەسەلمێنێت کە نەخۆشەکە رەشە گرانەتایەتی.
- تێستی دەرزی لەژێر پێستدان تا بزانین نەخۆشەکە بەرگری هەیە یان نا.

**رێرەوی نەخۆشییەکە**

بە گشتی باشە، بەلام مرۆڤی بە تەمەن بەرگەی نەخۆشییەکە ناگرێت.

**چارەسەرکردن**

لە ساڵی 1948 ەوە بەچری دەرمانی کلۆرامفێنیکۆل دژی بەکتریاکە بەکار دەهێنرێت و مەترسی نەخۆشییەکە زۆر کەمبۆتەوە .

- پێویستە لە ا هەفتەدا هەر 24 کاژێرێك 2-3 گم کلۆرامفێنیکۆل بخوات.
- تێتراسایکلین ، گەر نەخۆش لە 24 کاژێردا 2-3 گم بخوات ، زۆر باشە.
- ڤیبرامایسین، لەشێوەی دەرزی خوێنهێنەردایە رۆژانە 200 ملگم ئەنجامی باشی بووە.

**خۆپاراستن**

پێویستە بە زووترین کات نەخۆشییەکە بناسرێتەوە و نەخۆش جودا بکرێتەوە و ژمارەی تووشبووان رابگەیەنرێت. ئەوانەی گومانیان لێدەکرێت پێویستە وەك نەخۆش مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت. گرنگترین هەنگاو لە خۆپاراستندا بریتییە لە لەناوبردنی هۆی گواستنەوەی بەکتریاکە کە ئەسپێیە و ئەویش بە DDT ، کوتان کەشێوەیەکی دی خۆپاراستنە و لە شێوەی 2 دەرزی دایە ، هەریەکەیان یەك ملیلیترە و لەژێر پێست دەدرێت. پێویستە پاش 14 رۆژان دەرزی دووەم بدرێت لەو کەسە. هەروەها دەتوانرێت بە تێتراسایکلین خۆمان لەم دەردە بپارێزین.

**سەرچاوەکان**

References:
1.Alfred J. saah,. Ricketta prowaskii,. In: Principles and Practice of Infectious Diseases. 4th eds 1995
2.Marin GH. Voiculescu,. Infectious Diseases, vol 2, Med Ed Bucharest 1990, 112-134
3.A Schffler and I. Altekruger: medical microbiology and Immunology, Stuttgart 1992
4.Marin GH. Voiculescu,. Infectious Diseases, Med Ed. Bucharest 1989
5.Abram S. Benson: Editor,. Control of communicable Diseases in Man. 15th edition 1990.
6.Iwarson-Norrby, Infektionsmedicin, epidermiologi, Klinik och terapi, Stockholm 1998
7.CDC., Typhus vaccine. MMWR. 1978; 27: 189.

# لا ڕەشە

برینێیە لەو بارە کوتوپڕە دژوارەی لە ئەنجامی هەوکردنی برینێکەوە دروست دەبێت و ئەندامە بریندارەکە دادەرزێنێت و زۆرجاران دەبێتە هۆی بڕینەوەی ئەندامەکە ، زۆرجاریش بێچارە کردن دەبێتە هۆی مردن.

**هۆزانی**

**بڵاوترین بەکتریای گانگرینە نێوی:**

Clostridium Perfringens, Cl. Septicum هەروەها بە دەگمەن Cl. Histolyticum, Sporogenes, Fallax, Bifermentans

دەبێتە هۆی لاڕەشە لە نێو هەموو جۆرەکاندا جۆری Cl. perfringens بەرێژەی لە 64–80 ٪ دا دەبێتە هۆی لارەشە. بەکتریایەکی گرامپۆزەتیڤە و زۆر ئەستورە و نزیکەی 1-8, 2 مایکرۆن دەبێت ، بەکتریاکە لەخاك ، هەوا و خۆراکدا هەیە.

بە تاقیکردنەوەی لە 163 کیسە خۆڵی شوێنە جیاوازەکانی ئەوروپادا توانراوە لە 100 ٪ Cl. Perfringens جوداکراوەتەوە ، لە 64 ٪ یش Cl. Novyi و وە Cl. Septicum تەنیا لە 8 ٪ ی بارەکاندا جوداکراوەتەوە.

کلۆستریدیۆم بە ئاسانی لەنێو ریخۆڵەی مرۆڤدا هەس ، هەروەها لە 5 ٪ کەناڵی زاوزێی ژنی لەش ساخدا هەیە. بەکتریاکە لەهەوای سەر شەقام و کولان و ژووری نەشتەرگەریشدا جوداکراوەتەوە ، هەروەها لە سەرسمت و ناوپۆشەکانیشدا هەیە.

هەموو جۆرەکانی بەکتریاکە کەمێك ژەهر دروست دەکەن و لەجۆرێکەوە بۆ جۆرێکی دی جیاوازە. بەکتریای Cl. Perfringens شەش جۆری هەیە کە ئەمانەن: A, B, C, D, E, F بەلام لە هەموویان گرنگتر جۆری A یە.

ئەم جۆرە 12 جۆر ژەهر و ئەنزیم دروست دەکات بەپێی ئەلفو بێی یۆنانی نوسراوە و لەهەموویان گرنگتر جۆری ئەلفایانە.

لاڕەشە نەخۆشییەکە بەزۆری لەکاتی جەنگدا بلاوە، پاش ئەوەی برینێکی هەڵتەکاو تووشی بەکتریاکە دەبێت و پاشتر بەکتریاکە لەبرینەکەدا زێدەکات ودەبێتە هۆی سۆیەکی تێکەڵ بە 2-3 جۆری بەکتریاکە. هەندێکجار هەردوو بەکتریای گرامپۆزەتیف و گرامنێگەتیڤ بەشداری هەوکردنەکە دەکەن. لەم کاتەدا بەکتریاکان ژەهر دروست دەکەن و هێرش دەکەنە سەر خانەکانی دراوسێی برینەکە و خانەکان دادەرزێنن و دەکوژن. پاش ئەوەی بەکتریاکە بەرێگای پێست یان هەرس دا دەگاتە نێو لەش، پاشتر خۆی دەگەیەنێتە نێو خوێن و لەوێشەوە دەگەنە نێو خانەکانی سپڵ ، جگەر ، لیمفەگرێ و مۆخی ئێسك.

**نیشانەکان**

برینەسۆی هەڵتەکاو بە گولله ، قەمەو رمی جەنگ بە بەکتریای کلوستریدیۆم دەبێتە هۆی دەرکەوتنی نیشانەی کوتوپڕی جیاواز یان توندی ژەهراوی بێنەوەی خانەکانی دراوسێ تووشی هەوکردن بکات.

**جۆرەکانی لاڕەشە:**

1- **لاڕەشەی گازی کلۆسترۆیدی:**

**ماوەی کرکەوتنی بەکتریاکە لە 1-2 رۆژدایە ، هەندێکجار لەنێوان کاژێرێك و 6 رۆژدایە. سەرەتا برینەکە دەئاوسێت و ژان دەکات (ژانەکە لەشێوەی شەتەکدان دایە) کێمو زوخاوێکی پیس و بۆگەنی ناخۆشی لێدێتە دەرەوە و ئاوساویەکە گازی تەردەکەوێت. پێستی دەوروبەری برینەکە شین ، سارد و مەرمەڕی دەنوێنن ، دەمی برینەکە کراوەیە و داڕزاوە و لێواری خانەکانی مردوون. نەخۆش زۆر پەرێشانە ، تا (بەرزبوونەوە و نزم بوونەوەی پلەی گەرمی) ، زۆربوونی لێدانی دڵ و کەمیٔ رەنگ زەردی .**

**ڕێڕەوی نەخۆشییەکە**

**بە گشتی ڕێڕەوی سۆکە زۆر خێرایە و زۆرجار لە 48 کاژێردا ژمەرمکە دەتمنێتەوە و نەخۆش دەمرێت ، گەر زۆر زوو چارە نەکرێت ئەوا لە 100 ٪ نەخۆش دەمرێت.**

2- **لاڕەشەی گازی نا کۆلۆستریۆدیۆمی:**

**نیشانەکانی وەکو پێشوو وایە، بەلاَم هۆی گانگرینەکە جیاوازە و لەوانەیە پسیودۆمۆناس یان ئینترۆباکتێر بێت. ئەوەی راستی بێت ئەم جۆرەیان چارەسەردەکرێت و مەترسی کەمترە. بە رای شارەزایان نیشانەکانی لاڕەشە ئەمانەن: لە لای (راست ، چەپ) ی برینەکەدا نەخۆش هەست بەقورسایی دەکات. نیشانەکان لەپڕ دەردەکەون و برینەکە پەنماوە و زۆر بەئازارە ، گاز لە شوێنی برینەکە دایە ، لێدانی دڵ زێد دەبێت و بەرزی و نزمی تا نیشانەیەکی ژاری بوونەو نەخۆشیش زۆر بێئارامە.**

**دەستنیشانکردن**

- **زۆرجاران نیشانەی جێگەیی و گشتی برین و سۆکە دیاریکردن ئاسانتر دەکەن.**
- **تاقیکردنەوەی بەکتریایی (بۆدەستنیشانکردنی جۆری میکرۆبەکە) پێویستە.**
- **چاندن ، وەرگرتنو ناردنی بۆ تاقیگای تایبەت بۆ دەستنیشانکردن.**

**چارەسەرکردن**

**پێویستە ئەم خالاَنە لەبەرچاو بێت و پشت گویٔ نەخرێت:**

- **پێویستە نەخۆش بگەیەنرێتە بەشی فریاگوزاری وشارەزا چارەی بکات.**
- **پێویستە بەزووترین کات دەست بەچارەسەرکردنی گانگرینەکە بکرێت ، چونکە لەوانەیە لەچەند کاژێرێکدا نەخۆش بمرێت ، هەندێکجار تا پزیشك ئامادە دەبێت نەخۆش دەمرێت.**
- **پێویستە بەشی نەشتەرگەری ، بەشی ژمەراوی بوون و بەشی دژی میکرۆب لەچارەسەرکردندا بەشدار بن و هاریکاری یەکتر بکەن.**

**چارەکردنی نەشتەرگەری**

**پێویستە ئەم کارە زوو ئەنجام بدرێت و چەند کونێکی قوڵ بکرێتە دەوروبەری برینەکە و فتیلی پزیشکی پاکژی زۆری تێبکرێت، پێویستە دەمی برینەکە نەگیریٔ و بەرەلاَ بکرێت و تەنیا بە (ئۆکسجین) هایدرۆجین پیرۆکساید پاك بکرێتەوە ، لە کاتی هەوکردنی پەلەکاندا زۆرجار پێویستە دەست یان لاق ببڕێتەوە. سەرەتا پێویستە لە خوێنهێنەرەوە دەرزی پەنسیلین G لەگەڵ ئاوی دلۆپاودا بەرێژەی 1 ملیۆن یەکە لەخوێنهێنەرەوە بدرێت بە نەخۆش. پاشتریش 12-18 ملیۆن یەکە لە 24 کاژێردا بدرێت بە نەخۆش ، یان دەتوانرێت 8-12 گم کەپسولی ئەمپیسیلین بدرێت بە نەخۆش.**

گەر بەکتریاکە کلۆستریۆدیۆم نەبوو ئەوا جێنتامایسین یان تۆبرامایسین 105 ملگم بۆ 1 کگم کێشی نەخۆش بەکاردەهێنرێت . هەروەها بە پێی جۆری بەکتریاکە و هەستیاری ئەنتیبایۆتیك ئەدرێت بە نەخۆش.

**سەرچاوەکان**

References:
1.Bennrtt lorber., Gas Gangrene and other Clostridium Associated Diseases. In: Principles and Practice of Infec[illegible] Diseases, 4th eds. 1995;: 224· 2182-2195.
2.Marin GH. Voiculescu,. Infectious Diseases, vol 2, Med Ed. Bucharest 95; 1990. P.589-594.
3.Iwarson-Norrby, Infektionsmedicin. epidemiologi, Klinik och terapi, Stockholm, 1998.

## . بروسێلا، تای ماڵتا

یەکێکە لەنەخۆشییە هەوکردوەکانی ناوەڕاست و باشووری کوردستان ، ساڵانە سەدان کەس تووشی نەخۆشییەکە دەبن.

**هۆزانی**

بەکتریایەکە بە نێوی بروسێلا کە 6 جۆریان هەیە و هەریەکەیان تایبەتە بە گیانەوەرێك. بەڵام لە هەموویان گرنگتر (1-3) یە کە مرۆڤ تووشی نەخۆشی دەکات ئەمانەن:

1- بروسێلای Melitensis تووشی مەڕ و بزن دەبێت و لەرێگای شیرەوە هەردووکیان مرۆڤ تووشی بروسێلا دەکەن (3 جۆری هەیە).
2- بروسێلای abortus لەگادایە (9 جۆری هەیە).
3- بروسێلای suis لەبەرازدایە (4 جۆری هەیە).
4- بروسێلای canis لەسەگدایە (لەساڵی 1967 دا جیاکراوەتەوە و زۆر دەگمەنە)
5- بروسێلای ovis.
6- بروسێلای neotomae.

بروسێلا خۆرەیەکی چیلکەیی گرامنێگەتیڤی کەمێك گەورەیە. لە هیشکی و تەڕیدا زۆر بەرگەی دەرەوە دەگرێت. لەسەهۆڵدا 6 مانگ و لەشیردا 5 هەفتە دەژی. ئەوەی شایانی باسە بروسێلا رووکەشە ئەنتیجێن و ئەنتیجێنی تواوەی هەیە.

**مێژوو** (1، 8)

- بە درێژایی مێژوو نەخۆشییەکە 56 ناوی لێنراوە. زۆر لەمێژە لەکەنارەکانی دەریایی سپی ناوەڕاستدا هەیە.

- بەپێی هوگێنس (1897)، هیپۆکرات لەساڵی 460 پ. ز.لەسەر نەخۆشییەکەی نوسیوە.
- مارستۆن لەساڵی 1859 دا لەسەر نەخۆشییەکەی نووسیوە.
- ئەوەی شایانی باسە ئەم نووسەرانە پێش مارستۆن (نەشتەرگەری ئینگلیزەکان لەدورگەی ماڵتا) باسیان لەسەر تای ماڵتا نووسیوە.
ڤاوگیرگی 1798-1800، گلیگهۆرن 1744-1749، بۆرنێت 1800-1810، هینین 1816-1825، داڤی 1833-1835.

- داڤد بروسی لەساڵی 1887 دا ئەو بەکتریایەی جیاکردەوە کەدەبێتە هۆی تالیهاتنەکە
- هۆگێنس لەساڵی 1897 دا نەخۆشییەکەی نێو نا (تای بەرز و نزم).

بانگ لەمەمان سالدا باسیلەکەی دۆزییەوە و نیوی Bacillus abortus ی لینا و پاشتر بەنەخۆشی بانگ نیوی دەرکرد.

- لەسالی 1905 و 1907 دا بۆ یەکەمجار سەلمینرا کە بەکتریاکە لەمالتادا بەهۆی بزنەوە دەگوێزرێتەوە.
- لە سالی 1918 دا نەخۆشییەکە وەك بروسیلای گا ناسراوە.
- تورکو و مۆرارو لەسالی 1932 دا یەکەم حالەتی نەخۆشییەکەیان لەمرۆڤدا دیاری کرد.

**پەتازانی**

**بروسێلا یەکێکە لە گرنگترین نەخۆشییەکانی کۆئەندامی هەرس ، لە زۆربەی ولاتاندا تا ئێستا هەرماوە وخەلکی تووشی گیروگرفت و چەرمە سەری کردووە . سالانە نزیکەی نیو ملیۆن کەس تووشی نەخۆشییە کە دەبن.**

**لە سالی 1990 دا لە ئەمێریکادا تەنیا 85 باری نەخۆشییەکە تۆمار کراوە ، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ باش کۆنترۆلکردنی نەخۆشییەکە. لەباشوور و ناوەڕاستی کوردستاندا لەو ناوچانەدا کە بزن و مەڕ زێدەتر بەخێودەکەن نەخۆشییەکە زێدەتر بلاوە و سالانە سەدان کەس تووشی نەخۆشییەکە دەبێت. ئەمیش بەهۆی باش نەکولاندنی شیرەوەیە و پەیوەندی کردنی راستەوخۆ بە گیانەوەری نەخۆشەوە. زۆرجار نەخۆشییەکە نێوی (نەخۆشی گاڕ) ی لێنراوە ، واتە ئەو کەسانە کە مەڕومالات بەخێو دەکەن ، شوانی بزن یان ئەو کەسانەی لە قەسابخانەدا کاردەکەن تووش دەبن. بزن و گا و بەراز سەرچاوەی میکرۆبەکەن.**

**رێگاکانی گواستنەوە**

- **لە 60٪ بارەکاندا بەپەیوەندی راستەوخۆلە گەل گیانەوەری نەخۆشدا مرۆڤ تووش دەبێت.**
- **بروسێلا لە رێگەی خواردنەوەی شیری پەستۆرەنەکراوە دەگوێزرێتەوە.**
- **لەوانەیە لە (تاقیگادا) لەرێگای هەواوە مرۆڤ تووشی بروسێلا ببێت (10).**

**بەلام تا ئەمڕۆ نەخۆشێك نەیتوانیوە مرۆڤێکی لەش ساغ تووشی بروسێلا بکات. هەندێك پزیشك دەبێژن لەوانەیە میزیش بروسێلا بگوێزێتەوە پاش ئەوەی بەکتریای بروسێلا لەرێگەی پێست ، چاو، چاندنی ئەندام یان هەرسەوە دەگاتە نێو لەش، خۆی دەگەیەنێتە نێوخوێن و لەنێو خرۆکە سپییەکاندا جێگیر دەبن. پاشتریش خۆیان دەگەیەننە جگەر، سپڵ، لیمفە گرێکان و مۆخی ئێسك و لەوێدا ژمارەیان زێدەکات.**

**نیشانەکان**

**ماوەی کرکەوتنی بروسێلا لە نێوان 10-14 رۆژدایە،جاری وایە لەنێوان 3-4 هەفتە دایە. سەرەتا لە 90 ٪ ی تووشبووەکان ئەم نیشانانەیان هەیە: ژانەسەر ، بێهێزی ، ژانکردنی جومگەکان ، تای ناڕێك ، ئارەقەکردنەوەیەکی زۆر. بەدەگمەن نەخۆشییەکە لەپڕ و بەلەرز و تا و ئارەقەکردنەوەوە دەر دەکەوێت. بروسێلا نەخۆشییەکی ئالۆزە . لەبەرئەوە نیشانەکانی بە ئارەحەتی دەناسرێتەوە. دەلێن گوایە بروسێلا 230 نیشانەی هەیە !!!. یان بە (نەخۆشی سەد روو) ناسراوە. تالێهاتن ناڕێکە و بەرزونزم دەبێتەوە ، ئارەقەکردنەوە شەوانەیە و بۆنێکی تایبەتی لە ئارەقەکە دێت، نەخۆش زۆر بێهێزە و توانای جولاندنی کەمە.**

## شێوەی ئازار لە بروسێلادا

ژانەسەر ، ژانکردنی جومگەکان (بەتایبەتی بڕبڕەی پشت) ، ژانە سک ، ژانکردنی ناوچەوان و پشتی سەر.

هەروەها نەخۆش ئارەزووی خواردنی نامێنێت، هێڵنجدان و گرفتی تووش دەبێت، هەندێکجار نەخۆش تووشی کۆکە دەبێت. زۆرجار نیشانەی دەماری ، خەمباری و بێخەویش لە نەخۆشدا دەردەکەون. بەڵام لەشێوەی کوتوپڕ یان ژاربوون نەخۆش تووشی خەواڵویی ، بێخولقی دەبێت. (هەندێکجار باتووی نەخۆش ژان دەکات). لە کاتی تێڕوانینی نەخۆشدا بۆمان دەردەکەوێت کە: لە 64 ٪ لیمفەگرێکان ، لە 60 ٪ سپڵ و لە 49 ٪ جگەریش گەورە دەبێت. ژنان تووشی گرفتی بێنوێژی دەبن. هەندێکجار نەخۆش تووشی کەمخوێنی دەبێت ، لە 70-80 ٪ خرۆکە سپییەکان و لیمفۆسایتەکان نزم دەبنەوە.

## ڕێڕەوی بروسێلا

زۆر جیاوازە لەوانەیە نەخۆشییەکە مانگێك بخایەنێت ، بەڵام لە 85 ٪ ی بارەکاندا نەخۆشییەکە 3 مانگ دەخایەنێت ، لە شێوە تولانییەکاندا ساڵێك یان چەند ساڵێك دەخایەنێت.

## ماکەکان

- بۆریە سۆی سی و کێمکردنی سی پۆش.
- ئاڵۆزکارییەکانی دڵ و بۆریەکانی خوێن ، ناوپۆشەسۆی دڵ.
- ئاڵۆزکارییەکانی گەدە و ریخۆڵە ، زەردوویی بروسێلایی، لە 40-60 ٪ ی بارەکان دا دەبینرێت ، هەندێك جاری دی لەگەڵ بارە کوتوپڕەکەدا تێکەڵ دەبێت و لەوانەیە ببێتە هۆی دلرزاندنی جگەر.
- جومگەسۆ و ئێسکەسۆ بە تایبەتی بڕبڕەی پشت.
- ماکە دەماریەکان وەك دەمارەسۆ و پەردەسۆی مێشك.

## شێوەکانی بروسێلا

1- شێوەی کوتوپڕ، لە 7 ٪ ی بارەکان دەگرێتەوە.
2- شێوەی ژێر کوتوپڕ ، لە 16 ٪ بارەکان دەگرێتەوە.
3- شێوەی تولانی ، لە 65 ٪ بارەکان دەگرێتەوە.

## دەستنیشانکردن

- نیشانەکان و کاری نەخۆش زیاتر زانیاریمان بۆ روون دەکاتەوە.
- جیاکردنەوەی بروسێلا و ناسینەوەی لەژێر میکرۆسکۆپدا بە ڕێگەی چاندن لە گیانەوەر یان مرۆڤدا.
- تێستی سێرۆزانی و چاندن ، دەرکەوتنی دژەتەنەکانی بەکتریاکە لە سەرەتای نەخۆشییەکەدا (8-10 یەم رۆژدا) بە سودن.
- دەرکەوتنی دژەتەنی IgM لە بروسێلادا زۆر گرنگە ، هەروەها IgG ، ئەم دژە تەنە لە دووەم هەفتەی نەخۆشییەکەدا دەردەکەوێت. لە شێوەی تولانی تالێهاتن دا IgG بە هەمیشەیی دەمێنێتەوە.
- تێستی ELISA زۆر هەستیارە لە دەستنیشانکردنی دژەتەنی دژی بروسێلادا.

- تێستی Burnett کە لەشێوەی دەرزی دایە و لەژێر پێستی نەخۆش ئەدرێت . لەسەر نەخۆش تاقی دەکرێتەوە تابزانین تووشی بروسێلا بووە یان نا.

**چارەسەرکردن**

- پێویستە چاوەڕوان بین کەلە 5-15 ٪ بارەکاندا نەخۆشییەکە دەست پێبکاتەوە.

- چارەسەرکردن بۆماوەیەکی درێژ بەیەك ئەنتیبایۆتیك بێهودەیە ، بەڵام تێکەڵکردنی دەرمانەکان ئەنجامی باشی هەبووە.

- حەوانەوە و خۆماندوونەکردنی لەش و دەروون زۆر بەسودە.

- هەندێکجار پێویستە نەخۆش پسپۆڕی دەروونی ببینێت بۆ دڵدانەوە و ئامۆژگاریکردنی دەروونی لەبەرئەوەی نەخۆشییەکە درێژە دەخایەنێت.

**ئەنتیبایۆتیك**

پێویستە هەمیشە دوو دەرمان بدرێت بەنەخۆش ، دەرمانی Doxycycline بەرێژەی 200 ملگم رۆژانە و هاوکات Rifampin بە رێژەی 600-900 ملگم رۆژانە بۆ ماوەی 6 هەفتە زۆر ئەنجامی باشی داوە بەدەستەوە. ئەم دوو دەرمانە بوونەتە هۆی ئەوەی کە بەرێژەی زیاتر لە 90 ٪ ژمارەی پەیدا بوونەوە یان سەرهەڵدانەوەی تای ماڵتا کەم بکاتەوە. ئافرەتی دووگیان تەنیا دەرمانی Rifampin ی ئەدرێتێ.

بەڵام منداڵ دەرمانی Trimethoprim-sulfamethoxazole (TMP-SMZ) ی ئەدرێتێت هاوکات زۆر پێویستە ڤیتامین و دەرمانی دامرکاندنەوەی تا و ئازار بدرێت بە نەخۆش .

**بۆ منداڵ بە پێی تەمەن :**

- منداڵی ژێر تەمەن 8 ساڵان 8-10ملگم . کێشی لەش دەرمانی(TMP-SMZ) بۆ ماوەی 45 رۆژان لە گەڵ 15-20 ملگم . کێشی لەش دەرمانی Rifampin رۆژانە ئەدرێت بە منداڵ .

- منداڵی سەروو تەمەن 8 ساڵان 2-4 ملگم. کگم کێشی لەش (خەپلە) دەرمانی Doxycycline بۆ 6 هەفتە لە گەڵ رۆژانە 1 گم Streptomycin لە شێوەی دەرزی ماسولکەدا ئەدرێت لە نەخۆش . ئەتوانین Doxycycline و Gentamicin بەیەکەوە بدرێت بە نەخۆش .

**خۆپاراستن**

- کوتانی مەڕ و ماڵات تا تووشی بروسێلا نەبن.
- کوڵاندنی شیری مەڕ و بزن و پاستورەکردنی.
- پەیوەندی نەکردن بە مەڕوماڵاتی نەخۆشەوە.
- نەخواردنەوەی شیری خاو (نەکوڵێنراو).
- نەخواردنی گۆشتی مەڕ و ماڵاتی نەخۆش ، باشتر وایە گۆشتەکە بسوتێنرێت یان لە ژێر خاکدا بشاردرێتەوە.

**تێبینی:** ئەوەی شایانی باسە رووسەکان لەساڵی 1952 دا کوتانێکیان لەجۆری abortus AV 19 دروستکردولە نێوان 1952-1958 دا نزیکەی 3 ملیۆن کەسیان کوتی بەڵام کوتانەکە زۆر سەرکەوتوو نەبوو.

هەروەها لەچین کوتانێکی دی ئامادەکرا A abortus کە لە کوتانی رووسەکان باشتر بوو بەڵام کاتێک لە ژێر پێست ئەدرا نیشانەی بروسێلا لە مرۆڤدا دەردەکەوت.

پاشتریش چەند هەوڵێکی دی دراوە بەڵام زۆربەیان ماکیان هەبووە. تا ئەمرۆ کوتانی RB51 دژی تای ماڵتا باشترینیانە .

سەرنج : ئەو کوتانەی ئەمرۆ لە مەڕ و ماڵات ئەدرێت و بە هیچ جۆرێك نابێت لە مرۆڤ بدرێت !!.

سەرچاوەکان

**References:**

1.**Arne Forsgren, Göran Kronvall**, Klinik bakteriologi. Stockholm 1996.
2.**Young, E. J. Human Brucelosis**, Rev Infec. Dis 1983. 5, 821.
3.**Abram S. Benson**: **Editor**,. Control of communicable Diseases in Man. 15th eds. 1990.
4.**CDC. Summary of notifiable diseases**, **United States**, 1991. MMWR. 1991; 40: 53.
5.**Sharda DC. Lubani M**: **A study of Brucelosis** in Cjildhood. Clin. Pedia. 1986; 25 (10): 492.
6.**Donald Kaye, Brucelosis, In**: Harrisson, Principles of internal medicine vol 1. 1991; 625-627.
7.**Iwarson-Norrby, Infektionsmedicin**, epidermiologi. Klinik och terapi, Stockholm, 1998.
8.**M. Monir Madkour, Historical aspect of Brucellosis In** Brucellosis, USA 1989.
9.**J. Roux. Brucella vaccines in humans**, **In**: Brucellosis, USA 1989.
10.**How dose Brucella abortus infecte human beings**? Lancet, 1983, II, 1180.

## وەناق

نەخۆشییەکی هەوکردوی درمە بە هۆی بەکتریای چیلکەیی وەناقەوە بڵاودەبێتەوە ، ژمارەی بەکتریاکە لەناستی شوێنی چوونە ناوەوەدا زێد دەبێت و هەر لەو شوێنەدا دەبێتە هۆی گۆڕانکاری خانەکان و لە ئەنجامی دەرکردنی ژەهری بەکتریاکەدا هەندێك نیشانەی گرنگی ژەهراوی بوون لە نەخۆشدا دەردەکەوێت.

**هۆی وەناق** (10 ،2)

بریتییە لە بەکتریایەکی گرامپۆزەتیف بەنێوی Corynebacterium Diphtheriae ، قەبارەکەی لە نێوان 2-4 میکرۆندایە و ئەم سەرو ئەو سەری ئەستورە ، نەگۆڕن و لەشێوەی پیتی چینی دان. ژەهری بەکتریاکە زۆر زیان بەخشە بۆ مرۆڤ و دەبێتە هۆی زێد کوتوپڕبوونی نیشانەکان و زۆرجاریش دەبێتە هۆی مردن. میکرۆبەکە ژەهر دەردەکاتە نێو سوڕدانی خوێنەوە بە تایبەتی کاردەکاتە سەر ناوپۆشی دڵ ، گورچیلە و هەندێکجار خانەکانی دەماریش دەگرێتەوە ، ژەهرەکە لەسەر خانەکان دەنیشێت و پێکهاتوویەکی ئاڵۆز دروست دەکات و شی نابێتەوە و هەرئەم پێکهاتووەکە دەبێتە هۆی مردنی نەخۆش.

**مێژوو** (3) .

- ئەرێتاوس لەسەدەی یەکەمی پێش زایینیدا باسی وەناقی کردووە.
- برێتۆنیاو لەساڵی 1815 دا یەکەمجار لەسەر نەخۆشییەکەی نوسیووە.
- ترۆسییاو لەساڵی 1828 دا ناوی وەناقی لەنەخۆشییەکە نا.
- لە ساڵی 1883 دا باسیلی وەناق ناسرا.
- یەرسین و رۆوکس لەساڵی 1888 دا ژەهری بەکتریاکەیان جوداکردەوە.
- لە ساڵی 1890 دا سیرەمی دژ بەوەناق دۆزرایەوە.
- بێهرینگ لەساڵی 1891 دا چارەسەری یەکەم وەناقداری کرد
- لەیاداشتی ئەو کارەمەزنەدا لەساڵی 1901 دا خەڵاتی نۆبڵ پێشکەش بە بێهرینگ کرا.

- له سالی 1913 دا لەسەر تێستی Schick نوسرا.
- رامۆن لەسالی 1923 دا ئەو دژە ژەمرەی وەدەستهێنا کە دەبێتە هۆی بەرگری دژی وەناق.

**پەتازانی**

**ئەوەی شایانی باسە نەخۆشییەکە لەهەموو جیهاندا بلاّوە بەتایبەتی لە ناوچەکانی هێڵی ئیستیوادا. وەناق ، نەخۆشی منداڵییە لەم ساڵانەی دوایدا جۆرێك وەناقی تەمەنداریش دەرکەوتووە ، بە تایبەتی لەو کەسانەدا کە لە منداڵیدا خۆیان نەکوتیوە !!. لەسالی 1994- 1995 جارێکی دی نەخۆشییەکە لەرووسیا و ئۆکرانیا سەری هەڵدایەوە و بووە هۆی مردنی نزیکەی 2000 کەس. هەروەها دەرکەوتووە کە رێژەی مردن لە نێو کۆمەڵگا نەکوتراوەکاندا زۆر بەرزە. بە پێی ر ت ج سالی 2001 لە هەموو ئێراقدا 32 نەخۆشی تۆمارکراو هەبووە (15).**

**رێگاکانی گواستنەوە**

- **راستەوخۆ، واتە بەکتریاکە راستەوخۆ لەیەکێکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ یەکێکی دی یان بەهەوادا دەگوێزرێتەوە.**
- **ناراستەوخۆ، لەوانەیە بەهۆی بەکارهێنانی کەلوپەلی نەخۆشەوە میکرۆبەکە دەگوێزرێتەوە.**

**نیشانەکان**

**ماوەی کرکەوتنی میکرۆبەکە لە نێوان 2-6 رۆژدایە. هەندێکجار باسیلەکە چەند ئەندامێك یان بەشێکی لەش تووشی هەوکردن دەکات ، ناسراوترین و بلاّوترینیان بریتین لە:**

**1- هەوکردنی مەرازەکان (ئالّووکەوتن)**

**مەرازەکان لە هەموو ئەندامەکانی دی لەش زێدەتر تووشی هەوکردنی باسیلەکە دەبێت.**

**سەرەتا نەخۆشییەکە بەم شێوەیە دەست پێدەکات: سوکەتا ، بێهێزی ، هێڵنج ، رشانەوە ، خۆراك نەخواردن ، ئازار لەکاتی جوینی خۆراکدا. گەر سەیری نێو دەمی نەخۆش بکەین دەبینین ئالّووەکان سور هەڵگەراون وپاشماوەیەکی کورت رووەکەیان بە گەندە پەردەیەك دادە پۆشرێت.**

**ماوەی دەرکەوتن**

**لەم ماوەیەدا مەرازەکان بەگەندە پەردەیەکی تەنك دادەپۆشرێت کە دیواری ناوەوە، پشتەوە، سەروو، خوارووی ئالّووەکان، هەروەها زمانە بچکۆلە و مەلاّشوو دەگرێتەوە. گەندەپەردە رەنگی سپی سەدەفییە یان زەرد و سپییە و کەمێك بەیەکداچووە و بەگرانی لێدەبێتەوە. گەر بەهێز دای بماڵین ئەوا لەژێریدا ناوچەیەکی سوور و بریندار و خوێناوی دەردەکەوێت کە خێرا لەماوەیەکی کەمدا گەندە پەردەیەکی دی دروست دەبێت و برینەکان دادەپۆشێتەوە. ئەوەی راستی بێت گەندە پەردە ئەوەندە بەهێزە کە بە ئاو ناخوسێت تا لێبکرێتەوە یان لاببرێت.**

**لە گەڵ گەندە پەردەدا مەرازەکان دەئاوسێن و هێدی هێدی هەموو نێو گەروو، ژێر چەناگە و مل دەگرێتەوە و هەندێکجار ئاوساویەکە دەگاتە سنگ. لیمفەگرێکان ئەوەندە گەورە دەبن گەر دەستیان لەسەر دابنرێت مرۆڤ بەئاسانی هەستیان پێدەکات ، زۆرجاران ئەوەندە گەورە دەبن بەئاسانی لە لاملدا دەبینرێن.**

نیشانە گشتییەکان

تا، نزیکەی 38 پلەیە ، نیشانەی سەرەکی کە باش دەردەکەوێت بریتییە لە بێهێزی ، نەخۆش ناتوانێت لەسەر جێگەکەی بێتەخوارەوە.

ڕووخساری خاکی هەڵدەگەڕێت، لێوەکان هیشك دەبنەوە، لەوانەیە هێڵنج و ڕشانەوەشی لەگەڵدا بێت.

تریەی دڵ زۆر لاوازە و ژمارەی لێدانی دڵ زێد دەکات، پەستانی خوێن نزم دەبێتەوە.

هەندێکجار میزکردن کەم دەبێتەوە ، هاوکات لەگەڵ میزدا ڕێژەیەکی زۆر لە ئەلبومین دەکرێتە دەرەوە.

هەستی بەرگری دژی دووەم هەوکردن بەباسیلەکە لەسەر ڕێژەی دژەتەنی باسیلەکە (کەمترین ڕێژە لە 34 یە) لەخوێندا بەندە.

ڕەوەوی نەخۆشییەکە

هەندێکجار گەر لەکاتی خۆیدا زوو هەوکردنەوەکە چارە نەکرێت ئەوا لە 40- 60٪ ی نەخۆشەکان بەخنکان دەمرن ، هەندێك جاری دی گەر لە 2 هەفتەدا چارەنەکرێن ئەوا نەخۆشییەکەیان کوتوپڕوناڵۆز دەبێت ئەوسا نیشانەکان دەردەکەون.

لە هەندێك جۆری وەناقدا نیشانەکان لەپڕ دەردەکەوێت و باری گشتی نەخۆش (تا، ژانەسەر، بێهێزی، لەش داهێزران) تێك دەچێت ، گەندە پەردە ڕەنگی خوێن وەردەگرێت چونکە شێوەی لوولەی هەیە خێرا دەتەنێتەوە ، لە وانەشە نەخۆش تووشی خوێنرێژی ببێت. جگەر گەورە دەبێت و لەچەند ڕۆژێکدا بەهۆی سستی سوڕدانی خوێن و دڵەوە دەمرێت.

دەستنیشانکردن

- نیشانەکان ، گەندە پەردە و گەورەبوونی لیمفەگرێکان.
- مێژووی تێکەڵی بە نەخۆشێکەوە کە وەناقی هەبێت.
- تێستی تاقیگایی ، وەرگرتنی نمونەی سەر مەرازەکان ، ناو لووت یان شلەی ناوپۆشەکان و ناردنی بۆ تاقیگا و چاندن و زێدکردنی باسیلەکە لە تاقیگادا.

چارەسەرکردن

- پێویستە نەخۆش هەمیشە لە نەخۆشخانەدا چارەسەربکرێت.
- پێویستە نەخۆشییەکە ڕابگەیەنرێت و نەخۆشیش لە نەخۆشخانە بهێڵرێتەوە.
- نەخۆش بۆ ماوەی مانگێك بحەوێتەوە.
- پێویستە نەخۆش خۆراکی هەمەرەنگ بخوات (بەتایبەتی شلەمەنی) چونکە نەخۆش تووشی گیروگرفتی جووین دەبێت.

پێویستە پێش دەستپێکردنی چارەسەرکردن سێرەمی دژی وەناق 1000- 4000 یەکە/ کگم بەپێی باری نەخۆشەکە بدرێت بە نەخۆش بۆئەوەی سێرەمەکە ژەهری باسیلەکە لە سوڕدانی خوێندا لاببات یان هاوسەنگ بکات. (ئەکادیمییای منالانی ئەمێریکایی پێشنیار دەکات ، پێویستە 20-40 هەزار یەکە سێرەمی دژی وەناق لە 48 کاژێردا بدرێت بەمندال).

تێبینی: سێرەمەکە ناتوانێت کاربکاتە سەر ئەو ئەندامانەی کە ژەهرەکەیان لەسەر چەسپ بووە.

**لەرمانی**

پێویستە رۆژی 2 گم ئیریترۆمایسین (بە مەبەستی پاککردنەوەی لەش لەباسیلەکە بەکاربهێنرێت) ، بۆماوەی 7- 10 رۆژان بدرێت بە گەورە. هەروەها رۆژانە 20-40 ملگم/ کگم دەدرێت بە منداڵ .

لەباری کوتوپڕدا پێویستە لەخوێنهێنەرەوە یان لە ماسولکەوە پرۆکاین پەنسیلین G بدرێت بە نەخۆش .

مەڵبەندی کۆنترۆڵ و خۆپاراستن لە نەخۆشییەکانی ئەمێریکا ئەم پێشنیارانە دەکات:

- ئەو منداڵانەی کێشیان لە ژێر 20 کیلۆگرامەوەیە 300 هەزار یەکە سێرەمیان لە 12 کاژێردا بدرێتێ.
- ئەو منداڵانەی کێشیان لەسەروو 20 کیلوگرامەوەیە ، 600 هەزار یەکە سێرە میان بدرێتێ.
- پاشتریش 125- 250 ملگم پەنسیلینی V یان بدرێتێ.

یان: ئیریترۆمایسین ، رۆژانە 120- 500 ملگم بۆ 2 هەفتە دەدرێت بە نەخۆش. یان: یەك ژەم دەرزی بێنزاتین پەنسیلین G، 600 هەزار تا نزیکەی ملیۆنێك و دوو سەد هەزار یەکە بدرێت لە نەخۆش.

**خۆپاراستن**

- دوورکەوتنەوە و پەیوەندی نەکردن (لە ماڵەوە و لەنەخۆشخانە) بە نەخۆشەوە.
- پێکوتە دژی وەناق باشترە لە چارەسەرکردن.
- لەساڵی 1991 دا مەڵبەندی کۆنترۆڵ و خۆپاراستن لە نەخۆشییە درمەکانی ئەمێریکا بڕیاری دا:

لە 6 هەم هەفتەوە تا تەمەنی 7 ساڵان پێویستە 3 جاران نیو ملیلیتر دەرزی (DPT) لە شێوەی پێکووتەدا بدرێت لە منداڵ. هەروەها لە 4- 8 هەفتەدا و لە 6- 8 هەفتەییدا یان 4 جاران لەنێوان 6- 18 مانگاندا و پاش 3 ساڵان جارێکی دی بدرێت لە منداڵ.

منداڵ لەسەروو 7 ساڵانەوە: دوو جاران دەکوترێت ، ماوەی نێوان یەکەم و دووەم پێکووتە 4-8 هەفتەیە ، سێیەم کوتان لە 6-12 هەفتەدا یان دواتر دەدرێت لەمنداڵ.

**راگەیاندنی نەخۆشی**

پێویستە بەڕێوەبەرایەتی تەندروستی (ئینستیتوتی کۆنترۆڵ و خۆپاراستن لە نەخۆشییە درمەکان) کاربەدەستانی وەزارەتی تەندروستی ئاگاداربکەن کە وەناق دەرکەوتووە تا خێرا هەوڵی بەربەستکردنی بکرێت و بە هۆی راگەیاندنەوە دانیشتوان ئاگادار بکرێنەوە.

**سەرچاوەکان**

References:

1.Marin GH. Voiculescu, Diphtheria, In: Infectious diseases, Vol 11, 1990, 62: P 229-243
2.Rob Roy Mac Gregor., Corynebacterium Diphtheriae. In: Principles and practices of infectious diseases, 1995; 184: 1865-1871.
3.Calalb, G., Diphtheria, Medical Edition, 1967
4.Sanford T. Shulman, Bacterial infectious of the upper respiratory tract. In: The biologic and clinical basis of Infectious Diseases. Fifth edsn. 1997.
5.Chen Rt, et al. Diphtheriae in the United States, 1959-1970, J Infect Dis 1974, 129: 172-8
6.Taindel, CI., Diphtheria., In: Infectious Diseases, Edited By M. Voiculescu Didac and Pedag eds. 1980, 163-170.
7.Dixon JMS. Diphtheriae in north America. J Hyg (camb). 1969, 280: 135-41
8.Diphtheria. In: Report of the Committee on Infectious Diseases 22nd eds Elk Grove Village IL American Academy of Pediatrics; 1991; 191-5.
9.Jellard CH. Diphtheriae infection in northwest Canada, 1969. 1970. and 1971 J Hyg 1972, 70: 503-10
10.A-Paunescu-Podeanu, Principles for Medical Practics., Vol 111 . Med Eds 1984
11.Melvin I. Marks and Jerome O. Klein. Bacterial infections of respiratory tract. In: Infectious Diseases of the fetus newborn infant, 4th eds. W. B. Saunders Company 1995; 22: 891-898
12.CDC. Recommended childhood immunization schedule United States, MMWR, 1996, 45: 35-8
13.CDC Recommended childhood immunization schedule United States. MMWR, 1997, 2 35-39
14.Weekly Epidermiology Record, No. 20, 19 May 1995
15.Communicable disease profile Iraq, updated 19 mars 2003. WHO/CDS/2003 17

# گازگرتنی گیانەوەر

ئەوەی شایانی باسە هەر یەکێك لە ئێمە لە وانەیە رۆژێك لە رۆژان گیانەوەرێك گەستبێتی (یان بیگەزێت) و شوێنی گازەکە هەوی کردبێت . ئەمیش یەکێکە لەوبارە تایبەتییانەی رۆژانە پاش گەستن ، رووشاندنی پێست یان ماسولکەی شوێنە گەستراوەکە مرۆ تووشی ئازار ، تا و سور هەڵگەڕاندنی شوێنەکە و هەندێکجار رشانەوە دەبێت . لە ساڵی 1950 دا (Debre) یەکەم کەس بوو لەسەر سۆی پاش گەستنی گیانەوەری نووسیوە .

هەر لە هەمان ساڵدا (Mollaret) یش لەسەر (Lymphoreticuloz benign) ی نوسیوە . ئەوەی راستی بێت ئەم هەوکردنانە لە هەموو جیهانداو بگرە لە کوردستان دا بە رێژەی جیاواز رۆژانە مەنیشتوان تووشی گیروگرفت دەکەن و گرنگترینیان بریتین لە گەستنی سەگ و پشیلە و مار.

## گازگرتنی سەگ

زۆرجاران سەگ رووخساری منداڵ دەگەزێت ، گەستنی دەست و پاش بینراوە ، گەستنەکان ئاساییە و لە 15٪ یان شوێنی گەستنەکان هەودەکات

### فریاگوزاری

- پێویستە پزیشك بپرسێت ئایا گەستراو بە دژی دەردەکۆیان یان رابیا خۆی کوتراوە یان نا ؟
- خێرا برینەکە بشۆرە ، نمونەیەك لە شوێنی قوڵی ددان یان لە برینەکە وەربگرەو بینێرە بۆ تاقیگا .
- زۆر پێویستە شوێنی گازی سەگ بە کراوەیی بمێنێتەوە تا هەوای لێ بدات .
- لە کاتی برینی پاش گەستنی دەستدا پێویستە پەنسیلین یان ئێریترۆمایسین بدرێت بە نەخۆش .

**تێبینی** : لە کاتی گەستنی پشیلەدا شوێن گازەکە قوڵترە و زۆرجاران هەودەکات .

**تێبینی** : پاش گەستنی مرۆڤیش دەستنیشانی هەر دوو سترێپتۆکۆکەس و ستافیلۆکۆکەس کراوە .

## گازگرتنی پشیلە

ئەوەی شایانی باسە لە کاتی گەستنی پشیلەدا ماوەی 3 کاژێرشوێنەکە زۆر ژان دەکات . سووربونەوە یان پەنمانی ئاستی گەستنەکە لە 2 سم زیاترە و شوێنەکە شلەی لێدێتە دەرەوە ، تا لە سەروو 38 پلەوەیە . لە 50٪ ی بارەکاندا هەوکردن دەردەکەوێت .

### هۆزانی

بەکتریای (pasteurella multocida) کە بەکتریایەکی گرامنێگەتیفە ئاسراوترین بەکتریایە کە دەبێتە هۆی هەکردنی پاش پشیلە گەستن . بەڵام ستافیلۆکۆکەسی ئاوریوس و سترێپتۆکۆکەسەکان بە دەگمەن لە نێو گیانەوەراندا دەستنیشانکراوە .

### دەستنیشانکردن

بەسەرهاتی نەخۆش ، شوێنی گەستنەکە و نمونە بۆ تاقیگا زۆر گرنگن .

### چارەسەرکردن

پێش نیشانەکان یان پاش دەرکەوتنی نیشانەکان رۆژانە 3 ژەمی 1 گم PG بۆ ماوەی 10-14 رۆژان بدرێت بە گەستراو .

بۆ مندالٚ ئەمۆکسیسیلین بە پێی کێش 3 ژەم دەدرێت بە نەخۆش . لە کاتی هەستداری دژی پەنسیلیندا پێویستە دۆکسیسیلین بدرێت بە نەخۆش گەر ستافیلۆکۆکەس دەستنیشانکرا ئەوسا پێویستە Flucloxacillin بدرێت بە نەخۆش پێویستە پاش 2-3 رۆژان نەخۆش بێتەوە بۆ کۆنترۆڵکردن .

## گازگرتنی مار

لە زۆربەی بارەکاندا مندالٚ زیاتر مارانگاز دەبێت وەك لەگەورە .

**نیشانەکان**

شوێنی ، ئازار ، پەنماوی ، پەیدابوونی بلۆق ، ئاوسانی لیمفە گرێکان .

بەرتەکی گازگرتنەکە بەندە لەسەر جۆر و کەم و زۆری ژەهری مارەکە و شوێنی گەستنەکە . گیروگرفتی سوڕدانی خوێن ، خورپە ، تەنگەنەفەسی ، هێڵنجدان ، رشانەوە ، ژانەسك و سکچوون ، خوراندنی لەش و تالێهاتن .

گۆرانکارییەکانی پێست ، نیشانەی کۆئەندامی ناوەندی دەمار ، هاوکات نیشانەی ناتەواوی گورچیلە و گیروگرفتی مەینی خوێن دەردەکەوێت .

**چارەسەرکردن**

- پشودان و هێمن کردنەوەی نەخۆش
- کردنەوەی برینەکە .
- کوتانی دژی دەردەکۆیان (لە کاتی گومانگردندا کوتاندنی دژی رابیا گرنگە).
- لە کاتی خورپەدا کۆرتیزۆن و ئەدرێنالین دەدرێت بە مارانگاز .

**سەرچاوەکان**

**References**

1. Iwarsson –Norrby, infektionsmedicin, klinik och terapi, Säve Förlag 1998. 439-450.
2. Arne Tärnvik (Brucella och pasteurella) klinisk bacteriologi. Arne Forsgren Göran Kronvall (red), studentlitteratur, Lund, 1996 sida 428-433,

# بەشی چوارەم

## نەخۆشییە بەکتریاییەکان

1- سالمۆنێلاکان
2- گرانەتا
3- دیزانتری بەکتریایی
4- کۆلێرا
5- سکچوونی کوتوپڕ بە ئیشیریا کۆلای
6- برینی گەدەو ریخۆڵە (هێلیکۆباکتێر)
7- سۆی کامپیلۆباکتێر
8- سووربونەوەی میزەرۆکان

## سالمۆنێلاکان
## Salmonellosis

**کۆمەڵێک بەکتریایی چیلکەیی گرامنێگەتیڤن سەر بە خێزانی Entero bacteriaceae ن ، بەپێی جۆری ئەنتیجێنی (O) ناویان لە Z-A لێنراوە ، بە ژمارەش نێویان لە 51-61 لێنراوە تا ئەمڕۆ زیاتر لە 2500 جۆری سێری سالمۆنێلا جوداکراوەتەوە.**

**سالمۆنێلا گەورەکان**

**بریتین لە** (S. Typhi، S. Paratyphoid A, B، C. S. Enteritides) **دەبنە هۆی نەخۆشی لەمرۆڤدا و گچکەکانیش دەبنە هۆی هەوکردن لە ئاژەڵی دیدا. ئەوەی راستی بێت هەوکردنە سالمۆنێلاکان لە 4 گرووپی گەورەدا دەردەکەون کە ئەمانەن :**

- **بێنیشانەکان** (مرۆ هەڵگری بێنیشانەیە) .
- **نیشانەدار** (نیشانەکان لە 1-2 هەفتەدا دادەمرکێنەوە) .
- **سالمۆنێلا ژاراوییەکان** (گرنگترینیان گرانەتایە) .
- **هەوکردنە جێگاییەکان** (زیاتر لە نێو ریخۆڵەدا دەبنە هۆی دەرکەوتنی نیشانەکان)

**مێژوو**

- دوو پزیشکی ڤێتێرنەری ئەمێریکی سمیپ و سالمۆن لەسالی 1886 دا بەکتریای سالمۆنێلای جۆری Cholera suis یان جوداکردەوە.
- گارتنێر لەساڵی 1888 لە ئەڵمانیا جۆری S. enteritides ی جوداکردەوە.
- لفلەر لەساڵی 1890 جۆری S. typhi marinum جوداکردەوە.
- لە ساڵی 1900 دا بۆ یەکەمجار وشەی سالمۆنێلا بەکارهێنرا.
- لە ساڵی 1987 ژمارەی سالمۆنێلاکان گەیشتە 2200 جۆر.

**پەتازانی**

**هەوکردنە سالمۆنێلاییەکان گرنگترین هەوکردنە گەڕۆکەکانن کە لەجیهاندا بڵاون. بۆ نموونە لە سوێددا سالانە نزیکەی 5000 کەس تووشی سالمۆنێلا دەبێت لەمانە تەنیا 30-40 کەسیان تووشی گرانەتا بوون و نزیکەی 30-50 یان تووشی سوکە گرانەتا (پاراتایفۆید) بوون. لە 80٪ تووشبوان لە دەرەوەی سوێد تووشی سالمۆنێلا دەبن. سەرچاوەی سەرەکی بەکتریاکە سەگ ، بەراز ،مریشك ، گا ، پشیلە ، مشك ، ماسی ، بۆق و باڵندەیە. ڕۆژانە بە سەدان کەس لە جیهاندا تووشی جۆرێکی سالمۆنێلا دەبێت.**

**ڕێگاکانی گواستنەوە**

**- لە ڕێگای خواردنی پیس بوو یان ئالودە بە بەکتریاکە وەك گۆشت ، قیمە ، شیر و هێلکە. لەوانەیە هەموو خۆراکێك تووشی بەکتریاکە ببێت و پاشتریش مرۆڤ تووشی هەوکردن بکات.**

**- گواستنەوەی ڕاستەوخۆ لە نێوان 2 ئەندامی خێزانێکدا (لە دایکەوە بۆ منداڵ).**

**لێرەدا باسی گرنگترین سۆی سالمۆنێلا لە کوردستاندا دەکەین کە زۆربڵاوە و بریتییە لە گرانەتا. هۆکاری پیس و پۆخڵی ، دواکەوتوویی ، بایەخنەدان بە تەندروستی گشتی و ڕێزنەگرتن لە خۆپاراستن و گوێ نەدانە پاکژی ژینگە بوونەتە هۆی سەرەکی بڵاوبوونەوەی ئەم بەکتریایە کە زیانێکی زۆر بە ئابوری حکومەت و دانیشتوان دەگەیەنێت .**

## **گرانەتا**

**یەکێکە لە نەخۆشییە درمە توندە بڵاوەکانی وەرزی هاوینی باشوری کوردستان ، بەمانای تای گران یان تای قورس دێت. زۆرجار زاراوەی تایفۆئیدی بۆ بەکاردەهێنرێت ، بە دەگمەن مرۆڤ دووجار تووشی گرانەتا دەبێت.**

**هۆزانی**

**هۆی نەخۆشییەکە بەکتریایەکە بە نێوی سالمۆنێلای تایفی لەجۆری D سەر بەخێزانی ئینتێرۆباکتریایە و چیلکەیی و گرامنێگەتیڤ و بزێوە. لە باشوری کوردستاندا زێدتر جۆری (A, E, F1, D1) لە هەموو جۆرەکانی دی**

**بڵاوترە. بەکتریاکە لەپلەی گەرمی خوێندا زێد دەبێت ، بەئاسانی لەئاوی کوڵاودا دەمرێت ، لە بەفر و ئاودا نزیکەی 2-3 مانگ دەژی ، لە ئاوی پاك و سوێردا زیاتر دەبێت و بە هیشکایی درەنگ دەمرێت. لە خاکدا 1-5 مانگ و ئاوی ڕووباردا 4-10 مانگ و لە ئاوی کەناڵدا 6-12 مانگ دەژی، لەشیردا 1-7 ڕۆژ دەژی و لە پیساییدا 25 ڕۆژ دەژی . بەڵام لە 60 پلەی گەرمیدا نزیکەی 20 خولەك دەژی.**

**مێژوو** (4)

- لەسالی 1829 (P. ch. A. Louis) لەپاریس تایفۆئیدی لەجۆرەکانی دی نەخۆش لیمفە گرێکانی ریخۆڵە و سپڵ دا جوداکردەوە.
- ولیام ژێنرا لە ساڵی 1850 دا تایفۆئیدی ئاورهەوای لە نەخۆشی تایفۆئید جودا کردەوە.
- وێلسۆن لەسالی 1869 دا زاراوەی تای ریخۆڵەی گۆڕی بۆ تای تایفۆئید.
- بودد لەسالی 1873 دا سەلماندی کەخۆراك و ئاو گرانەتا دەگوێزنەوە.

- كارل ئێربێرت لە سالی 1880 دا بۆ یەکەمجار هۆی تایفۆیدی جوداکردەوە کە پاشتر بوە هۆی دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکە .
- گافکی (ئەڵمانیا) لەسالی 1884 دا باسیلی تایفۆئیدی لەسپلی نەخۆشێکدا جودا کردەوە.
- پفێر و کالێ لەسالی 1869 دا یەکەم پێکوتەی دژی گرانەتایان دروست کرد.
- تیۆدۆر و دوارد و هاوڕێکانی لەسالی 1948 دا رایانگەیاند کەچارەسەری ژانی ماسولکەی گرانەتادارێکیان بە Chloromycetin واتە کلۆرامفینیکۆل کرد.

## پەتازانی

نەخۆشییەکە لە هەموو جیهاندا بلاوە ، بەلام لە ولاتە گەرم و فێنکەکاندا لە هاویندا زۆرە و خێرا بلاودەبێتەوە. گەر مرۆیەك جار تووشی نەخۆشییەکە ببێت بە دەگمەن دووبارە تووشی دەبێتەوە. زۆرجاران مرۆڤ دەبێت بە هەلگری بەکتریاکە و تەنیا بە هۆی تێستی پیساییەوە دەتوانین دەستنیشانی مرۆڤ بکەین کەهەلگری بەکتریاکەیە. سالانە ، لە باشووری ئەوروپا دا 2000 کەس تووشی گرانەتا دەبن و لە ئیسپانیا سالانە نزیکەی 1000 کەس تووشی نەخۆشییەکە دەبن. ئەوەی راستی بێت گرانەتا زۆر بە ئاسانی لەکاتی جەنگ دا بلاودەبێتەوە ، هۆی ئەمەش ماندوویی ، پیس وپۆخلی و زۆری ئیشە.

## رێگاکانی گواستنەوە

- پەیوەندی راستەوخۆ لەگەل نەخۆش یان هەلگری بەکتریاکە (پیسایی، میز، رشانەوە، تف، بەلغەم) دەبێتە هۆی گواستنەوەی بەکتریاکە.

لەدەمەوە باسیلەکە دەگاتە ریخۆلە باریکە، لە نێوپۆشی ریخۆلەدا خۆی مەلاس دەدات و بە کەنالە لیمفاویەکاندا خۆی دەگەیەنێتە نێو لیمفەگرێکانی هەناوبەند و لەوێدا زۆر دەبێت.

پاشتریش خۆی دەگەیەنێتە نێوخوێن و بە ئاسانی بە هۆی لیمف و خوێنەوە بەنێو لەشدا بلاودەبێتەوە.

- پەیوەندی ناڕاستەوخۆ، رێگای تەپ و تۆز، مێش ، خواردنەوەی ئاوی میکرۆباوی ، شیری باش نەکولاو ، میوەی پاکژ نەکراو کەباسیلەکەی تێدا بێت یان سەوزەیەك باش نەشوردرابێتەوە . زۆر نەخۆش پاش چاك بوونەوەیان ماوەیەکی نادیار هەلگری بەکتریاکەن هاوکات لەگەل پیسایی و میزیاندا بەکتریاکە دەکەنە دەرەوە بۆیە ئەو کەسانە مەترسی ئەوەیان لێدەکرێت ببنە چاوگی نەخۆشییەکە.

## نیشانەکان

ماوەی کرکەوتنی بەکتریاکە لە نێوان 10-14 رۆژدایە. لەوانەیە نیشانەکان لەسەرخۆ دەربکەون ، لەوانەشە لە ناکاو نەخۆشییەکە بەم نیشانانە دەست پێدەکات:

- پێشەنگی نیشانەکان تایەکی قورسە و نزیکەی 6-7 رۆژ لە نێوان 39-40 پلە دا دەمێنێتەوە ، بێهێزی و لاوازی ، ئازاری ماسولکە ، کەمبوونەوەی ئارەزووی خواردن ، لیری تایبەتی رەنگ پەمبەیی لەسەر سك و سنگی

نەخۆش (نیوە تیرەیان 3-4 ملم) دەردەکەوێت و نزیکەی 24 کاژێر دەمێنێتەوەو ونەبن و رۆژی دواتر پەلەی دی دروست دەبنەوە. ئازاری ناوچەوان ، لووت پڕان ، کۆکە ، خەوی ناخۆش ، بەلغ گرتنی زمان . دەم هیشك بوونەوە ، سکچوون ، یان گرفتی. نەخۆش میز کەم دەکات ، هەندێك جار میز خوێناویە.

تێبینی: لە نەخۆشی سوکە گرانەتا (پاراتایفۆید) دا ئەم لیرانە گەورەترن و زێدەتر لەسەر دەست و پا دەردەکەون.

تێبینی: پلەی گەرمی ئێواران پلەیەك لە پلەی گەرمی بەیانیان زیاترە.

– لە کۆتایی هەفتەی یەکەمدا نەخۆش بارێکی تایبەتی بەسەردا دێت:
لەش داهێزراوی و لەش قورسی، سووربوونەوەی روومەت، هیشکبوونەوەی
لێوەکان و دەم، پشتی زمان بەڵغێکی سپی چڵکن دەگرێت و لەماوەی شەو و رۆژێکدا سکی نەخۆش چەند جارێك دەچێت ، پرتەی دڵ توند و لە سەرخۆ تر (کەمبوونەوەی ژمارەیان) و ژمارەی هەناسەدان زۆر دەبێت.
– سپڵی نەخۆش گەورە دەبێت و 35٪ی نەخۆشەکان جگەریان گەورە دەبێت. میز خەست دەبێتەوە و تۆخ دەبێت ، پێست هیشك دەبێتەوە ، ژانە سەر و تینویەتی نەخۆش شپرزە دەکات.
– پاش هەفتەی یەکەم لیری پەمبەیی بازنەیی نەختێك بەرز لەسەر سنگ ، سك و بن باخەڵ دەردەکەون. هەندێکجار لەسەر دەست و پا دەردەکەون ، هەندێکجاری دی ئەم (لیرانە) خاڵانە زۆر کەم دەردەکەون. ئەم خاڵە پەمبەیانە بەکۆمەڵ پەیدادەبن و هەر کۆمەڵێك 3-4 رۆژ دەمێنێتەوە بە گشتی خاڵەکان 10-21 رۆژ دەمێنێتەوە.
**تێبینی**: **دەرکەوتنی لیری زۆر مانای توند و تیژی گرانەتا نییە !!.**
– لە هەفتەی دووەم دا تا دەگاتە پلەیەکی نەگۆڕ و تەنیا بەیانیان پلەیەك
نزم دەبێتەوە ، هێدی هێدی ژانە سەر کەم دەبێتەوە بەڵام لاوازی ، بێهێزی و
نیشانەکانی دی توندتر دەبن ، ئیتر تالێهاتن نەخۆش بە تەواوی لاواز دەکات و بۆ ماوەی 24 کاژێر نەخۆش دەکەوێتە قۆناخی بێهۆشییەوە. هەندێکجار ژەهری بەکتریاکە دەبێتە هۆی لەباربردنی ئاولەمە. هەندێك جاری دی ژەهری سالمۆنێلا دەبێتە هۆی مردنی ئاولەمە و کۆرپەلە بە مردوویی لە دایك دەبێت یان شیرەخۆرە پاش چەند رۆژێك دەمرێت.
ئەوەی راستی بێت هەندێك جار نیشانەکانی گرانەتا لەگەڵ سورەتا، دەردەباریکە، ئینفلوەنزا، رەشە گرانەتا، تای ماڵتا، لەرزوتا و هەندێك نەخۆشی تردا لەیەك دەچن.
لە بەرئەوە پێویستە زۆر بە وردی سەیری نەخۆش بکرێت و تێستی تاقیگایی بۆ بکرێت و بەکتریاکەش دەستنیشان بکرێت بۆئەوەی پزیشك بە هەڵەدا نەچێت و بە رێکوپێکی دەرمانی دامرکاندنەوەی نیشانەکان و ئەنتیبایۆتیك دیاری بکات.
– لە هەفتەی سێیەمدا نەخۆش روو لەچاکبوونەوە دەکات، تا نزمدەبێتەوە، زمان پاك دەبێتەوە و نەخۆش باشتر دەبێت.
– لە هەفتەی چوارەمدا نەخۆش بە تەواوی چاك دەبێتەوە و نیشانەکانی گرانەتا نامێنن.
**کورتەی نیشانەکان بەپێی کۆئەندام:**
– کۆئەندامی هەرس ، هیشکبوونەوەی زمان ، پێی دەگوترێت (زمان برژاو) ، هەندێکجار نزیکەی 1-3 برینی بازنەیی گچکەی بێئازار لەنێو دەم دێت (وەك بۆقژە وایە) پێیان دەگوترێت مەرازەکانی Duguet.
– لەهەفتەی 3-4 دا برینی گچکەی دی لەسەر نێو پۆشی مەڵاشوو دەردەکەون و سەر زمان و ئەم لاولای زمانە گچکەش دەگرێتەوە. هەندێك جاری دی مەرازەکان دەسووتێنەوە و نەخۆش لە خواردن دەخەن، سکی نەخۆش پڕە لە با ، لەوانەیە پیسایی کردن ئاسایی ببێتەوە ، وەلێ جگەر و سپڵ هەر گەورەن.
– کۆئەندامی هەناسە، سیکڵدانۆچکەسۆ بە تایبەتی لە منداڵدا، هەناسەی خێرا خێرا دەبیترێت .

- کۆئەندامی دڵ و خوێن، بە باشی لێدانی دڵ نابیسترێت، لێدانی دڵ نەرم و بێهێزە، هەرکاتێک ژمارەی لێدانی دڵ زێد بکات (زێدتر 120 لێدان) ئەوا ڕێرەوی نەخۆشییەکە بەرەو سەختی دەڕوات.
- کۆئەندامی میز، کەمبوونەوەی میزی نەخۆش، جارجاریش میزی خوێناوی دەبینرێت، هەروەها لەتاقیگادا دەردەکەوێت کە میزی نەخۆش ئەلبومینی زۆری تیادایە .
- نەخۆش تووشی کەمخوێنی و بێهێزی دەبێت.
- ژمارەی خڕۆکە سپییەکان دەگەنە نێوان 2000-3000 و لەسەر باری نەخۆشییەکە بەندە. خانە هاوتاکان کەم دەبنەوە.
- زۆرجار خەپلەکانی خوێن (ترۆمبۆسایت) و ڤیتامین K کەم دەبنەوە و دەبنە هۆی خوێن پژانی لووت، پووک و گۆلینک.

سارێژبوونەوە

بریتییە لەو ماوەیەی کە نەخۆش دەگەڕێتەوە باری پێشووی و ئەمیش لە 2-4 هەفتەدا دەبێت ، لە 5-25٪ ی نەخۆشەکان گرانەتایان لێهەڵدەداتەوە و 4-7 هەفتەی دی نەخۆشییەکە درێژە دەخایەنێت.
(لەم بارەدا نەخۆش بەباشی خۆی چارەسەر ناکات و کاتێک دەبینێت نیشانە کوتوپڕەکان رەویونەتەوە وا دەزانێت چاکبۆتەوە و بیر لەوە ناکاتەوە کەبەکتریاکە هەر لە لەشیدا ماوە بۆیە نیشانەکان سەر لەنوێ دەردەکەونەوە).
هەرچەندە لە 3-5٪ ی نەخۆشەکان بێنیشانەن وە دووبارە دەرکەوتنەوەی گرانەتا مانای ئەوەیە سالمۆنێلا لە شانە و پێکهاتوە لیمفاویە مردووەکاندا هەر هەیە. چاکبوونەوەی شانە لەناوچووەکان وا دەکات کە سالمۆنێلا جارێکی دی خۆی بگەیەنێتەوە نێو خوێن و دووبارە دەربکەونەوە.
ئەوەی شایانی باسە زۆرجار قۆناخێکی نوێ بەسەر باری نەخۆشدا دێت ، لەم قۆناخە نوێیەدا لە 5-10٪ ی نەخۆشەکان نزیکەی 4-7 رۆژ لە گەڵ دەرکەوتنی نیشانەی دی دا تایان لێدێت.
هەروەها تێسستە تاقیگایەکانی نەخۆش پۆزەتیڤە. هەندێکجار نەخۆش 2-3 جار یەک لەدوای یەک گرانەتا دەگرێتەوە و تووشبوونەوە بە گرانەتا وەک نەخۆشییەک بە دەگمەن تۆمار کراوە.

جۆرەکانی گرانەتا

1- بە پێی کوتوپڕی گرانەتا

- کوتوپڕە گرانەتا، لە منداڵدا (لە ساوادا کەمە) نیشانەکان زۆر توند و تیژن.
- ناوەندە تا، مرۆڤ لەماوەیەکی کورتدا چاکدەبێتەوە و دووبارە نەخۆشییەکەش دەگرێتەوە.

پەردەسۆی مێشک ، لووت پژان ، خوێن بەربوون، سکچوونی کۆلێرایش دەبینرێت.

2- بەپێی جۆری نیشانەکانی و چۆنیەتی دەرکەوتنیان

- گرانەتای سییەکان ، گرانەتای پەردەی مێشک.

3- بەپێی تەمەن

- شیرە خۆرە و ساوا ، نیشانەکان زۆر توندن.
- گەورە ، نەخۆشییەکە کوتوپڕە ، مەترسی نیشانەی دڵی لێدەکرێت.

گەر دووگیان تووشی گرانەتا ببێت ئەوا دەبێتە هۆی لەبارچوونی ئاولەمە یان لەوانەیە منداڵی نابەکام (پێش 9 مانگان) لە دایک ببێت.

**دەستنیشانکردن**

- سەرەتا تالێهاتن ، خاڵی سوری بازنەیی، گەورەبوونی سپڵ و جگەر گرنگە.
- چاندنی خوێن ، لە 90-100٪ دەستنیشانی بەکتریاکە دەکات.
- لە هەفتەی یەکەم دا (چاندنی پیسایی پۆزەتیڤە)، بەڵام لە هەفتەی دووەم دا (چاندنی میز پۆزەتیڤە).
- لە هەفتەی دووەم دا (دژەتەنەکان بەرزدەبێتەوە) و لە هەفتەی چوارەمدا دەگاتە لووتکە.
- خوێن ، نزمبوونەوەی خرۆکەی سپی، خانەی لیمفی، خرۆکەی سور و کەمخوێنی.
- بەرزبوونەوەی ئەنزیمەکانی جگەر.
- تێستی Widal زۆر بەسودە.
- تێستی RWA دەستنیشانی گرانەتا دەکات ، بەڵام تێستەکە لە منداڵی ساوادا بێ سودە.

**ئاڵۆزکارییەکان**

- خوێنبەربوونی ریخۆڵە (بەهۆی بریندرابوونی بۆریەکی خوێنەوە) لە کۆتایی قۆناخی دووەمی نەخۆشییەکەدا روو دەدات.
- کوونبوون و خوێنبەربوونی کۆتایی ریخۆڵە باریکە لەیەك شوێندا یان لە چەند شوێنێکدا.
- گیروگرفتی دڵ و بۆریەکانی خوێن ، گرانەتای ناوپۆشی دڵ.
- گیروگرفتی دەمار، مێشکە سۆ(لەم بارەدا دەبێتە هۆی گێلی)، پەردە سۆی مێشك ، گونچکە سۆ تاد.

**چارەسەرکردن**

- پاکژکردنی کەلوپەلی پیس بوو بە میز، رشانەوە، بەڵغەم و پیسایی نەخۆش.
- پێویستە پاش کوڵاندن و ساردکردنەوەی ئاو یان ئاوی نێو شووشە بدرێت بە نەخۆش.

**دەرمان**

- دەرمانی Ciprofloxacin رۆژی 2 ژەم ی 500-750 ملگم دەدرێت بەو نەخۆشانەی کە باری گشتییان باشە .
- هەمان دەرمان رۆژی 2 ژەمی 400 ملگم لە خوێنهێنەرەوە دەدرێت بەو نەخۆشانەی کە بارەکەیان سەختە.
- چارەسەرکردنی نیشانەکان، پێویستە دەرمانی دژی تا و ئازاری لەش (شاف) بدرێت بەنەخۆش.
- پاکوخاوێنی گشتی، بە تایبەتی نێودەم و پووك ، حەوانەوە ، ڤیتامین زۆر پێویستە.
- لەکاتی تاداری دا پێویستە ئاو و شلەی دی (شیر، شەربەت) زۆر بدرێت بە نەخۆش.

**خۆپاراستن**

- جوداکردنەوەوپاکوخاوێن راگرتنی نەخۆش‌و کەسوکاری، پاکوخاوێنی ژینگە، پاکژکردنی ئاودەستخانەولە ناوبردنی بەکتریاکە
- بڵاوکردنەوەی زانیاری دەربارەی تەندروستی گشتی.

دووبارە چاندنی پیسایی‌ومیزی نەخۆش بۆ دووبارە دڵنیابوون .

**پێکووتە**

ئەوەی راستی بێت بە 3 شێوە پێکووتە هەیە:

1- پێکووتەی دەرزی بەنێوی Typhim vi نادرێت لەمنداڵی ژێر دوو ساڵان.

2- پێکووتە لەشێوەی شلەدا هەیە و لە هەفتەیەکدا 3 ژەم بەرگرییەکی باشی پەیداکردووە.

کەپسولی Vivotif، لەشێوەی پێکووتە لەسالمۆنێلای زیندووی بێهێز و بەستوو دروستکراوە ، ماوەی 3 ساڵان مرۆڤ بەرگری پەیدا دەکات.

**تێبینی :** ئەم کەپسولانە نادرێت بە دووگیان و منداڵی ژێر 5 ساڵان.

**سەرچاوەکان**


1- ئەحمەد مستەفا ئەحمەد، گرانەتا، تەندروستی و کۆمەڵ، ژمارە 1، ل 30-34، هەولێر، 1987.

**References**

1.**Abram S. Benenson**, Control of Communicable Diseases in Men, Ed a 75th Amer. Publ. Health Ass., 1990.
2.**Adriana Baltiev**. Febra tifoida. In: Boli ınfectioase, Editura didactica si pedagogica Bucurest-1980.
3.**Watson K**. Isolation of Salmonella typhi from blood stream. J. Lab Clin. Med. 1959; 47: 329-32.
4.**Marin GH**. Voiculescu, Infectious Diseases, Medical Ed. vol 2. Bucurest-1990; 438-56
5.**Benenson, A**. Control of Communicable Diseases in Men, Ed. A 14-a Amer. Publ. Health Ass., 1985.
6.**Samuel I. Miller et al.**, Salmonella., In Principles and practice of Infectious Diseases. 1995; 2013-32.
7.**Vivotef**. Oral typhoid vaccin for reseprofylax, Cortec Medical AB, 1996


## دیزانتری بەکتریایی

نەخۆشییەکی هەوکردوی درمە بە زۆری لە وڵاتە گەرمەکاندا دەبینرێت ، شوێنی سەرەکی سۆکە ناوەندی ریخۆڵە ئەستورەیە.

**هۆزانی**

بەکتریایەکە بەنێوی خۆرەی دیزانتری جۆری Shigella ، بەکتریاکانی گرامپۆزەتیڤە سەر بەخێزانی ئینتێرۆبەکتریاکانە. بە پێی جۆری کیمیایی و پێکهاتووی ئەنتیجێنی 4 جۆری گچکەیان هەیە کەئەمانەن:

1- جۆری گچکەی A بریتییە لە Schinga, Agne, Schmitz، 10 جۆری هەیە.

2- جۆری گچکەی B بریتییە لە Flexner، 6 جۆری هەیە.

3- جۆری گچکەی C بریتییە لە Boyd، 15 جۆری هەیە.

4- جۆری گچکەی D بریتییە لە Soone، تەنیا یەك جۆری هەیە.

**مێژوو**

-هیپۆکرات بۆ یەکەمجار نێوی دیزانتری بردووە.

-کانتێمێسێ و ڤیدال لە ساڵی 1888 دا جۆرێك بەکتریایان جودلکردەوە کەدەبووە هۆی دیزانتری.

-شیگە (میکروبیۆلۆجی یابانی) لەساڵی 1898 دا لە توێژینەوەیەکدا باسی بەکتریاکەی کردوە.

-پاشتر ئەو بەکتریایەی شیگە دۆزیبوویەوە نێوی (شیگێلای دیزانتری جۆری یەك)ی لێنرا.

-فلێکستێر، سترۆنگ و موسگراڤ لەساڵی 1890 دا جۆری دی و هۆی دیزانتری یان دۆزییەوە.

باسیلەکە زۆر کەم بەرگەی گەرما دەگرێت ، لە 55 پلەدا تەنیا کاژێرێك دەژی، لە 15-30 خولەکدا بەپاکژکەری فینۆڵ 1٪ دەمرێت و هەروەها کەم بەرگەی هۆکاری کیمیکیی دەگرێت ولە دەرەوەدا زۆر بەرگری لەخۆی دەکات لە ئاوی رووبار و زێدا 3 مانگان دەژی ، لە ئاوی پیسی سەرشەقام و زۆنگاوەکاندا 2-4 رۆژ دەژی ، لەشیر و پێکهاتووەکانیدا 5-7 رۆژ دەژی ، لە پیسایدا تەنیا چەند کاژێرێك دەژی و لە بەفرو سەهۆڵدا نزیکەی 2 مانگ دەژی. شیگێلا لە دەمەوە دەچێتە نێو کۆئەندامی هەرسەوە و بەترشەڵۆکی گەدەدا تێدەپەرێت.

له ریخۆڵەدا باسیلەکە هێرش دەکاتە سەر ناوپۆشی ڕیخۆڵە ئەستورە (بەتایبەتی بەشی ڕێکە و کۆم) و دەبێتە هۆی برین دروستبوون و لەناوبردنی بۆریە خوێنەکان.

**تێبینی: تەنیا 10–100 گرام لە بەکتریای شیگێلا بەسە بۆ دەرکەوتنی دیزانتری .**

**پەتازانی**

نەخۆشییەکە لەهەموو جیهاندا (بەتایبەتی لەناوچە گەرمەکاندا) بڵاوە ، گەر نەخۆشییەکە تووشی ساوا و منداڵ (باخچەی منداڵان) ببێت ئەوا زۆر بە سەختی دەستی بەسەردا دەگیرێت. دیزانتری لە هاوین و پایزدا زێدترە ولەم ساڵانەی دوایشدا نەخۆشییەکە لەزستانیشدا بڵاوبۆتەوە. سەرچاوەی سەرەکی دیزانتری مرۆڤی نەخۆشە، بە تایبەتی مرۆڤی بێنیشانە هەڵگری بەکتریاکە بێت.

**ڕێگاکانی گواستنەوە**

ڕێگای سەرەکی گواستنەوەی بەکتریاکە پیسایی بۆ دەمە. هەروەها پیس و پۆخڵیو پەیوەندیکردن بە کەلوپەلی بەکارهێنراوی نەخۆشەوە. زۆرجاران دیزانتری لە ڕێگەی شیر، دۆندرمەی پیس بوو بە بەکتریاکەوە بڵاودەبێتەوە.

هەندێکجاری دی نەخۆشییەکە لە زستاندا و بەتایبەتی لە نێو قوتابخانە، نەخۆشخانە، باخچەی ساوایان ، بەشی ناوخۆیی قوتابیاندا بڵاودەبێتەوە. جگە لەساوای شەش مانگان بەگشتی منداڵ زۆر مەترسی تووشبوونیان لێدەکرێت. لە منداڵی ژێر 9 ساڵاندا ڕێژەی تووشبوون دەگاتە لە 8٪، بەڵام لەپیردا ڕێژەکە نزیکەی لە 50٪ دایە. هەروەها بۆ ماوەی 12-18 مانگ (بەرگری پاش تووشبوون) لە دیزانتری باسیلی شیگێلادا دروست دەبێت.

**نیشانەکان**

ماوەی کڕکەوتنی باسیلەکە لەنێوان 2–3 ڕۆژدا یان لەنێوان 1-7 ڕۆژدایە. سەرەتا نەخۆش لەرزوتایەکی توند، بێهێزی و لاوازی ، لەش داهێزران ، ئازار و پێچ هاتن بەسکدا، لەوانەیە نەخۆش هێڵنج و ڕشانەوەی هەبێت. نیشانەی سەرەکی دیزانتری سکچوونە، چەند کاژێرێك پاش دەرکەوتنی نیشانەکان پەیدا دەبێت. سەرەتا پیساییەکە نەختێك شلە ، پاشتر پیسایی کەم دەبێتەوە و خوێناوییە ، پێیدەووترێت لیمان !! لە 50٪ ی نەخۆشەکان زۆر لەخویان دەکەن و لەسەر ئاودەستخانە پیسا ییان نایەت، لەبەر ئەم هۆیەشە ناوپۆشی ڕێکە و کۆم دێتە خوارەوە ، ڕۆژی وایە 5–6 یان 20–100 جاران نەخۆش دادەنیشێت و هەندێکجار نەخۆش بەلەفیرێی تووش دەبێت.

**جۆرەکانی دیزانتری**

1- سوکە دیزانتری ، زێدەتر لە گەورەدا دەردەکەوێت.

2- ناتایبەتە دیزانتری ، لە 10–23٪ دا تووشی گەورە دەبێت.

3- سەختە دیزانتری ، زۆرجاران دیزانتری ژەهراوییە هۆکەی شیگێلای دیزانتری یە، هەندێکجار پاش هەوکردنێکی سەخت دەردەکەوێت و دەبێتە هۆی ژەهراوی بوونی نەخۆش و لەدەستچوونی شلەیەکی زۆری نێو لەش و سەرەنجام دەبێتە هۆی دروست بوونی گیروگرفتی دەماری و دەروونی.

4- بە پێی تەمەن: لەساوا و منداڵی گچکەدا، شێوەی جیاوازی هەیە و دەبێتە هۆی گەشکە و سستی سوڕدانی خوێن و لە 7٪ ی ساوایان دەمرن.

5- جۆری کلینیکی (بەپێی جۆرەکانی شیگێلا).

**ئالۆزکارییەکان**

- سڕبوون یان ئیفلیجی دەم و چاو.
- رۆماتیسمی دیزانتری.

**رێڕەوی نەخۆشییەکە**

لە ماوەی 1-2 رۆژی چارەکردندا نیشانەکان خاو دەبنەوە و کوتوپڕی یان نامێنێت و هەندێکجار نەخۆشییەکە بەرەو تولانی دەڕوات.

**دەستنیشانکردن:**

- بەپێی مێژووی نیشانە کلینیکیەکان و شێوەی پیسایی دەستنیشانکردن ئاسان دەبێت .
- تێستی باکتریۆلۆژی بۆ دەستنیشانکردنی ژەهری بەکتریاکە (Verotoxin=VT, Shiga Like Toxin= LST)
- گەورە ، پێویستە نزیکەی 15-20 سانتیمەتر سۆندەی نێلتۆن بکرێتە نێو رێکە و بگرە سەرووتریش تا بتوانرێت نموونەیەکی پیسایی بەهۆی ئامێری (کۆلۆنۆسکۆپەوە) راستەوخۆ لە نێوپۆشی کۆلۆن یان بەهۆی کراندنی نێوپۆشی ریخۆڵەوە وەربگیرێت و زۆرخێرا لە تاقیگادا باسیلەکە بچێنرێت.
- منداڵ، پێویستە نزیکەی 10-15 سانتیمەتر لە سۆندەی نێلتۆن بکرێتە نێو رێکە و هاوکات بە هۆی سرنجێکی گەورەوە پیساییەکە رابکرێشرێتە نێو سۆندەکەوە تا تێستی راستەوخۆی لەسەر بکرێت بۆ:
  - ناسینەوەی جۆری باسیلەکە. – قۆناخی بایۆکیمیکیی تایبەت.
  - لە کاتی چاندنی پیسایی دا خوێن و خرۆکەی سپی لە نێو پیساییەکەدایە .

**چارەسەرکردن**

جوداکردنەوە و حەوانەوە زۆر بەسودە بۆ نەخۆش . لە 24 کاژێری یەکەمدا پێویستە نەخۆش ئاو و شلەمەنی وەك (چا ، شۆربای سوێر ، شۆربای

گوێزەر، ئاوی برنج) زۆر بخواتەوە بۆ جێگرتنەوەی شلەی لە دەستچوو.

هەروەها پێویستە پەنیری مانگا ، شۆربای گۆشت، سێوی پاککراو، نانی برژاوی سپی و پەتاتە بدرێت بە نەخۆش. نابێت ئەو خۆراکانەی مادەی سیلیلۆزیان تیادایە بدرێت بە نەخۆش.

**دەرمان**

**منداڵ:** رۆژی 10 ملگم / کێشی لەش تریمیتۆپریم لەگەڵ 50 ملگم / کێشی لەش سولفامیتۆکسازۆڵ بە دوو ژەم (لە 12 کاژێردا) بۆ ماوەی 3-5 رۆژان دەدرێت بە نەخۆش.

**گەورە:** پێویستە رۆژانە 2 جار 400 ملگم norfloxacin یان رۆژانە 2 ژەمی 500 ملگم ciprofloxacin بۆ 3 رۆژان بدرێت بە نەخۆش . هەروەها دەتوانرێت دەرمانی ئەمۆکسیسیلین بدرێت بە نەخۆش.

**سەرچاوەکان**

References:
1.**Abram S. Benenson, Control of** Communicable Diseases in Men, Ed a 75[th] Amer Publ. Health Ass., 1990.
2.**Marin Voiculescu, Bacterial Disantry**, In: Infectious Diseases, Didactic and Pedagogic Ed, Bucurest-1980.
3.**Marin GH. Voiculescu, Bacterial Disantry**, In Infectious Diseases, Medical Ed, vol 2. Bucurest-1990; 477-91
4.**M. Schaechter, Gerald M and Barry** I. Eisenstein. Mechanism f Microbial Disease. Williams & wilkins, 1993.
5.**Barbara A. B., Nrman T. Begg and Stephen** H Gillespie Infectius Disease. Blakwell Science 1996.
6.**Benenson, A. Control of** Communicable Diseases in Men, Ed A 14-a Amer Publ. Health Ass., 1985.
7.**Herbert** L. Dup ont., Bacillary Disentry., In: Principles and Practice of Infectious Diseases, 1995; 2033-386.
8.**Summary of notifiable Diseases** USA, 1987, MMWR, 1988, 36, (sept 16).
9.**Rubhana Raqib. Pathogenesis and immune** Responses in Shigellosis Doctoral dissertation, Karoliniska Institute. **Huddinge University Hospital and the** department of Immunology. The Arrhenius Laboratories for Natural Sciences, **Stockholm University**, Stockholm, Sweden 1995 pp 9, 12
10.**Speelman, P., I. Kabir and M. Islam** Distribution and spreas of colonic lesions in Shigellosis: a colonoscopic study. **J Inf Dis**. 1984; 150: 899-903.

# کۆلێرا

**یەکێکە لە نەخۆشییە سۆییە کوتوپڕە گرنگەکانی کۆئەندامی هەرس کەزۆر لە مێژە بۆتە هۆی گیروگرفتێکی سەرەکی دانیشتوان (بە تایبەتی ناوچە گەرمەکانی هێڵی ئیستیوا و نزیک هێڵی ئیستیوا) ، نیشانەی سەرەکی نەخۆشییەکە سکچوونە. تا چەند ساڵێکیش لە مەوبەر کۆلێرا گیروگرفتێکی تەندروستی دانیشتوانی باشووری کوردستان بووە.**

**هۆزانی**

**بەکتریای گچکەیە لەکۆمەڵی گرامنێگەتیڤ بە نێوی (Vibrio Cholerae)، لە خێزانی (Vibrionaceae) یە. ئەوەی راستی بێت زێدتر لە 60 جۆری سێرەمی Vibrio Cholerae هەیە، تەنیا جۆری سێرەمی01 دەبێتە هۆی کۆلێرا، ڤیبریۆی 01 یش 2 جۆرن (17):**

**1- جۆری کلاسیکی.**

**2- جۆری EL Tro.**

**هەر جۆرێك لەمانە دەکرێت بە 2 جۆری ترەوە بەنێوی Ogawa و Inaba. جۆری EL Tro هۆی سەرەکی زۆربەی کۆلێرای نوێیە، بەڵام جۆری کلاسیکیش دەبێتە هۆی کۆلێرا. هەروەها جۆری سێرەمی Hikojima یش دەبێتە هۆی کۆلێرا. ڤیبریۆکە شێوەی قامچیداری هەیە و لەسەر رووی ئاو یان لەدەریادا دەژی . لە بەرئەم هۆیەشە نەخۆشییەکە لە وەرزی هاوین – پاییزدا لە کەناری دەریاکاندا زیاتر بڵاوە. ئەوەی پێویستە لێرەدا ئاماژەی بۆ بکەم ئەوەیە سێرەمی 01 تایبەتە بە باسەکەمان کە بەرپرسیاری سەرەکی کۆلێرایە. ڤیبریۆکە شێوەی هەڵوێستە (کۆمای) هەیە و درێژی ، مایکرۆنە و لە سەرێکییەوە قامچییەکی پێوەیە کەبە هۆیەوە زۆر و بەئاسانی دەبزوێت. بەکتریاکە 2 جۆر ژەهر دەردەدات کە ناسراون بە (A لە 60 ٪) و (B لە 40 ٪) ە**

**مێژوو** (18,8,3)

- یەکەمجار نەخۆشییەکە لەهیندستان دا دەرکەوت.
- لەساڵی 1905 دا Gotschlih جۆرێکی بەکتریاکەی لە لەشی مردوودا جیاکردەوە. پاشتر نەخۆشییەکە وڵاتانی درلوسێی وەك پاکستان، بەنگلادێش و بۆرمای گرتەوە.
- ئەوەی شایانی باسە 6 جار نەخۆشییەکە بۆتە هۆی بڵاوبوونەوەی گەورە لەساڵانی 1817 و 1913 و لە ساڵی 1999 دا نەخۆشییەکە هەر لەهیندستاندا بڵاوبۆتەوە.
- لە ساڵی 1913 دا لەنزیك دەریای سپی ناوەڕاست بڵاوبۆتەوە و بە (شەڕی باڵقان) ناسراوە.
- لە ساڵانی 1945-1949 دا نزیکەی 842 هەزار کەس بەنەخۆشییەکە مردن.
- هەروەها لە 1950-1954 (بەپێی راپۆرتی ژمارە 9-10 ی ساڵی 1956 ی رێکخراوی تەندروستی جیهانی) نزیکەی 385 هەزار کەس مردوون.
- پاشتریش نەخۆشییەکە گەیشتۆتە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەك میسر و لەو ناوچانەی نزیکدا بڵاوبۆتەوە.
- لە ساڵانی 1961 لە ئیندۆنوسیا، لە 1964 لەهیندستان. لەساڵانی 1970 دا لەباشووری کوردستان و رۆژهەڵاتی ئەوروپا دا بڵاوبووە.
- لە 1973 ئیتالیا دا بڵاو بۆتەوە، لەساڵی 1982 لەبەنگلادیشدا بڵاوبۆتەوە.

- له سالی 1985 دا 48 هەزار و 507 کەس تووشی نەخۆشییەکە بوون، تا سالانی 1986-1987 دا لەپێنج ولاتدا هەر هەبووە.
- له سالی 1991 دا له ولاتی پیرۆ نەخۆشییەکە بلاوبۆتەوە. لەسالی 1992 له بەنگلادیش. له 1993 دا لەئەمێریکا هەبووە.
- ل سالی 1995 نەخۆشییەکه له باشووری کوردستاندا بلاوبۆتەوە.
- هەر لەسالی 1995 دا له ئۆکرانیا و رووسیادا نەخۆشییەکه بلاوبۆتەوە.
- له مانگی یەکی 1997 دا نەخۆشییەکە لەنێجیریا بلاوبۆتەوە و نزیکەی 200 کەسی پێ مردوون.
- پاش شەری کەنداو 1991 له شاری سلێمانی له نێوان مانگی سێپتەمبەر-ئۆکتۆبەردا 20 کەسی تۆمارکراو به کۆلێرا هەبوون و یەك مردووش تۆمارکراوە (21).

## پەتازانی

ئەوەی راستی بێت لە کۆندا نەخۆشییەکە لەهەندێك ناوچەی باشووری ئاسیادا هەبووە و بۆیە زیاتر ناوی "کۆلێرای ئاسیا" ی لێنراوە. هەر له ئاسیا بەکتریاکە 7 جاران بۆتە هۆی بلاوبوونەوەی گەورە و هەموو جارێك ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانی ناوچەکەی کوشتووە. له 1961 دا بۆ یەکەمجار گەیشتۆتە باشووری کوردستان و (تا ئەمرۆش هەیە) سالانە لەشارە گەورەکاندا چەندەها باری کۆلێرا تۆمارکراو هەبووە بەلام رێژەی مردن لەچاو ولاتانی تردا زۆر کەمتر بووە، لەبەرئەوەی توانراوە زوو کۆنترۆلی بلاوبوونەوەکە بکرێت.

بەلام لەسالانی 1854 دا له لەندەن و 1892 دا له هامبۆرگ نەخۆشییەکە بەرێگەی پەیوەندی لەنێو خەلکی دا بلاوبۆتەوە. له سالی 1971 دا ژمارەی تووشبووان گەیشتوونەتە 155 هەزار و 550 کەس. له سالی 1977 دا ر ت ج رایگەیاند کە ژمارەی مردووان به نەخۆشییەکە له 15 ولاتدا قەبلێنراوە به 85 هەزار و 661 کەس.

سالانە ژمارەی ئەو ولاتانەی کە کۆلێرایان تیادا بلاودەبێتەوە له زێد بووندایە و هەریەکەیان مانگانە یان سالانە راپۆرتی خۆیان لەسەر (ژمارەی تووشبووان، ناوچەی بلاوبوونەوە، هۆی بلاو بوونەوە و چۆنیەتی دەست بەسەراگرتن) دەدەن بەم رێکخراوە جیهانییە.

(گومان لەوە دەکرێت کە سەرچاوەی بلاوبوونەوەی نەخۆشییەکە له کوردستاندا بگەرێتەوە بۆ ئەو کرێکارە هیندی و پاکستانی و بەنگلادیشیانەی کە لەحەفتاکاندا میری بەغداد هێنابوونیە کوردستان بۆ کارکردن).

سەرچاوەی نەخۆشییەکە مرۆڤی نەخۆشە، لەم سالانەی دواییدا هەلگری درێژخایەنی ڤیبریۆکە (زراو شوێنی خۆمەلاس دانی ڤیبریۆکە بووە) دەستنیشان کراوە. ماوەی کردنە دەرەوەی ڤیبریۆکە 2-3 هەفتەیە. له ناوەراستی سالی 2005 دل نەخۆشییەکە له رۆژهەلاتی کوردستاندا بلاوبۆوە وەلیٚ خۆشبەختانە تەشەنەی نەکرد بۆ باشووری کوردستان .

## رێگاکانی گواستنەوە

رێگای سەرەکی گواستنەوەی ڤیبریۆکە رێگای پیسایی بۆ دەمە ، ئەمیش له رێگەی:

- پەیوەندی راستەوخۆ له نێوان نەخۆش و لەش ساخدا.
- خواردنەوەی ئاوی جۆگەلە و بیر کە ڤیبریۆکەی تیادا بێت
- خواردنی خۆراکی پیس بوو بە ڤیبریۆکە (شیر، گۆشت ، ماسی ، میوە ، سەوزە).
- بەکارهێنانی کەلوپەلی نەخۆش (قاپ و قاچاخ).

**درمی کۆلێرا**

درمی نەخۆشییەکە زۆر زۆرە بەتایبەتی جۆری Biotype EL Tro لەو شوێنانەدا کە هەژارن و باری ئابووری و پاکو خاوێنی ژینگە و شارستانیەت زۆر نزمە. پاش تووشبوون ، ڤیبریۆکە هیچ جۆرە بەرگرییەك لە لەشدا بەجێ ناهێلێت. ئەوەی راستی بێت بەرگری کوتانیش دژ بە ڤیبریۆکە تەنیا بۆ 3–6 مانگە.

**سوڕی نەخۆشییەکە**

ڤیبریۆکە لە دەمەوە دەگاتە سورێنچك و پاشتریش دەگاتە نێو کۆئەندامی هەرس، زیاتریش لە ریخۆڵە باریکەدا نیشتەجێ دەبێت چونکە تفتێتی شوێنەکە زۆر لەبارە بۆ زۆربوونی ڤیبریۆکە. هەروەها برینی گەدە و ریخۆڵە لەو بارەدا هۆکاری یاریدەدەرن.

ڤیبریۆکە لە ترشەڵۆکی نێو گەدەدا PH 4.5 یان کەمتردا دەمرێت، هەروەها نزمی ترشەڵۆکی گەدە و ریخۆڵە هۆکاری یارمەتی دەرن بۆ تووش بوون بە ڤیبریۆکە.

**نیشانەکانی کۆلێرا**

بەکتریاکە لە 1-3 رۆژدا کردەکەوێت، لەسەرەتادا نەخۆش لەپڕتووشی سکچوون (ژمارەیان زۆرە) و پاشتریش بێرەنگ دەبن تا وەك ئاوی برنجیان لێدێت، هەر جارێك کە سك دەچێت نزیکەی لیترێك شلە لە لەش دەکرێتە دەرەوە (رۆژانە 15–20 لیتر شلە دەکرێتە دەرەوە). ئەمەش دەبێتە هۆی نزمبوونەوەی خوی کالیسیۆم، پۆتاسیۆم کە دەبنە هۆی بێهێزی و شێواوی زیندەپاڵ ، رشانەوە ، گرژبوونی ماسولکەکان لەش و ژانەسك و رەقبوونی ماسولکەی سك !!. ئەوەی شایانی باسە لە 25 ٪ ی نەخۆشەکان تایان لێدێت. لەکیس چوونی شلەیەکی زۆر لە رێگای سکچوون و رشانەوە دەبێتە هۆی داقوپاندن و هیشك و رەق هەڵگەڕانی روومەت و لووت فشی و چاو زەقی و بەقوڵاچوویی، هیشکبوونەوەی پێستی لەش و ساردبوونەوەی لەش. نەخۆش ئارەقەیەکی چەور دەر دەدات، هەناسەدان زۆر و ڕووکەش دەبێت ، هەوای هەناسەدانەوە ساردە.

نەخۆش میزی کەمدەبێتەوە و هەندێکجار هەر میز ناکات. زێدبوونی (ژمارە) لێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پلەی گەرما (تا دەگاتە ژێر 34 پلەوە).

نەخۆش نائارام و شپرزە دەبێت و سك و سنگی نەخۆش ژان دەکات. لە گەڵ ئەم نیشانانەدا باری دەروونی ، مێشکی نەخۆش ئاساییە ، ناگۆڕێت و هەندێکجار نەخۆش ماوەیەك لەهۆش خۆی دەچێت.

**ڕێڕەوی کۆلێرا**

لەوانەیە نەخۆشییەکە 3 ڕێڕەو بگرێت کەئەمانەن:

1– مردن (لە 50–80 ٪ بێچارەسەرکردن نەخۆش دەمرێت).

2–چاکبوونەوەیەکی خێرا (کەمبوونەوەی ژمارەی سکچوونەکان و رشانەوەکان ، رێکبوونەوەی پرتەی دڵ، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، گەرمبوونەوەی پێست، دەست پێکردنەوەی میزکردن .. تاد).

3– کۆلێرای گران، هەندێکجار پاش گەڕانەوە بۆ باری جاران نەخۆش تووشی تای (بەرز و نزم) دەبێت) هەندێکجاری دی تا وەکو تای گرانەتای بەرزە (41–42.8) پلەی گەرمی)، کە ئەم تا بەرزە لە کۆلێرای ئاسایی دا دەرناکەوێت.

**ئاڵۆزكارییەكان**

- بەردەوامبوونی سكچوون.
- بریندارببوونی بۆریە خوێنەكان.
- لەبارچوونی منداڵ.
- سییە سۆ، گورچكە سۆ، گلاندە سۆی لاجانگ.
- لاڕەشەی سەر پەنجەكانی دەستوپیا یان هەندێكجار سەری چوك (كێن) و ناوگەڵی نەخۆش دەگرێتەوە.

**دەستنیشانكردن**

- بەپێی نیشانەكان ناوچەیەكی گومان لێكراو (یەكێك لەو شوێنەوە هاتبێت).
- دەستنیشانكردنی بەكتریۆلۆجی (پێویستە ڤیبریۆنی كۆلێرا لە ڕشانەوە و پیسایی نەخۆشدا جیابكرێتەوە).
- لە ڕێگای سۆندەیەكی لاستیكەوە كە دەكرێتە نێو كۆمی نەخۆش

دەتوانرێت پیسایی نەخۆش بكرێتە ناو شووشەیەكی تایبەتییەوە (ماددەی Cary-Blair) تێدابێت و ببرێت بۆ دەستنیشانكردنی بەكتریاكە.

- ڕشانەوە لە شووشەی پاكژكراودا كۆدەكرێتەوە و دەبرێت بۆ تاقیگا.
- تێستی PCR ڕێگایەكی دی جیاكردنەوە و ناسینەوەی ڤیبریۆكەیە.
- تێستی سیرەمی ڕێگایەكی ترە بۆ دەستنیشانكردن، لە یەكەم هەفتەدا دژەتەن و دژە ژەهری ڤیبریۆكە زۆر بەرزدەبێتەوە.
- پێویستە بە ڕێگای بەكتریۆلۆجی جۆرە جیاوازەكانی ڤیبریۆكە و بەكتریاكانی دی لە یەكتری جیابكرێنەوە.

بە پێی ڕێژەی لە دەستچوونی شلەی لەش و هیشكبوونەوە جۆرەكانی هیشكبوونەوە بریتین لە:

**1- سووكە هیشكبوونەوە:**

كەمێك لاستیكی پێستی لەش كەم دەبێتەوە ، تینوێتی، زیادبوونی ژمارەی لێدانی دڵ، لە دەستچوونی لە 5 ٪ ی كێشی لەش ، یان كەمبوونەوەی 50 ملیلیتر / كگم كێشی لەش لە منداڵدا یان 2500 ملیلیتر / كگم لە گەورەیەدا.

1- **هیشكبوونەوەی مامناوەندی:**

كەمبوونەوەی لاستیكی پێستی لەش، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن (بەپێوە)، زیادبوونی لێدانی دڵ، ترپەی دڵ بە ئاستەم هەستی پێدەكرێت،

لە دەستدانی لە 8 ٪ ی كێشی لەش، یان كەمبوونەوەی لە 80 ملیلیتر / كگم كێشی لەش لەمنداڵدا یان 4000 ملیلیتر / كگم لەگەورەیەك دا.

2- **هیشكبوونەوەی بەهێز:**

لەم بارەدا لاستیكی پێست بە تەواوی كەمبۆتەوە، پەستانی خوێن زۆر نزمە، لە هۆشخۆچوون، لە دەستدانی لە 10 ٪ ی كێشی لەش، یان كەمبوونەوەی 100 ملیلیتر / كگم كێشی لەش لەمنداڵدا یان 5500 ملیلیتر / كگم لە گەورەیەك دا.

چارەسەرکردن

هەموو کاتێك چارەسەکردنی باری تیژی نەخۆشییەکە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ڕێژەی مردن، یەکەم هەنگاو بۆ چارەسەرکردنی ئەم بارە بریتییە لە هاوسەنگی شلەی سوڕدانی خوێن.

پێویستە پەیڕەوی ئەم خاڵانە بکرێت:

- پێویستە نەخۆش لە بەشێکی تایبەتدا لە نەخۆشەکانی دی جودا بکرێتەوە، هەروەها جوداکردنەوەی نەخۆشە گومان لێکراوەکانیش لە بەشێکی دیدا.
- چارەسەرکردن لەبەشی فریاگوزاری ئەو نەخۆشانەدا کە باری گشتییان زۆر تێکچووە.
- پاکژی و پاکوخاوێنی لەکاتی نەخۆشییەکی وەك کۆلێرادا پێویستە:
  - پیساییەکان و ڕشانەوەکان جیابکرێنەوە .. تاد
  - جیاکردنەوە و پاکژکردنی کەل و پەلی بەکارهێنراوی نەخۆش.
  - پێویستە کاربەدەستانی نەخۆشخانە هەموویان دژی کۆلێرا خۆیان بکوتن.

چارەسەرکردنی ناتەواوییەکان

- پێویستە نەخۆش شلە و ئاوی دڵۆپاو وەربگرێت تا شوێنی شلەی لە دەستچوو پڕبکاتەوە.
- پێویستە بەخوێنهێنەردا یان لەدەمەوە شلە و خۆراك بدرێت بەنەخۆش.
- هەوڵدان بۆ دابین کردن و چاك کردنەوەی فرمانی گورچیلە.
- بەکارهێنانی ئەنتیبایۆتیك دژی ڤیبریۆنی کۆلێرا.
- زۆر پێویستە نەخۆش بحەوێتەوە و خۆراك و شلەی بەسودی بدرێتێت.

دەرمان (17)

دۆکسیسیلین ، یەك ژەمی 300 ملگم زۆر بەسودە (نادرێت بەسکپڕ).

تێتراسایکلین ، هەر 6 کاژێرێك 500 ملگم × 2 گم ماوەی 3 ڕۆژ دەدرێت بە نەخۆش. فورازۆلیدۆن، ڕۆژی 4 × 100 ملگم ، ماوەی 3 ڕۆژ دەدرێت بە گەورە.

خۆپاراستن

پێویستە هەموو کەسێك کە لەنزیك نەخۆشەوە بووبێت تێستی ڤیبریۆکە بکات و گەر نەخۆش زوو چارەی خۆی نەکات ئەوا دەبێت بەهەڵگری ڤیبریۆکە، چاودێریکردنی پاکوخاوێنی نەخۆشخانە زۆر پێویستە تا کۆلێرا بڵاونەبێتەوە. لەماوەی 3 مانگدا کوتانی دژی کۆلێرا دەبێتە هۆی دروستبوونی بەرگری ، ئەمیش لە 40–80 ٪ دەبێتە هۆی دروستکردنی بەرگری دژی نەخۆشییەکە. ساڵی 2000 پرۆفیسۆر Jan Holmgren و خێزانەکەی لەئینستیتوتی کارۆلینسکای سوید جۆرێك کوتانیان دروست کردووە (دوو کیسەی بچووکی پێکهاتووی بیکاربۆنات دەکرێتە پەرداخێك ئاوەوە و دەخورێتەوە) تا ئەمڕۆ پاش تاقیکردنەوە و توێژینەوە ئەنجامی باشی هەبووە.

سەرچاوەکان

References
1.Gerald T. Keusch, Cholera., In: Harissons principles of internal medicine. ed 12th. 1991. 632-633.
2.WHO. Guidelines for Cholera Control. WHO/CDD/er/80 4 Rev1 Geneva 1986.
3.Ludovic Paun, Holera., In: Infectious Diseases. Didactic and Pedagogic Ed, Bucurest-1980.
4.Rosenberg CE. The Cholera Years Chicago. University of Chicago press. 1962.
5.Marquez GG. Love in the time of Cholera. New Yourk Alfred A Knopf: 1988.
6 Barua D Laboratory diagnosis of Cholera In. Barua D. Butywsw. eds, Cholera. Philadelphia. WB, Saunders. 1974

7.Colwell RR. Ed. Vibrons in the Environment New Yourk John Wiley & Sons; 1084.
8 Marin GH. Voiculescu, Infectious Diseases. Medical Ed. vol 2 Bucyrest-1991, 506-519.
9.Benenson, A. Control of Communicable Diseases in Men, Ed A 14-a Amer Publ Health Ass., 1985.
10.Abou, S. Susceptibility of Cholera. Lancet. 1948 1903
11.Azurin, J. C. et al. A Longterm Carrier of Cholera, Bull Wld Hlth Org. 1967; 37, 745.
12.William B. Greenough 111. Vibrio Cholerae and Cholera , In: Principles and Practice of Infectious Diseases. 1995 1934-44.
13.Politzer R., Cholera. Geneva: WHO 1959
14.Sandy SC. Et al., Anew Cholera toxin (letter). Lancet. 1983, 1: 1337.
15.Ted Lankester, Setting Up Community Health Programmes, UK 1992.
16.Abram S. Beneson, Control of communicable diseases in Men, Ed A 75th Amer. Publ. Health Ass. 1990.
17.Ann M. Arvin and Y vonne A Maaldonado, Protozoan and Helminth Infections. In: Infectious Diseases of the fetus newborn infant, 4th eds. W. B. Saunders Company 1995; 18: 745-756
18.Weekly Epidemiological Record, No 21, 28 May 1996.
19.WHO. Guidelines for Cholera Control Geneva 1993.
20.Weekly Epidemiological Record, No. 28, 14 july 1995.
21.Communicable Disease Profile IRAQ, Updated 19 mars 2003, WHO/CDS/2003.p 74-80.

## سکچوونی کوتوپڕ بە ئیشیریا کۆلای

جۆرێکە لەسکچوون بە هۆی بەکتریای (E. coli) ئیشیریای کۆلاوەیە و بە زۆری لەساوا منداڵی بچوکدا دەردەکەوێت. بەکتریاکە لە گەورەدا دەبێتە هۆی سکچوونی خوێناوی و هەندێکجاریش دەبێتە هۆی هەوکردنی کۆئەندامی میز.

**هۆزانی**

هۆی سەرەکی سکچوونەکە بەکتریایەکی گرامنێگەتیڤە بەنێوی ئیشیریای کۆلای E. coli. بەکتریاکە 4 جۆر ئەنتیجێنی هەیە (O-antigen, k- antigen, H- antigen, F- antigen) ئەنتیجێنی (O) نزیکەی 165 جۆر، ئەنتیجێنی (H) نزیکەی 54 جۆرو ئەنتیجێنی (K) نزیکەی 103 جۆری سێرەمی هەیە. هەرچەندە ناتوانرێت هەموو جۆرە سێرەمییەکان جودا بکرێتەوە، جوداکردنەوەی جۆری سێرەمی بەکتریاکە گرنگیەکی زۆری پەتازانی هەیە . ئەوەی راستی بێت 4 جۆر E. coli دەبنە هۆی پەیدابوونی سکچوون کە بریتییە لەجۆرێك ژەهری بەکتریاکە.

**پەتازانی**

هەندێك توێژیار دەبێژن ئەم جۆرە سکچوونە لە 50-80٪ ی هەموو سکچوونەکانی منداڵ (ژێر 2 ساڵان) دەگرێتەوە. لەو شوێنانەدا کە پاکوخاوێنی گشتی و ژینگەیان تیادا پشت گوێ خراوە زێدترە نەخۆشییەکە بڵاوە. لەساڵی 1996 دا E. coli 0157:H7 لەیابان بڵاوبۆوە. یەکەمجار لە ساڵی 1982 پاش بڵاوبونەوەیەکی باکتریاکە ناسرایەوە .

**رێگاکانی گواستنەوە**

بەکتریاکە زۆر بەئاسانی لە رێگای دەستی پیس، کەلوپەلی پیس بووەوە (بە تایبەتی لەبەشی منداڵی تازە لە دایکبوودا و باخچەی منداڵاندا) دەگوێزرێتەوە. زۆرجاران لەشوێنە قەڵەباڵەخەکاندا دەبێتە هۆی خێرابوونی سکچوونەکە و لەوانەیە ببێتە هۆی مردنی ساوا.

**میکانیسمی سکچوون**

لە کاتی سکچووندا ناوپۆشی ریخۆڵەکان (باریکە و نەستوورە) جۆرە ئەنزیمێ ئەردەدات، هاوکات پێچولۆچەکانی ریخۆڵە دەکەونە جووڵەیەکی گورج و خێرای نائاسایی و دەبنە هۆی شلبوونەوە و تێکچوونی رەنگ و بۆی پیسایی. ئەمەش مانای ئەوەیە کە زۆربەی ئەو شلانەی لە لەشدان لە گەڵ پیساییدا (لەشێوەی سکچووندا) دەکرێتە دەرەوە. سووتاونەتەوەی ریخۆڵەکان دەبێتە خۆی کەمبوونەوەی توانای مژینی شلە و خۆراك، لەم بارەدا رێژەی مژین زۆر لە رێژەی فرێدان کەمترە . پاش لە دەستدانی شلە و ئاوی نێو لەش پێست هیشك دەبێتەوە و لاستیکی پێست زۆر کەم دەبێتەوە یان هەرنامێنێت. هەندێکجار مرۆڤ تووشی بەدخۆراکی دەبێت چونکە سکچوون دەبێتە هۆی ناهاوسەنگی نێوان ئەو مادە و شلانەی کە لە رێگەی سکچوونەوە چونەتە دەرەوە کە دەبێتە هۆی لەدەستدانی رێژەیەکی زۆر لە خوێ ومادە گرنگەکانی گەشەی شانەکانی لەش. زۆرجاران رەوانی ، رشانەوە و هیشکبوونەوە سێ نیشانەی سەرەکی سکچوونن.

**نیشانەکان**

سکچوونەکە زێدەتر تایبەتە بەساوا و شیرەخۆرە بەهۆی جۆرێکی سیرەوی بەکتریاکەوە کەوەك کۆلێرا وایە. بەکتریاکە لە نێوان 1-2 رۆژدا کردەکەوێت.

لەپر منداڵ تای لێدێت، دەرشێتەوە و سکی دەچێت و پیساییەکە زۆر شل دەبێتەوە ، رەنگی زەردی کاڵ دەبێت و بۆنێکی ناخۆشیشی لێدێت. باری گشتی نەخۆش زوو تێکدەچێت و منداڵ شلەیەکی زۆر بە سکچوون و رشانەوەوە لەدەست دەدات و لەماوەیەکی کورتدا لەهۆش خۆی دەچێت. منداڵ خەواڵو دەبێت، سوکە تای لێدێت، چاوی بەقوڵادەچێت سەر پەنجەکانی دەست و لاقی زۆر سارد دەبن. هەرچەندە سووتانەوەکە بەرگری پاش هەوکردن بەجێ دەهێڵێت و لەوانەیە سکچوونەکە جارێکی دی بە هۆی جۆرێکی سیرەمی تری بەکتریاکەوە تووش ببێتەوە. هەندێکجار نیشانەکان بەشێوەیەکی دی دەست پێدەکەن وەك لەرزوتا و لەپیسایی نەخۆشدا ریشاڵی خوێنی تیادا دەبینرێت.

**دەستنیشانکردن**

نیشانەکانی سکچوونەکە زۆر بەسودن بۆ دەستنیشانکردنی سکچوونەکە، تێستی سێرەمی و بەکتریایی زۆر سودبەخش نین. بەڵام جیاکردنەوەی جۆری ژەهری بەکتریاکە سودبەخشە بۆ دەستنیشانکردن و ئەمیش لە تاقیگای بەکتریۆلۆجی دا ئەنجام دەدرێت.

**رێرەوی نەخۆشییەکە**

زۆر پێویستە زۆر زوو چارەی سکچوونەکە لە شیرەخۆرە و ساوادا بکرێت ، تا رێژەی مردن کەم بکرێتەوە.

**چارەسەرکردن**

پێویستە لەباری کوتوپردا لە خوێنهێنەرەوە خوێناووشەکراو بدرێت بە منداڵ ، کاتێك مەترسی کەمتر بێت لە دەمەوە شلەمەنی و خۆراك دەدرێت بە منداڵ. یان بە سۆندە لە کونە لووتەوە خۆراك دەدرێت بە منداڵ. لە بارە کوتوپرەکاندا پێویستە ئەنتیبایۆتیك لەجۆری نیۆمیسایین 100 ملگم / کگم کێشی منداڵ بدرێت بەنەخۆش. هەروەها دەتوانرێت 50 ملگم ئەمپیسیلین / کگم / کێشی لەش رۆژانە لە 4 ژەمدا بدرێت بە نەخۆش.

**خۆپاراستن**

- پاکوخاوێنی مرۆڤ زۆر گرنگە، بە تایبەتی لەکاتی شیرداندا، خزمەتکردنی منداڵی گچکەی نەخۆش یان کاتێك دایك و باوك لەگەڵ منداڵدا لە نەخۆشخانە دەمێننەوە.
- پێویستە بۆماوەی 6 رۆژ منداڵی سکچوو لە نەخۆشخانە جودا بکرێتەوە.

**سەرچاوەکان**

References:
1.Abram S. Benenson, Control of Communicable Diseases in Men, Ed a 75th Amer. Publ. Health Ass., 1990.
2.Marin Voiculescu, Acute Diarrhea with E Coli In Infectious Diseases, Medical Ed, Bucurest-1990; 491-98.
3.Flexner S. On the etiology of tropical dysentery Philadelphia Med J 1990; 6:417.
4.Shiga K. Observations on the epidermiology of dysentery in Japan Philippine J Sci. 1906; 1: 485.
5.Benenson, A. Control of Communicable Diseases in Men, Ed. A 14-a Amer. Publ. Health Ass., 1985.
6.M. Schaechter, Gerald M and Barry I. Eisenstein Mechanism f Micrbial Disease. Wiilliams & wilkins, 1993.
7.Barbara A. B., Nrman T. Begg and Stephen H Gillespie. Infectius Disease, Blakwell Science 1996.. pp 370-374.
8.Dupont H, Hornick R. et al., Clinical approach to infectious diarrheas, Medicine. 1973; 52: 265.
9.Herbert L. Dupont., Bacillary Disentry., In Principles and Practice of Infectious Diseases, 1995; 2033-38. 9. Levine, 11. M. Escherichia coli Infections, New Engl J Med 1985; 313. 445.
10.World Health, The magazine of world health organization. No. 2, March-April 1997.

## برینی گەدە و ریخۆڵە

یەکێکە لەو نەخۆشییە ناسراوە بڵاوانەی کەم یان زۆر دانیشتوانی دنیای گۆتۆتەوە و بە رێژەی جیاواز دەبینرێت و لە کوردستانی خۆشماندا ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوان بە دەست ئەم نەخۆشییەوە دەناڵێنن و زێدەتر بە زاراوەی عارەبی (قورحە) ناسراوە. هەندێك لە پسپۆرانی نەخۆشییەکانی گەدە و ریخۆڵە نەخۆشییەکە بە نەخۆشی کۆمەڵ ناودەبەن . پێش دۆزینەوەی بەکتریاکە نەخۆشییەکە تولانی بوو و زۆرجاران دەردەکەوتەوە و نەخۆشی وەرس دەکرد وەلێ لە سەرەتای ساڵانی هەشتاکاندا ئاماژە بەو راستییە کراوە کە بەکتریای هێلیکۆباکتێر دەبێتە هۆی برینی سەرنێوپۆشی گەدەو ریخۆڵە . لە ساڵی 1982 (Barry Marshal & Robin Warren) ی ئۆستراڵی بەکتریایHelicobacter Pylori یان جوداکرایەوە ، لە پاداشتی ئەو کارە مەزنەدا ئاکادیمیایی سوێدی خەڵاتی نۆبڵی پزیشکی ساڵی 2005 یان بەخشییە هەردووکیان .

ئەم دۆزینەوەیە بوە هۆی ئەوەی کە بۆچوونێکی جیاواز لە مەڕ برینی گەدەو ریخۆڵە هەمواربکرێت . گەدە و ریخۆڵە سۆ بەم بەکتریایە زۆر ئاساییە و تووشی نیوەی دانیشتوانی جیهان دەبێت بە تایبەتی منداڵ زۆرجاران وەك هەڵگری بەکتریاکە دەستنیشان دەکرێن بەڵام هیچ نیشانەیەکی کلینیکییان نییە . ئەوەی راستی بێت باکتریاکە تەنیا لە قوڵایی نێوپۆشی گەدە و ریخۆڵەی دوانزە گرێدا دیاری کراوە . کاتێك برینەکە دەکەوێتە سەر نێوپۆشی گەدە ئەوسا زۆرجاران مرۆ ئازاری لە بەشی سەرەوەی گەدەی دا هەیە. گەر بێتو مرۆ برینی سەر گەدە و ریخۆڵەی چارەسەرنەکات ئەوا مەترسی ئاڵۆزکارییەکانی لێدەکرێت . گەدە شێوەی تورەکەی هەیە لە سەرەوە بە هۆی کونێکەوە خۆراك لە سورێنچکەوە دێتە نێوی ونێونراوە دەمی سەرەوەی گەدە و بەشی خوارەوەشی بە هۆی کونێکی ترەوە بەستراوە بە ریخۆڵەی دوانزە گرێ وە و ناسراوە بە دەمی خوارەوەی گەدە لەوێوە خۆراك لەرەو ریخۆڵە باریکەو پاشتر ئەستورە دەڕوات .

ئەوەی شایانی باسە ڕۆژانە نێوپۆشی گەدە نزیکەی 2 لیتر لە ترشی بەهێز دەردەکات و ئەمیش پێکهاتوە لە لیك ، ئەنزیمی پێپسین و ترشی. بۆ خۆپاراستن لە کاریگەی ترشی نێوگەدە نێوپۆشەکە هۆرمۆنی پرۆستاگلاندین دەردەکات . هەرچەندە ترشی گەدە ئەوەندە بەهێزە کە چەندین باکتریا لە نێو دەبات وەلێ هێلیکۆباکتێر ماددەیەك دەرژێنێت کە دەبێتە هۆی هاوتاکردنی ترشییەکە وئەوسا زۆر کاری تێناکات . لەم بارەدا باکتریاکە خۆی دەگەیەنێتە بەشی ژێرەوەی نێوپۆشی گەدە یان ریخۆڵە کە ترشییەکەی ناگاتێ و دەبێتە هۆی سووربوونەوە کە ناسراوە بە سووربونەوەی گەدە واتە (Gastrit) .

**جۆرەکانی برینەکە**

1- برینی سەر نێوپۆشی گەدە .

2- برینی سەر نێوپرشی ریخۆڵە (ئەم جۆرەیان زێدەتر ئاساییە) .

**هۆزانی**

- هۆی لە 90٪ ی برینی سەر ریخۆڵە و لە 70٪ ی برینی سەر گەدە دەگەڕێتەوە بۆ هێلیکۆباکتێر (H.Pylori) .

- ئازارشکێنەکان بە تایبەتی ئەسپرین کە بە نێوپۆشی گەدەوە دەلکێت و دەیکاتە برین .

- هۆی نەزانراو ، لەوانەیە هۆی برینی سەر گەدە نەزانرێت .

**هۆکاری یارمەتیدەر**

نائارامی دەروونی ، جگەرە کێشان (دەبێتە هۆی نزمبوونەوەی بەرگری لەش)، لە رادەبەدەر یان رۆژانە مەی خواردنەوە ، نان نەخواردن لە کاتی خۆیدا ، چا و قاوەش رۆڵی خۆیانیان هەیە .

زۆرجاران پاش چارەسەرکردن جارێکی دی لە تێستی سێرەمی دا بەکتریاکە دەستنیشان دەکرێتەوە ئەمەش ئەو راستییە دەسەلمێنێت کە سۆکە دووبارە و سێ بارە دەردەکەوێتەوە . توێژیارانی یابانی لە توێژینەوەیەکی ساڵی 2004 یاندا ئاماژەیانکرد کە هێلیکۆباکتێر مەترسی گەشەکردنی شێرپەنجەی گەدەی لێدەکرێت (4) . لە ناوەراستی ئەمساڵدا لە توێژینەوەیەکی نوێی توێژیارانی ئیتالی لە میلانۆ ئاماژەیان پێکرد کە ئەو کەسانەی تووشی ئەم جۆرە باکتریایە دەبن مەترسی تووشبوونیان بە گیروگرفتی دڵ زێد دەکات (5). بە پێی ئەنجامی توێژینەوەیەکی ئەمێریکا کە لە گۆڤاری پزیشکی Western Journal of Medicin ی مانگی ئاوگوستی 2005 دا بڵاوکرایەوە پسپۆران دەبێژن وەرزش بە سوودە بەڵام نازانرێت و بۆیان روون نەبۆتە چۆن وەرزشکردنی رێکوپێك مەترسی تووشبون بە برینی گەدەو ریخۆڵە بە رێژەی 50٪ کەم دەکاتەوە (8) .

**رێگاکانی تووشبون**

- تا ئەمرۆ بە تەواوی نازانرێت ، گومان دەکرێت کە بەکتریاکە لە رێگای پیساییەوە بگوێزرێتەوە .

- رێگای ئاو یان خۆراك (راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ) بەکتریاکە دەگوێزرێتەوە .

**نیشانەکان**

- ناوبەناو یان لە پڕ مرۆ ئازاری لەبەشی سەرەوەی سکیدا هەیە .

- لە رۆژێکەوە بۆ رۆژێکی دی ئازارەکە نەگۆڕدرێت .

- ئازارەکە نارێکوپێك دەردەکەوێت .

- بە هۆی ئازارەکەوە مرۆ تووشی نائارامی دەبێت .

زۆرجاران مرۆ بێ نیشانەیە بەڵام هەندێك جار منداڵ هێڵنجدان و ئازاری سکی لێ دەردەردەکەوێت.

**نیشانە مەترسیدارەکانی نەخۆشییەکە**

**- کوتوپڕ پەیدابوونی ئازاری بەشی سەرەوەی سك .**

**- رشانەوە وهێنانەوەی هەموو خۆراکی نێو گەدە (رەنگی قاوەی هەیە)**

**- رەنگی پیساییەکە مەیلەو رەش دەبێت (واتە خوێنبەربوون لە نێوپۆشی گەدەدا هەیە) .**

**- لاوازی ، ماندوویەتی ، بێهێزی ، پشوسواری و کەمبوونەوەی کێشی نەخۆش .**

**- مرۆ بە ناڕەحەتی خۆراکی بۆ قووت دەدرێت .**

**دەستنیشانکردن**

**- ئامێری گەدەبین Gastroscopy ، ئامێرەکە بریتییە لە سۆندەیەکی تایبەتی نزیکەی 1 مەتر درێژ و تیرەکەی 1 سم ە ، سەرەکەی گلۆپێك و زەرەبینی پێوەیەو لە دەمەوە بە سورێنچکدا شۆڕدەکرێتە نێو گەدە و بە هۆی ئەم ئامێرەوە دەتوانرێت سەیری نێو پۆشی سورێنچك ، گەدە و بەشێکی دوانزەگرێی پێ بکرێت . هەرچەندە زۆرجاران ئەنجامدانی ئەم کارە زۆر نارەحەتە و لەوانەیە نەخۆش بەرگەی نەگرێت و ئەنجامدانی مەحاڵ بێت . بەڵام بە هۆی ئامێرەکەوە دەتوانرێت نێوپۆشی گەدە ببینرێت و هاوکات نمونەی شلەی نێو گەدە بۆ چاندن و نمونەی نێوپۆشەکەش وەربگیرێت و پاشتر لە تاقیگادا بۆ لێکۆڵینەوە و یان دەستنیشانکردن سوودی لێوەردەگیردرێت .**

**- تاقیگا ، لە تێستکردنی پیسایی نەخۆشدا دەتوانرێت باکتریاکە یان باکتریای دی دیاری بکرێت .**

**- تێستی PCR دەستنیشانی بەکتریاکە دەکات .**

**- تێستی سێرۆزانی (Elisa) لە خوێندا دژەتەنی IgG و IgA ی دژی بەکتریاکە دەستنیشانی دەکات .**

**- تێستی هەناسەدان (گەر مرۆ ماددەی Urea لە هاڵاوی هەناسەدانەوەدا هەبێت ئەوە مانای ئەوەیە کە باکتریاکەی لە لەشدا هەیە) .**

**چارەسەرکردن**

**لە زۆربەی وڵاتاندا بۆ چارەسەرکردنی برینی گەدە و ریخۆڵەی گەورە ساڵان دەرمانی Nexium-PH واتە (Esomeprazol) رۆژانە دوو ژەم بۆ ماوەی یەك هەفتە دەدرێت بە نەخۆش ، ئەنجامی زۆرباشی داوە بە دەستەوە بەڵام دەرمانی ناوبراو نادرێت بە منداڵ.**

**هەرچەندە برینی گەدەو ریخۆڵەی منداڵ نائاساییە وەلێ کاتێك دەستنیشانی خودی باکتریاکە دەکرێت ئەوسا پێویستە 3 دەرمانی Losec, Klacid, Amimox بە رێژەی جیاواز و بە پێی کێش بۆ ماوەی هەفتەیەك بە منداڵێکی نەخۆش دەدرێت کە هەڵگری باکتریاکەیە .**

**- لوسێك ، Losec : (رۆژانە تەنیا یەك ژەمی پێدەدرێت) (*)**

**منداڵی 10 و 15 کیلۆ 10 ملگم ، منداڵی 20 و25 کیلۆ 20 ملگم ،**

**منداڵی 30 و 35 کیلۆ 30 ملگم ، منداڵی 40 کیلۆ 40 ملگم ی درێتێ .**

**- کلاسید، Klacid : (رۆژانە دوو ژەمی پێدەدرێت)**

**منداڵێ 10 کیلۆ دوو ژەمی 150 ملگم ، منداڵی 15 کیلۆ دوو ژەمی 225 ملگم .**

**منداڵی 20 کیلۆ دوو ژەمی 300 ملگم ، منداڵی 25 کیلۆ دوو ژەمی 375 ملگم .**

**منداڵی 30 کیلۆ دوو ژەمی 450 ملگم ، منداڵی 35 کیلۆ دوو ژەمی 500 ملگم .**

منداڵی 40 کیلۆ دوو ژەمی 500 ملگم ی ئەدرێتێ .

– **ئەمیمۆکس، Amimox** : (ڕۆژانە دوو ژەمی پێدەدرێت)

منداڵی 10 کیلۆ دوو ژەمی 500 ملگم ، منداڵی 15 کیلۆ دوو ژەمی 750 ملگم .

منداڵی 20 کیلۆ دوو ژەمی 750 ملگم ، منداڵی 25 کیلۆ دوو ژەمی 750 ملگم .

منداڵی 30 کیلۆ دوو ژەمی 750 ملگم ، منداڵی 35 کیلۆ 750 دوو ژەمی ملگم .

منداڵی 40 کیلۆ دوو ژەمی 750 ملگم ی ئەدرێتێ .

**زۆرجاران گەر دەرمان نەیتوانی چارەسەری نەخۆشییەکە بکات ئەوا پێویستە بە ڕێگای نەشتەرگەری چارەسەری برینەکە بکرێت**

**تێبینی: لە ئەنجامی دووبارە و سێبارە بوونەوەی سۆکەدا هەندێك نەخۆش لە چاکبوونەوە بێ ئومێد دەبن و لەوانەیە تووشی خەمۆکی بن .**

**سەرنج : باشتر وایە پاش 3 مانگ تێستێکی هەناسەدان بۆ زارۆك بکرێت .**

**(*) ئەو 3 دەرمانەی سەرەوە لە زۆربەی نەخۆشخانەکانی منداڵان ی سوێد دا پەیڕەوی دەکرێت .**

**سەرچاوەکان**

1. **Marta Granström.** Helicobacter-nya rön. Mikronytt. Årgång 15, Nr.2 april 2001:5-6.
2. **Marin GH.Voiculescu,** boli infectioase. vol 2.editura medicala, Bucurest. 1990.
3. **Arne Forsgren, Göran Kronvall** (red). Klinik bakteriologi. Studenlitteratur. 1996;421-23.
4. **Naomi Uemura, M.D.,** et al: Helicobacter pylori Infection and the Development of Gastric Cancer. NEJM, Vol 345:784-789, 2001, No. 11
5. www.dagensmedicin.se © 050617 10:28
6. www.magotarm.se © 050506
7. www.infomedica.se © 050801
8. www.primavi.se © 050806
9. www.gi-clinic.com © 050810

## کامپیلۆباکتێر

**کامپیلۆباکتێر، بەکتریایەکی گرامنێگەتیفی چەماوەیە . زۆرجاران لە ژێر میکرۆسکۆپدا بە ئاسانی دەناسرێتەوە . لە ساڵی 1970 موە بەکتریاکە دەبێتە هۆی سکچوون لە مرۆدا بەڵام پێشتریش لە ئاژەڵدا بینراوە . زێدەتر لە 20 جۆری سێرەمی هەیە ، بەڵام ناسراوترینیان کە تووشی مرۆ دەبێت و هۆی سەرەکی سکچوون و ژانە سکن بریتین لە جۆری (Campylobacter jejuni & Campylobacter coli) . بەکتریاکە بە ڕێژەی جیاواز لە هەموو وڵاتاندا بڵاوبۆتەوە .هەردووجۆرەکەی سەرەوە بە تێتراسایکلین و ئیریترۆمایسین لە ناودەبرێن . نزیکەی 4 هەفتە لە ئاودا (4 پلەی گەرمی) دا دەژێت بەڵام لە 4 ڕۆژان زێدتر لە گەرمایی (25 پلە گەرمی) دا ناژی . لە بارترین شوێنی زێدەبوونی بەکتریاکە بریتییە لە ریخۆڵە ئەستورە و گەرمی خوێنی ئاژەڵ . لە 50٪ ی نەخۆشەکان لە 2 هەفتەدا چاك دەبنەوە ، سۆکە تولانی نییە . لە سوێد لە 5 مریشکی تازە سەربڕدراودا یەکێکیان بەکتریاکەی تێدایە .**

**ڕێگاکانی گواستنەوە**

- پیسایی- دەم (لە ڕێگای خۆراکخواردنی پیسبوو- مریشك- بە بەکتریاکەوە) .
- ڕێگای ئاوی پیسبوو .
- شیری پاستوێری نەکراو (نەکوڵاو لە 100 پلەی گەرمیدا) .
- لاوەکی (لەوانەیە منداڵ گەورەساڵانی هەمان خێزان تووش بکات) .

**نیشانەکان**

ئەوەی شایانی باسە مرۆ سەرچاوەیەکی سکچوونەکەیە .

ماوەی کرکەوتنی بەکتریایە لە نێوان 2-7 ڕۆژدایە و لەوانە بکاتە 10 ڕۆژ .

**کوتوپڕ مرۆ ئەم نیشانانەی لێدەردەکەوێت :**

- لەرزو تا نزیکەی 39 پلە .
- سووکە سکچوون ، پێچ هاتن بەسکدا و ژانەسەر .
- هێڵنجدان و رشانەوە و ژانکردنی ماسوولکەش دەردەکەوێت .
- سکچوونەکان زێدتر لینجاوین و هەندێك جاریش خوێناوین .

**دەستنیشانکردن**

- چاندنی پیسایی (ئەنجامەی 2 ڕۆژ دەخایەنێت) .
- گەر گومان لە ژاراویبوونی خوێن کرا ئەوا پێویستە چاندنی خوێن ئەنجام بدرێت .

**ئاڵۆزکاریەکان**

- کۆنیشانەی Guillian-Berres .
- کۆنیشانەی Reiter .
- سۆی جمگەکان .

**سەرچاوەکان**

1. Iwarson-Norrby, infektionsmedicin, epidemiologi, klinik och terapi, säve förslag, 1998;298-99.
2. Marin GH.Voiculescu, boli infectioase, vol 2.editura medicala, Bucurest. 1990;498-502.
3. Arne Forsgren, Göran Kronvall (red). Klinik bakteriologi. Studenlitteratur. 1996;418-20.

## سووربونەوەی میزەڕۆکان

بریتییە لە سووربونەوەی میزەڕۆکانی نێوان گورچیلە و میزەڵدان و هاوکات نێوان میزڵدان و کونی میزکردن . هەندێکجار ئەم میزەڕۆیانە (سەرەوە و خوارەوە) تووشی بەکتریای کلامیدیادا دەبن کە نەخۆشییەکی درمی زایەندییە . ئەوەی شایانی باسە ئەم سووربونەوانە زێدەتر تووشی مێوینە دەبێت وەك لە نێرینە بەلام هەموو تەمەنێك و ڕەگەزێك دەگرێتەوە .

لە کاتی دواخستن و کەمتەرخەمی چارەکردندا زیانی گەورە بە ئافرەت دەگەیەنێت .

ئەوەی شایانی باسە پێویستە مرۆ هاوسەنگییەك بۆ وەرگرتن و كردنەدەرەوە بۆ لەش داین بكات، گەر هاوسەنگییەكە لاسەنگ بوو ئەوا لەشی مرۆ دە پەنمیٚ (دەئاوسێت) و پاشتریش هیشك دەبێتەوە .
بۆهاوسەنگی وەرگرتن وكردنەدەرەوە لە لەش پێویستە رۆژانە .

وەرگرتن

- خواردنەوە 1,5 لیتر.
- خۆراك 600 ملیلیتر .
- زیندەپاڵ (میتابۆلیسم) 200 ملیلیتر .

كردنەدەرەوە (لە دەستدان)

- میز 1,4 لیتر .
- ئارەقەكردنەوە 100 ملیلیتر .
- پیساییكردن 100 ملیلیتر
- هەناسەدانەوە 350 ملیلیتر .
- نزیكەی 350 ملیلیتر بە رێگای تر .

كۆئەندامی میز پێكهاتووە لە :

1- گورچیلەكان ، ژمارەیان دووانە ، دەكەونە ئەملاولای كەمەرەوە . كار و فەنكشنی زۆریان هەیە بەڵام لە هەموویان گرنگتر پاڵاوتن ودروستكردنی میزە . (رۆژانە گورچیلەكان 180 لیتر شلە دەپاڵێون) .

2- میزەڕۆی سەروو(میزدۆش) ، بریتیین لەو دوو بۆریە درێژەی كە لە گورچیلەكانەوە میز دەدۆشنە نێو میزەڵدانەوە .

3- میزەڵدان ، بریتییە لە توورەكەیەكی ماسولكەیی بەهێز میزی تێدا كۆدەبێتەوە و پاش زێدبوونی فشاری میزەكە كونی سەر میزەڕۆكانی خواروو دەكرێتەوەو ئەوسا مرۆ هەست بە میزكردن دەكات . میزەڵدانی نێرینە توانای كۆكردنەوەی میزی كەمتری هەیە وەك لە میزەڵدانی مێوینە و مرۆ دەتوانێت نزیكەی (700) سم سێجا میز لە میزەڵداندا هەڵبگرێت .

4- میزەڕوی خواروو، بریتییە لەو تاكە بۆریەی دەكەوێتە نێوان میزەڵدان و كونی میزكردنەوە لە بۆریە میزەكانی سەروو كورتترە (لە نێرینەو مێوینەدا جیاوازە):

- لە مێوینە دا كورتە و نزیكەی 3-5 سم دەبێت وتیرەیان لە نێوان 7-8 سم دەبێت و تەنیا میزی پێدا دەكرێتە دەرەوە .
- لە نێرینەدا درێژترە و نزیكەی (18) سم دەبێت ومیزو سپێرمی پێدا دەكرێتە دەرەوە . كەناڵی میزیش بریتییە لە كونێكی بچوك و كۆتایی بە میزەڕۆكانی خواروو دەهێنێت .

## 1- له مێوینه دا

**سووربونەوەی میزەڕۆی خواروو**

**هۆزانی**

**ئەوەی شایانی باسە لە ٪80 ی هۆی ئەم جۆرە سووربونەوەیە بە تایبەتی لە ئافرەتدا بریتییە لە بەکتریای (E.coli) و (ستافیلۆکۆکەس ساپرۆفیتیکوس) (Staph Saprophytus) لە هاوین و پایزدا دەردەکەوێت .**

**نیشانەکان**

- **کزانەوە لە کاتی میزکردندا.**
- **زۆری ژمارەی میزکردن (میزە چڕکێ) .**
- **هەندێکجار بەر موسڵدانی ئافرەت ژان دەکات .**
- **هەندێکجار پلەی گەرمی نەخۆش لە ژێر 37 پلەوەیە .**
- **زۆرجاران نەخۆش پشتی دەیەشێت .**

**تێستی میز**

- **خرۆکەی سپی و نیترێت لە نێو میزەکەدا هەیە .**
- **هەندێکجاری دی هێمۆگلۆبین (خوێن) لە نێو میزدا دەبینرێت .**

**دەستنیشانکردن**

**ئەوەی شایانی باسە هەمیشە پێویستە نەخۆش برێك میز بدات (باشتر وایە یەکەم میزی بەیانیان بێت) بە تاقیگا تا میزەکە شیتەڵ بکرێتەوە و گەر پێوست بوو باشتر بنێرێت بۆ چاندن .**

**لەم حاڵەتانەدا پێویستە میز بنێرێت بۆ چاندن :**

- **گەر رێژەی (نیترێت) لە میزدا (0) بوو .**
- **گەر ئافرەت چەند جارێك تووشی هەمان سووربوونەوە ببێت .**
- **گەر ئافرەت سکپڕ بێت و نیشانەکانی سەرەوەی تیادا دەربکەوێت .**

**باشتر وایە پاش چاندن تاقیگا ئەو دەرمانانە دیاری بکات کە بەکتریاکە دەکوژن .**

**تێبینی : ئەو خانمانەی مانگانە یان بە 2 مانگ جارێك تووشی ئەم سووربونەوانە دەبن پێویستە سەردانی پسپۆری نەخۆشییەکانی ئافرەت بکەن .**

## 2- لە نێرینەدا

**سووربونەوەی میزەڕۆی خواروو**

**لە نێرینەدا بارەکە جیاوازە و لەوانەیە سووربونەوەکە بە هۆی بەکتریاوە یان نەخۆشییە درمییە زایەندییەکانەوە بێت وەك کلامیدیا یان تریهۆمۆناس .**

**هەندێکجار لە تەمەنداردا سووربونەوەکە ئاڵۆز بە تایبەتی کاتێك کە پرۆستات دەگرێتەوە !**

**هۆزانی**

**لە 50-60٪ ی بارەکاندا بەکتریای (ئێشیریا کۆلای) یە و بەکتریای (کلیبسێلا) و(ئینتێرۆکۆکەس) دەبنە هۆی سووربونەوەکە .**

**نیشانەکان**

– کزانەوە وسووربونەوەی کەناڵی میز . هاتنەخوارەوەی شلەیەکی لینج لە کونی میزکردن (لە بەکتریاییەکەوە بۆ یەکێکی دی ڕەنگ و بۆنی جیاوازە) و هاوکات کەناڵەکە زۆر بە ئازارە .

– زۆری ژمارەی میزکردن (میزە چڕکێ)

– ئازاری سەر موسڵدان یان خوارووتر وەك ژانکردنی پرۆستات وایە .

**تاقیکا**

لە کاتی میزکزانەوەدا گەر تێستی میز (نیتریت ی تیادانە بوو) ئەوسا میزەکە دەبرێت بۆ چاندن .

لە پیاودا پێویستە تێستی تایبەتی کلامیدیاو گۆنۆکۆکەس (سوزەنك) ی بۆ بکرێت .

**نیشانەکان لە ژنی دووگیاندا**

– لە 1-2٪ ی بارەکاندا بەکتریا لە میزەکەدا هەیە .

– کزانەوە لە کاتی میزکردندا ، (میزە چڕکێ)

– ژانکردنی سەر موسڵدان .

– زۆرجاران نەخۆش پشتی دەیەشێت .

**تێبینی :**

لە نێومیزدا هیچ کام لە شەکر، نیتریت ، هیمۆگلۆبین ، خڕۆکەی سپی و ئەلبومین وبەکتریای تیادا نییە .

## 3– لە منداڵدا

**سووربونەوەی میزەڕۆی سەروو**

بریتییە لە سووربونەوەیەکی کوتوپڕی میزەڕۆی سەروو یان گورچیلە .

**هۆزانی**

لە 80٪ ی بارەکاندا بەکتریای (**ئێشیریا کۆلای**) و لە 5٪ دا (**ئینتێرۆباکتێر**) ەکان دەبنە هۆی سووربونەوەکە .

**نیشانەکان**

– تالێهاتن ، هەمیشە لە سەروو 38,5 پلەوەیە .

– باری گشتی منداڵ خراپە ( نوزەنوز دەکات) ، ڕشانەوە.

– لە منداڵی گەورەدا ژانە سك دەبینرێت .

**سووربونەوەی میزەڕۆی خواروو**

جوداکردنەوەی سووربونەوەی میزەڕۆی سەروو لە خواروو لە منداڵدا زۆر گرانە یان هەر ناکرێت.

**نیشانەکان**

– نەبوونی تا یان تایەکی نزم .

– میز کردن کزانەوە .

– زۆری ژمارەی میزکردن (میزە چڕکێ) .

**تێستی میز**

- خرۆکەی سپی و نیتریت لە نێو میزەکەدا هەیە .
- هەندێکجاری دی هێمۆگلۆبین (خوێن) لە نێو میزدا دەبینرێت .

* گەر میزەکە بنێرین بۆ چاندن ئەنجامەکەی پۆزەتیفە .

**سەرچاوەکان**

Referencers
1.Börje Haraldsson, Njurfysiologi, Göteborg Universitet, December. 2000.
2.Urinvägsinfektioner i öppen vård. Etiologi, diagnostik och behandling . Stockholms Läns Lsndsting. 1999.
3.www.praktiskmedicin.se (C)
4.www.netdoktors.se (C)

# بەشی پێنجەم

## نەخۆشییە بەکترياييەکان

1- مێشکە پەردەسۆکان
2- پەردەسۆ بەکترياييەکان
3- پەردەسۆ ڤايرۆسييەکان
4- خورپەی ژارين
5- ناوپۆشە سۆی دڵ
6- خوێنی باکترياي
7- سۆی کلاميديا

## مێشکە پەردەسۆکان

**مێشکە پەردەسۆ:**
بريتييە لە هەوکردنێکی کوتوپڕی پەردەی مەننگ (مێشک پۆش).
**مێشکە پەردەسۆ:**
بريتين لە کۆمەڵێك هەوکردنی گرنگی پەردەی مێشك بە هۆی ميکرۆبی نەخۆشيدارەوە.
زۆرجاران هەوکردنەکە دەبێتە هۆی گيروگرفتی گەورە بۆ نەخۆش و پزيشك، هاوکات بەشێکی گەورەی نەخۆشييە درمە فرياگوزاريەکان پێکدەهێنن.
**نەخۆشييە درمە فرياگوزاريەکان**: کۆمەڵێك نەخۆشی کوتوپڕن کە پێويستە نەخۆش لەبەشی فرياگوزاريدا چارەسەر بکرێت.

**تێبينی**: پێويستە ميکرۆبی نەخۆشيدار لە شلەی پەتکەدەمار (CSF) هەبێت کە گۆڕانکاری گرنگ بەسەرپەردەی مێشك دا دەهێنن.
**جۆرەکانی پەردەسۆی مێشك:**
- جۆری شلەی پەتکەدەماری روون: هۆکەی ڤايرۆس ، بەکتريا و کەڕووە.
- جۆری شلەی پەتکەدەماری کێماوی: هۆکەی بەکترياية.
- جۆری شلەی پەتکەدەماری خوێناوی: بريندار بوونی بۆريەکانی خوێن.

**هۆزانی**

- **بەکتریا.**

به پێی تەمەن و جۆری بەکتریاکە زۆرجاران ئەم بەکتریایانە دەستنیشانکراون.

| تەمەن | جۆری مایکرۆئۆرگانیسم |
|---|---|
| تا 4 هەفتە | Strep. pneumonia, Strep. agalactiae, E. coli, Listeria monocytogenes |
| 1-3 مانگان | E. coli, H. Influenzae, Listeria monocytogenes, Neisseria meningitides, Strep. agalactiae |
| 3-18 مانگان | Strep. pneumonia, H. Influenza, Neisseria meningitides |
| سال و نیو-50 ساڵان | Neisseria meningitides, Strep. pneumonia |
| لەسەرو 50 ساڵان | Strep. pneumonia, Listeria monocytogenes |

- **ڤایرۆس.**
- **کلامیدیا.**
- **کەڕوو:** پەردەسۆ و شلەی روونی پەتکەدەمار.
- **پرۆتۆزۆر:** تۆکسۆپلاسما و پلاسمۆدیۆم فالسیپاروم و هی تریش.

* سوود لە Donald A & Jonathan Cohen, infectious. Diseases, 1999. وەرگیراوە.

## پەردەسۆ بەکتریاییەکان

بریتین لە هەوکردنی کوتوپڕی پەردەی مێشك بە هۆی بەکتریاوە. ئەم جۆرە هەوکردنە چەند تایبەتمەندییەکی گرنگیان هەیە کە شلەی پەتکەدەمار دەگۆڕن بۆ شلەیەکی کێمکردوو هەروەها ژمارەی خرۆکە سپییەکان (دەنکۆڵەدارەکان) و بەکتریاکان زێدەبێت. سۆکە دەبێتە هۆی خولقاندنی کێروگرفتێکی گەورە بۆ پزیشکی منالان و هۆیەکی سەرەکی مردنە لە بەشی فریاگوزاری نەخۆشییە درمەکاندا.هەروەها هەوکردنەکە ڕێڕەوێکی دراماتیکی (بەتایبەتی لەمنداڵدا) هەیە و زۆرجار پاش هەوکردنەکە نیشانەی دەماری و دەروونی لە زۆر نەخۆشدا بەجێ دەمێنێت.

**مێژوو**

- ڤیسیۆکس لە ساڵی 1800-1850 دالەمەڕ یەکەم بلاوبوونەوەی پەردەسۆی نووسیوە.
- ڤێشێل باوم لە ساڵی 1886 دا لەسەر مێنینگۆکۆکەسی نووسیوە.
- جوهمان لە ساڵی 1906 دا سیرەمی دژی مێنینگۆکۆکەسی بەکارهێنا کەپاشتر بووە هۆی کەمبوونەوەی لە 30-50 ٪ ی ڕێژەی مردن.

**هۆزانی**

هۆی سەرەکی نزیکەی 50 ٪ ئەم هەوکردنە دەگەڕێتەوە بۆ:

Haemophilus Influenzae و Streptococcus Pneumoniae, Neisseria meningitidis ئەو بەکتریایانەی سەرەوە بەکتریا کلاسیکیەکانی درمەکەن. ئەمڕۆ ژمارەیەکی زۆر لەبەکتریا دەبنە هۆی سۆ کێمکردوەکەو

گرنگترینیان ئەمانەن: ستافیلۆکۆکەس، ستریپتۆکۆکەس، گۆنۆکۆکەس، لیستێریا مۆنۆسیتۆجێنیس، سالمۆنێلاکان، ئیشیریا کولای، کلیبسێلا، بروسێلۆسیس و ئینتێروباکتێر.

ئەوەی راستی بێت ڕێژەی زۆری و بڵاوی درمەکە پەیوەندی بەتەمەن، ناوچەی جوگرافی و وەرزەوە هەیە هەر لەبەر ئەم هۆیەشە زۆرجاران هەوکردنە کێمکردووەکان زێدەتر لەساوادا دەردەکەون وەك لە گەورەدا.

پەردەسۆکان بەشێکی گرنگی نەخۆشییە درمەکان پێك دەهێنن چونکە:

- زۆرجاران لەپراکتیکا دەبینرێن و هۆکانی درمەکە جیاوازن.
- زۆر گیروگرفت دەخەنە رێی دەستنیشانکردن و چارەسەرکردن.

**هەوکردنەکە لەسەر ئەم خاڵانە بەندن و جوداکرێنەوە:**

- شێوەی میکرۆسکۆپی شلەی پەتکەدەمار CSF هۆی نەخۆشییەکە.
- میکانیسمی تووشبوون بە درمەکە.

**جوداکردنەوەی هۆی هەوکردنەکە بەپێی شلەی راکێشراوی نێو پەتکە دەمار:**

- شلەی کێم کردوو (لیل).
- شلەی روون یان شلەی خوێناوی.

**جۆرەکانی پەردەسۆ:**

1- پەردەسۆی کیمیکی

لەم بارەدا هەوکردنەکە پیسبووە و کێمو جەراعەتی کردووە، لەیەك ملیمەتری سێجادا نزیکەی 2-3 هەزار خانە دەبینرێت.

2- پەردەسۆی روون (کێم نەکردوو)

لەم بارەدا هەوکردنەکە کێمی نەکردووە، لەیەك ملیلیتری سێجادا نزیکەی 1-2 هەزار خانە دەبینرێت و هۆی هەوکردنەکە ڤایرۆس ، بەکتریای کوخ، کەپوو ، سپایرۆکیتە.

3- پەردەسۆی خوێناوی

ئەم جۆرە زۆر بە دەگمەن دەبینرێت و هۆکەی لیستیریا و کاربونیلە.

**تێبینی:** لەم 35 ساڵانەی دوایدا هەردوو پەردەسۆی ستافیلۆکۆکەس و پنێومۆکۆکەس زێدەتر دەبینرێت.

هەندێکجار 2 یان 3 بەکتریا دەبنە هۆی پەردەسۆ، هەندێکجاری دی بەکتریاکان تێکەڵدەبن وەك ستافیلۆکۆکەس + ستریپتۆکۆکەس و لەوانەیە هیمۆفیلوس ئینفلوەنزا، پنێومۆکۆکەس و مێنینگۆکۆکەس بێت. لەهەندێك باردا هۆی هەوکردنەکە بەکتریایەك و ڤایرۆسێکە.

**پەتازانی**

بڵاوی پەردەسۆ بەکتریاییەکان بەندە لەسەر بڵاوی بەکتریاکان ، وەرز ، قەڵەباڵغی، ئۆرگانیسم ، تاد ...

لە زستان و سەرەتای بەهاردا پەردەسۆی بەکتریایەکان زێدەتر دەبینرێن، چونکە بەکتریاکان راستەوخۆ لەگەڵ پرژەی کۆکە و پژمین و پریشکی چڵمی نێو لووت و لیکی گەردووەدا دەگوێزرێنەوە بۆیەکێکی دی. هەندێکجار پەردەسۆی مێشك لەنەخۆشخانەدا بڵاودەبنەوە، گەر لە نەخۆشخانەی منداڵبووندا دەرکەوێت ئەوا لەشێوەی پەردەسۆی مێشکی تازەبوودایە بە هۆی بەکتریای گرامنێگەتیڤەوەیە و لەم بارەدا ڕێژەی مردن زۆر بەرزە.

**ڕێگاکانی چوونە ناوەوەی بەکتریاکە:**

- ڕێگای خوێن ،

- ڕێگایەکی ناسراوە زۆرجاران بەکتریا لە برینێکدا لەخوێنەوە دەگاتە پەردەی مێشك.

- ڕێگای درمی ،

مەبەست لە هەوکردنەی دوملی مێشك و لۆچەکانی لا لووتە.

- ڕێگای ڕاستەوخۆ،

لە کاتی ڕاکێشانی شلەی پەتکەدەمار و بەنجی نیوەیی دا ڕوودەدات.

**نیشانەکان**

ئەوەی شایانی باسە هەمیشە نیشانەکانی لەپڕ دەردەکەون، مرۆڤێکی ساخ لەپڕ تووشی ژانەسەرێکی توند، لەرزو و تا، ڕشانەوە و تایەکی بەرز دەبێت. ژانەسەر ئەوەندە بەهێزە (دەرمانی دژی ژانەسەر کاری تێناکات) بۆیە هەمیشە پێویستە پزیشك بیر لەپەردەسۆی مێشك بکاتەوە. زۆرجاریش لە سەرەتادا مل ڕەق دەبێت و نیشانەی (Brudzinski, Kering) دەردەکەون.

بە دەگمەن نەخۆش لەهۆش خۆی دەچێت یان تووشی گێروگرفتی ناهاوسەنگی دەروونی دەبێت ، لەوانەشە مرۆڤ بە تەواوی لە هۆش خۆی بچێت و ئاگای لەخۆی نەمێنێت (coma).

ماوەی دەرکەوتنی بەکتریاکان لەنێوان 2-3 ڕۆژدایە ژانەسەرێکی زۆر توند (هەموو کاسەی سەر دەگرێتەوە) ، هەندێکجار یەك شوێن ژان دەکات وەکو ناوچەوان یان پشت مل، زۆرجار ڕەنگی پێست لەسورەوە دەگۆڕدرێت بۆ سپی نەخۆش لەبارێکدا دەمێنێتەوە.

**نیشانەیەکی گرنگ بریتییە لەوەی نەخۆش ناتوانێت چەناگەی بدات لەسەر سنگی و ملی وەرناچەرخێت و دانانەوێت گەر هەوڵ بدرێت مل بجوڵێنرێت لە بەر ئازار نەخۆش دەزریکێنێت.**

- **نیشانەی Kering**، نەخۆش لەسەر گازی پشت پاڵ دەکەوێت، بەڵام ناتوانێت لەسەرقوون قاچەکانی بۆ سەر سك (بەرەو موسڵدان) بەرزبکاتەوە.

- **نیشانەی Brudzinski**. کاتێك نەخۆش لەسەر گازی پشت پاڵ دەکەوێت ، ناتوانێت ملی بەرە و سنگی بنوشتێنێتەوە، هەروەها ناتوانێت چەناگەی لە سنگی بدات، ئەم دوو نیشانە پۆزەتیڤە بۆ دەستنیشانکردنی پەردەسۆ زۆر گرنگە.

- کاتێك نەخۆش سەیری گلۆپ یان ڕووناکی دەکات ناڕەحەت دەبێت و ناتوانێت بەردەوام سەیری بکات .

**نیشانەکان لەساوادا**

**منداڵی چوار هەفتەیی**: لەم تەمەنەدا ناتوانرێت دەستنیشانی نیشانەکان بکرێت ئەوەی جێی سەرنجە منداڵ تووشی گێروگرفتی شیرخواردن، هەرس و کردنەدەرەوە، هەناسەدان و لەهۆشخۆچوون دەبێت.

ناسراوترین نیشانەکانی شیرەخۆرە لەنێوان 5-30 ڕۆژدایە و بریتین لە:

تالێهاتن، شین و مۆربوونەوەی پێستی لەش و ناوپۆشەکان، نەخەوتنی منداڵ و لەتاو ئازار زۆر دەجوڵێت، ڕشانەوە و چاوی زەق دەبێت. تا منداڵەکە تەمەن بچووك بێت نیشانەکانیش نا ئاشکراترن.

له منداڵی 12–1 مانگاندا: نیشانەکان جیاوازە وەك: تاڵیهاتن، رشانەوە، نیشانەی پەردەسۆ، لەهۆش خۆچوون نامێنێت. لەم بارەدا نیشانەیەکی زۆر بەنرخ بریتییە لە: ئاوسانی شلکەی کەللەسەر لەگەڵ زێدبوونی تەمەندا نیشانەی Brudzinski و Kering دەردەکەون ودەستنیشانکردنیش ئاسانتر دەبێت.

**ئاڵۆزکارییەکان**

– لە بارە کوتوپڕەکەدا، بریتین لە: کێمکردنی نێو مێشك، هەوکردنی سکۆڵەی مێشك، دومەڵی مێشك، مێشکە پەردەسۆی درێژ خایەن و هەڵدانەوەی هەوکردنەکە.

– لە بارە تولانییەکەدا، بریتین لە: شەپڵەداری جووتە کەللە دەماری 3 و 7 و 9 ، تووشبوونی بەشی جوڵە لەمێشك دا، گیروگرفتی بیستن ، بینین و دەماری ، شەپڵەداری بینین و بیستن و کوێری ، گیروگرفتی لیك‌و جوین قیژاندن و ددان جیڕکردنەوە و گیروگرفتی دەروونی دەردەکەوێت.

**دەستنیشانکردن**

- نیشانەکانی نەخۆش (بەتایبەتی مل وەرنەچەرخاندنی نەخۆش).
- لە تێستی خوێندا خڕۆکە سپییەکان بەرزدەبنەوە (لە هەوکردن بە ئینترۆباکتێردا خڕۆکە سپییەکان نامێنن).
- دەرهێنانی شلەی (CSF) لە نێو بڕبڕەی پشتی نەخۆشەوە.
- چاندنی نموونەیی ئاوگرتنەکە و خوێن .... تاد.
- لە کاتی ئاوگرتندا پێویستە سەیری رەنگی شلەی پەتکەدەمار CSF

بکرێت ئایا شلەکە روونە یان لێڵ و کێماوییە.

دەتوانین نەخۆشییەکە لەم نەخۆشییانەی خوارەوە جیابکرێنەوە. مێشکە پەردەسۆی ڤایرۆسی، خوێنبەربوونی مێشك، شێرپەنجەی مێشکە پەردە، دەردەکۆیان و دومەڵی مێشك.

**چارەسەرکردن**

- پێویستە نەخۆش خاوێن رابگیرێت و خۆراکی بدرێتێ و لە نەخۆشخانە دا لەبەشی فریاگوزاریدا بمێنێتەوە و چارە بکرێت.
- پێویستە بەزووترین کات بەخوێنهێنەردا دەرمان بدرێت بەنەخۆش.
- پێویستە جۆری بەکتریاکە و ئەنتیبایۆتیکی دژی بەکتریاکە لەتاقیگادا دەستنیشان بکرێت.
- رۆژانە 200–400 هەزار یەکە / کگم دەرزی پەنسیلینی G (یەکەم رۆژ لە خوێنهێنەر دەدرێت، پاشتر لەماسولکەی سمت دەدرێت.
- رۆژانە 200–400 کگم / کەپسولی ئەمپیسیلین تا 10–12 گرام (لە 20 گرام زیاتر نادرێت بەنەخۆش).
- بۆ باسیلی گرامنێگەتیڤ رۆژانە 5 ملگم/کگم دەرزی جێنتامایسین دەدرێت لە نەخۆش ، بۆ منداڵ ژمەکە کەم دەکرێتەوە.
- دەرزی کلۆرامفێنیکۆل زۆر بەسودە (لەپەردەی مێشك دەپەڕێتەوە) بە مەرجێك رۆژانە لە 100 ملگم / کگم تێنەپەڕێت لەبەرئەوەی ژەهراوییە.
- رۆژی 100 ملگم / کگم ریفامپین دژی ستریپتۆکۆکەس بەکاردەهێنرێت.
- هەروەها رۆژی 5–10 ملگم / کگم دەرمانی سێپترین بەسودە.

لەم بارەدا زۆر پێویستە دەرمان لەشێوەی دەرزی دا بدرێت بەنەخۆش ، تێستی شلەی پەتکەدەمار بکرێت بۆ جود اکردنەوەی بەکتریا و لایەنی بایۆکیمیکیی.

- هەوکردنی مێنینگۆکۆکەس ، تەنیا بە پەنسیلینی G چارە دەکرێت.
- هەوکردنی پنێومۆکۆکەس ، بە پەنسیلینی G، ئەمپیسیلین و کلۆرامفێنیکۆل چارەسەر دەکرێت.
- هەوکردنی ستافیلۆکۆکەس ، بە ریفامپیسین ، جێنتامایسین و سێیترین چارەسەر دەکرێت.

**خۆپاراستن**

زۆر پێویستە هەوکردنە گچکەکانی ئەندامانی دی بەخێرایی و باشی چارەسەر بکرێن تا هەوکردنەکە تەشەنە نەکات و نەبێتە هۆی ئەوەی لە خوێنەوە بگاتە پەردەی مێشک.

**جۆرە کلینیکیەکانی پەردەسۆکان:**

وا لێرەدا بەکورتی باسی 3 جۆر پەردەسۆی بەکتریایی گرنگ و ناسراو دەکەین کە ئەمانەن:

## پەردەسۆی کوتوپڕی مێنینگۆکۆك

یەکێکە لەهەوکردنە هەرە کوتوپڕە گرنگەکانی پەردەی مێشك.

**هۆزانی**

بەکتریایەکی گرامنێگەتیڤە بەنێوی نێسیریا مێنینجیتیدیس، شێوەی دەنکە قاوەی هەیە و لە دەرەوەدا زوو دەمرێت بەکتریاکە بە چاندنی خوێن، سیرەمی Muller Hinton زۆر دەکرێت. ئەوەی راستی بێت بەکتریاکە لەکوونە لووت‌و گەروەوە دەچێتە نێو لەشەوە و لە رێگای لیمف یان خوێنەوە بەلەشدا بڵاودەبێتەوە . زۆرجار هەوکردنەکە دەبێتە هۆی پیسبوونی پەردەی مێشك خوێنیش دەیگوێزێتەوە.

**پەتازانی**

نەخۆشییەکە لە هەموو جیهاندا بڵاوە بەتایبەتی لەناوچە گەرمەکانی نزیك هێڵی ئیستیوادا، هەندێکجار لەکاتێکی دیاری کراودا بڵاودەبێتەوە. هەندێکجاری دی لەماوەی 5-10 ساڵدا دەردەکەوێت بە تایبەتی سەربازگاکان دەگرێتەوە.

**رێگای گواستنەوە**

بەکتریاکە لە هەواوە بە هۆی پرژەی لیك و چڵمی گەروو و لووتەوە دەگوێزرێتەوە (نەخۆشییەکی زۆر زۆر درمە) !!

**نیشانەکان**

سەیری نیشانەکانی پێشوتر بکە .

ئاڵۆزکارییەکان و دەستنیشانکردن وەکو پەردەسۆ بەکتریایەکان وایە !!

**چارەسەرکردن**

رۆژی 8-10 ملیۆن یەکە دەرزی پەنسیلینی G دەدرێت بەگەورە، وەمنداڵ نزیکەی 200 هەزار یەکەی لێدەدرێت. یان یەك ملیۆن یەکە لەدوو کاژێردا رۆژانە بۆ 15 رۆژان دەدرێت لەنەخۆش.

هەروەها رۆژانە دەرمانی ئەمپیسیلین نزیکەی 10-12 گم بۆ 7-10 رۆژ دەدرێت بە نەخۆش. ئەوەی شایانی باسە دەتوانرێت کلۆرامفێنیکۆل بدرێت بەنەخۆش.

**کوتان**

ئەوەی شایانی باسە لەبەر بڵاوی نەخۆشییەکە لەم ساڵانەی دوایدا هەوڵی چڕوپڕ دراوە بۆ دروستکرنی کوتانێك دژی ئەم باکتریایە .

لە ساڵی 1999 دا ئینگلستان بریاری دا هەموو منداڵێك لە ژێر 18ساڵانەوە بکوترێت دژی باکتریاکە . بۆ ئەم مەبستەش ئەم 3 کوتانە بەکارهێنرا (Menjugate, Neisvac, Meningitec) پاش ئەوەی بەرگری باشی دا بە منداڵان ساڵی 2001 وڵاتانی بازاڕی هاوبەشی ئەوروپا پەسەندیان کرد بۆ بەکارهێنان .

## پەردەسوی کوتوپڕی پنیۆمۆکۆکەس

دووەم جۆری پەردەسۆیە ، منداڵ و گەورە تووش دەبێت.

**هۆزانی**

بەکتریای پنیومۆکۆکەس لە جۆری گرامنێگەتیفە ، نزیکەی 20 جۆری سێری هەیە و دەبنە هۆی پەردەسوی کوتوپڕو سییە سۆ. هەوکردنەکە منداڵی 0-1 ساڵی و سەروو 40 ساڵانەوە دەگرێتەوە . ئەم بەکتریایە جۆرە ژەهرێك دەرژێت و بەشێك لەپەردەی مێشك و موولوولە خوێنەکان بریندار دەکات و دەبێتە هۆی ژەهراوی بوونی هەموو لەش.

زۆرجار بەکتریاکە لە دەرەوەی پەردەی مێشك دا دەمێنێتەوە و خۆی مەڵاس دەدات و دەبێتە هۆی هەندێك جۆری دی هەوکردن ، ئەمەش لەخۆیدا هۆیەکە بۆ دەرکەوتنەوەی نەخۆشییەکە.

**نیشانەکان**

زۆربەی پەردەسۆکان هاوبەشن. تەنیا ئەوە نەبێت کە لەم هەوکردنەدا بارێکی ژەهراوی کوتوپڕ بۆ نەخۆش دروست دەبێت گەر زوو فریای نەکەوین ئەوا لە 24-48 کاژێردا نەخۆش دەمرێت.

دەستنیشانکردنی وەك جۆرەکانی پێشوتر وایە.

**چارەسەرکردن**

پێویستە رۆژانە نزیکەی 200-400 هەزار یەکە / کگم کێشی لەش پەنسیلینی G لەشێوەی دەرزی دا بدرێت لەمنداڵ.

یەکەم رۆژ دەرزییەکان لەگەڵ ئاوی دڵۆپاودا لەخوێنهێنەرەوە دەدرێت بۆئەوەی کەمێك نیشانەی کوتوپڕەکانی بارە ژەهراویە ئاڵۆزەکە هێمن ببێتەوە.

پاشان 5-10 هەزار یەکە لەسەت دەدرێت تا ئەنجامی تێستی شلەی پەتکەدەمار ئاسایی دەبێتەوە و نیشانەکانیشی نامێنن. هەموو کاتێك باشتر وایە پزیشك پاش چاندنی بەکتریاکە دەرمان بەکاربهێنێت.

هەروەها پێویستە هەوکردنی پنیۆمۆکۆکەسی شوێنەکانی تری لەش چارەسەر بکرێت. لەم جۆرە هەوکردنەدا رێژەی مردن لە نێوان 20-45 ٪ دایە.

# پەردەسۆی کوتوپڕی هایمۆفیلوس ئینفلوەنزا

ئەم جۆرەبەکتریایە لە جۆری گرامنێگەتیفە و 6 جۆری هەیە و دەبنە هۆی هەوکردنی ڕاڕەوی سەرەوی بۆریەکانی هەوا ، پێستەسۆ ، ئێسکە سۆ ، پەردەسۆ .. تا . هەوکردنە لە منداڵی نەکوتراودا تەمەن نێو- 7 ساڵیدا زێدەتر دەبینرێت ، بەدەگمەن لە گەورەدا دەبینرێت. هەندێکجار لەکاتی نەبوونی فاکتۆری بەرگری دا دەردەکەوێت ، لەم جۆرەدا نیشانەی هەوکردنی کۆئەندامی ناوەندی دەمار دەرناکەوێت. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمێریکادا منداڵ و گەورە لەهەموو تەمەنێکدا تووشی هێمۆفیلوس ئینفلوەنزا دەبن.

**خۆپاراستن**

پێویستە لەکاتی هەوکردنی شوێنێکی لەشدا بەپێی توانا و بەرێکوپێکی ئەو شوێنە چارەسەربکرێت تا هەوکردنەکە تەشەنە نەکات و نەگاتە پەردەی مێشك. جگە لەکوتان پێویستە کوتانی ئینفلوەنزا و پنێومۆکۆکەس بەکاربهێنرێت تا منداڵ تووشی ئەو دوو جۆرە پەردەسۆیە نەبن. هەروەها بەکتریای تر دەبنە هۆی پەردەسۆ وەك ئینترۆباکتر و ستافیلۆکۆکەس، پسێودۆمۆناس و ستریپتۆکۆکەس.

**ئاڵۆزکارییەکان**

- ئاڵۆزکارییە میکانیکییەکان: ئاوبەنگی مێشك و دواکەوتنی گەشەی مێشك (گێلی).
- ئاڵۆزکارییەکانی کێمکردنی کەللە دەمارەکان (جووتە دەماری 3، 4، 7، 8) و داکەوتنی پێڵوی چاو، شەپلەداری دەماری ڕوو بزوێن.

هەندێکجار نەخۆش کەڕ دەبێت و لە 10-20 ٪ نیشانە دەمارییەکان هەر دەمێنێتەوە.

- ئاڵۆزکارییەکانی دەرەوە: لەوانەیە هەوکردنەکە ببێتە هۆی خورپەی هەوکردن (shock infectious) ، سییەسۆ و ناوپۆشەسۆی دڵ.

**دەستنیشانکردن**

- پێویستە لەهەموو نەخۆشێکی تادار دا بۆ نیشانەی پەردەسۆ بگەڕێن.
- پێویستە نەخۆش لەنەخۆشخانەدا بمێنێتەوە.
- دەرهێنانی شلەی پەتکەدەمار بۆ چاندنی بەکتریایی و ڤایرۆسی.
- تێستی بایۆکیمیکی شلەی پەتکەدەمار.

**ڕێڕەوی نەخۆشییەکە**

ئەمڕۆ ڕێڕەوی پەردەسۆکان زۆر باشترە وەك لەچەند ساڵێك لەمەوبەر، هەروەها ڕێژەی مردنیش زۆر کەم بۆتەوە. پێشتر ڕێژەکە لە نێوان 50-100 ٪ دا بوو ، ئەمڕۆ لە نێوان 10-30 ٪ دایە.

**ڕێڕەوی هەوکردنەکە بەندە لەسەر:**

- تەمەن ، لەشیرەخۆرە و تەمەنداردا ڕێژەی مردن لەسەروو 50 ٪ یە.
- جۆری میکرۆبەکە و هەستداری میکرۆبەکە بۆ ئەنتیبایۆتیك.
- باری بەرگری لەشی نەخۆش (نزمە یان ئاساییە).
- چۆنیەتی دەستنیشانکردن و چارەسەرکردن.

– جۆری کلینیکی مەننگییەکە ، لەجۆرە قورسەکاندا ڕێڕەوەکە گرانە و بە خوریەی هەوکردن کۆتایی دێت.

**چارەسەرکردن**

پێش دەست پێکردنی چارەسەرکردن پێویستە:

– لەیەکەم نیو کاژێردا پزیشك بارەکە هەڵسەنگێنێت تا جۆری بەکتریاکەی بۆ ئاشکرا دەبێت و بەپێی نیشانەکان خێرا دەست بەچارەسەرکردن بکرێت

(سەرەتا بەرێژەیەکی زۆر لەخوێنهێنەرەوە دەرمان دەدرێت بەنەخۆش).

– پزیشك بەپەلە بروانێتە باری گشتی، هەناسەدان، سوڕدانی خوێن، نیشانەی پەردەسۆ، گۆڕانکاری پێست و دەمار و گوێ هەتا سەیری چاویش دەکرێت.

– نەخۆش لە نەخۆشخانەدا (بەشی نەخۆشییە درمەکان دا) چارەسەر بکرێت.

**بۆ نموونە:**

– پاکژکردنەوەی بۆریەکانی هەوا لە کاتی پێویستدا کون دەکرێتە بۆری هەناسەی نەخۆش.

– گەر نەخۆش نائارام بوو ئەوا 10-20 ملگم (دایازیپام) لەخوێنهێنەرەوە دەدرێت بەنەخۆش.

– لەسەرخۆ نەخۆش ئاگادار دەکرێت کە بۆ دەستنیشانکردنی هۆی نەخۆشییەکە پێویستە ئاو لەبڕبڕەی پشتی نەخۆش بگیرێت و بنێردرێت بۆ چاندن.

**پاشتر**

دژی بەکتریای مێنینگۆکۆکەس و پنێومۆکۆکەس پێویستە Penicillin G بەکار بهێنرێت.

دژی بەکتریای هیمۆفیلۆس ئینفلوینزا – Cefuroxim و ئەمپیسیلین باشن.

دژی بەکتریای ستافیلۆکۆکەس ئاوریوس – Cefuroxim باشە.

هەروەها تێتراسایکلین و Cefotoxinma=Claforan, Ceftriaxona باشن.

ماوەی چارەسەرکردنی پەردەسۆی پنێومۆکۆکەسی 10 ڕۆژە.

ماوەی چارەسەرکردنی پەردەسۆی ستافیلۆکۆکەس 14 ڕۆژە.

**لە ساوای 2 مانگاندا:**

جێنتامایسین + ئەمپیسیلین / 5 ملگم / کگم کێشی لەش / ڕۆژانە بۆ ماوەی 17 ڕۆژ. دەتوانرێت ئەمۆکسیسیلین لەبڕی ئەمپیسیلین بدرێت بەنەخۆش.

**لە ساوای 2–6 مانگاندا:**

**یان:**

ئەمپیسیلین 200 ملگم / کگم / ڕۆژانە + ریفامپیسین 15 ملگم / کگم ڕۆژانە.

**ساوای سەروو 6 مانگاندا:**

پەنسیلین G + کلۆرامفێنیکۆڵ یان: ئەمپیسیلین کلۆرامفێنیکۆڵ

**لەگەورەدا:**

نزیکەی 10 – 20 ملیۆن یەکە پەنسیلین G لە 24 کاژێردا + کلۆریمۆکسازۆڵ دەدرێت بەنەخۆش.

**یان:**

پەنسیلین G + ئەمپیسیلین 4-6 ملگم / کگم / کێش / ڕۆژانە + جێنتامایسین.

لە هەموو بارودۆخەكانی چارەسەركردندا پێویستە:

- بەپێی توانا چارەسەری ئەو شوێنە بكرێت كەهەوكردنەكەی تیادایە.
- دەرمانی دژەسووربوونەوە (كۆرتیزۆن) بەكاربهێنرێت.
- زۆر بەخێرایی چارەی ئاوسانی مێشك بكرێت.
- بەزووترین كات پێویستە شلەی لەش هاوسەنگ بكرێتەوە (چارەكردنی ناچووستی سوڕدانی خوێن).

تێبینی: ئەو شلەیەی پزیشك بەهۆی دەرزی تایبەتەوە پاش سڕكردنی شوێنەكە (لە نێوان بڕبڕەكانەوە دەردەهێنرێت بۆ چاندن پێی دەووترێت شلەی پەتكە دەمار (CSF).

## پەردەسۆ ڤایرۆسییەكان

بریتین لەپەردەسۆی كوتوپڕی مێشك بەهۆی ڤایرۆسەوە كە دەبنە هۆی لەپڕ دەركەوتنی نیشانەكان. ئەم جۆرە زۆر بە كەمی دەبێتە هۆی مردن .

لەم جۆرەدا شلەی نێو بڕبڕەی پشت روونە، لیمفۆسایتە لاوەكان لە تێستی خوێندا دەردەكەون.

**هۆزانی**

ئینترۆڤایرۆسەكان و كۆریۆمێنجیت، ڤایرۆسی تامیسكی 1، 2، 3، 4، 5، 6 ئەربۆڤایرۆس، لێنتی ڤایرۆس، ڤایرۆسی سورێژە، ڤایرۆسی سورێژەی ئەڵمانی، ڤایرۆسی ئینفلوەنزای A, B ، ئەدینۆڤایرۆسەكان. ئەم ڤایرۆسانە لە چەند ناوچەیەك و چەند وەرزێكدا دەردەكەون و هەروەها لەسەر چۆنییەتی وەرگرتنی (ئیستیعاب) ڤایرۆسەكان بەندە.

ئەوەی راستی بێت لە 50 ٪ ی پەردەسۆ ڤایرۆسییەكان لە نێو منداڵدا بڵاون. بە گشتی ئینتێرڤایرۆس و ئەربۆڤایرۆس زێدەتر لە هاوین و پایزدا دەردەكەون وڤایرۆسی ئاوڵە لە زستان و بەهاردا دەردەكەون.

**پەتازانی**

زۆربەی سۆ ڤایرۆسییەكان لەوەرزی پایزدا دەردەكەون

وەلێ سۆی ڤایرۆسی (Urlian) لە سەرەتای بەهاردا دەردەكەوێت ، سۆ ڤایرۆسییەكان زێدەتر تووشی منداڵ دەبن وە گەورەش تووش دەبێت و نیشانەی جیاوازیان هەیە، چونكە نیشانەكان بەندن لەسەر چۆنیەتی رەت دانەوەی (بەرتەكی) لەشی نەخۆش.

**شوێنی چوونە ناوەوەی ڤایرۆسەكە**

ئەوەی راستی بێت شوێنی چوونە ناوەوەی ڤایرۆسەكان جیاوازن و زێدەتر

لە رێگای ریخۆڵە، نێوگەروو، فارینجەكان و كونە لووتەكانەوە دەچنە ناوەوە.

پاشتریش ژمارەی ڤایرۆسەكە لە بۆری هەناسە و هەرس دا زێد دەكات و یەكەم حاڵەتی خوێنی ڤایرۆسی (بەرز بوونەوەی رێژەی ڤایرۆس لە نێو خوێندا) دروست دەكەن و بەهۆی سوڕدانی خوێنەوە ڤایرۆسەكە دەگاتە كۆئەندامی ناوەندی دەمار.

**نیشانەکان**

**دەرکەوتنی نەخۆشییەکە:** مرۆڤ لەپڕ ئەم نیشانانەی تیادا دەردەکەوێت تالێهاتن، ژانە سەر، رشانەوە، گیران، مل رەق بوون، ترس، گێژبوون، کەمبوونەوەی هەستی پێست، ژانکردنی ماسولکە. هەندێکجار تا دەگاتە 40 پلە و نزیکەی 7-10 رۆژ دەخایەنێت.

لەکاتی هەوکردن بە ڤایرۆسی (Coxsackie, ECHO) دا پێستی نەخۆش بڵقی پەمبەیی-سور، یان نوختەی سوری شێوە بڵقی لێدێت. بە گشتی پێستی لەش سڕدەبێت، هەروەها نیشانەی (Brudzinski, kering) پۆزەتیڤە. ڤایرۆسی (Coxsackie, ECHO) لە ماوەی 3-4 رۆژدا دەبنە هۆی گۆڕانکاری پێست (سوور، پەمبەی خاڵ، بڵق).

**تا ئەمڕۆ لەسەر دوو جۆری ئەم هەوکردنە نوسراوە کە ئەمانەن:**

1- جۆری Meningo-encephalic، بەرێژەی لە 50 ٪ بڵاوە (پەردەسۆ و مێشکەسۆ).

2- جۆری Meningo-mielitice، (پەردەسۆ و مێشکەسۆ).

**بە پێی جۆری ڤایرۆسەکان**

- پەردەسۆی ڤایرۆسی ئارمسترۆنگ (تالێهاتن، ژانەسەر، گەرووەسۆ).
- پەردەسۆی ڤایرۆسی Urlian (تا، ژانەسەر، خەوالوویی، ترس، رشانەوە ... تاد).
- پەردەسۆی ڤایرۆسی ئیفلیجی Poliovirus.
- پەردەسۆی ڤایرۆسی کۆکساکی، جۆری A (1، 2، 4، 14، 16، 17، 18، 22، 24 و جۆری B (1-6) زۆر بڵاون و ئەم جۆرە بەپەردەسۆی مێشك (ماسولکەی ژانکەر) نێونراوە چونکە ماسولکەکانی نەخۆش زۆر زۆر ژان دەکەن).
- پەردەسۆی ڤایرۆسی ECHO، (جۆری 1-4، 11-24، 25، 30، 31 یان زۆر بڵاوە).
- پەردەسۆی ڤایرۆسە تامیسکییەکان.

**ئاڵۆزکارییەکان**

- هەرچەندە نیشانەکان زوو وندەبن و پەردەسۆی ڤایرۆسییەکان لە ماوەیەکی کورتدا ساڕێژ دەبن، هەندێکجار دەرکەوتووە کە نەخۆش هەر ژانەسەر، پەستانی نێو کەللەی سەر و گیروگرفتی دەروونی بەردەوام هەبووە.
- زۆربەی نەخۆشەکان گیروگرفتی دەروونی و دەمارییان تیادا دەر دەکەوێت.

**دەستنیشانکردن**

بە هۆی نیشانە و ئەنجامی تێستی تاقیگاییەوە دەتوانین پەردەسۆ دیاری بکەین. باشترین رێگا بۆ دەستنیشانکردن بریتییە لە:

- جوداکردنەوەی ڤایرۆسەکە لە نموونەی شلەی پەتکە دەمار، شلەی نێو کوونە لووت و گەروو، پیسایی دا.
- تێستی ڤایرۆسی.
- تێستی سیرۆزانی (هەمیشە ئیمونۆگلۆبولینەکان 4 جاران لە ئاستی ئاسایی بەرزترن).

**رێڕەوی نەخۆشییەکە:**

بەگشتی پەردەسۆ ڤایرۆسییەکان باشن و لەزۆربەی بارەکاندا نەخۆش چاك دەبێتەوە ، هەندێکجار هەرگیروگرفتی ژانەسەر و دەروونی دەبینرێت.

**چارەسەرکردن**

- چارەسەرکردنی نیشانەکان (دەرمانی دژی ژانەسەر و رشانەوە و رێکخستنەوەی ناتەواوی شلەی نێو لەشی لە دەست چوو لە ئەنجامی رشانەوەدا).
- لە کاتی سوربوونەوەدا دەرمانی پرێدنیسۆن دەدرێت بە نەخۆش.

**سەرچاوەکان**

References
1.Lenneette E. et al., Viral central nervous system diseases, J. Amer Med. Ass. 1962; 179.
2.Lepow, M. et al. A clinical, epidemiological and laboratory investigation of aseptic meningitis during the four yesr period (1955-1958), New Eng. J. Med. 1962; 266. 1188.
3.Allan R. et al. Acute Meningitis, In: Principles and practices on infectious diseases, 1995; 64: 831-864.
4.Barbara M. et al. Chronov Meningitis, In Principles and practices on infectious diseases, 1995; 65: 865-874.
5.Spudis, V, Cramblett, G., ECHO-4 Meningoencehpalitis, Arch. Neurol. (chic), 1965; 12, 404.
6.Artenstein, M. Prophilaxis for meningococcal disease. J Am Med Ass. 1975; 231, 1035.
7.Poolman, J et al., meningococcal serotypes and scrotype B disease in N-W Europe, Lancet, 1986; 11, 555.
8.Marin GH. Voiculescu, meningococcal Meningitis and other. In Infectiouis Diseases, 1990; 64: 254-66.
9.Michael A. Apicella. Neisseria Meningitis dis. Infec dis. 1995; 189: 1896-909.
10.Durand ML et al. Acute Bacterial Meningitis in adults N Eng Med. 1993; 328: 21-8.
11.Feldman AA. Meningococcal infectious Avd Intern Med. 1972, 18: 117-40.
12.Peltola H. meningococcal disease still with us. Rev. Infect. Dis. 1983; 5: 71-91.
13.Anderson BM. Mortality in meningococcal infectious. Scand J Inf Dis. 1978; 10: 277-.
14.Schwartz B et al. Global epidemiology of meningococcal disease. Cli Rev Microb. 1989; 2: s118-24.
15.Sport Ms, et al. Peniciline insensitive Neisseria meningitis Lancet 1988; 1: 1167.
16.A-Paunescu-Podeanu., principles for medical practices, Vol 111 , Med. Eds. 1984.
17.A-Paunescu-Podeanu., principles for medical practices, Vol 11.. Med Eds. 1983.
18.Witte JJ. Congenital cataract following German measles in the mother. Trans Ophthalmol Soc Aug. 1941; 3: 35.
19.Horstman DM. Rubeolla: The challenge of its control. J Infect Dis 1971; 123: 640.
20.MMWR. CDC and prevention. Increase in rubeolla and congenital rubeolla-USA. 1991; 40: 93-9.
21.Cherry JD. Newer viral exanthems. Prog Med virol. 1973; 16: 269.
22.Lepow, M et al. A clinical, epidemiological and laboratory investigation of aseptic Meningitis during the four year period (1955-1958), New Eng J Med. 1962; 266. 1188.
23.Allan R. Tunkel and W. Michael scheld. Acute Meningitis, In: Principles and practices of infectious diseases, 1995; 64: 831-864.
24.Taindel, Gl. Et al. Meningitis in Infancy , Med Life., 1985; 32, 13.
25.McCrachen, G., Management of Bacterial Meningitis. Current Status and Future Prospects, Amer. J. Med, 1984; (may 15), 215.
26.Haworth C, J. The diagnosis of Acute Meningitis in Infancy. Lancet, 1953; 1, 911.
27.Barbara M. Grispshover and Jerrold J Ellner . Chronov Meningitis, In. Principles and practices of infectious diseases, 1995; 65: 865-874.
28.Ram Yougev and Moshe Arditi, Central nervous system infections, In: The biologic and clinical basis of Infectious Diseases. Fifth edition. USA. 1997.
29.A-Paunescu-Podeanu, Principles for Medical Practics., Vol 111 , Med. Ed. 1984.
30.Veys, TH et al. Bacterial Meningitis. Infectious caused by multiple organisms, Proc. Mayo. Clin. 1966; 41, 179.
31.Deafness after Meningitis, Lancet, 1986; 1 134.

# خورپەی ژارین

خورپە: بریتییە لە دەردێکی ئاڵۆزی زۆر سەخت کە زۆرجاران لەپڕ دەردەکەوێت.

**هۆی خورپە**

هۆکانی خورپە زۆرن و هەمە جۆرن هەر خورپەیەك هۆیەکی تایبەتی هەیە.

**گرنگترین نیشانەکانی بریتین لە:**

ناچووستی سوڕدانی خوێن، کەمبوونەوەی ئۆکسجین و ناچووستی خانەکان و شانەکان. لەم بارەدا سوڕدانی خوێن لە موولوولەکانی خوێندا گۆڕانکارییان بەسەردا دێت و ناچووست دەبن.

**جۆرەکانی خورپە:**

- خورپەی دڵ (ڕێژەی خوێن ئاساییە).
- خورپەی خوێن (کەمبوونەوەی ڕێژەی خوێن).
- خورپەی رووداو (رووداوی ئۆتۆمۆبیل، مۆتۆڕسیکل، شەمەندەفەر)، کەوتنەخوارەوە لە (شوێن ، سەربان، پەیژە، شاخ، دیوار) ... تاد.
- خورپەی ئانافیلاکسیس (خورپەی خورشت) . لەو کەسانەدا دەردەکەوێت کە بە پەنسیلین هەستیارن.
- خورپەی سووتاوی (بەتایبەتی سووتاوی پلەی سێ و بەرەو ژوورتر).
- خورپەی ژارین (لەکاتی لەباربردنی زۆرەملێدا یان لەبارچوونی ئاولەمەدا دەردەکەوێت).

لە یەکەم و دووەم جۆری خورپەدا هۆکاری دەرکەوتنی خورپە بریتییە لە دڵ و بۆریەکانی خوێن کە مرۆڤ تووشی گیروگرفتی لێدانی دڵ، خوێن یان ئاو لە دەستدان دەبێت. بەڵام لەجۆرەکانی دی دا هۆکاری تریش ڕۆڵ لە دەرکەوتنی ئەو بارە ئاڵۆزەدا دەبینن کە زۆرجاران چارەسەرکردنی گیروگرفتێکی زۆر گەورەیە.

لە 65 ٪ ی بارەکاندا هۆی سەرەکی باری ئاڵۆزی خورپەی سۆیی بەکتریای گرامنیگەتیڤە. دەنا ئەوانی دی بەکتریای گرامپۆزەتیڤ ، سپیرۆکێت ، ڕێکیتیس ، پرۆتۆزۆر و ڤایرۆسن.

**بەکتریا ناسراوەکان ئەمانەن:**

ئیشیریاکۆلای، پۆلی کلیبسێلا، ئینترۆباکتێر، سالمۆنێلاکان، شیگێلا و گرامنیگەتیڤەکان.

لە نێو بەکتریاکاندا گرامپۆزەتیڤەکان– ستافیلۆکۆکەس و کولۆستریدیۆم.

**چۆنیەتی دەرکەوتنی خورپە**

گەر هۆی خورپە باسیلی گرامنیگەنیت بێت ئەوا بارەکە زۆر کوتوپڕە و لە 60-80٪ دا دەبێتە هۆی مردنی نەخۆش (خورپەی ژاراوی)؛ تەنیا لە 75٪ ی بارەکاندا نەخۆشییەکە لە نەخۆشخانەدا (بە تایبەتی لەبەشی گورچیلەزانی – شیکردنەوەی خوێن – نەخۆشییەکانی ژن و منداڵبووندا) دەردەکەوێت.

لە 20 ٪ ی ئەو کەسانەی بە بەکتریای گرامنیگەتیڤ و لە 5 ٪ ی ئەوانەی بە بەکتریای گرامپۆزەتیڤ تووشی خوێنی بەکتریایی دەبن هاوکات تووشی خورپەی هەوکردن (خورپە سۆ) دەبن.

**هۆی یاریدەدەر**

لەئەنجامی توێژینەوەدا دەرکەوتووە لە 30٪ ی هەوکردنی باسیلی گرامنێگەتیڤی نێو نەخۆشخانە دەبنە هۆی دەرکەوتنی بارە ئاڵۆزەکە. هۆکاری یاریدەدەری دەرکەوتنی نەخۆشییەکە بریتییە لە نزمبوونەوەی بەرگری لەشی ئەو نەخۆشە بەرانبەر هەوکردن، وەك نەخۆشی ناتەواوی بەرگری، نەخۆشی تولانی شەکرە، ئاوبەنگی جگەر، شێرپەنجە، یان ماوەیەکی زۆر بە تیشك یان کۆرتیزۆن چارەسەری نەخۆشی دیان کردووە،

لەم بارەدا زۆربەی نەخۆشەکان بە تەمەنن. کاتێك مرۆڤ تووشی خورپەی خوێنبەربوون دەبێت ژەهری بەکتریاکەش ئەوەندەی تر بارەکە ئاڵۆز دەکات و زۆرجار نەخۆش بەرگەی بارەکە ناگرێت و دەمرێت.

**نیشانەکان**

لەهەموو خورپەکاندا بارەکە بەچەند قۆناخێکدا یان چەند پلەیەکدا دەڕوات جا گرنگ نییە قۆناخەکان یان پلەکان کورت بن یان درێژ، چونکە زۆرجاران هەوکردنەکە زۆرخێرا دەتەنێتەوە. زۆر پێویستە لە 3-6 کاژێری یەکەمدا چارەسەری نەخۆشییەکە بکرێت دەنا ئەو نیشانانەی پاشتر دەردەکەون هەرگیز چاك نابنەوە.

**بە گشتی بارەکە دوو قۆناخی هەیە:**

**1-قۆناخی پێش دەرکەوتن – سەرەتا:**

گرنگترین نیشانەکانی ئەم قۆناخە: لەپڕ لەرزوتا (تا نزیکەی 40 پلەیە)، هێڵنج و رشانەوە، رووخسار کەمێك پەنماوە، هیشکبوونەوە و سارد بوونەوەی پێست، زیدبوونی لێدانی پرتەی دڵ کەباش دەنگی دێت کەمێك نزمبوونەوەی پەستانی خوێن دەردەکەوێت. زۆرجار نەخۆش ئاسایی میز دەکات ، هەندێکجاری دی ڕێژەی میزکردن کەم دەبێتەوە. نەخۆش سەرزارەکی هەناسە دەدات و ژمارەی هەناسەدان زیدەبێت، پێست دەبریسکێتەوە، نەخۆش نائارامە و تینوی ئۆکسجینە. هەندێك نەخۆش لەپڕ و یەکسەر سوڕدانی خوێنیان رادەوەستێت، هەندێکی دییان لەرزو تایان لێدێت. لەم بارەدا دەستنیشانکردن و چارەسەرکردنی خێرا ڕێڕەوی نەخۆشییەکە باشتر دەکات دەنا نەخۆش دەمرێت.

**2-قۆناخی پاش دەرکەوتن – پاشتر:**

گرنگترین نیشانەکانی ئەم قۆناخە: نزمبوونەوەی پەستانی خوێن، ژمارەی لێدانی دڵ زێد دەکات، پرتەی دڵ کەم دەبێتەوە (لەبەرئەوەی دڵ خوێنی

تیادا نەماوە یان زۆر کەم بۆتەوە جا دڵ بە بەتاڵی لێدەدا بۆیە پڵتەی دێت).

بۆریە خوێنەکانی لامل هەڵدەئاوسێن، زیدبوونی هەناسەدان، ساردبوونەوە و سپی هەڵگەڕانی پێست، ساردبوونەوەی سەر پەنجەکانی دەست و پا.

لەم بارەدا ڕێژەی میزکردن زۆرکەم دەبێتەوە و هالآوی نێو زاری نەخۆش بۆنێکی زۆر ناخۆشی لێدێت، باری دەروونی نەخۆش زۆر خراپە، نائارامە، شت لێتێکچوون. هەندێکجار لەم قۆناخەدا چارەسەرکردن ئەنجامی باشی دەبێت. گەر بارەکە بەردەوام ببێت یان بێچارە کردن بمێنێتەوە ئەوا باری نەخۆش زۆر دەشێوێت.

پەستانی خوێن زۆر نزم دەبێتەوە، نەخۆش لەهۆش خۆی دەچێت، پرتەی دڵ زێد دەکات، هەناسەدان زۆر رووکەشە و نەخۆش خەواڵو دەبێت و بە تەواوی لە هۆش خۆی دەچێت و نەخۆش دەکەوێتە باری میز نەکردنەوە.

پێستی لەش شین دەبێتەوە، خوێنی تێدەزێت وەك مەرمەڕی لێدێت و ساردە. گەر بارەکە بەرەو سەختر بڕوات ئەوا نەخۆش بە تەواوی خەواڵو دەبێت و خاڵی سور (خوێنبەربوون) لەسەر پێست و نێوپۆشی سورێنچك دەردەکەوێت (برینی گەدە و ریخۆڵە) پەیدا دەبێت.

**رێڕەوی نەخۆشییەکە**

بێت رێڕەوی نەخۆشییەکە یەدەکە و هەروەها ئەم هۆکارانەی خوارەوە باری نەخۆشییەکە بەدتر دەکەن.

- تەمەن (لەمنداڵ و پیردا نەخۆشییەکە زۆر سەختە).
- نەخۆشی تولانی (شەکرە، زەردوویی تولانی، ئاوبەنگی جگەر، شێرپەنجە).
- نزمبوونەوەی بەرگری (زگماکی).
- لەبارچوونی منداڵ (ژەهراوی ببێت).
- خوێنی بەکتریایی، سۆی باسیلی گرامنێگەتیڤ، کلیبسێلا و پسیۆدۆمۆنەس.

هاوکات بێچارەسەرکردن (لەچەند کاژێرێکدا یان لە 1-2 رۆژدا) لە 60-80 ٪ ی نەخۆشەکان دەمرن، تەنیا بەکتریای ئێشیریا کۆلای بەرێژەی لە 40 ٪ و پرۆتیوەس، ئایرۆباکتێر، ئایرۆروجینۆس بەرێژەی 70-80 ٪ دەبێتە هۆی مردن . گەر بارەکە بەردەوام بێ ئەوا نەخۆش تووشی ناچووستی گورچیلە دەبێت (میزناکات، پۆتاسیۆمی نێو خوێن، ئازۆت، ترشی زیندەپاڵ بەرزدەبنەوە)، زۆرجاران نەخۆش بە هۆی ناچووستی گورچیلە و سییەکانەوە دەمرێت.

**دەستنیشانکردن**

پێویستە زۆر زوو نەخۆشییەکە دەستنیشانبکرێت، نیشانەکان رۆڵی گرنگ دەبینن هەروەها تێستە تاقیگاییەکان تەواوکەرن لە دەستنیشانکردنی بارەکەدا. لەهەموو شتێك گرنگتر ئەوەیە کە بتوانین جۆری ژارین جودا بکەینەوە.

- تا، پرتەی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن (بە پێوە پەستانی خوێن لەژێر 30 ملم جیوەدایە).
- پێست (سەرەتا گەرم و شێدارە بەڵام پاشتر سارد دەبێتەوە).
- هەناسەدان قوڵە و ژمارەیان زۆرە، سەر پەنجەکانی دەست و پا ساردن.
- کەمبوونەوەی میز (لەژێر 20 ملیلیتر / کاژێر) یان میزنەکردن ئەوسا پێویستە بە تاڵمیز (سۆندە) میز بە نەخۆش بکرێت.

**تاقیگا**

- پێوانی پەستانی خوێنهێنەر، پێویستە لە یەکەم کاژێردا رێژەی CRP، ژمارەی هێماتۆکریت، هیمۆگلۆبین ، ژمارەی خڕۆکە سپییەکان بزانرێت.
- مەینی خوێن (کاتی مەینی خوێن، خڕۆکە سوورەکان، فایبرینۆجین، کاتی پرۆترۆمبین) دەپێورێت.
- پێوانی گازی ئۆکسجین و دووەم ئۆکسیدی کاربۆنی نێوخوێن.
- میز (یۆریا، گلوکۆز، ئەستۆنە، سۆدیۆم، پۆتاسیۆم، کلۆر) دەپێورێت.

- خوێنی خوێنهێنەر (یوریا، گلوکۆز، سۆدیۆم، پۆتاسیۆم، کلۆر، ئەسید لاکتیک، ئەسید پیرۆڤیك PH ی تێدا دەدۆزرێتەوە) دەپێورێت.
- کێشانی نەخۆش (زۆرجاران بە پێی کێشی نەخۆش دەرمان بەنەخۆش دەدرێت).

**پێویستە نەخۆشییەکە لەم نەخۆشی وسۆیانەی خوارەوەدا جودا بکرێتەوە:**

- ناوپۆشەسۆی دڵ.
- سییەسۆ و کەمبوونەوەی ئۆکسجین.
- لێدانی دڵ و تالێهاتن.
- ناچووستی تیژی سەرگورچیلە گلاند.
- پەنکریاسە سۆی دژوار.

**هۆکاری لەپڕ خراپبوونی ڕێڕەوی نەخۆشییەکە**

- گەر نەخۆشییەکە درەنگ (لەقۆناخی 3 و 4 دا) دەستنیشان بکرێت.
- گەر نەخۆش تووشی مەینی خوێنی نێو بۆریەکانی خوێن ببێت.
- بەرزبوونەوەی ڕێژەی ترشی و کەمبوونەوەی خڕۆکە سوورەکان.

هۆکاری باش بوونی نەخۆشییەکە بریتییە لە ڕەوینەوە و کەمبوونەوەی نیشانەکان هاوکات ئاسایی بوونەوەی ئەنجامی تێستەکان.

**چارەسەرکردن**

یەکێکە لەو بارە ئالۆز و دژوارانەی پێویستی بە چارەسەرکردنی ڕێك و دەم و دەستە . گەر ئەو نیشانانەی پێشتر باسکران دەربکەون ئەوا پێویستە دەست بەچارەسەرکردن بکرێت. بۆئەوەی ژارین برەوێنینەوە پێویستە زوو بە خوێنهێنەردا ئەنتیبایۆتیك بە نەخۆش بدەین، **هەروەها پێویستە:**

- لەخوێنهێنەرەوە ئاو وشلەی دی بکرێتە لەشەوە تا ڕێگا لەناچووستی سوڕانی خوێن بگیردرێت.
- دابینکردنی ئۆکسجین (کەمی ئۆکسجین ڕاست بکرێتەوە) و ڕاستکردنەوەی ترشی.
- کۆرتیزۆن و ئەنتیبایۆتیکی بەکتریا کوژ بدرێت بەنەخۆش.
- ڕاستکردنەوە و چاککردنەوەی زیندەپاڵ و وزە.
- چارەسەرکردن و خۆپاراستن لە دەرکەوتنی گیروگرفتی مەینی خوێنی نێو بۆریەکانی خوێن.
- نەخۆش لەبەشی چارەسەکردنی فریاگوزاریدا لە ژێر کۆنترۆڵی ئامێردا دەمێنێتەوە.
- لێدانی دڵ تۆمار دەکرێت، تا دەپێورێت، تاڵمیز لە کوونی میزکردندا دادەنرێت تا میزکردن ئاسان بکرێت.
- بۆ ڕاستکردنەوەی گیروگرفتی سوڕدانی خوێن (واتە کەمی خوێن و پلاسمای خوێن) پێویستە بە زووترین کات ڕووبەرووی بە تاڵی سوڕدانی خوێن پڕبکرێتەوە. زۆر پێویستە لە 2-3 کاژێری یەکەمدا نزیکەی 1-3 لیتر یان زێدەتر پلاسمای خوێن بکرێتە خوێنهێنەرەکانەوە، بەمەرجێك نەخۆش لەژێر کۆنترۆڵی پەستانی خوێنهێنەردا بێت.
- گەر نەتوانرا ئەوا پێویستە کۆنترۆڵی خوێنهێنەری لامل بکرێت. شلەی دێکستران نزیکەی 1500 ملیلیتر؛ شلەی تر یان گلوکۆز (هەر ملیلیترێ ، لەخولەکێکدا) ئەوەی ڕاستی بێت هەر پزیشکێك لەسەر

ڕێگای شارەزایەك چارەسەری بارەكە دەكات. هەندێكجار شلەی Ringer، شلەی فیسیۆلۆجی ClNa یان گلوكۆزە 5٪ خێرا رووبەری بۆریەخوێنەكان پڕناكاتەوە بۆیە تەنیا ئەو پلانەی سەرەوە لە خوریە سۆدا ئەنجام دەدرێت.

**داین كردنی ئۆكسجین بۆ خانەكان**

زۆر پێویستە ئۆكسجین بۆ شانەكان داین بكرێت، تانەخۆش تووشی ناچووستی كوتوپڕی هەناسەدان نەبێت. گەر ئۆكسجینی نێوخوێنبەر لەژێر 70 ملیمەتر جیوەدا بێت ئەوا نەخۆش بەرە و خنكاندن دەچێت.

لە كاتی ناچووستی كوتوپڕی هەناسەداندا، نەخۆش لەسەر جێگا دادەنیشێت و بۆریەكانی هەناسەی پاكدەكرێتەوە تاكو هەوا بەباشی هاتوچۆیان پیادا بكات. گەر ئۆكسجین بەنەخۆش بدەین ئەوا پێویستە سۆندەی ئۆكسجین بكرێتە نێو كوونە لووتەكاندا.

گەر ئەمە ئەنجام نەدرا و باری هەناسەدانی نەخۆش زیاتر شێوا ئەوا پێویستە لەدەرەوە كون بكرێتە بۆری هەناسە Thacheostomy و تا هەموو شانەكان ئۆكسجینی پێویستیان بكاتێ و لە شانەكان نەخنكێن و نەمرن. هەروەها زۆر پێویستە فشاری ئۆكسجینی خوێنهێنەر بگاتە 70 ملیلیتر جیوە.

**راستكردنەوەی زیندەپاڵی ترشاوی:**

لەم بارەدا پێویستە شلەی بیكاربۆناتی سۆدیۆم یەك لەسەر چوار یان 84٪ یان لەگەڵ Tris Hidroximetil-Aminometana (THAM) بەخوێنهێنەردا بكرێتە نێو نەخۆشەوە.

**چارەسەركردنی ئەنتیبایۆتیك** (9)

پێش دەستپێكردنی چارەسەركردن پێویستە خێرا نموونەیەكی خوێن وەر بگیرێت بۆ چاندن و جوداكردنەوەی جۆری بەكتریاكە، پاشتر تێستی بەكتریاكوژ (واتە بزانین كام دەرمان بەكتریاكە دەكوژێت) ئەنجام دەدرێت تا لە ئەنتیبایۆتیكەكە دڵنیا ببین. هەندێكجارجاران پێویستە پزیشك دوو ئەنتیبایۆتیك تێكەڵ بكات و بەكاریان بهێنێت تا بەكتریاكە لەناوبەرێت. گەر هۆی سۆكە مێنینگۆكۆكس بێت ئەوا پێویستە بەزووترین كات 2 ملیۆن یەكە پەنسیلین G لەگەڵ ئاوی دڵۆپاودا بەخوێنهێنەردا لەماوەی 2 كاژێردا بكرێتە نێو خوێنهێنەرەوە

پێویستە 2.2 ملگم / كگم كێشی نەخۆش جێنتامایسین یان تۆبرامایسین بەخوێنهێنەردا بدرێت بەنەخۆش. گەر رێژەی میزی نەخۆش كەم بوو بۆوە، ئەوا پێویستە رێژەكەی سەرەوە كەم بكرێتەوە بۆ 1.5 ملگم / كگم.

- گەر گومان كرا سەرچاوەی ژارینەكە لەنێو سكدایە ئەوا 3 × 600 ملگم كلیندامایسین لەگەڵ 1 گم میترۆنیدازۆڵ (بەجارێك بەخوێنهێنەردا) دەدرێت بە نەخۆش.
- گەر گومان كرا سەرچاوەی ژارینەكە لە نێو سكدا نییە ئەوا دەبێت 3 × 1.5 ملگم Cefuroxim=Zinacef لەخوێنهێنەرەوە یان 2 × 2 ملگم / كگم Cefotaxim=Claforan بدرێت بە نەخۆش.
- گەر گومانی پەردەسۆی مێشك كرا ئەوا پێویستە 3 × 3 گم Cefotaxim بدرێت بەنەخۆش.
- گەر گومان كرا سەرچاوەی ژارینەكە لە بۆری میزو میزەرۆو میزەجۆگانەوەیە ئەوا پێویستە 2 × 2 گم Cefotaxim بدرێت بە نەخۆش . یەك ژەمی 3-4 ملگم / كگم جێنتامایسین زۆر باشە.

تێبینی: پێویسته بەپێی ڕێژەی کریاتینین دەرمانی جێنتامایسین و تۆبرامایسین و ئەمیکاسین بدرێت بەنەخۆش.

تێبینی: له کاتی دوو دڵیدا پێویسته پزیشك 3-4 ملگم/کگم ی نەخۆش دەرمانی جێنتامایسین بدات بەنەخۆش تا نەخۆش دەگاته لای پزیشکی تایبەتمەند.

هەروەها پێویسته:

- چاودێری کردنی فرمانی گورچیله (تێکەڵکردنی ئەنتیبایۆتیك).
- چاودێری کردنی فرمانی دڵ و بۆریەکانی خوێن (له کاتی ناچووستی دڵ دا) پێویسته دەرمانی دڵ بەهێزکەر بدرێت به نەخۆش.
- کۆنترۆڵی دڵ ECG و پرتەی دڵ بکرێت و پەستانی خوێن دەپێورێت.
- نزیکەی 1-4 میکرۆگرام / خولەك لەدەرمانی ئیزۆپرێنالینه، یان

ئیسۆپریل لەگەڵ شلەی گلوکۆز 5٪ دا (له گەڵ کۆنترۆڵی پرتەی دڵدا، نابێت له 100 جار زێدتر لێبدات) دەدرێت بەنەخۆش.

- نۆرئەدرێنالین ، ئیفیدرین و میترۆنیدازۆڵ به سوودن بەڵام نادرێت بەو نەخۆشەی تووشی خوریەی ژاراوی بووە !.
- کورتیکۆستیرۆیز: بەپێی جۆری خوریه بەکار دەهینرێت.
- چارەسەرکردنی نەشتەرگەری ، برین و لابردنی شوێنی کۆبوونەوەی میکرۆب ، وەك هەوکردنی هێلکەدان و زاماڵ پاش له بارچوون ، پێویسته برینەکان پاکژبکرێتەوە.

لەخوریەدا پێویسته پزیشك به خوێنهێنەردا دەرمان بدات به نەخۆش.

خۆپاراستن

- چارەسەرکردنی برینێك که گومانی تەنینەوەی لێبکرێت و ببێته هۆی خوێنی بەکتریایی.
- وردبینی و هۆشیاری لەکاتی گورچیلەسۆ، میزەرۆسۆ، میزڵدان سۆ و ددانەسۆدا.
- گەر پێویست بکات هەندێك شوێن به نەشتەرگەری چارەسەر دەکرێت.

سەرچاوەکان

References
1.Abboud, M. Shock in Cecils textbook of Medicine (p211), ed a 17a W. B. Saunders, Philadelphia, 1985.
2.Baue, A. The treatment of septic shock. surgery, 1969; 65, 85.
3.James P. Steinberg and W. Lee Hand. Bacteremia and septic shock, In. Medicine for the practicing Physician, 3rd ed, 1992; 265-69.
4.Kreger BE, et al., Gram-negative bateremia: 111. Reassessment of ctiology, epidemiology and ecology in 612 patients. Am I Med 1980; 68: 332
5.Young LS. Gram-negative sepsis In Mandell GL. Douglas RGjr. Bennett JE, eds. principles and practice of infectious diseases, 3rd ed. New Yourk Churchill Livingstone, 1990; 611.
6.Weinstein MP et al., Septic shock in humans. Am Intern Med 1990; 113: 227.
7.Jeromo O. Klein and S. Michael Marcy Bacterial Sepsis and Meningitis. In: Jack S. Remington and Jeromo O. Klein, eds. Infectious Diseases of the Fetus newborn infant, 4th ed USA. 1995; 26: 980-1028.
8.Moselio Schechter, Gerald Medoff and Barry I. Eisenstein, Mecanism of Microbial Disease, 2ed eds, Williams & Wilkins, 1993.
9.Jan Sjolin, Sten Iwarson, Sepsis och den inflammatoriska reaktionen. Stockholm 1997.

# ناوپۆشه سۆی دڵ

بریتییه لەو هەوکردنانەی تووشی ناوپۆشی دڵ ، زمانه و بۆریەخوێنەکانی دڵ دەبێت . هەندێك شارەزا لەم بوارەدا دەبێژن کە زۆرجاران هەوکردنەکە تەنیا زمانەکانی دڵ دەگرێتەوە و بە دەگمەن ناوپۆشی دڵ دەگرێتەوە . بە مانایەکی دی دەتوانین بڵێین کە هەوکردنەکە جۆرێکی تایبەتی ژارین ە . ئەوەی شایانی باسە پێش دۆزینەوەی ئەنتیبایۆتیك کاتێك شاخوێنبەر و بۆریەگەورەکانی دڵ تووشی سۆ دەبوون لە 100٪ ی بارەکاندا نەخۆش دەمرد . هۆی بەرزی ڕێژەی مردن دەگەڕایەوە بۆ سەرچاوەی هەوکردنەکە دەکەوێتە سەر ناوپۆشی دڵ و زمانەکانی دڵ.

**هۆزانی**

هۆی هەوکرنەکە دەگەڕێتەوە بۆ:

* بەکتریا بریتین لە:
- ئەلفاسترێپتۆکۆکەسەکان
- ستافیلۆکۆکەسەکان .
- ئێنتێرۆکۆکەکان .
- ستێپتۆکۆکەسە هێمۆلیتیکەکانی A,B,C,F,G

ستافیلۆکۆکەسی ئاوریۆس ،سترێپیۆکۆکەس هێمۆلیتیك و پنێومۆکۆك دەبنە هۆی هەوکردنی کوتوپڕ. میکرۆئۆرگانیسمەکانی دی دەبنە هۆی باری ژێرکوتوپڕ .

* فونج

*ریکێتیس

* ڤایرۆس ، ئەم ڤایرۆسانە دەتوانن هەو بە دیواری ناوەوەی دڵ بکەن (Coxsacki B virus, Influenza A,B, EBV,CMV,HIV) هاوکات تۆکسۆپلاسما، مایکۆپلاسما وکلامیدیای Psittaci , Trypanosoma cruzi بینراوە .

**پەتازانی**

ئەوەی شایانی باسە سۆ کە بە ڕێژەی جیاواز لە هەموو جیهاندا بڵاوە . بە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا بۆ نمونە سوید لە یەك ملیۆن کەسدا تەنیا 50 کەس تووشی ئەم سۆیە دەبن . وەلێ لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا ڕێژەکە زۆر زۆرترە ، هۆی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ پێشکەوتنی باری ئابوری ، زانستی،پزیشکی و ڕۆشنبیری لە سوێددا. ئەوەی لێرەدا پێویستە ئاماژەی پێبکەم ئەوەیە کە بە پێی جۆری میکرۆئۆرگانیسمەکە نیشانەکان جیاوازە .

ئەمەش کاردەکاتە سەر شێوەی چارەسەرکردن پێش ئەوەی پزیشك ئەنجامی چاندنی میکۆئۆرگانیسمەکە وەربگرێت . ئەوەی ڕاستی بێت 2 مانگ پێش نەشتەرگری لە 33٪ ی زمانەکانی دڵی نەخۆش تووشی ئەم سۆیە دەبن . لە کاتی هەکردن بە S.epidermidis دا سۆ کە کەمێك گیروگرفت پەیدا دەکات .

**جۆرەکانی سۆکە**

1- **جۆری کوتوپڕ**

لە ناکاونیشانەکان دەردەکەون، تا بەرزە و لە سەروو 40 پلەوەیە ، لەرزوتا زۆر بەهێزە ، گۆرانکاری لێدانی دڵ ، ناتەواوی خێرایی و ناچوستی دڵ ، تێستی خوێنی CRP زۆر بەرزە .زۆرجاران لە چەند رۆژێکدا یان لە چەند هەفتەیەکدا نەخۆش دەمرێت . لە 50-80٪ ی بارەکاندا هۆی سۆکە دەگەرێتەوە بۆ S. aureus .

2- **ژێر کوتوپڕ**

لەم بارەدا نیشانەکان لە سەرخۆ دەردەکەون . تا مامناوەندییە بە دەگمەن دەگاتە 39 پلە ، شەوئارەقەکردنەوە ، ماندوویی ، تێستی خوێنی CRP زۆر بەرزە . نەمانی ئیشتیهای خۆراک خواردن . هاوکات ژانە ماسولکە و دەرکەوتنی گۆرانکارییەکانی سەر پێست دەر دەکەون . لەوانەیە سۆکە 3-6 مانگان بخایەنێت . گەر هۆی سۆکە S. epidermidis بێت ئەوا لەوانەیە سۆکە نزیکەی یەك ساڵ بخایەنێت . لەم بارەدا و لەکاتی تێڕوانیندا پزیشك گوێی لە وژمەکی تایبەتی دڵ دەبێت .

**دەستنیشانکردن**

- نیشانەکان و گۆرانکارییەکانی لێدان و گوێگرتن لە دڵ .
- هەر کاتێك نەخۆش ماوەی 7 رۆژ تادار بوو بێئەوەی هۆی تا بزانرێت پێویستە پزیشك گومان لە ناوپۆشە سۆی دڵ بکات .
- چاندنی خوێن (پێویستە لە 3 شوێنی جیاواز خوێن وەربگیرێت پێش ئەوەی دەست بە چارەسەر بکرێت)
- تێڕوانینی سورێنچك لەم بارەدا زۆر هەستدارە .

**چارەسەرکردن**

- بۆئەلفاسیتێپتۆکۆکەسەکان پێویستە Benzyl Penicillin لە گەڵ ئەمینۆ گلیکۆسیدەکاندا بۆ 2 هەفتە بدرێت بە نەخۆش .
- بۆ ئینتێرۆکۆکەسەکان پێویستە PG، یان (Ampicillin) لە گەڵ ئەمینۆ گلیکۆسیدەکاندا بۆ 4-6 هەفتە بدرێت بە نەخۆش.
- لە کاتی S. Aureus دەبێت (Isoxazol PC) بۆ 4-6 هەفتە، لە گەڵ ئەمینۆگلیکۆسیدەکاندا بۆ 1 هەفتە بدرێت بەنەخۆش .
- لە کاتی S. epidermidis دەبێت (Isoxazol PC) بۆ 4-6 هەفتە بدرێت بە نەخۆش .

لە گەڵ ریفامیسین بۆ 4-6 هەفتە و ئەمینۆگلیکۆسیدەکان دا بۆ 2 هەفتە بە یەکەوە بدرێت بە نەخۆش.

**ئەمینۆگلیکۆسیدەکان بریتین لە:**

تۆبرامایسین، جێنتامایسین ، سپێکترۆمایسین ، ئەمیکاسین و نێتیلمیسین .

گەر پزیشك گومانی کرد هۆی سۆ کوتوپڕەکە ستافیلۆکۆکەس ئاوریۆس، سترێپتۆکۆکەسی هێمۆلیتیك یان پنیۆمۆکۆکەس بێت ئەوا دەتوانین لە خوێنهێنەرەوە رۆژانە 6 گم Cefuroxim=Zinacef دابەشبکرێت بە 3-4 ژەمدا لە گەڵ (Aminoglycosid=Garamycin=Nebcina-Netilyn) بە رێژەی 1,5 mg/kg x3 بدرێت بە نەخۆش .

### سەرچاوەکان

References
1 Kaye D (ed) infective endocarditis, 2 edition, Rarens press. NW. 1992
2.Stanford T.Shulman, John P. Phair, Lance R Peterson, John R Warren The biologic and clinical basis of infectious Diseases. London 1997.
3.G. Friman, Från Iwarsson –Norrby, infektionsmedicin, klinik och terapi, Säve Förlag 1998. 414-420
4. Anna-Stina Malmber , septikemi och endokarit, från Arne Forsgren, Göran Kronvall, Klinik Bakteriologi, Studentlitteratur, Lund. 1996, 211-220.
5.Lars Olaison, Endokatit ;infektiös, Infektionkliniken/SU/ÖSTRA Sjukhuset och Ragnar Norrby. www.internetmedicin.seSmittskydsinstitutet/Solna.uppdaterat 12 09.03

## خوێنی بەکتریایی

نەخۆشییەکی کوتوپڕی سەراپایی کۆئەندامەکانی لەشە کاتێك مایکرۆ ئۆرگانیسم و ژەهرەکانیان دەگەنە نێوخوێن. کاتێك برینێك لە لەشدا کراوەتەوە، لەنێو برینەکەدا میکرۆب زێد دەکات و پاشتر لەخوێندا ژەهر دەردەدات، کە دەبێتە هۆی ئەوەی بەردەوام بەکتریا لە نێوخوێندا هەبێت و لە رێگای سوڕدانی خوێنەوە بەکتریاکە بەنێو لەشدا بڵاودەبێتەوە و ئەندامی دی تووشی دەکات.

- لە وڵاتە ئینگلیزییەکاندا نەخۆشییەکە بە Bacteremia نێو دەبرێت.
- لە وڵاتە فەرەنساییەکاندا بە Septicemia نێو دەبرێت.
- لە ئەمێریکا ، سوێد و ئەڵمانیا زاراوەی Sepsis ی بۆ بەکاردەهێنرێت.

**تێبینی: لە Bacteremia دا رێژەی بەکتریا کاتی‌یە و کەمترە وەك لە Septicemia دا.**

**تێبینی: لە مرۆڤی لەش ساخدا بەکتریا لەخوێن و میزدا نییە.**

**گرنگی نەخۆشییەکە**

ئەوەی شایانی باسە لەم چەند ساڵانەی دووایدا هەوکردنەکە زێدتر بڵاوە و زێدتر دەبینرێت و هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ:

1- بەکارهێنانی سۆندە، ئامێری پشکنینی گەدە و ریخۆڵە، وەرگرتنی نمونەی خانەیی بۆ چاندن یان بە هۆی نەشتەرگەری کردنەوەی دڵ، دانانی زمانەی دڵ، زمانە سۆی دڵ.

2- هەندێك لە بەکتریا و کەڕوو بەرانبەر ئەنتیبایۆتیك بەرگریان پەیدا کردووە و دەرمان بە ئاسانی نایانکوژن.

3- کەمبوونەوەی بەرگری (لە کاتی چارەکردندا بەدژە شێرپەنجە، کۆرتیزۆن درێژخایەن).

4- کەمبوونەوەی بەرگری بەهۆی نەخۆشی ترەوە (شەکرە، بازەڵە، شێرپەنجە).

ئەمانە هۆکاری یاریدەدەری دەرکەوتنی ئەو بارە ئاڵۆزەن کە بەکتریا بە ئاسانی دەگاتە نێوخوێن و لەوێدا زێد دەکات و پاشتر بەهۆی خوێنەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ئەندامەکانی دی. ئەوەی راستی بێت رێژەی مردن لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دی جیاوازە. لە Sepsis دا پزیشك دەبینێت:

- باری گشتی نەخۆش خراپە و هاوکات نەخۆش نیشانەی هەوکردنی هەیە.
- پلەی گەرمی لەشی نەخۆش لە سەروو 38 پلەوەیە یان لە ژێر 36 پلەوەیە.
- ژمارەی لێدانی دڵی نەخۆش لە سەروو 90 جاردایە لە خولەکێکدا.

- ژمارەی هەناسەدانی نەخۆش لە سەروو 20 هەناسەدایە لە خولەکێکدا.
- ژمارەی خڕۆکەسپییەکان WBC لەسەروو 12000 خانەوەیە لە یەك ملم سێجادا.

**هۆی سۆکە**

**هۆی ئالۆدەبوونی خوێن بەبەکتریا دەگەڕێتەوە بۆ چەند بەکتریایەك و بەدەگمەن کەڕوو هۆیەکی دی سۆکەیە. لە هەندێك ئاماردا ستافیلۆکۆکەس ئاوریوس و ئێشیریا کۆلای زۆر بڵاون.**

**نزیکەی لە 40 ٪ ی سەرجەمی هۆکان پێك دێنن (سترێپتۆکۆکەس بێتا هێمۆلیتیکەس ڤیریدانس، ئینترۆباکتر، کلیبسێلا، پنێومۆکۆکەس، پسێودۆمۆناس زێدەتر لە Bacteremia دا دەردەکەوێت وەك لە Septicemia) بەدەگمەن دەبینرێن.**

**هەندێکجار مێنینگۆکۆکەس ، گۆنۆکۆکەس ، باسیلی کەربۆنۆس یش دەردەکەوێت. -**

**باسیلی گرامنێگەتیڤ** (ئایرۆب - زیندە بەهەوا):

**زۆربەی زۆری ئەو بەکتریایانەدەگرێتەوە کە پاش لەبارچوون، منداڵبوون یان پاش نەشتەرگەری ریخۆڵە دەردەکەوێت، رێژەی ئەمانیش لەنێوان 38-50 ٪ دایە.**

**گرنگترین باسیلە جوداکراوەکان ئەمانەن:**

- لە 30٪ ی بەکتریای گرامپۆزەتیڤی Staphylococcus aureus, Staphylococcus epidemidis, Enterococci, Pneumococci ن.
- لە 35 ٪ ی بەکتریای گرامنێگەتیڤی E. coli, Pseudomonas spp. Klebsiella spp. ن.
- لە 21 ٪ یش بەکتریای تێکەڵن و لە 5 ٪ ی بریتین لە Fungi, Anaerobes, Mycobacteria.

**هۆی نەخۆشییەکە لەمنداڵدا**

**منداڵی ژێر 3 ساڵان تووشی (پسێودۆمۆناس، سالمۆنێلا، ئێشیریاکۆلای، کلیبسێلا) دەبێت، منداڵی گەورە زێدتر تووشی (ستافیلۆکۆکەس) دەبێت.**

**کەڕوو**: هەندێکجار جۆری کاندیدەی ئەلبیکانیس دەردەکەون.

**تێبینی: گەر پاش هەموو نەشتەرگەرییەك نەخۆش تای لێهات ئەوا پێویستە بە وردی بە شوێن سەرچاوەی برینی سۆدا ، شوێنی کێمکردندا بگەڕێن و هاوکات شوێنی نەشتەرگەریەکە بە باشی بپشکنین.**

**نیشانەکان**

**بە گشتی بەکتریاکان لەچەند رۆژێکدا (لە بەکتریایەکەوە بۆ یەکێکی دی جیاوازە) کڕەکەون، هەندێکجار لەجۆرە سەختەکاندا بەکتریاکە لەچەند کاتژێرێکدا کڕەکەوێت. بەدەگمەن نیشانەکان لەسەرخۆ دەردەکەون دەنا زۆرجاران لەپڕ مرۆڤ لەرزێکی توندی لێدێت و باری تەندروستی تێك دەچێت.**

**تێبینی**: لەکاتی ئالۆدەبوونی خوێن بە بەکتریا پەردەی ناوەوەی دڵدا، نیشانەکان هێواش دەردەکەون.

**زۆرجاران لە گەڵ نیشانەی دەمی برینەکەدا (دومەڵ، سۆی زامالی پاش لەبارچوون، سۆی هەوکردن) دا نیشانەکانی سۆکە دەردەکەوێت. لەم بارەدا تا زۆر بەرزە (41 پلە) و بەرز و نزم دەبێتەوە و نارێکە و لە گەڵ لەرزدا دەردەکەوێت.**

**پێست**: ژەهری بەکتریاکە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی پەڵەی سوری شێوە خاڵ و لیری قەبارە جیاواز لەسەر پێست، هەندێکجار پێکهاتووی وەك پنتە خوێنرێنە دەردەکەوێت.

جاری وایە پێست پەنماوە یان هەوای تێچووە. واتە هەوا دەچێتە ژێر پێستەوە (وەك لە كاتی بەكتریای ستافیلۆكۆكەسدا دەردەكەوێت).

**گیروگرفتی دڵ بۆریەكانی خوێن:** بریتین لەزێد لێدانی دڵ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن و ناچووستی دڵ و هەناسەدان، هەندێكجار (بە هۆی بەكتریای گرامنێگەتیڤەوە) بۆ ماوەیەكی كەم و لەپڕ نەخۆش لەهۆش خۆی دەچێت.

**هەناسەدان:** لەم بارەدا فرمانەكانی هەناسەدان گیروگرفتیان تووش دەبێت، چونكە خوێن بەكتریاكە بۆ كۆئەندامی هەناسەدان و توێی نێوان سییەكان دەگوێزرێتەوە.

**گەورەبوونی جگەر:** زۆرجاران رووخساری نەخۆش زەرد دەبێت یان زۆركەم زەرد دەبێت، هەروەها سپڵیش كەمێك گەورە دەبێت و نەرمە.

**كۆئەندامی هەرس:** نێوپۆشی زار هیشك دەبێتەوە چونكە شلەی نێو دەم (لیك) و شلەی نێوكۆئەندامی هەرس كەم دەبێتەوە، نەخۆش گڕ و گازی هەیە (سكی گەورە دەردەكەوێت).

**كاری گورچیلە:** بەگشتی فرمانەكانی گورچیلە تووشی گیروگرفتی كردنەدەرەوەی ئەلبومینی نێو میز، میزی خوێناوی، هەروەها زێدبوونی یوریای نێوخوێن، بەرزبوونەوەی كریاتینینی نێو سیرەمی خوێن، گورچیلەسۆ و كەمبوونەوەی میز دەبێت و لەئەنجامدا هەموو گیروگرفتەكان دەبنە هۆی ناچووستی گورچیلە.

**گیروگرفتی دەروونی:** نائارامی، خەواڵوویی، لەش داهێزران، بێخوڵكی، بێئاگایی، لەهۆش خۆچوونی هەمیشەیی- درێژ خایەن)، ئەم نیشانانە ئەو راستییەمان بۆ دەسەلمێنن كە ژەهری بەكتریاكە كاری كردۆتە سەر كۆئەندامی ناوەندی دەمار. هەندێكجار تەشەنەكردنی ژەهری بەكتریاكەوە دەبێتە هۆی دەركەوتنی نیشانەكان و ئاسانكردنی دەستنیشانكردنی نەخۆشییەكە. زۆرجاران پزیشك وادەزانێت كەنەخۆش تووشی رۆماتیسمی كوتوپڕی جومگەكان بووە و بۆ چارەسەركردن پەنا بۆ كۆرتیزۆن دەبا و ئەمەش دەبێتە هۆی شێوانی رێڕەوی نەخۆشییەكە. لەبەرئەوە زۆر پێویستە بارەكە لەئاستی سییەكان، بۆریەكانی هەوا، ئاشین، جگەر، گورچیلە، دەورووبەری كۆم، مەژی و ئێسكدا كۆنترۆڵ بكرێت.

**گرنگترین نیشانەكانی خوێنی بەكتریایی بە مێنینگۆكۆكدا بریتین لە :**

* ژانەسەر ، تا ، ژانەسك ، ژانكردنی ماسولكەكانی لەش ، خێرابوونی لێدانی دڵ ، نزمبوونەوەی پەستانی خوێن ، ساردبوونەوەی پەنجەكانی پەلەكان و دەركەوتنی پەڵەی سەر پێست .

**تاقیگا**

- نزمبوونەوەی ژمارەی خڕۆكە سپییەكان، بەتایبەتی خانە هاوتاكان، هەندێكجار (لە كاتی سۆی بەكتریای گرامنێگەتیڤدا) خڕۆكە سپییەكان زۆر زوو نزم دەبنەوە، وا دەردەكەوێت كە نەخۆش تووشی كەمخوێنی پلاستیكی بووە.

- لەم بارەدا هۆی كەمخوێنی دەگەڕێتەوە بۆ ژەهر بەتایبەتی ژەهری سترێپتۆكۆكەس یان كلۆستریدیەم .Cl. Perferingens

- ناهاوسەنگی كانزاكان و بەرزبوونەوەی رێژەی ئەسید و ئازۆت دەبینرێت.

ئەوەی شایانی باسە بەكتریا گرامنێگەتیڤەكان دەبنە هۆی كەمبوونەوەی فۆسفاتی نێو خوێن (ژێر 2 ملگم ٪). هاوكات زیندەپالی پرۆتین تێك دەچێت.

- بەرزبوونەوەی گلۆبولینی ئەلفا 2 بەلام ئەلفا 1 کەمتر بەرزدەبێتەوە.
- بەرزبوونەوەی فیبرین لەخوێندا.
- زیندەپالی هیدرۆکاربۆن ئەوەندە تێکدەچێت کە دەبێتە هۆی گیروگرفتی خانەکان.
- زۆرجاران بەدەگمەن نیشانەی گیروگرفتی خانەکانی جگەر دەردەکەون.

**ئالۆزکارییەکان**

لەم بارەدا ئالۆزکاریەکان زۆرن بەلام گرنگترینیان بریتین لە:

- خوریەی سوێی.
- ناچووستی تیژی گورچیلە.
- ناچووستی جگەر (لەو کەسانەدا کە گیروگرفتی جگەریان هەیە).
- تەشەنەکردنی مەینی خوێنی نێو بۆریەکانی خوێن.
- پەیدابوونی خوێنی مەیوی تۆپەڵ بووی نێو بۆریەکانی خوێن و ناچووستی دڵ.
- گیروگرفتی خوێنەبەر و هەندێکجار لەوانەیە خوێنبەر بتەقێنێت.

**جۆرە کلینیکییەکان بەپێی ڕێرەوی سۆ:**

- لەوانەیە سۆکە کێم بکات (لە 2-3 ڕۆژدا سۆکە هەڵدەچێت و نەخۆش دەمرێت).
- جۆری تیژ.
- جۆری ژێر کوتوپڕ (ناوپۆشەسوی دڵ بە ستریپتۆکۆکەس).
- جۆری تولانی (سۆ بە ستریپتۆکۆکەسی ڤیریدانس، مێنینگۆکۆکەس).

**بەپێی شوێنی چوونە ژوورەوەی بەکتریاکە:**

- پاش لەدایکبوون، لەبارچوون، نەشتەرگەری، مەرازەسۆ (ئالووکەوتن)، هەرچەندە نیشانەی کلینیکی نەخۆشییەکان زۆر لەیەکەوە نزیکن ، وە بەپێی جۆری هۆی سۆکە هەندێك نیشانەیان کەمێك جیاوازە.

جۆری ستافیلۆکۆك: ئەمڕۆ لەهەموویان زێدتر دەبینرێت و هەمیشە بارێکی قورسە و ڕێرەوی سۆکە ژێر تیژە ، هەروەها ژەهری ستافیلۆکۆکەس زۆر زوو تەشەنە دەکات. لە سۆبە بەکتریای ستافیلۆکۆکەس دا، بەکتریاکە دژی زۆربەی ئەنتیبایۆتیکەکان بەرگری لەخۆی دەکات.

ئالۆدەبوونی خوێن بە بەکتریای کلۆستریدیەم Cl. Perferingens زۆر ترسناکە بەلام وەك دەرکەوتووە زۆر کەم بوونەتەوە. لەم بارەدا نەخۆش ژاراوییە، زەردی ڕووخسار و ناچووستی گورچیلەش (میزنەکردن و بەرزبوونەوەی یۆریا) دەردەکەوێت.

نابێت ئەو ڕاستیەشمان لەیاد بچێت کە ئەم میکرۆبانەش Bacteriodes fragilis, B. Insolitus دەبنە هۆی سۆی ترسناك. گەر هۆی سۆکە (لەکاتی شیکردنەوەی خوێن لەدەرەوەی لەشدا) تێکەڵ بوونی 2 بەکتریا بوو کە (7 ٪) دا دەردەکەون ئەوا ڕێژەی مردن دەگاتە 80 ٪. هەروەها زۆرجاران ستافیلۆکۆکەس دەبێتە هۆی مردن. هۆی چوونە ناوەوەی بەکتریا لە دەمی زامانەوە (پاش لە دایکبوون یان لەبارچوون) زۆرە و زۆرجاران هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ستافیلۆکۆکەس گرامنێگەتیڤ کە نیشانەی جیاوازی هەیە.

ئالۆدەبوونی خوێن بە بەکتریا بەهۆی سوندەوە (بەتایبەتی لەساوادا) زۆر ئاسانە ، چونکە زۆرجاران ساوا لەنەخۆشخانەدا تووشی ئێشیریا کۆلای ، پسیودۆمۆناس و پرۆتیۆس دەبێت.

له 3 توێژینەوەی سویدی ، ئینگلیزی و نەرویجیدا دەرکەوتووە کە نزیکەی 160 ٪ منداڵی ساوا تا 4 ساڵان لەساڵانی 1990 – 1995 دا زێدەتر (منداڵانی کوتراوی بەهیمۆفیلیس ئینفلوەنزا) تووشی پنیمۆکۆکەس بوون بەڵام منداڵانی گەورەتر تووش نەبوون (1).

**ڕێڕەوی نەخۆشییەکە**

تا ئەمڕۆ نەخۆشییەکە (لەکاتی گرامنێگەتیڤدا) بە ڕێژەی 25–30 ٪ دەبێتە هۆی مردن ، وە لە تەمەنداردا یان لەو کەسانەی نەخۆشی درێژخایەنیان هەیە لەوانەیە ڕێژەکە بگاتە 75–80 ٪. هەروەها ڕێژەی مردن لەسەر قورسی نەخۆشییەکە، شوێنی سۆکە و جۆری بەکتریاکە بەندە. هەرچەندە ڕێژەی مردن بە بەکتریای گرامپۆزەتیڤ زۆر کەمتر بۆتەوە بەڵام ڕێژەی مردن بە بەکتریای گرامنێگەتیڤ هەروەك خۆی ماوەتەوە و نزیکەی لە 60 ٪ دایە. هەروەها تەمەن ، باری ئەندامەکانی لەش ، خوڕپەی سۆیی ، ناچووستی تیژی گورچیلە هۆی سەختکردنی ڕێڕەوی نەخۆشییەکەیە.

**دەستنیشانکردن**

- مێژووی سۆ و چۆنیەتی تەشەنەکردنی سۆ و دەرکەوتنی نیشانەکان.
- زۆر پێویستە جۆری بەکتریاکە لەخوێندا جودا بکرێتەوە.
- کاتی سۆ (ڕووداو، دومەڵ ، لەبارچوونی ژەهراوی یان کێمکردوو ، تای بەرزوناڕێك، گۆڕانکاری پێست، گەورەبوونی سپڵ و گیروگرفتی دەروونی) بزانرێت. بوونی زاری (کونی) چوونە ناوەوەی بەکتریاکە.

**تاقیکا**

- کەمبوونەوەی ژمارەی خڕۆکە سپییەکان (لەنێوان 10-15 هەزاردایە) و خانە هاوتاکان.
- کەمبوونەوەی ژمارەی خڕۆکە سوورەکان 150 هەزار / ملیمتر سێجادا.
- گەر هۆی سۆکە گرامنێگەتیڤ بێت ئەوا ژمارەی خەپلەکانی خوێن لە نێوان 60–80 هەزاردایە.
- گەر هۆی سۆکە گرامپۆزەتیڤ بێت ئەوا ژمارەی خەپلەکانی خوێن لە نێوان 80 – 100 هەزاردایە.
- نزمبوونەوەی ڕێژەی فۆسفاتی نێو خوێن (فۆسفاتی نا ئۆرگانی).
- ئێکسبەرداری ، سنتیگرافی ، تێڕوانینی لووت و گوێ و گەروو و چاو زۆر یاریدەی دەستنیشانکردنی بارەکە دەدەن.
- جوداکردنەوە و ناسینەوەی هۆی سۆ و هەڵبژاردنی ئەنتیبایۆتیکی لە بار.
- چاندنی نموونەیەکی خوێنی نەخۆش کلیلی دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکە (گەربێت و بەلانی کەمەوە 2 نموونەی چاندن وەربگیرێن) ئەوا لە ئەنجامەکەی باشتر دڵنیا دەبین. (لەبارترین کات بۆ وەرگرتنی خوێنی خوێنهێنەر بریتییە لە کاژێرێك پێش بەرزبوونەوەی تا، چونکە لەوانەیە لە کاتی بەرزبوونەوەی تا دا بەکتریای نێوخوێن زۆر نزم ببێتەوە).

**تێبینی**: ڕێژەی خوێن بۆ چاندن لەنێوان 10-15 ملیلیتردایە بەڵام لە منداڵدا لە نێوان 1-5 ملیلیتر خوێندایە.

**چارەسەرکردن**

لێرەدا زۆر گرنگە و پێویستە ئاماژە بەوە بکەم کەپێویستە هەمیشە لە کاتی ئالۆدەبوونی خوێن بە بەکتریا نەخۆش لە بەشی فریاگوزاری کلینیکی نەخۆشییە درمەکاندا بمێنێتەوە. زۆر پێویستە پزیشك و تاقیگا بە باشی هاریکاری یەکتری بکەن (لەباری قورسی و خورپەی ژاریندا) نەخۆش لەژێر کۆنترۆڵی ئامێردا بێت.

**تێبینی:** سەرەتا پێویستە بزانرێت ئایا نەخۆش خورپەی ژەهری هەیە نا؟؟

**دەرمان:** هەڵبژاردنی دەرمانی بەکتریاکوژ.

- چارەسەرکردنی سەرچاوەی سۆکە.
- راستکردنەوەی هاوسەنگکردنی ژەهر و فرمانەکان و زیندەپاڵ.

هەندێك ئەنتیبایۆتیك کە بە پێی هۆی سۆکە بەکاردەهێنرێت:

| هۆی سۆکە | ئەنتیبایۆتیك |
|---|---|
| Staphylococcus saureu | G Penicillin |
| Streptococcus pyogens | ,Erythromycin ,G Penicillin Cepfalosporins |
| Enterococci type D | G Penicillin Streptomycinor , Streptomycin+Amoxycillin |
| Streptococcus pneumonia | Penicillin G. Erythromycin or Cepfalosporins, Lincomycin |
| Streptococcus anaerob | Penicillin G. Cephalosporins, Lincomycin |
| Neisseria Menigititi | Penicillin G, chloramphenicol, Rifampicin |
| E. Coli, Klebsiella pneumonia | Gentamycin. Tobramycin. Kanamycin. Ampicillin, Sephalosporins, Cortimethoxazol |
| Salmonella Typhus | Ampicillin, chloramphenicol |
| H. Influenza | Ampicillin, chloramphenicol |
| Salmonella, Shigella | Ampicillin |
| Brucella | Tetracyklin, chloramphenicol |

هەروەك پێشووتر ئاماژەمان کرد زۆر پێویستە بەزووترین کات ناتەواوی (خوێن، پلاسما، ئاو) ی نێو لەش پڕ بکرێتەوە.

- گەر نەخۆش تووشی کەم خوێنی بوو ئەوا پێویستە خوێن بکرێتە نەخۆشەوە.
- هەروەها لەکاتی کەمبوونەوەی خڕۆکە سپییەکاندا پێویستە خانە دەنکۆڵەدارەکانی خڕۆکە سپییەکان بکرێتە نەخۆشەوە.
- ئیمونۆگلۆبولینی پێوانەیی یان ئەو جۆرانەی لە خوێنهێنەرەوە دەدرێت بە نەخۆش (پاش ساڵی 1985 دا IgM دروستکراوە) ئەنجامی باشی داوە بەدەستەوە.
- پێویستە خۆراك و ڤیتامین بە خوێنهێنەردا بدرێت بەنەخۆش.
- گەرگومان کراخوێنی نەخۆش دەمەێت، ئەوا پێویستە (هێپارین) بدرێت بە نەخۆش.

خۆپاراستن

– پێویستە زۆر گرنگی بە برین، رۆماتیسمی دڵ یان گیروگرفتی نەشتەرگەری ددان، لووت، گوێ و گەروو و چاو بدرێت و لە کاتی خۆیدا چارەیان بکرێت.

– خۆپاراستن لە لەبارچوونی ژەهراوی

– گرنگیدان و چاودێری کردنی ئەو کەسانەی دەرمانی کۆرتیزۆن بەکار دەهێنن.

– چاودێری کردنی ئەو شوێنانەی کە لە لەشی مرۆڤدا سۆندە یان تێدایە.

– زۆر پێویستە گرنگی بەپاکو خاوێنی برینی کراوە بدرێت و زوو زوو برینەکە بە ئەلکهول بیرژێنێتەوە و پاکژ بکرێت.

– بەکارهێنانی سۆندەی یەك جار بەکارهێنراوی پاکژ یان گۆڕینی پاش 2-3 رۆژان.

– پێویستە 2-3 رۆژ پێش نەشتەرگەری نەخۆش ئەنتیبایۆتیك وەربگرێت و لە نزیکەوە کۆنترۆڵی باری گشتی بکرێت.

سەرچاوەکان

References
1.Johan Gieseck and Hans Fredlund; increase in pneumococcal bacteraemia in Sweden Lancet. 1997; 349. 699-700.
2.Baer M, et al., Increase in bacteraemic pneumococcal infection in children, Lancet, 1995; 345: 661
3.Atkison, K. et al., Septicemia in the neuropetic patient, Brit Med J 1974. 3. 244.
4.Chiotan, M., Clinical manifestation and laboratory in adult septicemia IMF Buchurest 1997
5.Banks D. et al., Infections from intravenous catheters. Lancet, 1970. 1. 443
6.O. L. Wade et al., Eritish national formulary 1981; 5: no 1
7.Antiserum from Gram-negative i.v. Alimentatia, Lancet. 1983, 1 967

## سۆی کلامیدیا

یەکێکە لەو نەخۆشییە سۆییانەی بەشێکی گرنگی ناساخی مرۆڤ پێك دێنێت چونکە نیشانەی کلینیکی زۆریان تێدا دەردەکەوێت و زۆربلاون.

– سۆی کۆئەندامی زاوزێ (لە 30-50 ٪ ی نەخۆشییە درمە زایەندییەکان).

– سۆی منداڵی تازە لەدایکبوو (پێلۆوپۆشەسۆ، سییەسۆ).

– تراخۆما (پێلۆوپۆشەسۆ، لەناوچەیەکدا بلاودەبێتەوە).

– لیمفۆگرانۆلۆمی زایەندی (لیمفۆگرانۆلۆمی ئاستی کەمەر).

– سۆی بۆریەکانی میز (لە 80٪ ی ژنان تووشدەبن وەلی هەوکردنەکە بێ نیشانەیە) .

– دەردی (Reiters syndrom)

هەندێکجار ئەم سۆیانە پیس دەکەن گەر لەکاتی خۆیدا چارەیان نەکرێت ئەوا دەبنە هۆی دەرکەوتنی ئالۆزکارییەکان.

زۆرجاران کلامیدیا دەبێتە هۆی گیروگرفتی گەورە وەك: نەزۆکی مێوینە، سکپڕی دەرە زاماڵ، نەخۆشی ئەندامی زاوزێ، کوێربوون، هەروەها رۆڵی گرنگی لە نەخۆشبوونی پێش لەدایکبووندا هەیە.

**هۆزانی**

هۆی نەخۆشییەکە (کلامیدیای تراخۆماتیس) ە کەخەسڵەتی بەکتریایی گرنگیان هەیە و DNA, RNA یان تێدایە، بە ڕێگای دابەشبوون زۆد دەبن، تێتراسایکلین لە ناویان دەبات.

کلامیدیا وەك ڤایرۆس تەنیا لەخانەی زیندوودا دەژین و سوڕی گەورە بوونیان ئاڵۆزە. قەبارەی کلامیدیا لە نێوان 250-1000 نانۆمیتردایە، دیواری خانەیان جیرە و لە دیواری بەکتریای گرامنێگەتیڤ دەچێت.

**جۆرەکانی کلامیدیا**

سێ جۆر کلامیدیا هەیە کە ئەمانەن:

- کلامیدیای psittaci، دەبێتە هۆی سییە سۆی (Psittacosis) زۆر جۆری سیرەمی جودانەکراوەی هەیە (دەرەتوێ).

لە نۆڤەمبەری 2005 دا پسپۆرانی Seoul ڕایانگەیاند کە ئەم جۆرە کە لە نێو گیانلەبەریماڵیدا دەژێت دەبێتە هۆی لیمفۆمی شانەکانی دەوروبەری چاو ، شێرپەنجەی سییەکان و شێرپەنجەی دەمی پزدان (14) .

- کلامیدیای trachomatis، دەبێتە هۆی تراخۆما ، سییەسۆ، لیمفۆگرانولومی زایەندی و سۆی بۆریەکانی میز ، 15 جۆری سیرەمی هەیە.

- کلامیدیای pneumoniae، دەبێتە هۆی هەکردنی بۆریەکانی هەوای سەرەوە و خوارەوە ، یەك جۆری سیرەمی هەیە.

ئەوەی شایانی باسە کلامیدیای تراخۆما کەتایبەتە بەباسەکەمان 15 جۆری سیرەمی خوێنی هەیە کەئەمانەن:

1- جۆری A, B, Ba, C هۆی سەرەکی کوێری تراخۆمان.

2- جۆری D, E, F, G, H, I, J, K هۆی سەرەکی سییەسۆ و پێڵووپۆشەسۆ (لە منداڵی تازە لەدایکبوودا)، هەروەها دەبێتە هۆی پێڵووپۆشەسۆ، باتووەسۆ و سۆی کۆئەندامی زاوزێ مێ لە گەورەدا.

3- جۆری L-1, L-2, L-3 هۆی سەرەکی لیمفۆگرانۆلۆمی زایەندییە.

کلامیدیا بەئاسانی بەئیسەر و تایت و ئیتانۆڵ لەناودەچن ، هەروەها لە 56 پلەدا لە 5-30 خولەکدا ناچالاك دەبن. کلامیدیا بەرگەی پەنسیلین دەگرێت و بەتێتراسایکلین و دۆکسیسیلین و ئێریترۆمایسین دەمرێت.

**ڕێگاکانی گواستنەوە**

- ڕێگای زایەندی، سۆی ئەندامی زاوزێ (ئەو کەسانەی تەمەنیان لەنێوان 18-30 ساڵدایە و زایەندی چالاکن) زێدتر تووش دەبن.

هەروەها تا ژمارەی هاوسەری زایەندی زێد بێت ئەوا مەترسی تووشبوون زێد دەکات.

- منداڵی تازە لەدایکبوو، لەکاتی لە دایکبووندا لە دایکییەوە تووشی کلامیدیا دەبێت.

کلامیدیا یەکێکە لە نەخۆشییە درمە زایەندییەکان و بە هۆی زایەندەوە دەگوێزرێتەوە. هۆی نەخۆشییەکە کلامیدیای تراخۆمایە و جۆری D, E, F, G, H, I, J, K دەبنە هۆی سەرەکی سۆی ئەندامی زاوزێ و برینی گچکەی بێئازار (هاتنە دەرەوەی شلەیەکی لینجی روون لەکونی میزکردنی نێرینەدا یان

له گولینکی مێوینەدا). پەنمان و کێمکردنی گرێ لیمفاویەکان. پاشتریش لە ئاستی کۆم و گولینک دا دەبنە دوملَ و زۆرجاران دەبنە هۆی گرتنی کونی پیسایی. نەخۆشییەکە لەهەموو جیهاندا بلاَوە (ناوچە گەرمەکانی هێلَی ئیستیوا، ژێر هێلَەکە، ئاسیا و ئەفریقا).

سەرچاوەی سۆکە: مرۆڤە بە تایبەتی مێی بێنیشانە یان نیشانەدار.

نیشانەکان

ماوەی کڕکەوتنی کلامیدیا لەنێوان 3–30 رۆژدایە. کلامیدیا دەبێتە هۆی دروستبوونی برینێکی گچکە و سۆی نێوپۆشی بۆری میز و تۆو، سۆی

گولینکی مێوینە، ئاوسانی گرێ لیمفاویەکان و پاشتر دوملَ دروست دەکەن و زۆرجاریش دوملَەکان رێکە دەگرنەوە (هەموو پرۆسێسەکە لەژێر پێستدایە). پرۆسێسی سۆکە گرێ لیمفاوییەکانی سێبەندە ، کۆم ، دیواری نێوان کۆم و گولینکی مێوینە دەگرێتەوە. کلامیدیادار ماوەیەکی زۆر بێ تایە و هەندێکجار لەرزو ئارەزوونەکردنی خواردن و ژانکردنی ماسولکە لە نەخۆشدا دەردەکەوێت. هەندێکجاری دی پەردە سۆی مێشك سۆکە جومگەکان دەگرێتەوە. جۆری سیرەمی خوێنی D-K دەبنە هۆی سۆی زایەندی.

هەروەها لەئامارێکدا دەرکەوتووە کەلە 5-25 ٪ ی سکپڕەکانی ئەمێریکا ئەم کلامیدیایە یان لەملی زامالَدا هەبووە، رۆژانە سۆکە لەشارە گەورەکانی سوێددا لە نێوان لاوانی 15-25 سالاَندا لەزێد بووندایە.

لە نێرینەدا: لە 50 ٪ ی بارەکاندا سۆی ئاسوزەنەکی بۆری و کونی میز تووش دەکەن. گەر بەراورد بکەین لە نێوان سوزەنك زۆر کەمبۆتەوە بەلاَم بە پێچەوانەوە سۆی کلامیدیایی زێدی کردووە. لە 50 ٪ بارەکاندا باتووەسۆ و هەندێکجار سۆی پرۆستاتیش دەبینرێت.

لەمێوینەدا: ناتوانرێت ماوەی کڕکەوتن دیاری بکرێت وە لە هەندێکدا کلامیدیا لە 8-15 رۆژدا کڕدەکەوێت. زۆرجاران ژن بێنیشانەیە، هەندێکجاری دی زامالَ دەئاوسێت و شلەیەکی لینج لەگولینکەوە دێتە دەرەوە یان سۆکە دەبێتە هۆی دروستبوونی نەخۆشی (میزکردن– میزی کێماوی)، هەروەها روونبۆتەوە کلامیدیا رۆلَی گرنگ لە هەناوپۆشەسۆدا دەبینێت یان دەبێتە هۆی نەخۆشی -Fitz Hugh-Curtis.

## نەخۆشی (Fitz-Hugh-Curtis):

بریتییە لە پێلَووپۆشەسۆ، جومگەسۆ و هاتنە دەرەوەی شلەی نێو بۆری و کونی میز (نەخۆشییەکە لەپیاودا دەردەکەوێت).

ئەمیش بەهۆی تێستی سیرەم زانییەوە دەستنیشان دەکرێت کاتێك دژەتەنەکان زۆر بەرز دەبنەوە. کاتێك سکپڕ تووشی کلامیدیا دەبێت زۆر مەترسی لەتووشبوونی ئاولەمە (لەکاتی لەدایکبووندا) دەکرێت کەدەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی رێژەی مردنی پێش لە دایکبوون. سالاَنە نزیکەی 150 هەزار منداڵ لەژنی کلامیدیادار لەدایك دەبێت و ئەم سۆیەش دەبێتە هۆی سییەسۆ، پێلَووپۆشەسۆ و گوێچکەسۆ.

# تراخۆما (Trachoma)

بریتییە لە پێڵووپۆشەسۆ بەهۆی جۆری سیرەمی C,B,A وە. یەکەمجار لە سەدەی 16ی ز دا لە لایەن Ebers Papyrus ەوە باسی نەخۆشییەکە کراوە . نەخۆشییەکە زۆرسالان دەخایەنێت (زێدەتر لەوەرزی گەرما هەڵدەداتەوە) و لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی ئەستووربوونی قەتماخەی برینەکان و کەمبوونەوەی بینین.

ئەوەی شایانی باسە ساڵانە چەندان ملیۆن مرۆڤ لەناوچەکانی هێڵی ئیستیوادا و ژێر هێڵی ئیستیوادا تووشی تراخۆما دەبن و ساڵانەش 6-7 ملیۆن کەسیان لێ کوێر دەبێت. نەخۆشییەکە لەباشووری ئاسیا، ئەمێریکا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەمریکای باشوردا بڵاوبۆتەوە.

**تێبینی: تراخۆما هۆی سەرەکی لە دەست دانی بینینە لەجیهاندا.**

**دەستنیشانکردن**

– تێستی تاقیگایی: چاندنی نموونەیەکی سۆکە (لەتاقیگای تایبەتیدا بەهێڵی خانەیی McCoy یان Hela 229) ی ئەنجام دەدرێت ، تاکە تێستێکە بە راستی کلامیدیا دەستنیشان دەکات).

– هەروەها پێویستە شلەی روون یان لینجی نێو کون و کەناڵی میزی نێر یان گولینکی مێوینەدا وەربگیرێت وله تاقیگادا زێد بکرێت. نابێت نمونەکە دوابخرێت (بەلانی کەمەوە دەتوانرێت 24 کاژێر لەبەفرگردا هەڵبگیرێت و پاشتر کاری لەسەر بکرێت).

– دەستنیشانکردنی خانە:

وەرگرتنی خانەی کرِاندراوی ناوپۆشەکان و رەنگکردنی بە Gimsa دەتوانێت لە 95٪ی پێڵووپۆشەسۆی ساوا دەستنیشان بکات.

– نیشاندانی ئەنتیجێنی کلامیدیا و تێستی Nuclei acid hybridization.

– تێستی PCR لەمیز و شلەی نێو بۆری میز و ملی زاماڵدا.

– تێستی ELISA ، ئەنجامی باش دەدەن بەدەستەوە.

**چارەسەرکردن**

تا ئەمڕۆ زۆر سەرکەوتوانە دەرمانی تێتراسایکلین کلامیدیا لەناو دەبات گەر بێت و رۆژی چوار ژەم و هەرجارەی 500 ملگم بۆ ماوەی 7 رۆژان بدرێت بەنەخۆش. هەرچەندە ئیریپرۆمایسین ، دۆکسیسیلین، کلۆرامفێنیکۆڵ و ریفامپیسین بەهێزن، وەلی مەڵبەندی کۆنترۆڵی خۆپاراستن لە نەخۆشییەکانی ئەمێریکایی وا بەباش دەزانێت و پێشنیار دەکات لە بری تێتراسایکلین رۆژانە دوو ژەمی 100 ملگم دۆکسیسیلین بۆ 3 هەفتە بەکاربهێنرێت. لەم ساڵانەی دواییدا سەلمێنراوە کە 1 تا 1.5 گم Azithromycin چارەی سۆی کلامیدیای کۆئەندامی زاوزێ و چاویش دەکات. ئەوەی شایانی باسە هەمان دەرمان بە پێی کێش ی منداڵ بەکاردەهێنرێت .

هەروەها دەتوانرێت تێتراسایکلین بۆ چارەسەرکردنی پێڵووپۆش بەکار بهێنرێت.

**سەرچاوەکان**

References
1.Schahter J, Damson CR Human Chlamydia Infection. MA: PSG Publishing: 1978, 63-96
2.Robert B. Jones, Chlamydia trachomatis In Infections Diseases 4th eds. 1995; 157 1579-93

3.CDC. Recommendation for the prevention and management of Chlamydia trachomatis infections. 1993; MMWR. 1993; 42: 1-39.
4.Coutes We, Cole B. Asymptomatic chlamydia thrachomatis uretritis in men Sex Trans Dis. 1986; 13. 163-5.
5.Ripa T. Epidemiologic control of genital chlamydia thrachomatis infection Scand J Inf Dis. 1990; 69 (suppl): 157-67.
6.Penelope J. Hitchook. Sexually Transmitted Diseases, 4th eds 1997. 65 802-05.
7.Abram S. Beneson, Editor. Control of communicable diseases in men 15th eds 1990; 86-88.
8.Joshua lederberg. Encylopedia of Microbiology. Academic press. Vol 1. A-C 1992.
9.Stamm WE. Lymphogranulomatos venerium. A general review. Bull WHO. 1950; 2: 545-62.
10.Julius Schachter and Moses Grossman., Chlamydia. In: Infectious Diseases of the fetus newborn infant, 4th eds, W. B. Saunders Company. 1995; 15: 657-665.
11.Chlamydia Trachomatis In Infections. MMWR. (suppl) 1985; 31. nr 3. S
12.Chlamydia in women a case for mor action, Lancet 1986; 1, 892
13.CDC. Chlamydia trachomatis Genital infections- USA 1995, MMWR 1997, 46: 9.
14.www.dagensmedicin.se (C) 05110

# بەشی شەشەم

## نەخۆشییە ڤایرۆسییەکان

1- ئینتێرۆڤایرۆسەکان
2- شەپلەداری منداڵ
3- ڤایرۆسی Coxsackie
4- سۆی ڤایرۆسی ECHO
5- سیەسۆیە RSV
6- سۆی Calicivirus
7- پێستە سۆی Molluscum contagiosum

## ئینترۆڤایرۆسەکان
## Enteroviruses

ئینتێرۆڤایرۆسەکان کۆمەڵێك ڤایرۆسن سەر بە خێزانی (Picornaviridae) ن " دەبنە هۆی سۆی جیاواز لە مرۆڤدا و سێ کۆمەڵی گەورەیان باس دەکەین کە ئەمانەن :

1- ڤایرۆسەکانی پۆلێۆ Poliovirus (3 جۆرن 1, 2, 3)

2- ڤایرۆسەکانی کۆکساکی Coxsackie (دوو جۆرن A، یان 23 جۆری سیرەمی هەیە و B یان 6 جۆری هەیە ) .

3- ڤایرۆسی ECHO (31 سیرەمی هەیە) و ئینتێرۆڤایرۆسی 68 تا 71 .

ئەوەی شایەنی باسە هەر 3 جۆرە ڤایرۆسەکە لە کۆئەندامی هەرسدا زیاد دەبن وکۆئەندامەکەش تووشی سۆ دەکەن . بە گشتی ڤایرۆسەکان گچکەن و لە نێوان17-28 نانۆمیتردان و لە گەروو و پیسایی نەخۆشدا جیاکراونەتەوە .

ڤایرۆسەکان ناوکە ئەسیدی RNA یان بە رێژەی 20-30٪ تیادایە . لە بەر ئەوەی لیپیدیان نییە بە ئیسەر نامرن. هەر وەکو سۆکانی پێشوی بۆری هەرس، ئەمانیش بەزۆری لە هاوین و پایزدا دەردەکەون و بەهەموو جیهاندا بلاوبونەتەوە و هەندێکجار لە پیسایی نەخۆش ولەش ساخیشدا ڤایرۆسەکان جودا کراونەتەوە . وا قەبڵێنراوە لە 33٪ ی منداڵان (لە ناوچە جیاوازەکاندا) یەکێك لە ڤایرۆسانەی سەرەوە لە گەڵ پیساییدا دەریکەنە دەرەوە. هاوکات ئەم 3 کۆمەڵە ڤایرۆسە دەبنە هۆی : هەوکردنی پەردەی مێشك ،چاو ، دڵ ، سییەکان ، نەخۆشی دەم- دەست - پا، زەردوویی ، پەنکریاسەسۆ ، سۆی ریخۆڵە ونەخۆش بوونی ماسولکەکانی لەش.

رێگای سەرەکی گواستنەوەی ڤایرۆسەکان بریتییە لە بۆری هەوا وهەرس .

هەندێکجار ڤایرۆسەکان راستەوخۆ بە هۆی ئاو و خۆراکەوە دەگوێزرێنەوە ، هەندێکجاری دی ڤایرۆسەکان لە نێو منداڵدا بە تایبەتی لە ( 3) سالێدا دەبینرێن .

وا دەردەکەوێت کە جۆری دیکەش هەبە و سەر بەم ئێنتێرۆ ڤایرۆسانەیە و تا ئێستا جیانەکراونەتەوە بە تایبەتی جۆری 69،68 ,70، 71 زۆرجاران کۆئەندامی دەمارتووشی هەوکردن دەکەن و دەبنە هۆی پەردە سۆی مێشك یان شەپلەداری . لە سالأنی 1974 دا جۆری 71 بوە هۆی بلأوبونەوەی نەخۆشی لە ئەمێریکادا وهەمان جۆر سالی 1975 لە بولگاریادا بوە هۆی مردنی 43 کەس.

## ئیفلجی= شەپلەداری مندالْ

نەخۆشییەکی سۆیی درمی گرانە کە دەبێتە هۆی هەوکردنی ناوچەی خۆلەمێشی پەتکە دەمار وزۆرجار بە شەپلەداری مندالی نێو دەبرێت .

**مێژوو**

- لە سالی 1789 دا Michael Underwood ی ئینگلیزی باسی ئیفلیجی کردووە .
- لە سالی 1843 دا بۆ یەکەمجار نەخۆشییەکە لە ئەمێریکادا بلأوبۆتەوە .
- لە سالی 1909 دا بۆ یەکەمجار نەخۆشییە ڤایرۆسییەکە لە لایەن هەردوو (Landsteiner , Popper) ناسرایەوە .
- لە سالی 1930 دا ڤایرۆسەکە جوداکرایەوە .
- لە سالی 1952 دا لە ئەمێریکا نزیکەی 21 هەزار کەس بەهۆی ئەم ڤایرۆسەوە تووشی ئیفلیجی بوون .
- لە سالی 1979 دا دوا نەخۆش لەو ولأتەدا تۆمارکراوە .

**هۆزانی** (8, 7 ,6)

ڤایرۆسێکە بە نێوی Poliovirus، گچکەیە نزیکەی 28 نانۆمیترە وسەربە خێزانی پێکۆرنە ڤیریدایە و 3 جۆری سیرەمی هەیە.

# یەکەم جۆر جۆری Brunhilde, Mahoney –ect ی هەیە .

# دووەم جۆر جۆری Lansing MEF1 ی هەیە .

# سێیەم جۆر جۆری Leon ,Saukett ی هەیە .

هەموو ڤایرۆسەکان بلأون وەلیْ ڤایرۆسی پۆلیۆ لە وانی دی بلأوترە . پێش دروستکردنی کوتان دژ بە ڤایرۆسەکە لە80–90 ٪ ی نەخۆشەکان تووشی شەپلەداری دەبوون ، بەلأم ئەمڕۆ ئەو ڕێژەیە زۆر نزم بۆتەوە و بگرە لە هەندێك ولأتدانە ماوە ، دووەم جۆریش بلأوە بەلأم جۆری سێیەم بە ڕێژەی لە 3٪ دا بلأوە ڤایرۆسەکە بە ئیسەر ، کلۆرۆفۆرم ، ئەلکهول دەمرێت ، زۆر بەرگەی سەرما و بەستن دەگرێت . لە ئاوی زێرابدا نزیکەی 4 مانگ دەژی ، لە شیرو پێهاتومکانی شیریشدا دەژی . زۆر بەرگەی گەرما ناگرێت لە نیو کاژێردا لە پلەی 60 دا دەمرێت .(پاستورە کردنی شیر بۆماست و پەنیر ،ڤایرۆسەکە دەکوژێت) . هەروەها بە ئاوی ئۆکسجیناوی و پەرمەنگە ناتی پۆتاسیۆمیش دەمرێت، تیشکی سەروو وەنەوشەیی لە 10 خولەکدا ڤایرۆسەکە دەکوژێت ، نەخۆشییەکە لە هەموو جیهاندا بلأوە . زۆرجاران جۆری شەپلەداری نەخۆشییەکە لە ناوچە فێنکەکان و ساردەکاندا بۆتە هۆی بلأوبونەوەی نەخۆشییەکە. بە پێی سەرژماردنێکی ر ت ج لەو ولأتانەدا کە تازە گەشەدەکەن ، سالأنە نزیکەی 250 هەزار تووشبوی تۆمارکراو هەبوە .

بەلأم ئەمرۆ بە هۆی کوتانی سیانییەوە (3 کوتان) توانراوە کۆنترۆلی بلأوبوونەوەی نەخۆشیەکە بکرێت . بۆ نمونە لە سا لی 1952 دا لە ئەمێریکا تەنیا 21 هەزار کەس تووش بووە ، بەلأم لە سا لی 1987 دا هیچ بارێکی شەپلەداری تۆمار نەکراوە . لە سەرەتای سالی 2004 دا ر ت ج رایگەیاند هیوایان زۆرە کە تا سالی 2008 نەخۆشییەکە لە هەموو جیهاندا نەهێلن . لە کۆتایی سالی 2005 دا رت ج رایگەیاند کە لە تەنیا لە نێجیریادا نەتوانراوە کۆنترۆلی نەخۆشییەکە بکرێت دەنا تا رادەیەکی باش لە دونیادا توانراوە دەست بە سەر بلاو بونەوەیدا بگیرێت . ئەوەی شایانی باشە هەمان رێکخراو رایگەیاند سالی 1977 لە عێراقدا تەنیا 2 نەخۆش تۆمارکراوە . لە سالی 1998 دا دوا نەخۆشی تۆمارکراو لە کوردستاندا راگەیەندراوە ، بەلأم لە سالی 2000 دا نەخۆشییەکە لە هەموو ئێراقدا نەماوە (9) .

**رێگاکانی گواستنەوە**

– راستەوخۆ ، ڤایرۆسەکە لە رێگای هەواوە واتە بەهۆی دلۆپە پرژەی کۆکە وپژمەی هەلگری ڤایرۆسەکەوە دەگوێزرێتەوە .

– ناڕاستەوخۆ، بەرێگای پیسایی بۆ دەم دەگوێزرێتەوە .

– لە کۆتایی ماوەی کڕکەوتن وسەرەتای نەخۆشییەکەدا (بوونی ڤایرۆسەکە لە گەروودا) هۆیەکی سەرەکی گواستنەوەی ڤایرۆسەکەیە لە هەردوو بارەکە دا پەیوەندی راستەوخۆی نێوان نەخۆشێك ولەش ساخێك زۆر گرنگە . هەروەها لەوانەیە لە رێگەی پەیوەندی ناڕاستەوخۆ وەك بەکارهێنانی کەلوپەلی پیس بووی نەخۆشەوە ڤایرۆسەکە بگوێزرێتەوە. درمی ڤایرۆسەکە زۆر بەرزە ( نزیکەی 8حەفتەیە) بە تایبەتی لە دوارۆژی ماوەی کڕکەوتنی ڤایرۆسەکەدا و لە یەکەم هەفتەی نیشانەکانیدا (بە تایبەتی ئەو کاتەی ڤایرۆسەکە لە گەروی نەخۆشدا هەس) ، یان ئەو کاتانەی ڤایرۆسەکە لە گەلْ پیسایی‌دا دەکرێتە دەرەوە . لەوانەیە نەخۆش دووبارە بە جۆرێکی سیرەمی دی ڤایرۆسەکە توشی نەخۆشی‌یەکە ببێت.

**نیشانەکان**

· ماوەی کڕکەوتنی ڤایرۆسەکە لە نێوان 7–14 رۆژدایە و لەوانەشە لە نێوان 3–21 رۆژدا بێت.

**ماوەی دەرکەوتن** : لە نێوان 1–5 رۆژدایە سەرەتا (تا) بەرز دەبیێتەوە ، پاشتر تا دەگاتە 37–39 پلە ، گەروو ئێشان ، ژانکردنی ماسولکە (وەك سوکە پەتای هاوین دەردەکەوێت)، هێلنجدان ، رشانەوە ، ژانەسك، نەمانی ئارەزوی خواردن دەردەکەوێت . نەخۆش بیٚخۆلق وخەوالّووە ،سەرو پشتی ژان دەکات. نزیکەی 2–4 رۆژ پاش ئەم ماوەیە پلەی گەرمی نەخۆش ئاسایی دەبێتەوە ،پاش 3–4 رۆژ تا ئاسایی دەبێتەوە ، لەپرنەخۆشییەکە بە تایەکی بەرزو نیشانەی دەماری‌یەوە دەردەکەوێت.

**ئەم ماوەیە بە 2 قۆناخدا دەڕوات کە ئەمانەن :**

**1– قۆناخی پێش شەپلداری**

لە ئاسایی بونەوەی تا لێهاتنەوە دەست پێدەکات تا دەرکەوتنی شەپلەداری (نزیکەی 5 رۆژ دەخایەنێت) ، گرنگترین نیشانەکانی ئەم قۆناخە بریتین لە : ژانە سەر ، بیٚ خولقی، ژانکردنی ماسولکەو دەمارەکان .

رەنگ هەلّبزرکانن ، (منداڵ ناتوانێت لە سەر پێخەفەکەی راست بێتەوە) . راستیان گووتوە کە نەخۆش زیاتر لەشی ژاندەکات وەك لە شەپلەداری هەروەها گرژبونی ماسولکە ، بێهێزی لاوازی و بێتوانایی دەردەکەوێت . گەر نەخۆش لەپرپەرزبێتەوە ، بەرتەکی دەماری نامێنێت.

وەلێ نەخۆش ئاگاداری خۆیەتی لە تێڕوانیندا پزیشك پەردە سۆی مێشك ونیشانەی ماچ (هەوڵ دەدرێت نەخۆش بە دانیشتنەوە دەمی بگاتە سەر کەشکە ئەژنۆی) دەستنیشان دەکات .

2- قۆناخی شەپلەداری

پاش توندبوونی نیشانەکان لە 2-5 رۆژدا شەپلەداری دەردەکەوێت . لەم بارەدا ماسولکەکان شل دەبن ، بەتەواوی ناجوڵێن پاشتر بەتەواوی لە کارو جوڵان دەکەون . بە گشتی زۆربەی ماسولکەکانی شان وقۆڵ و پا شەپلەدار دەبن و لە کار دەکەون . نەخۆش زۆر ئارەق دەکاتەوە . سەری پەنجەکانی دەست وپا سارد دەبنەوە زۆرجار مرۆ تووشی گیروگرفتی میزکردن دەبێت ، هاوکات نەخۆش هەمیشە بەدەست ئازارەوە دەناڵێنێت (ئازاری شەپلەداری لە شێوەی گرژبونەوەی ماسولکەدایە).

ماوەی گەڕانەوە بۆ بارودخی جاران نزیکەی 10- 14 رۆژ یان مانگێك دەخایەنێت، پاش نەمانی نیشانە کوتوپڕەکان نەخۆش هەست بە باش بوون و چاکبونەوەی ماسولکەکان دەکات و پاش 3 مانگان شەپلەداری چاك دەبێتەوە . ئەوەی جێی سەرنجە لە یەکەم 3 مانگدا لە 50٪ ی شەپلەدارەکان چاك دەبنەوە ، وەلێ لەماوەی ساڵێکدا نزیکەی لە 75٪ یان چاکدەبنەوە ، هەروەها لە ماوەی 2- 3 ساڵدا لە 100٪ ی شەپلەدارەکان چاکدەبنەوە . ئەوەی راستی بێت تەنیا لە 10- 15 ٪ی نەخۆشەکان بە تەواوی دەست ولاقیان چاك نابێتەوە ولەکار دەکەوێت .

جۆرەکانی نەخۆشییەکە

1- جۆری ناشەپلەداری

ئەمیش 3 جۆرە:

- جۆری دەرنەکەوتوو، بێنیشانەیە و لە 90-95 ٪ ی نەخۆشییەکە لەم جۆرەیە . لە تاقیگادا دژەتەنی دژ بە ڤایرۆسەکە دەستنیشان دەکرێت .

- جۆری گچکە بە گرانی دەناسرێتەوە و زۆرجاران وەك هەلأمەتێك دەردەکەوێت . هاوکات ڤایرۆسەکە بەگرانی بەرێگای تێستی سیرەمییەوە یان ڤایرۆسییەکەوە لە پیسایی یان لەگەرووی نەخۆشدا جودا دەکرێتەوە و دەستنیشان دەکرێت .

- جۆری پەردەسۆی مێشك ڤایرۆسەکە دەبێتە هۆی پەردە سۆی کوتوپڕی مێشك .

2- جۆری شەپلەداری ، ئەمیش 5 جۆرە :

- جۆری لامل وکەلەکە ، 60٪ ی جۆرە شەپلەدارەکان دەگەڕێتەوە کە دەبێتە هۆی شەپلەداری دەست ولاق ،ماسولکەی سك ، ناوپەنچك یان ماسولکەی مل .

- جۆری لاسکی مێشك ، لە 5-25 ٪ ی جۆرە شەپلەدارەکان دەگەڕێتەوە .

- شەپلەداری جووتە کەللە دەماری 8,7,6,5,4,3 دەگرێتەوە ، زۆرجاران تاکێك دەمار دەگرێتەوە. سۆی جووتە کەللە دەماری (12,10,9) زۆر ترسناکە ودەبێتە هۆی گیروگرفت لە جووین وهەناسەداندا ، گەربێت وسوڕدانی خوێن تووشی گیروگرفت بێت ئەوا لەوانەیە ژیانی نەخۆش بکەوێتە مەترسییەوە.

- جۆری مێشکی.

- جۆری تێکەڵ.

3- جۆرەکانی نەخۆشییەکە (بەپێی تەمەن)

- لە ساوادا ، زۆر ترسناکە.

- له گەورەدا، نەخۆشییەکە وەك لەش داهێزران و ژانکردن دەردەکەوێت

4- نەخۆشییەکە لە کوتراواندا (هەندێکجار شەپلەداری تووشی منداڵی کوتراویش دەبێت).

**ڕێژەی نەخۆشییەکە**

ڕێژەی مردن بە نەخۆشییەکە نزیکەی 4-10٪ دایە وەڵێ لە منداڵدا ڕێژەکە لە نێوان 2-5٪ دایە . هۆی مردن لە منداڵدا دەگەڕێتەوە بۆناتەواوی هەناسەدان ، سوڕدانی خوێن و ئالۆزکارییە بەکتریاییەکان. لە هەندێك باری دی دا شەپلەداری 2-3 ساڵ دەخایەنێت واتە 50٪ یان تووشی سووکە شەپلەداری و25٪ یش تووشی شەپلەداری بەهێز دەبن، ئەوەی راستی بێت تەنیا ژمارەیەکی کەمیان پاش نەخۆشییەکە دەتوانن کاربکەن.

**ئالۆزکارییەکان**

- سییە سۆ، ناوپۆشە سۆی دڵ.

- گیروگرفتی گورچیلە.

- گیروگرفتی دەرونی وەك نائارامی و باری هەرەسی نەخۆش    تاد.

**دەستنیشانکردن**

پێویستە نەخۆشییە کە لە قۆناخی پێش شەپلەداری دا دەستنیشان بکرێت دەنا لەوانەیە پاش شەپلەداری نەتوانرێت هیچ بکرێت .

- نیشانەکان (نیشانەی ماچ) ، پەیوەندی کردن بە نەخۆشییکەوە لە خێزاندا یان لە دەرەوەدا زۆر گرنگە لەو دەستنیشان کردنەدا .

- جوداکردنەوەی ڤایرۆسەکە لە شلەی نێو کوونە لووت، گەروو یان لە پیساییدا .

- 80٪ ی بارەکاندا (لە یەکەم دوو هەفتەی نەخۆشییکەدا) دەتوانرێت ڤایرۆسەکە جودا بکرێتەوە .

- تێستی سیرەمی، لە سەرەتای نەخۆشییەکەدا دژە تەنەکان زۆر بەرزدەبنەوە و بۆ دەستنیشانکردن بە سوودە.

**کوتان**

کوتانی سییانە لەساڵی 1955 ەوە پەسەندکراوە و لە شێوەی 3 دەرزیدایەو دەدرێت لە منداڵ ئەنجامی باشی هەبووە . لە ساڵانی 1962- 1963 جۆرێك کوتان لە نەخۆشخانەکاندا بەکاردەهێنرێت لە شێوەی (دڵۆپ) دایە و بە ئاسانی دەدرێت بە منداڵ . ئەوەی شایانی باسە ئەم جۆرە کوتانە پێکهاتوە لە هەر 3 جۆری سیرەمی ڤایرۆسەکە و هاوکات هەردوو دەرمانی (Neomycin. Streptomycin) یشی تیادایە .

**چارەسەرکردن**

هیچ دەرمانێك نییە تا ڤایرۆسەکە لەناو بەرێت. هەروەها بەپێی جۆری شەپلەداری وناشەپلەداری دەتوانرێت نیشانەکان دابمرکێنرێتەوە.

**سەرچاوەکان**

**References**

1 .John F: modlin Poliovirus.In principles & practice infectious disease Vol 2.,1995;148 1613-20.

2. Amold L. Smith Central Nervous System. In mechanism of Microbial Disease Second Edition 1993;58.716-35.

3 Martin Gh.Voiculescu. Poliomyelitis.In Infectious Diseases Vol 2 Medical Edition 1991.71 308-29.

4 Benenson Abram S. Control Communicable Disease in Man Editor 15 th e ds 1990

5 Paul JR Epidemiology of Poliomyelitis WHO monograph Series 1995 26.9.

6. WHO Global eradication of Poliomyelitis by year 2000 Geneva WHO 1998 (Resolution WHA 41 28)
7.CDC.Progress toward global eradication of poliomyelitis eradication 2002 MMWR 2003,53
8.CDC. Certification of poliomyelitis eradication-the Americas, transmission1994 MMWR 1994; 43
9 Mary Kay Kindhauser, Global defence against the infectious disease threat. WHO/CDS/2003 15

# ڤایرۆسی کۆکساکی

ئەم ڤایرۆسە دەبێتە هۆی کۆمەڵێ سۆی جیاواز کە لە جیهاندا بڵاون .

**هۆزانی**

هەروەکو پێشتر ئاماژەمان کرد ئەمیش لە کۆمەڵێ ئینتێرۆڤایرۆس . لە خێزانی پیکۆرنە ڤایرۆس ، ناوکە ئەسیدی RNA هەیە ولە نێوان 25-30 نانۆمیتردایە . ڤایرۆسەکە دەبێتە هۆیی نەخۆشییەکی گرنگ لەمندالی ساوادا . تا ئەمرۆ نزیکەی 30 جۆری سیرەمی ڤایرۆسەکە دۆزراونەتەوە دەکرێن بە 2 کۆمەڵەوە :

1 - کۆمەڵی A ،32 جۆری سیرەمی هەیە ، هەندێکیان تایبەتن بە مرۆڤ و هۆی پەردە سۆی مێشك ، سۆی کۆئەندامی هەناسە ،سۆی لووت وگەروو ، شەپلەداری ، نەخۆشی دەست – پا – دەم ن. هەندێکجار دەبنە هۆی سکچوون Reye، یان نەخۆشی Guillein Barre.

2- کۆمەڵی B, 6 جۆری سیرەمین (هەموویان تایبەتن بە مرۆڤ و وەك جۆری پێشو وان) . ئەم جۆرەیان دەبێتە هۆی سۆی پەنکریاس ؛ پەردەسۆی دڵ ، زەردوویی لە مندالٚ وپیردا، سکچوون ، نەخۆشی بێهێزی و لاوازی ماسولکە .تاد . لە ساڵی 1948 دا لە گوندی Coxsackie ی نزیك شاری نیویۆرك دا ڤایرۆسە کە لە پیسایی منداڵێکی نەخۆشی ئەو گوندەدا دۆزرایەوە وپاشتر نێوی کۆکساکی لێنرا (ا) .

**پەتازانی**

ڤایرۆسە کە لە هەموو جیهاندا بلاّوە دەبێتە هۆی سۆی ترسناك . زۆر جاران ڤایرۆسە کە لە مرۆڤی نەخۆش ولەش ساخیشدا جیاکراوەتەوە (بە تایبەتی لە ساوادا) لە هاوین وپایزدا دەردەکەوێت 48٪ ی بارەکاندا ڤایرۆسەکە لە گەرووداجوداکراوەتەوە . سەرچاوەی سۆکە ئەو کەسانەن بە سەرزارەکی لەش ساخن یان هەڵگری ڤایرۆسەکەن .

**رێگاکانی گواستنەوە**

– رێگای هەرس ، پیسایی بۆ دەم ڤایرۆسەکە ماوەیەکی زۆر لە گەڵ پیسایدا دەکرێتە دەرەوە .

– رێگای هەناسە ، قەڵەباڵخی باخچەی منداڵان و نێو خێزان هۆکاری یاریدەدەری گواستنەوە وبلاّوبوونەوەی ڤایرۆسەکەن.

ئەوەی راستی بێت سەلمێندراوە جۆرەکانی A3/4/5/6/B3/4 زێدە تربلاّون ڤایرۆسەکە لە خوێن ، مێشك ، دڵ، شلەی نێو لەش ، پەردەی دەرەوەی دڵ ، گورچیلە و پەنکریاسدا جوداکراوەتەوە .

**نیشانەکانی**

بە پێی جۆری سیرەمی ڤایرۆسەکە سوك وکوتوپڕی نەخۆشییەکە جیاوازە :

# ڤایرۆسی جۆری A: ئەم جۆرە زیاترجۆری سیری 8،6،5،4،3،2 و10 دەگرێتەوە . جۆرەکانی 10، 21، 23، 24 دەبنە هۆی سۆی کۆئەندامی هەناسەی سەرەوە .

ماوەی کڕکەوتنی ڤایرۆسەکە لە نێوان 2-10 رۆژدایە   هەندێکجار نەخۆشییەکە لە شێوەی بڵاوبوونەوەدا دەبینرێت ، بە زۆریش منداڵ تووش دەبێت .
سەرەتا نەخۆشییەکە بە تا ، گەروو ئێشان ، رشانەوە ،ژانە سەر، ژانەسك ژانکردنی ماسولکە دەست پێدەکات ، هەندێکجار منداڵ تووشی گەشکە دەبێت . پاش 10-20 رۆژان ناوپۆشی مەلاشوو بڵقی بچوکی لێ دێت ، لە بەر تەڕی و شێداری بڵقەکان خێرا کێم دەکەن ئەمانیش بە پێکهاتوویەکی سور دەورە دەدرێن . نەخۆش ئارەزووی خواردنی نامێنێت و زمان بەڵغ دەگرێت . زۆرجاران لە 2-3 رۆژدا برینەکان چاکدەبنەوە و (تا) نزم دەبێتەوە . لە زۆربەی زۆری بارەکاندا نەخۆشییەکە چاکدەبێتەوە .
**دەستنیشانکردن**
بوونی ئەو نیشانانەی کە پێشوو تر باسکران و جوداکردنەوەی ڤایرۆسەکە زۆر گرنگن .
**# ڤایرۆسی جۆری B**
ئەمجۆرە ڤایرۆسە دەبێتە هۆی نەخۆشی ژانە ماسولکە .
**نەخۆشی ژانە ماسولکە ( نەخۆشی Bornholm)**
گرنگترینیان لە ساڵانی 1930 و 1934 دا نەخۆشییەکە لە دانیمارك و وڵاتە سکەندەناڤیەکاندا بڵاوبووە ، هۆی نەخۆشییەکە ڤایرۆسی جۆری B یە . ڤایرۆسەکە لە 3-5 رۆژدا کردەکەوێت . نیشانەی سەرەکی نەخۆشییەکە لە پڕ بە تا ، ژانە سەر ، ژانکردنی (گرژبوونەوەیان) ماسولکەکانی سنگ وسك دەست پێدەکات . لە منداڵدا ئازارەکە زیاتر دەداتە سك وکەمێك گرژبوونی ماسولکەی سکی لەگەڵدایە . لە ماوەی 4-7 رۆژدا نامێنێت وەلێ هەندێکجار دەر دەکەوێتەوە. زۆرجار منداڵ تووشی هێڵنج و رشانەوە و گەشکە دەبێت .
**# ناوپۆشە سۆی دڵ**
هۆی نەخۆشییەکە ڤایرۆسی جۆری B یە ، نەخۆشییەکی ترسناکە . زۆر جار دەبێتە هۆی مردنی منداڵی ساوا ، منداڵ تووشی تا ، هەناسەسواری ، شینبوونەوەی رووخسار ، زیادبونی لێدانی دڵ ، ونبوونی لێدانی دڵ و ئەبڵق بوون دەبێت و خێرایی دەمرێت . گەر ڤایرۆسەکە تووشی ژنی دوو گیان ببێت ئەوا دەبێتە هۆی  لە دایکبوونی منداڵێکی ناتەواو .
**# رووپۆشە سۆی دڵ**
ڤایرۆسی جۆری B 3-5 دەبێتە هۆی ئەم جۆرە سۆیە .
**# مێشکە پەردە سۆ**
هەندێکجار هەردوو جۆرە ڤایرۆسەکە (A-B) دەبنە هۆی سۆکە لم بارەدا نیشانەکان بریتین لە : تا، ژانە سەر ،ژانکردنی ماسولکەی لەش ،جاری وایە  گەرووش ژان دەکات .
**# کەللە دەمارە سۆ**
سۆی کەللە دەماری ژمارە 7 (دەماری ڕووبزوێن) و شەپڵەداری دەمارەکە   لەوانەیە ڤایرۆسەکە ببێتە هۆی سکچوونی زۆر کوتوپڕ ، زەردوویی ،یان گورچیلە یان پەنکریاس

# سۆی کوتوپر

به گشتی ڕێژەی سۆکە باشەو لە زۆربەی بارەکاندا نەخۆش چاك دەبێتەوە . بە دەگمەن سۆی دیواری ناوەوەی دڵ ومێشك دەبێتە هۆی مردنی ساوا .

دەستنیشانکردن

دەستنیشان کردنی سۆکە زۆر سەختە چونکە نیشانەکانی سۆکە جۆراو جۆرن ، هەرچەندە تێستی سیرەمی دژە تەنی IgM بەرز دەبێتەوە وەلێ دەتوانین بڵێین کە تەنیا جیا کردنەوەی ڤایرۆسەکە لە دەست نیشانکردنی نەخۆشییەکە دڵنیامان دەکات .

چارەسەرکردن

زۆر پێویستە نەخۆش جیا بکرێتەوە و بحەوێتەوە ودەرمانی دژ بە نیشانەکانی سۆکەی بدرێتێ ،چونکە دەرمان نییە ڤایرۆسەکە لەناوبەرێت .

سەرچاوەکان

**References**

1.Marin GH. Voiculescu –Coxackievirus- In :Infectious Diseases .Medical eds Bucharest 1991 72:330-337
2.John F Modlin Coxackieviruses Echoviruses &Newer enteroviruses In Principles &practics of Infectious Diseases 1995:1961964-1975.
3.Lake AM et al: Enterovirus infections. J Pediart 1976 89 787
4.Grififths PD et al :Coxackie B virus infections & myocardical infection Lancet 1980.1.1387
5.Tomas Bergstrom Virus infektioner Klinik diagnostik och behandling Glaxo Well come Sweden 1997

## سۆی ڤایرۆسیECHO

سۆی ئەم جۆرە ڤایرۆسە زۆر جیاوازترە لەبەرئەوەی کۆئەندامی هەناسە و پەردەی مێشك شەپلەداری وتالیهاتن دەگرێتەوە ، ناسراوترین سۆ بریتییە لە سۆی جۆری 31 ی ڤایرۆسەکە.

هۆزانی

ئەمیش جۆرێکە لە ئینترۆڤایرۆس، لە خێزانی پێکۆرنەڤیردایە و 34جۆری سیرەمی هەیە (1-9) ،(11-27) و (29-34) نزیکەی 24-30 نانۆمیترە و ئەسیدی RNA یان تێدایە .

مێژوو

لە ساڵی 1955 دا ڤایرۆسەکە بەم جۆرە ناونراوە Enteric Cytopatogenic Human Orphanc زۆرجاران کورتکراوەی (ECHO) بۆ بەکاردەهێنرێت.

پەتازانی

سۆکە لەجیهاندا بلاوە ، بە تایبەتی ناوچەکانی هێڵی ئیستیوادا هەموو وەرزەکان هەن ، جۆرە سیرەمیەکانی ڤایرۆسەکە زێدەترە لە منداڵدا دەبینرێن و وەك لە گەورەدا ، هەروەها ڤایرۆسەکە لە ریخۆڵەدا جودا دەکرێتەوە .

ڕێگاکانی گواستنەوە

– پەیوەندی ڕاستەوخۆ (پیسایی ، دەم) هۆی سەرەکی گواستنەوەی ڤایرۆسەکەیە .

– ڕێگای گواستنەوەی هەوایی واتە ڕێگای هەناسەدان (پرژەی کۆکە و پژمین) یان شلەی ناو لووت و گەروو .

درمی نەخۆشییەکە لە نێو قەڵەباڵغیدا زۆر بەرزە بە تایبەتی لە کاتی بەکارهێنانی گۆمی ملە کردندا .

**نیشانەکانی**

به پێیی جۆری سیرەمی ڤایرۆسەکە :

1– نەردەتا بە هۆی جۆری ( 7 ، 9 و 20 ) ە وە دەبێت ، نەخۆش تای لێ دێت گەرووی و ماسولکەکانی لەش ژان دەکەن .

2– نەردەتای دی بە ئێکسانتێمەوە، بەهۆی جۆری ( 4، 6 ، 9 ، 16 ، 18 و 52 ) ە وە دەردەکەوێت بەلاّم جۆری 9 یان لە هەموویان بلاّوترە .

3– گیروگرفتی بۆریەکانی سەرەوەی هەناسە ،جۆری ( 8 ، 11 ، 18 ، 19 و20 ) دەبنە هۆی سۆکە

4– جۆرەکانی 2, 4 ، 6 ، 9 دەبنە هۆی پەردەسۆی کوتوپڕی مێشك .

5– دەمارەسۆ ، دەبێتە هۆی سۆی هەمیشەیی کۆئەندامی دەمار .

6– نەخۆشی سکچون ،جۆری 11 ، 14 ، 18 ، 19 ، 20 دەبنە هۆی سکچون لە باخچەی منداڵاندا .

به پێیی تەمەنیش جۆرەکانی ئەمانەن :

# زۆر جاران لە منداڵانی تازە لەدایك بودادەبێتە هۆی مردن .

# منداڵی ساوا ، لە هەموو جۆرەکان کوتوپڕ ترو ئاڵۆز ترە .

# گەورە ، نەخۆشییە تادارەکان دەگرێتەوە وەك ( سورکە و مێشکە پەردەسۆ) وایە .

# ژنی سکپڕ ،گەر ئاو لەمە تووشی ڤایرۆسەکە ببێت ئەوا نەخۆشییەکە زۆر سەخت دەبێت .

**دەستنیشانکردن**

دەتوانین وەك نەخۆشییەکی سۆیی بیقەبڵێنین بەلاّم تەنیا لە تاقیگای ڤایرۆسیدا دەتوانین جۆری سیرەمی ڤایرۆسەکە لە شلەی گەروو ، پیسایی ، چڵمی ناو لووتدا جودا بکەینەوە تێستی سیرەمی دژەتەنی تایبەتی ڤایرۆسەکە دەستنیشان دەکرێت .

**چارەسەرکردن**

جۆری سیرەمی یەکەم ودووەم بێچارەیە وەلی پێویستە نیشانەکانی سۆکە بە دەرمانی ئاسایی دابمرکێنرێتەوە.

**سەرچاوەکان**

**References**

1.Annuziato D. Koplik spots & Echovirus .(letter) .NY State . Jmed .1987 :87:667 .
2.Martin GH.Voiculescu Infectious Diseases vol 2 Medical Edition 1991:71:308-28
3.Berry PJ & Nagington J Fatal infection with Echovirus 11 Arch Dis Chil 1982:57:22 .
4. Halfon N &spector SA Finl Echovirus type 11 infection Am J Dis . 1981 :57 :22
5.Crist . NA et al Entereviruses in humman diseases .Rorger Med Virol . 1987 :24 .114 .

# سییه سۆ بە R S V

یەکێکە لە گرنگترین و بلاوترین سییه سۆکانی کۆرپەی تەمەن ژێر 2–3 ساڵان . زۆرجاران مرۆی بە تەمەنیش تووشی ئەم سییه سۆیەی بۆریچکە هەوایەکان دەبێت . بە تایبەتی سۆیەکە لە مانگی جەنیوەری و بە گشتی لە زستان دا دەردەکەوێت . ساڵانە لە جیهاندا نزیکەی نیو ملیۆن کەس بەم سییه سۆیە دەمرێت .

**هۆزانی**

هۆی سۆکە ڤایرۆسێکی جۆری RNA ی (paramyxovirus) بە نێوی Respiratory Syncytai Virus و هەمیشە کورتکراوەی RSV بۆ بەکاردەهێنرێت . گەردیلەکانی ڤایرۆسەکە نزیکەی 6 کاژێر لەسەر رووی رەقی دەرەوە دەژین . دوو جۆرن A و B بەلام نیشانەکانی هەردوو جۆرەکە زۆر لە یەکتری دەچن . سابون و دەرمانی پاکژکردنەوە ڤایرۆسەکە ناچالاک دەکەن .

**ماوەی کڕکەوتن**

ماوەی کڕکەوتنی ڤایرۆسەکە نزیکەی 4–6 رۆژە .

**رێگاکانی گواستنەوە**

– پەیوەندی راستەوخۆ، پرژە ودلۆپە شلەی نێو دەمولووتی نەخۆش (لە کاتی کۆکە و پژمیندا) .

ڤایرۆسەکە لە نێو نێوپۆشی دەمولووت و چاو دا هەیە .

**نیشانەکان**

– تالێهاتن لە نێوان 38.3–39.4 پلەدایە .

– زۆرجاران کۆرپەی ژێر یەك مانگان شیری دایکی یان مەمکەمژە نامژێت (ناگرێت) .

– نیشانەی هەلامەت (ناوبەلووتی منداڵدا دێتەخوارەوە) ، بەلام منداڵ سییه سۆی بۆریچکە هەوایەکانیەتی .

– کۆکە و خیزەی سنگی منداڵ دەبیسرێت.

– لە یەکەم تێروانیدا مرۆ هەست دەکات منداڵەکەی سییه سۆیەتی (منداڵ پشویسوار دەبێت) .

– لە زۆربەی بارەکاندا لە 1 – 2 هەفتەدا نیشانەکان دەرەوێنەوە .

لە 1 – 2٪ بارەکاندا منداڵ بە تەواوی نەخۆشە و پێویستە لە نەخۆشخانەی منداڵاندا چارەسەری نیشانەکانی بکرێت .

**دەستنیشانکردن**

– وەرگرتنی نمونەی شلەی نێو کونە لووتەکان و ناردنی بۆ چاندن .

– تێستی Immunofluorescens (IF) .

– تێستی Enzym Immunology Antigendetection (EIA) .

– تێستی PCR کاتێکی زێدتر دەخایەنێت .

**چارەسەرکردن**

– ئۆکسجیندان بە منداڵ و دامرکاندنەوەی نیشانەکان .

– لە هەندێك وڵاتدا ئەنتیڤایرۆسیش دەدەن بە نەخۆش .

**خۆپاراستن**

– پاکوخاوێنی دەستەکان ، شتنیان بە ئاووسابون یان بەکارهێنانی پاکژ کەرەوە . تێکەڵنەبوون لە گەڵ نەخۆشدا زۆر گرنگە . بە مەبەستی خۆپاراستن دژی سییە سۆکە دەرزیەك بە نێوی (Synagis) Palivizumab لە شێوەی کوتاندا لە ئیمونۆگلۆبولین پێکهاتووە و لە بەشی پێشمەوەی رانی منداڵ دەدرێت .

**کوتانەکە لەم بارەندا بەکاردەهێنرێت :**

– ئەو منداڵانەی لە 35 هەفتەییدا لە دایکبوون و تەمەنیان لە 6 مانگان تێپەڕناکات .

– ئەو منداڵانەی تەمەنیان لە ژێر 2 ساڵانەوەیە و بەڵام لە 6 مانگی رابووردوەوە بە هۆی تەسکبوونەوەی بۆریچکە هەوایەکانی سییەکانیان تووشی گیروگرفت بووبێت .

– منداڵی ژێر 2 ساڵان کاتێك لە زگماکییەوە گیروگرفتی دڵی هەبێت .

بە پێی کێشی منداڵ دەرزییەکان بەکاردەهێنرێت ، هەر 15 ملگم دەدرێت بە 1 کگم کێشی منداڵ

**تێبینی :** ئەم ڤایرۆسە لە لەشدا بەرگری دروست ناکات لەوانەیە پاش ماوەیەکی تر ڤایرۆسەکە چالاك ببێتەوە .

**سەرچاوەکان**


1. Handläggning av RSV-infektioner. Info från Läkemedelverket. Sverige, 2000; 11 (6):7-32.
2. Tomas Bergström. Virusinfektioer. Klinik, Diagnostik och behandling, Glaxo Wellcom AB, Sverige, 1997. S. 41-43.
3. Iwarson S, Norrby R. Infektionsmedicin, epidemiologi, klinik och terapi. Partille: Säve Förlag, Sverige 1998.
4.www.fass.se


## سۆی Calicivirus

### (رشانەوەی زستان)

ئەوەی شایانی باسە ڤایرۆسی Calici کە پێشی دەگۆترێت ڤایرۆسە خرە کچکەکان، ناسراوە بە ڤایرۆسی گەدە و ریخۆڵە و هۆی سەرەکی رشانەوەی زستانە . ڤایرۆسەکە لە نێوان لاوان ، منداڵانی باخچەی منداڵان ، قوتابخانە ، نەخۆشخانە ، ماڵی پیران ...تاد بڵاودەبێتەوە . ئەم ڤایرۆسە زۆر زۆر درمییە، گەر بێت و یەك بەش لە 100 بەش یان گەردیلەی ڤایرۆسەکە تووشی مرۆ ببێت ئەوا مرۆ نەخۆش دەبێت . لە نێو یەك مللیلیتر لە ماددەی تووشبوودا نزیکەی زێدتر لە یەك ملیۆن گەردی تیادایە . زێدتر لە زستاندا (دیسەمبەر– فێبرواری) دا دەردەکەوێت ، لەبەرئەوە نێوی رشانەوەی زستان (Winter vomiting disease)ی لێنراوە . هەرچەندە زۆرجاران نەخۆش بێ چارەسەرکردن چاك دەبێتەوە و نیشانەکانی سۆکە دەرەوێنەوە . هەندێکجاری دی مرۆ پێویستی بە شلە هەیە تا جێگەی شلەی لە دەست دراو بە هۆی سکچوون و رشانەوەکانەوە پڕبکرێتەوە . زۆرجاران مرۆ سەر لە نوێ تووشی سکچونەکە دەبێتەوە نیشانەکانیش دەردەکەونەوە .

گەر ڤایرۆسەکە بڵاودەبێتەوە لە ماوەیەکی کورتدا ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوان (هەموو کەسێك دەگرێتەوە) بە تایبەی قوتابی و لاوان تووش دەکات . ڤایرۆسەکە لە پیسایی و رشانەوەی تووشبودا هەیە . ئەوەی شایانی باسە لە یەك گرام پیسایی نەخۆشدا نزیکەی 10 ملیارد ڤایرۆسی تیادایە ، لەبەرئەوە زۆر پێویستە پاش سەرئاوکردن مرۆ پاك دەستەکانی بە سابوون و ئاو بشۆرێت .

ڤایرۆسەکە 3 جۆری سێرەوی هەیە کە ئەمانەن :

1- جۆری Norwalk جۆری جێنی 1a پێك دەهێنێت .

2- جۆری Snow Mountain جۆری جێنی 2b پێك دەهێنێت .

3- جۆری Calici ی کلاسیکی جۆری جێنی 2b پێك دەهێنێت .

ئەم جۆرەیان تووشی منداڵی کەم تەمەن دەبێت و نیشانەکانی سوکە وەك سوێ رۆتاڤایرۆس وایە .

ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسەکە لە نێوان 1-2 رۆژدایە .

**رێگاکانی گواستنەوە**

1- راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ پەیوەندیکردن بە نەخۆشەوە . (لە کاتی رشانەوەدا هاڵاوی رشانەوە ، لە رێگای هەواوە) ڤایرۆسەکە بڵاودەکاتەوە .

2- لە رێگای خۆراکەوە، بە تایبەتی خۆراکی پیسبوو بە ڤایرۆسەکە یان خۆراکی ساردەوە مرۆتووش دەبێت .

3- لە رێگای ئاوی خواردنەوە ، سەوزەی نەشۆردراوی باخێك بە پاشماوەی پیسایی نەخۆشێك ئاودرابێت .

**نیشانەکان**

گرنگترینیان بریتین لە ژانە سك و رشانەوە بەڵام ژانەسەر ، هێڵنجدان ، سکچوون ، جارجار تالێهاتن یش ، دەردەکەوێت . لە 25-0٪ بارەکاندا تووشبوو تووشی ژانکردنی ماسولکەکانی لەش دەبێت .

نیشانەکان کورت خایەنن و لەوانەیە لە 1-3 رۆژدا نیشانەکان نەمێنن .

لە کاتی بڵاوبوونەوەدا بۆ نمونە لە نەخۆشخانەدا پێویستە بە پەلە هەوڵی خۆپاراستن لە ڤایرۆسەکە بدەن ، ئەویش بریتییە لە پاکژکردنەوە و شتنی هەردوو دەستەکان . گەر نەخۆشییەکە لە نێو نەخۆشخانەدا بڵاوبۆوە ئەوا پێویستە ئەو بەشە دابخرێت .

**دەستنیشانکردن**

- نیشاندانی ڤایرۆسەکە لە ژێرمیکرۆسکۆپی ئەلەکترۆنی.

- تێستی PCR ، ئەمرۆ لە ماوەی 3 کاتژمێردا ڤایرۆسەکە دەستنیشان دەکات .

**خۆپاراستن**

1- لە کاتی گومانکردندا پێویستە مرۆ پێش خۆراك خوارن دەستەکانی پاکوباش بشۆرێت .

2- هەوڵبدە دەستەسڕی کاغەزی یەك جاری بەکاربهێنە .

3- لە کاتی تووشبوندا پێویستە مرۆ لە ماڵەوە بمێنێتەوە و نەچێتەوە سەر کارەکەی تا رشانەوە و سکچوونەکە نامێنێت .

**سەرچاوە**


1. Iwarson-Norrby, Infektionsmedicin, epidemiologi, klinik och terapi Stockholm 2004
2. Claes Schalen, Lund Universitetsjukhus. Mikrobiologi-Nytt 2000
3. www.smi.se Calicivirusinfektion.2004.12.25.
4. Mat Eretell, Arnekötz. A –Chalotte-stenervyd. Smittskydd SMI Nr 3 203 S 14-15

# پێستە سۆی Molluscum Contagiosum

پێستە سۆیەکی ڤایرۆسییە ، لە هەموو جیهاندا بلاوە ، زۆرجاران تووشی منداڵ دەبێت . ئەمڕۆ پێستە سۆکە تووشی گەورە سالانیش دەبێت بەلام زایەند رێگەی گواستنەوەیەتی ، لەبەرئەوە وەك نەخۆشییەکی درمی زایەندیش ناسراوە .

**هۆزانی**

هۆی پێستە سۆکە ڤایرۆسێکە بە نێوی Poxvirus و دەبێتە هۆی جۆرێك گۆرانکاری گچکەی رەقی سەر پێستی شێوە بالوکەیی .

جیاوازی لە گەڵ بالوکەدا بریتییە لەوەی کە ئەمیان گچکەترن و بە کۆمەڵ (گروپ) دەردەکەون ، بەلام بالوکە گەورەترە و تاکە تاکە دەردەکەوێت . ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسەکە لە نێوان 2-6 هەفتەدایە .

**رێگاکانی گواستنەوە**

- پەیوەندی راستەخۆ بە پێستە سۆکەوە .
- پەیوەندی ناراستەوخۆ، لە کاتی بەکارهێنانی خاولی تووشبودا .
- زایەندی (تایبەتە بە گەورە سالان) .

**نیشانەکان**

- گۆرانکاریەکانی سەرپێست هەروەك بالوکە رەقن و نزیکەی 2-5 ملیمەترن بەلام گچکەترن .
- زۆرجاران لەسەر رووخسار، مل ، پەلەکان (دەستەکان ، پێکان) دەردەکەوێت .
- زۆرجاران خوراندن مامناوەندییە یان نەخۆش هەراسان دەکات .
- ئەو گۆرانکارییانەی سەرکۆئەندامی زاوزێ گەورەسالان دەردەکەون ، دەکەونە سەر مووەکانی بەر (توکەبەر) و کۆئەندامی زاوزێی دەرەوە , هەندێکجار لەسەربەشی خوارەوە یان سەرەوەی ران دەردەکەون .

نیشانەکان نزیکەی 1-3 مانگان ، هەندێکجار 6 مانگان دەمێنن .

**ئامۆژگاری و خۆپاراستن**

- پێوستە دایکوباوك هێمن و لەسەرخۆبن تا نەمانی گۆرانکارییەکانی سەر پێست .
- پێویستە منداڵی تووشبوو خاولی خۆی بەکاربهێنێت .
- پاش پەیوەندیکردن بە پێستەسۆکەوە ،پێویستە دەستەکان بە ئاووسابون یان بە پاکژکەرەوە بشۆردرێن یان پاکژبکرێن.
- مەهێڵە منداڵ خۆی بخورێنێت لەبەرئەوەی پاشتر دەبێتە برینۆ یان هەودەکات .

**چارەسەرکردن**

- زۆرجاران پێستە سۆکە خۆی چاکدەبێتەوە ونامێنێ (هەروەك لە بالوکەدا دەبینرێت) .
- باشتر وایە منداڵی ژێر 10سالان چارەسەرنەکرێت ، لەبەرئەوەی لەکاتی کراندندا منداڵ تووشی ترس لە کارمەندانی نەخۆشخانە دەبێت .
- لە کاتی کراندندا پێویستە شوێنەکە سڕبکرێت تا منداڵ ئازاری کەم بێت یان هەر نەبێت .

- گەر ئەیدزدار تووشی ئەم پێستە سۆیە ببێت ئەوا وەك پێستەسۆیەکی گشتی دەردەکەوێت .

**سەرچاوەکان**


1.Praktisk Medicin. three doctors förlag. Kap,11;230-231. Sverige 2004
2. Carl_fredrik Wahlgren, Dermatologi & venerologi. Stockholm. 2004
3.www. smi.se ©
4.www.netdoktor.se ©

# بەشی حەوتەم

## نەخۆشییە ڤایرۆسییەکان

1- ڤایرۆسی زەردوویی A
2- ڤایرۆسی زەردوویی B
3- ڤایرۆسی زەردوویی C
4- ڤایرۆسی زەردوویی Delta
5- ڤایرۆسی زەردوویی E
6- ڤایرۆسی زەردوویی G
7- سکچوونە ڤایرۆسییەکان (رۆتاڤایرۆس)

## زەردوویییە ڤایرۆسییەکان

**جگەر**

ئەندامێکی گرنگ وبزوێنەری لەشە ، لێرەدا ژمارەیەکی زۆر لە مادەکانی دی لەش دروست دەکرێن و دەکەوێتە ژێر ناوپەنچکەوە و لە بەشی لای راستی سك دایە . گەورەترین ئەندامی لەشە ونزیکەی 500 ئەرکی هەیە کێشەکەی لە نێوان 1 – 2 کیلۆ گرامدایە جگەر شێوەیەکی قوچەکی هەیە بنکەکەی بۆ سەرەوەیە لە دوو بەش پێکهاتوە یەکێکیان لەوەی دیان گەورە ترە . جگەر چاوگێکی مادەی ئاسنە و ڤیتامینەکانە بە تایبەتی ڤیتامینی B12 .
ئەم گلاندە دەست بە سەر کۆلیسترۆلی نێو خۆراکدا دەگرێت ، هاوکات هەندێك هۆرمۆن دروست دەکات گرنگترینیان هۆرمۆنی ئیسترۆجینی ژنانە.
جگەر ئەمبارێکی یەدەکی وزەیە و شلەی زراو دروست دەکات و پاشتر لە زراودانەوە بە هۆی کەناڵی زراوەوە دەرژێتە ناو ریخۆڵەوە لە ساڵی 1987 دا بۆ یەکەمجارلە مێژوودا لە شاری ( بالێن) ی ئیسپانی تاکە ئەندامی لەشە کە پەیکەری بۆ دروستکراوە دروستکردنی پەیکەرەکە تایبەت بوە بە ئەلکهولیست ومەی خۆرەکان تا بینینی پەیکەرەکە کاریان تێبکات و مەی خواردنەوە کەم بکەنەوە . هەروەها نابێت ئەو راستیەش فەرامۆش بکەین کە مەی تاکە گرفتی جگەر نییە وبگرە هەندێك هۆی تر هەن هەندێکیان ناوەکی و ئەوانی تریان دەرەکین وەکو مایکرۆئۆرگانیسمەکان ، هەروەها دەرمان و پیس بونی ژینگە کە لە پاشماوە پیشەسازیەکاندا بەدی دەکرێن . هەموو هۆناوەکی و دەرەکییە کان دەبنە هۆی سۆی کوتوپری acute یان سۆی تولانی chronic و پاشتریش لە ناوبردن و رزینیcirrhosis خانەکانی جگەر .

**مێژوو** (2،1، 24، 26، 44)

# بۆ یەکەمجار یۆنانییەکان لە جگەر و نەخۆشییەکەی دواون و لەو باوە ڕەدا بوون چونکە خوێن لە جگەر دا دروست دەبێت ئەوادەبێت جگەر مەڵبەندی هەست و هەستیاری مرۆڤ بێت ! هەروەها لەوباوەڕەدا بوون باژەڵە ascites نەخۆش بوونی جگەرە .

# هیپۆکرات لە کتێبەکەید ا ( نەخۆشییە کانی ناوەوە ) لە زاراوەی icter epidemic واتە درمی زەردوویی داوە .

# لە سەدەی پانزەهەمی پێش زایندا ( ئارێتاوس) ی خەڵکی ناوچەی ( کاپەدۆکیا ) چەند باسێکی دەربارەی گیروگرفتەکانی جگەر لە ژێر نێوی skirros نوسیوە .

# ( ڤیسالیۆس ) لە سەدەی شانزەدا باسی ئەوەی کردوە کە مەی خۆرەکان جگەریان گچکەیە .

# ( پاپا زەکەریا لە ساڵی 1791 دا نامەیەکی بۆ کڵێسەی (دێمانێ) نووسیوە و لە نامەکەیدا باسی نەخۆشی جگەر دەکات

# ( بایللێ) لە ساڵی 1793 دا توانی رزینی جگەر وەی خۆری لە نەخۆشییە کانی جگەر جودا بکاتەوە وە لە سەریان بدوێت .

#( براون) لە ساڵی 1865 دا لە ئینگلیستان یەکەم باری رزینی جگەری خستۆتە ڕوو .

# لە ساڵانی 1885 ەوە کوتوپڕە زەردوویی ناسراوە بەڵام لە ساڵی 1960 جۆری B و پاشتر لە 1973 دا جۆری A ناسرایەوە .

# ( لاینیێ ) لە ساڵی 1919 دا زاراوەی skirros بەکارهێناوە لە بنچینە دا ووشەیەکی یۆنانی کۆنەو بە مانای ئەو گرێ بچکۆلە زەردانە دێن کە لەسەر رووی دەرەوەی جگەرن .

# نەخۆشی درمە زەردوویی بە نەخۆشی جەنگ دەناسرێت ، چونکە لە دووەم جەنگی جیهانیدا نزیکەی دوو سەد هەزار سەربازی ئەمریکایی و ملیۆنێك لە ئەوروپا تووشی درمەکەبوون .

# یە کەمجار لە ساڵی 1940 دا بە دەرزی شلەی نێو خانەکانی جگەر راکێشراو لە تاقیگەدا لێی کۆڵرایەوە .

# یە کەمجار لە ساڵی1947 دا ( مارك کالۆم ) زاراوەی A واتە Hepatitis A ی بەکارهێناوە .

# تا ساڵی 1965 نەتوانراوە جیاوازی هەردوو جۆرەکەی ڤایرۆسی جگەری B، A بزانرێت .

پاشتر ( کرۆگمان ) هەردوو جۆری زەردوویی B، A لە یەکتر جیاکردەوە و سەلماندی کە ڤایرۆسی B بە هۆی دەمەوە لە کەسێکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی دی و هەروەها بە هۆی خوێن و بە کارهێنانی دەرزی پیسی ڤایرۆساوییەوە دەگوێزرێتەوە و پاشتریش سەلمێندرا هەرهەمان ڤایرۆس لە ڕێگەی زایەندەوە دەگوێزرێتەوە .

# ( بلۆمبێرگ ) لە ساڵی 1965 دا توانی پەیوەندی نێوان ئەنتیجینی ئوسترالیای ( بە نێوی ئۆسترالیاوە نێو نراوە ) و زەردوویی زەرداو بدۆزرێتەوە (ئیمرۆ پێیدەوترێت سەر رووە ئەنتیجین ) بەم هۆیەشەوە هۆکانی زەردوویی جۆری B دۆزرایەوە بەرامبەر بەم کارە بە سودەی بۆ مرۆڤایەتی لیژنەی پاداشتی نۆبڵ ئەو پاداشتە بە نرخەیان پێشکەش کرد .

# (پرینس ) لە ساڵی 1968 دا پەیوەندی نێوان ئەنتیجینی ( HBs ) وزەرداوی خوێنی زەردوویی نیشاندا .

# ( دانێ ) لە ساڵی 1970 دا ڤیریۆن(virion 0) ی ڤایرۆسی B ی لەژێر میکرۆسکۆپی ئەلکترۆنیدا دۆزییەوە .

# ( ماگنیۆس ) لە ساڵی 1972 دا بەباشی باسی دەربارەی سیستەمی دژە ئەنتیجینی ( Hbe) و هەروەها دژەتەنی anti-Hbe کرد.

# (ریزێتۆ) لە ساڵی 1976 دا یەکەمجار لەسەر جۆرێکی تری نوێی نووسی وپاشتریش بەزەردوویی جۆری دێلتا ناسرا.

# لە زۆربەی زۆری بارەکاندا ئەم زەردووییە(جۆری دێلتا ) تەنیا لەو کەسانەدا دەستنیشانکراوە یان دەکرێن کەهەڵگری ڤایرۆسی جۆری B بووبن .

# دۆزینەوەی زەردوویی جۆری (A,B,C) نەیتوانی گیروگرفتی زەردوووییەکان چارەبکات ودواتریش زانستانە توانرا جۆرەکانی تری Delta و E دەستنیشان بکرێن کەخوێن رێکایەکی سەرەکییە بۆ گواستنەوەیان.

# لە ساڵی 1987 دا لێپرسراوی کۆنترۆڵی نەخۆشییەکانی ئەمریکایی جۆرێك زەردوویی یان لە زەرداوی خوێنی هەندێك نەخۆشدا جیا کردەوە کە لەگەڵ زەردوویی جۆری نە A ونەB تێکەڵ بوو وپاشتریش بە زەردوویی جۆری E ناسراوە.

# لە ساڵی 1980 دا یەکەم کوتانی دژی زەردوویی B دروست کرا .

# له سالی 1995 دا دوو جۆری نوێ به ناوی Hepatitis GB Virion A&B دۆزرایەوە کە لە ئەفەریقاو ئەمەریکا و کەنەدا دا بڵاوە دەبنە هۆی زەردوویی کوتوپڕ بە لام تا ئیستا زانیاری تەواو لە سەر ئەم دوو ڤایرۆسە لە گۆرێدا نییە .
# پاشتر ڤایرۆسی زەردوویی جۆری G جودا کرایەوەو پاشتر ناوی GBV-C ی لینراوە .
# پەیوەندی نێوان زەردوویییە کوتوپڕە ڤایرۆسییەکان و زەردوویییە درێژخایەنەکانی جگەر لەوەدا دەردەکەوێت کە پاش ماوە توندە کە هەندێك نیشانەی تێکچوون یان ناتەواوی فەرمانەکانی جگەر بەردەوام بەدی دەکرێت ، ئەمیش ئەوە دەسەلمێنێت کە نەخۆش هەڵگری ڤایرۆسەو هەر ڤایرۆسیشە دەبێتە هۆی درێژە پێدانی زەردوویییەکە .
# لەم ساڵانەی دوایی دا تێستی زەرداوی خوێن ( تێستە سیرەمییەکان ) ڕۆڵێکی گرنگیان لە دابڕین یان لە دەستنیشانکردنی DNA ، RNA ی ڤایرۆسی زەردوویی جۆری HBV DNA HDV RNA دا بینیوە .
- لە نێوان ساڵانی 1955 – 1956 دا نزیکەی 29 هەزار ژن لە هندستان بە زەردوویی جۆری non A ،non B مردوون .
- لە ساڵی 1955 دا نزیکەی 11 هەزار کەس لە ڕوسیا بە هەمان ڤایرۆس مردون .
- لە ساڵی 1988 دا نزیکەی 20 هەزار کەس لە ئەندەنوسیا بە هەمان ڤایرۆس مردون .

**ڤایرۆسەکان**

**تا ئەمڕۆ بە لایەنی کەمەوە (6) جۆر ڤایرۆس دۆزراونەتەوە و ناسراون کە دەبنە هۆی برینداربون و زامی جگەر ، بوونیان لە لەشدا دەبێتە هۆی دەستنیشانکردنی زەردوویییە کان کە ئەمانەن :**

**# ڤایرۆسی زەردوویی A**
**# ڤایرۆسی زەردوویی B**
**# ڤایرۆسی زەردوویی C**
**# ڤایرۆسی زەردوویی Delta**
**# ڤایرۆسی زەردوویی E**
**# ڤایرۆسی زەردوویی GBV-C/HGV**

**ئەم ڤایرۆسانە جگەر زامار دەکەن و دەبنە هۆی زەردوویی کوتوپڕی جگە لەو جۆرانەی سەرەوە هەندێك ڤایرۆسی تریش هەن کە دەتوانن جگەر تووشی نەخۆشی تر بکەن وەك (1).**
CMV , Echovirus , Marburgvirus , EBV ,Varicella Fever Lassa Fever , Rudella, Haemorragic Fever , Adenoviruses , Coxackie B , Herpes Simplex.

**ئەوەی شایانی باسە ئەو ڤایرۆسانەی سەرەوە دەتوانن ببنە هۆی نەخۆشی کوتوپڕ ، جاری وایە نەخۆش ڤایرۆسەکە لە ڕێگای میزەوە یان پیسایییەوە دەکاتە دەرەوە و چاکدەبێتەوە وەکو لە هەوکردنی جۆری A دا دەبینرێت . بەلام جاری واش هەیە ڤایرۆسەکە پاش سۆی کوتوپڕ ڕێرەوی خۆی دەگۆڕێت و مرۆ تووشی نەخۆشی پاش سۆ کوتوپڕەکان دەبێت زەردوویییە کوتوپڕەکان لە جیهاندا زۆر بلاون ئەم بلاوییەش لە سەر پلەی تەندروستی باری ئابوری ، باشی ڕێگاو بان ، پاك وخاوێنی و خۆپاراستن لە ناوچەکەدا بەندە .**

**زەردوویی**

**بریتییە لە سۆی جگەر لە ئەنجامی سۆی ڤایرۆسییەوە ، هەندێکجاریش هۆی سۆکە دەگەڕێتەوە بۆ مادە ژەهراوییەکان .**

**ماوەی کرکەوتن:** لەو کاتەوە دەست پێدەکات کە ڤایرۆسەکە دەچێتە نێو لەشەوە زێد دەبێت تا دەرکەوتنی نیشانەکان .

ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسەکان بەپێی جۆری ڤایرۆس وتەمەنی نەخۆشەکە (44،21) .

-ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسی A لە نێوان (15-50) رۆژدایە مندال ولاو تووش دەبێت .

-ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسی B لە نێوان (30-80) رۆژدایە هەموو کەس تووش دەبێت

-ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسی C لە نێوان (30-90) رۆژدایە هەموو تەمەنێك دەگرێتەوە.

-ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسی D لە نێوان (10-18) رۆژدایە.

-ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسی E لە نێوان (30-50) رۆژدایە و 20-40 ساڵان دەگرێتەوە .

زەردوویی جۆری non A,non B کە هۆکەی ڤایرۆسی C لەو ولاتە پیشەسازی و پێشکەوتوانەدا زێدەترە وەك لە جۆرەکانی دی ، زۆرجاران بە پلەی یەکەمیش دێن ئەم جۆرە زەردووییانە وزەردوویی جۆری B بەهۆی خوێنەوە لە کەسێکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی دی ، واتە خوێن هۆی زۆربون وگواستنەوەی ئەو سێ جۆرەی سەرەوەن.

## زەردوویی جۆری A
## Hepatitis A

**ڤایرۆسی A**

ڤایرۆسێکی ناسراوە و بە خێزانی پێکورنا ڤایرۆس Picornavirus ە وشێوەی لەبێزینەیی هەیە و مرۆ تووشی درمە زەردوویی دەکات . سۆ بەم جۆرە ڤایرۆسە بە ئاسانی و زۆرجاران بێ دەرمان و چارەسەرکردن چاك دەبێتەوە بێئەوەی شوێنەواری بەجێ بهێڵێت .

سۆکە باری بەردەوامی و درێژ خایەنی بە خۆیەوە نابێت ئەم ڤایرۆسە RNA ی تیایە و تیرەکەی نزیکەی 28-32 نانۆمیترە .ڤیرێۆن virion ی ڤایرۆسەکە چوار پیکهاتوی پۆلیپێپتیدی گەورەی هەیە . ڤایرۆسەکە بە کولاندن لە پێنج خولەکدا دەمرێت ، وەلێ لە نێو کلۆردا بە 30 خولەك دەمرێت. گەر مرۆ یەك جار تووشی ئەم جۆرە ڤایرۆسە ببێت ، ئەوا دەتوانێت لە تاقیگادا دژە تەنی دژی ڤایرۆسەکە دەستنیشان بکرێت . ئەم ڤایرۆسە زێدەتر (منال و لاو) تووشی سۆ دەکەن ، زۆر جار مرۆڤ یەك جار تووشی ئەم ڤایرۆسە دەبێت

**پەتازانی**

زەردووییەکە زۆربەی جیهانی گرتۆتەوە . لە 85- 90 ٪ دا تووشی منداڵ و لە 20 -40 ٪ تووشی لاوان دەبێت ، چونکە ڤایرۆسەکە لە رێگای سوڕی دەم - پیساییەوە بلاودەبێتەوە ڤایرۆسەکە زۆر درمە و بە ئاسانی مرۆڤەکە تووش دەبێت . ساڵانە نزیکەی 60 هەزار کەس لە ئەمێریکا تووشی ئەم ڤایرۆسە دەبن .

**رێگایی گواستنەوە**

- خواردنەوەی ئاو ، شیر و خۆراکی ڤایرۆساوی ( کەواتە ئاوێك ، شیرێك یان خۆراکێکە ڤایرۆسەکەی تێدا بێت) .

- بەکارهێنانی ئاودەستخانەی پیس وناپاکژ ، یان دانیشتن لە قەراخ جۆگە یان لە کاتی کۆچرە و بومەلەرزە و باری دیدا .

- خۆراك خواردن وخواردنەوە لە سەرچاوەی پیس بوونەوەی ڤایرۆسەکە
- لە کاتی گەشت کردندا بۆ ناوچە درمییەکان (ئەو ناوچانەی ڤایرۆسەکەیان تێدا بلاوە) .
- ڤایرۆسەکە بە دەگمەن لە ڕێگای خوێنەوە دەگوێزرێتەوە (کاتێك خوێنەکە زۆر ڤایرۆساویی بێت).
لە ئەمێریکا وسوێددا نەخۆشیش دەستنیشان کراوە کە بە ڕێگای زایەندیدا ڤایرۆسەکە گوێزراوەتەوە .

سەرچاوەی ڤایرۆسەکە

- منداڵی باخچەی منداڵان ونەخۆشو شوێنە قەڵەباڵخەکاندا زێد تر دەکەونە بەرشاڵاوی ڤایرۆسەکە .
- نێربازەکان .
- بەکارهێنانی کۆکاین وماریوانە لە ڕێگای دەرزی دان لە خوێنهێنەر .

درمە زەردوویی

بریتیە لەو جۆرە زەردووییەیی بە ئاسانی بە ڕێگای سوڕی دەم - پیسایی یەوە لە یەکێکەوە دەگوێزرێتەوە بۆیەکێکی دی .

نیشانەکان

ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسەکە لە نێوان 2-6 هەفتەدایە ، جاری واهەیە ڤایرۆسەکە شێوەیەکی بەردەوامی هەیە لە نێوان 14-18 مانگدا و هەمیشە ڤایرۆسەکە پاش یەکەم سۆ بەرگری دژی دووەم سۆ لە لەشدا بەجێ دەهێڵێت بە مەرجێك هەمان جۆر ڤایرۆسی تووش ببێت ئەو بەرگریەش (بەرگری پاش سۆ) بە درێژایی تەمەن کاردەکات .

**1- قۆناخی پێش زەردهەڵگەڕان**

لە نێوان 3-7 ڕۆژدایە نەخۆشییە کە بە گرانی دەناسرێتەوە ، بە گشتی ( تا) 3 - 5 دەخایەنێت و لە 39 پلە تێنایەڕێ ، ژانکردنی ماسولکە ، هەندێك نیشانەی هەلامەت ، نەمانی ئارەزووی خواردنی تیادا دەردەکەوێت . لە 5 ٪ تووشبوان بێهێز و ماندوون .

- تووشبو هەست دەکات نەخۆشە .

دوو هەفتە پێش زەردهەڵگەڕانی ڕووخسارو هەفتەیەك پاش زەرد هەڵگەڕاندنەکە ، دەتوانرێت ڤایرۆسەکە لەپیسایی نەخۆشەکەدا دەست نیشان بکرێت و بناسرێتەوە .

- لەشی نەخۆش دەست بە ئاڵۆش و خوراندن دەکات .

**2- قۆناخی پاش زەرد هەڵگەڕان**

نزیکەی 10 - 14 ڕۆژ دەخایەنێت .

- سپێنەی چاوی تووش بوو زەرد هەڵدەگەڕێت .
- ڕەنگی میزی نەخۆش تۆخ دەبێت (وەك ڕەنگی چای لێدێت ).
- پیسایی نەخۆش بێڕەنگە ، یان زەردە ونەخۆشیش پیسایی کەمدەکات .
- هەندێکجار نەخۆش تووشی خوێن بەربوونی گەدە و پێست و ناو پۆشەکان ( لووت پژان و پوك پژان) دەبێت .

دەستنیشانکردن

دەتوانرێت لەماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسەکەدا یان لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکاندا ڤایرۆسەکە لە تاقیگەدا دەستنیشان بکرێت .

ئەوەی شایەنی باسە دژەتەنی anti-HAV لە نێو زەرداوی خوێندا جیادەکرێتەوە ، بەڵام IgM لە سەرەتای سۆکەدا دەردەکەوێت وماوەی چەند مانگێك دەمێنێتەوە. هەروە ها دژەتەنی anti-HAV بەردەوام لە هەردووجۆری ئیمونۆگلۆبولینی IgG,IgM دا ، دەست دەکەوێت ،پاش 3 – 13 مانگان IgM ی دژەتەنی anti-HAV ون دەبێت ، وەلێ IgG هەردەمێنێت ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بەردەوام بەرگری پەیدا دەبێت بۆ دەستنیشانکردنی ئەم جۆرە زەردوویە تەنیا دەستنیشانکردنی دژەتەنی anti-HAV پێویستە .

**چارەسەرکردن**

– جیاکردنەوەی نەخۆش بۆ 2 هەفتە پشودان و مانەوە لەجێگەدا .
– زۆر پێویستە ڤیتامینی B و C بدرێت بە نەخۆش .
– پارێز زۆر بەسودە و کاتێك نەخۆش زۆر دەرشێتەوە پێویستە لە خوێنهێنەرەوە خوێ یان شەکراوی تێبکرێت .

**کوتان**

کوتانی Havrix دژی ڤایرۆسی جۆری A بە کاردەهێنرێت .

**تێبینی** : رەنگ زەردی بریتییە لە خەست بوونەوەی مادەی بیلیروبین لە زەرداوی خوێن دا.

**تێبینی** : زەردوویی جۆری A لە باشوری کوردستاندا لە هەموو جۆرەکانی دی بڵاوترە .

## زەردوویی جۆری B

**ڤایرۆسی B**

ئەم ڤایرۆسە کە دەبێتە هۆی زەردوویی جۆری B گەورەیە و زۆر لە زەردوویی جۆری یەکەم سامناکترە و مرۆ تووشی زەردوویی سیرەمی (زەرداوی خوێن) دەکات.

ڤایرۆسەکە سەر بە خێزانی Hepadnavirus یەو لە شێوەی تەنۆڵکەی خڕ یان لە شێوەی پرۆتینی تایبەت بە ڤایرۆسەکە پرۆتینیك هەیە پێی دەووترێت رووکەشە ئەنتیجین HbsAg ، ئەم ئەنتیجینە لە نێو خوێندا لە شێوەی تەنۆڵکەی بازنەییدایە تیرەکەیان 20–22 یان 50–250 نانۆمیتری دایە .

**جۆرە نوێکانی ڤایرۆسی زەردوویی B**

ئەوەی شایانی باسە گەر بەراوردێك بکەین لە نێوان زانستی پزیشکی 20 ساڵان لەمەوبەرو ئەمڕۆدا دەبینین کە پێشکەوتنێکی بەرچاو ئەنجامدراوە و زۆر سوودی بە نەخۆش و پزیشکیش گەیاندوە . توێژینەوەکانی ئەم چەند ساڵانەی دوایی ئەو راستییەیان سەلماند کە ئەم ڤایرۆسە 8 جۆری جینی(gynotype) هەیەو لە نێوان H-A دایە، کە ئەمانەن: (1,2,3)

1– جۆری A لە ئەوروپا و باشوری ئەفریقادا هەیە .
2– جۆری B لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئاسیادا هەیە .
3– جۆری C لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئاسیا و ئوقیانوسەکاندا هەیە .
4– جۆری D لە وڵاتانی دەریای سپی ناوەراستدا ، باکوری ئەفریقادا و ناوەراستی ئاسیادا هەیە (زیاتر لە نێو ئەو کەسانە دەبینرێت کە خوویان بە مادە بێهۆشکەرە کانەوە گرتووە و بە دەرزی لە خوێنهێنەری خۆیانی دەدەن) .

5- جۆری E له رۆژئاوای ئەفریقا دا هەیە .

6- جۆری F له ئەمێریکادا هەیە .

7- جۆری G له فەرەنسادا هەیە .

8- جۆری H له ئەمێریکادا هەیە .

ئەوەی شایانی باسە لە تاقیگادا دەتوانرێت ئەوتەنۆلکەیە دەستنیشان بکرێت کە چەند پرۆتینێکی تایبەتی هەڵگرتووە پێیان دەگوترێت ئەنتیجین و ئەمانەن: e.c.s کە تیرەکانیان 22،27، 42 نانۆمیترە .

HBsAg = Hepatitis B surface antigen
HBcAg = Hepatitis C surface antigen
HBeAg = Hepatitis E surface antigen

ئەم ئەنتیجینانە تەنی دەرەکین بۆ لەش ، بۆیە لەشی مرۆ دژەتەنی تایبەت دژ بەم ئەنتیجینانە دروست دەکات و دەیانرژێنێتە نێوخوێنەوە کە بریتین لە:

anti- HBs = antibody against HBsg
anti- HBc = antibody against HBcg
anti- HBe = antibody against HBeg

ئەم دژە تەنانە تایبەتن بەو ئەنتیجینانەی سەرەوە ، هەر کاتێك بتوانرێت لە تاقیگە دا ئەنتیجین و دژە تەن یان تەنیا دژەتەن لە نێوخوێن دا بدۆزرێتەوە ، ئەوسا بۆمان روون دەبێتەوە جگەر تووشی سۆ بووە بە ڤایرۆسی جۆری B پاشترین دەتوانین قۆناخی سۆکە دەستنیشان بکەین . واتە پێویستە بزانین چ جۆرە سۆیە (کوتوپڕە ، لاوەکیە ، تولانییە) هەروەها دەتوانین بزانین ئایا باری ڤایرۆسەکە چالاکە ، ناچالاکە یاخود لە زێدبوندایە . هەرچەندە دژەتەنەکان رۆڵی گرنگ لە بەرگری کردندا دەبینن کەچی زۆرجار مرۆ دەبێتە هەڵگرێکی تولانی ڤایرۆسەکە . ئەم ڤایرۆسە لە جگەر ، خوێن ، خانە شلەکان و شلە دەردراوەکاندا هەس زۆرجار لەوانەیە چڕی ڤایرۆسەکە لە خوێن دا بەرزبێت بێئەوەی لە جگەردا هەبن . شەش هەفتە پێش دەرکەوتنی نیشانەکانی سۆکە (پێش پەیدابوونی بارە کوتوپڕەکە) ڤایرۆسەکە لە خوێن دا دەست بە جموجوڵ دەکات . بەڵام لە 5–10 ٪ نەخۆشەکان زۆربەی هەڵگرانی ڤایرۆسەکە لە خوێنیاندا دەستنیشان دەکرێت . لە هەندێك نەخۆشدا ڤایرۆسەکە بە درێژایی ماوەی زەردبونەکە دەمێنێتەوە (21) . لە 10– 15 ٪ ی نەخۆشەکان ڤایرۆسەکەیان لە خوێندا دەمێنێتەوە بێئەوەی بۆ ماوەی چەند ساڵێك نیشانەکانیان تێدا دەربکەون (واتە هەڵگر بێنیشانەن) . زۆرجاران ڤایرۆسەکە لە رێگای میزەوە دەکرێتە دەرەوە ، لە وانەیە ئەم رێگایە ببێتە هۆی گواستنەوەی ڤایرۆسەکە لە نێو ئەو کەسانەدا کە نەخۆشن و خزمەتی منداڵ دەکەن یان توانای میز راگرتنیان نییە . ڤایرۆسەکە لە نێو سپێرم و شلەی نێو گولێنك و خوێنی بێنوێژی دا بە رێژەیەکی بەرز هەیە ، هەرچەند پلەی خەستی ڤایرۆسەکە لە نێو چڵمی لووتو لیکی نێو دەم و گەروودا هەزار ئەوەندە وەك لە خوێندا کەمترە لە گەڵ ئەو رێژە کەمەشدا هەرڤایرۆسەکە توانای گواستنەوەی هەیە. ڤایرۆسی جۆری B لە ئاستی ئەنزیمی دیواری ناوەوەی ریخۆڵەدا ناچالاکە ، لە پیسایدا نییە ، وەکو جۆری A لە رێگەی پیسایی ودەمەوە ڤایرۆسەکە ناگوێزرێتەوە . ڤایرۆسەکە لە هەندێك شلەی نێو لەشدا هەیە ، هەر ئەمەشە بۆتە هۆی جیاوازی رێگاکانی گواستنەوەی ڤایرۆسەکە ، ئەم زەردوییە لە 10 ٪ ی هەموو زەردوییەکان دەگرێتەوە کە بە رێگای خوێندا تووش دەبن .

**درمی ڤایرۆسەکە**

لە شەشەم رۆژی کرکەوتنی ڤایرۆسەکەوە دەست پێدەکات و نزیکەی 1-2 مانگ دەخایەنێت رێژەی تووشبوون بەم ڤایرۆسە لە نێوان 5-10٪ دایە کە بۆ ماوەی 2-5 مانگان یان ساڵێك HBsAg یان لە خوێندا دەمێنێت .

**رێژەی بلاوی زەردوویی B**

ئەم جۆرە زەردووییە یەکێکە لەو نەخۆشییانەی کە زۆر بلاوە وساڵ بە ساڵ لە جیهاندا رێژەی بەرە و زیادی دەچێت . لە جیهاندا ساڵانە نزیکەی 230 هەزار نەخۆشی نوێی تۆمارکراو دەستنیشان دەکرێت ، ساڵانە نزیکەی 15-30 ملیۆن لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمێریکادا و لە ئەورووپادا هەموو ساڵێك نزیکەی لە 20-30٪ ی دانیشتوان لە تەمەنی جیاوازدا تووشی ئەم جۆرە زەردووییە دەبێت بەپێی سەر ژمێریەکی ر ت ج لە ساڵی 1993 دا نزیکەی 230 ملیۆن نەخۆش لە جیهاندا هەبوە .

دەتوانین بڵێین کە هۆی زۆری بلاوبونەوەی ئەم جۆرە زامەی جگەر زایەندە ، چونکە زایەند یەکێکە لەو رێگایانەی کە ئەم ڤایرۆسەش دەگوێزێتەوە رێگاکانی گواستنەوەی ئەم ڤایرۆسە وڤایرۆسی HIV لە یەك دەچن .

بەلام ژمارەی تووشبوان بەم ڤایرۆسە زۆر زیاترە وەك لە تووشبوان بەHIV ، ئەم ڤایرۆسە زۆر درمە لە چاو HIV و لە نێونەخۆشییە درمە زایەندییەکاندا بە پلەی سێیەم پاش سوزەنك وفەرنگی دێت . ئەو نەخۆشانەی کە چەند جارێك لە نەخۆشخانە دەمێننەوە زیاتر تووشی ئەم جۆرە زەردووییە دەبن .

زۆریەی ئەو کەسانەی زۆر تووشی ئەم جۆرە ڤایرۆسە دەبن بریتین لە (نەشتەرگەر، پزیشکی نەخۆشی ژنان و منداڵبوون ، پزیشك وسیستەری تاقیگاکان ، پزیشکی ددان) تاد . لە فەرەنسا زەردوویی جۆری B زۆربلاوە و جۆرێکە لە نەخۆشی کاری ولاتەکە .

**رێگاکانی گواستنەوە**

1- گواستنەوە خوێن و پێکهاتوەکانی خوێن وسپێرم ، تف ولیکی نێو دەم ، شلەی نێو گوڵینك وخوێنی بێنوێژی .
2- چاندنی ئەندام .
3- زایەند لە نێرەوە بۆ نێر ، لە نێرینەوە بۆ مێوینە ، لە مێوینەوە بۆ نێرینە .
4- رێگای دەرزی : دەرزی نەخۆشخانەی بەکارهاتوو ، دەرزی شرنقەی خوێنهێنەری بەنگ کێشەکان .
5- رێگای دی ، ژەك و شیری مەمکی دایك ، قەیچی ، نینۆکبڕ ، گوێزانی ریش تاشین زۆر مەترسییان هەیە .

**ڤایرۆسزانی**

نابێت ئەو راستییەمان لە یاد بچێت کە ڤایرۆسەکە زۆر گچکەیە و تەنیا لە ژێر میکرۆسکۆپی ئەلکترۆنیدا وەك 3-4 جۆر تەنۆلکەی گچکە لە سیرەمی (زەرداوی خوێنی) نەخۆش دا دەبینرێت کە ئەمانەن:

1- تەنۆلکەی (دانی ) نزیکەی 42 نانۆمیترە .
2- تەنۆلکەی دووەم نزیکەی 38 نانۆمیترە .
3- تەنۆلکەی سێیەم نزیکەی 22 نانۆمیترە .

ڤایرۆسەکە لە 60 پلەی گەرمی دا 10 کاژێر دەژێت ، بە کوڵاندن لە 100 پلەدا تەنیا 30 خولەك دەژی ، بەڵام بەرگەی کلۆر دەگرێت .

**نیشانەکان**

ئەوەی راستی بێت بەرتەك وەڵامدانەوەی لەش لە مرۆڤێکەوە بۆ یەکێکی دی جیاوازە ، هەر لە بەر ئەم هۆیەشە گەلێك جار نیشانەکانی سۆیەك یان نەخۆشییەك لە سەرخۆ و هەندێکجاریش نیشانەکان بە کوتوپڕی و زۆر خێرا دەردەکەون کە:

- تالیهاتن ، پلەی گەرمی نەخۆش دەگاتە 38-39 پلە – هێڵنجدان و رشانەوە .
- پەیدابوونی ئازار لە ئاستی جگەردا (شێوەی ئازارەکە جیاوازە) .
- زۆر جار نەخۆش تووشی ئالۆش و لەش خوراندن دەبێت .
- کاتێك جگەرەکێش تووشی ئەم ڤایرۆسە دەبێت هەست بە تامی جگەرە ناکات .
- رووخسارو سپێەی چاوی نەخۆش زەرد هەڵدەگەڕێت .
- شەکەت بوونی نەخۆش (بەتایبەتی گەرمندالێ تووش بیێ ئەوا ئارەزووی یاری کردنی نامێنێت).
- میزی نەخۆش خەست دەبێتەوە و دەگۆڕدرێ (وەك رەنگی چای لێدێت).
- سەرووی پیسایی نەخۆش دەبریسکێتەوە .
- ئەومندالآنەی تووشی ئەم ڤایرۆسە دەبن 20 ٪ یان سپڵیان گەورە دەبێت .
- ژان کردنی جومگەکان .
- ناتەواوی فرمانی جگەر .

**تێبینی** : زۆرجاران سۆی ڤایرۆسی HIV هەمان نیشانەی سۆی ڤایرۆسی زەردوویی دەبێت وئەویش پێش دەرکەوتنی تای زەردووی ، ماندوویی ، هێڵنجدان ، رشانەوە ، سکچوون ، نیشانەی کۆئەندامی دەمار (ژانەسەر ، گیروگرفتی بینین وناسینەوە و..تاد) شەوانە ئارەق کردنەوە ،گەورە بوون و ئاوساندنی گرێ لیمفاویەکان .

**تێبینی** : ڤایرۆسەکە چەند جۆر ئەنتیجینی هەبێت لەش ئەوەندە دژە تەن دژ بەو ئەنتیجینانە دروستدەکات.

**تێبینی**:ئەم زەردووییەش بە رێژەیەکی نادیار لەباشوری کوردستان بڵاوە

**جۆرەکانی سۆی زەردوویی B** (12،1) :

**1- کوتوپڕە سۆ**

لە ئامارێکدا وادەرکەوتووە لە 70٪ تووشبوان ئەم جۆرە سۆیە یان تێدا بە دی دەکرێت ، هەر لە هەفتەی 3-13 وە سەرە رووە ئەنتیجین لە خوێنی تووشبواندا دەردەکەوێت وبەردەوام دەستنیشان دەکرێت ، بەڵام لە 5 مانگان زیاتر لە لەشدا نامێنێتەوە هەروەها لە 80-90٪ ی نەخۆشەکان دژەتەنی ئەنتیجینەکەیان ناتوێتەوە لە بەر ئەم هۆیە نەخۆشییەکە بەرە و تولانی مل دەنێت .

**2- بێنیشانە سۆ**

لەم بارەدا نەخۆش کەمێك نیشانەی لێدەردەکەوێت ، هەندێکجار لە 20-25٪ ی تووشبوان بێنیشانەن ، لەشی نەخۆش ڤایرۆسەکە دەکاتە دەرەوە و ئەوسا دژەتەنەکان پارێزگاری لە گەشەکردنی دەکەن ، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەو کەسە ڤایرۆسەکەی تێدایە .

3- جۆری سێیەم

لەم جۆرەدا تەنیا 5-10٪ ی تووشبوان مەترسییان لێدەکرێت تووشی ڤایرۆسەکە بوبن ، لە گەڵ ئەوەشدا زەردوویبیدار تووشی نەخۆشییەکی تردەبن کە سوکترە و کەمترهەستی پێدەکرێت و پاشتر ون دەبێت . هەندێکجار لەو جۆرانەی سەرەوەدا نەخۆش هیچ نیشانەیەکی تێدا بەدی ناکرێت و لە تاقیگەشدا نیشانەی سۆی جگەری تێدا دەرناکەوێت .

گەر تاقیکردنەوەی نمونەی خانەیی biopsy وەرگرین وهیچ ئەنجامێکی پۆزەتیڤمان دەست نەکەوێت ، ئەوا نەخۆش هەر هەڵگری ڤایرۆسەکەیە ! ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دووجۆر توشبوو هەیە :

1- تووشبوی تولانی بێنیشانە .
2- تووشبوی تولانی نیشانەدار .

باری تولانی chronic

بریتییە لە بەردەوام بوونی ڤایرۆسەکە لە لەشی مرۆڤدا بۆ ماوەی شەش مانگان لەبارە کوتوپڕەکەوە یان لە رۆژی دیاریکردنی نەخۆشییەکەوە . مەترسی ئەو بارە تولانییە لە منداڵدا زیاترە بە تایبەتی منداڵی پێش نۆمانگان لە دایك ببێت ، بەلام مەترسی تووشبوون بەم بارە لە لاواندا کەمترە .

دەستنیشانکردن

ئەوەی راستی بێت بۆ دەستنیشانکردنی ئەم جۆرە ڤایرۆسە پێویستە پزیشك چەند پرسیارێك ئاراستەی نەخۆش بکات و پێویستە ئەویش بە راستی وبێ پێچ وپەنا وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە هەروەها ئەو نیشانانەی کە نەخۆش هەستی پێدەکات لەگەڵ ئەو نیشانانەی لە کاتی تێڕوانیندا پزیشك دەستنیشانی دەکات زۆر گرنگ وبە سوودن بۆ گەیشتن بە بۆچوونێك و ئەم بۆچوونەش لەگەڵ تێستی تاقیگای ئەنزیمەکانی جگەر ، زەرداوی خوێن و ڤایرۆسدا تەواو دەکرێت و سەرجەم دەستنیشانی زەردوویییەکە دەکەن

لەگەڵ ئەمەشدا تێستی تایبەتی بۆ دەستنیشانکردنی ئەنتیجینی s,c,e و دژەتەنەکانیان پۆلێکی گرنگیان لە دەستنیشانکردنی جۆری ڤایرۆسەکەدا هەیە ، هەرکاتێك HBsAg بۆ ماوەی شەش مانگان زیاتر بەردەوام بوو ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە زەردوویییەکە لە حاڵەتی درێژخایەنی دایە تێستی DNA ی ڤایرۆسی زەردوویی B جۆرێك تێستی ترە بۆ دەستنیشانکردنی زەردوویییەکە .

تێبینی : هەرکاتێك تێستی HBeAg پۆزەتیف بوو مانای ئەوەیە کە نەخۆش بە ئاسانی بەو رێگایانەی پێشوتر باسکرا دەتوانن کەسێکی دی تووش بکەن .

رێڕەوی نەخۆشییەکە

نزیکەی لە 85-90٪ ی زەردوویدارەکان جۆری B بە تەواوی چاك دەبنەوە ، ئەوانی دی دەچنە باری تولانییەوە یان تووشی رزینی جگەر دەبن .

لە قۆناخێکی پێشکەوتوودا زەردوویدار بە دەگمەن تووشی شێرپەنجەی جگەر دەبێت .

پارێزکردن

# لە کاتی نا تەواوی فرمانی جگەردا پێویستە نەخۆش لە 60-70٪ ی کالۆری بۆ دابین بکرێت و لە رێگەی خوێنهێنەرەوە لە شێوەی ئاو + گلوکوزی 5-10٪ ی بدرێتێ .

# له سەرەتادا پێویستە شیر و پێکهاتوەکانی شیروسەوزە بە نەخۆش بدرێت کاتێکیش زەردوویدار ئارەزووی خۆراکی کرد ئەوا گۆشت و پەتاتەی دەدرێتێ .
# پاش دەرکەوتنی یەکەم قۆناخی زەردووییەکە پێویستە رۆژانە 60-70٪ گرام چەوری لە شێوەی رۆنی زەیتون ، گوڵبە رۆژە یان گەنمەشامیدا بە نەخۆش بدریت و هەروەهاگۆشتی مریشك و ماسی وڤیتامینەکانیش بە سودن .
# پێویستە بەپێی پێویست بە رێژەیەکی ئاسایی خوێ و ئاو بە نەخۆش بدرێت .

**چارەسەرکردن :**

پێویستە نەخۆش جودا بکریتەوە ، پشووبەخۆی بدات و گوێرایەڵی ئامۆژگاریەکانی پزیشك بێت .

*ڤیتامینی B1,2,6,12,C زۆر بەسودن هەروەها ڤیتامینی K,1,3 لە کاتی خوێن بەربوون وخوێن پژاندا زۆر پێویستە .

*دەرمانی interferon alpha A یەکێکە لە دژە ڤایرۆسەکان زۆر بەکارە چونکە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی DNA لەزەرداوی خوێندا ، هەروەها دەبێتە هۆی هەژاندنی یەکەم وەڵامدانەوە، خانەقەپگرەکان ، لیمفۆسایتەکانی T ، خانە کوژەرەکان و خانە سروشتییە کوژەرەکان چالاك دەکات . دەرمانی تریش بۆ چارەسەرکردنی نیشانە لاەکیەکان کۆئەندامەکانی لەش هەیە وەلێ بەپێی باروجۆری کلینیکی بەکار دەهێنرێت .

**هەنگاوە پێوانەییەکان لە کاتی سۆی ڤایرۆسی جۆری B دا :**

1- دوبارە کۆنترۆڵکردنی فرمانەکانی جگەر (بایۆکیمییایی کلینیکی) .
2- دوبارە کۆنترۆڵکردنی دەمارو باری دەروونی نەخۆش .
3- هەوڵدان بۆ لابردنی ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی هۆشخۆچوونی هەمیشەیی
4- کۆنترۆڵی هاوسەنگکردنەوەی ترش و تفت و کانزاکان .
5- کۆنترۆڵی رێژەی شلە وەرگرتن و شلە کردنە دەرەوە .
6- رێککردنەوەی رێژەی شەکر .
7- راستکردنەوەی بەرزی رێژەی ئامۆنیای نێو خوێن بە هۆی : دەرمانی دژە ئامۆنیاوە .
8- کۆنترۆڵ وچارەسەرکردنی ئاتەواوی گورچیلە .
9- چارەسەرکردنی سۆ بەکتریایەکان .
10- لەکاتی خوێن بەربوون و پژانی لووت و پوکدا، پێویستە ڤیتامین K بدرێت بە نەخۆش .

**تێبینی** : دابینکردنی پیسایکردنی زەردوویدار زۆر گرنکە لە بەرئەوە پێویستە نەخۆش میوە وشلەمەنی بخواتەوە و لە کاتی پێویستدا ( گیراندا) کۆمشۆری بۆ بکرێت یان دەرمانی رەوانی پێ بدرێت .

**تێبینی** : پێویستە هەمووژنێکی دووگیان تێستی ئەنتیجینی HBsAg لە کاتی هەر سکپڕیەکدا دووبارە بکاتەوە .

**تێبینی** : لە ساڵی 1998 دا دوو کوتانی نوێ کەوتە بازارەوە دژی زەردوویی B,A بە نێوی Twinrix بۆ منداڵ و گەورە ساڵان .

### چارەسەرکردنی زەردوویی تولانی جۆری B

ئەوەی شایانی باسە زەردەرسۆی جۆری B (HBV) خۆی چاك دەبێتەوە بەلاّم دەتوانین بڵێین کە نزیکەی ٪5 ی گەورەسالاّن تووشی جگەرسۆی درێژخایەن ئەبن . ئەو منداڵانەی لە کاتی لە دایکبووندا تووشی ڤایرۆسەکە دەبن (کاتێك دایکیان هەڵگری ڤایرۆسەکەیە) .

لە ٪90 یان رێرەوی سۆکەیان بەرەو درێژخایەنی گەشەدەکات ئەمڕۆ لە تاقیگادا و لە سیرەمی خوێندا ئەتوانین دەستنیشانی ڤایرۆسەکە بکەین واتە رێژەی HBeAg anti HBe و رێژەی HBV DNA بزانین (دەستنیشان بکەین) کە زۆر یارمەتی دەرە تا بزانین ئایا سۆکە چالاکە (کەسانی دی بە ئاسانی تووش دەکەن) یان نا یان کەسانی دی تووش ناکەن . خەملاّندنی دەست پێکردنی ئەنتیڤایرۆسی لەسەر ئەو رێژەیە بەندە . ئەمڕۆ 2 ئەنتیڤایرۆسی پەسەندکراو دژی زەردوویی جۆری B بەکاردەهێنرێن ئەوانیش بریتین لە :

1- دەرمانی ئەلفا ئینتەرفێرۆن Alpha interferon و کورتکراوەی IFN بۆ دانراوە .

2- دەرمانی Lamivudin نێوی بازرگانی Zeffix .

3- دەرمانی Pegasys .

### دەرمانی IFN

ئینتەرفێرۆن لە خێزانی سایتۆکاینەکانەوە Cytokine هاتووە وەك وەلاّمدانەوەی سۆی ڤایرۆسی Primary virus infection لەش دروستی دەکات . لە ساڵی 1997 دا وەك ئەنتیڤایرۆسێکی بەکارهێنراو لەم سۆ ڤایرۆسییەدا ئەدرێت بە نەخۆش :

- کاتێك رێژەی ئەنزیمەکانی جگەر لە خوێندا بەرزن .
- کاتێك HBV ADN, HbeAg پۆزەتیفن .
- کاتێك جگەرسۆ فیبرۆس Fibros دەستنیشان دەکرێت .

دەرمانی IFN= Introna – Rofeon لە شێوەی دەرزیدایە و هەفتەی 3 دەرزی لە ماوەی 4-6 مانگدا ئەدرێت لە ژێر پێستی نەخۆش . ئەم دەرمانە ئەنجامی باشی بە زۆربەی تووشبوانی زەردوویی جۆری B داوە ئەمیش وەك ئەنتیڤایرۆسەکانی دی بەشی خۆی نیشانەی لاوەکی وەك نیشانەی ئینفلوەنزای ، دەماری دەروونی و بەرگریزانی هەیە .

### دەرمانی Lamivudin

ئەمیش لە خێزانی سایتۆکاینە و پەسەندکراوە ، چونکە بە ژەمی جودا کاردەکاتە سەر HBC, HCV گەر بەراوەرد بکرێت لە گەڵ IFN دا نیشانەی لاوەکی ئەمیان زۆر کەمترە . لەبەرئەوە ئەتوانرێت ئەم دەرمانە بدرێت بەو کەسانەی کە تووشی ناتەواوی جگەریش بوون . رۆژانە ژەمی یەك حەپلە بۆ ماوەی ساڵێك ئەدرێت بە نەخۆشی (دیاری نەکراوە چەند پێویست دەکات) بەلاّم کاتێك کە ئەنزیمەکانی جگەرئاسایی بوونەوە ئەوا چارەسەرکردن رادەگیرێت . نالەبارترین نیشانەی لاوەکی ئەم دەرمانە بریتییە لەوەی کە لە ماوەی 6 مانگدا ڤایرۆسەکە بەرگری دژی دەرمانەکە دروست ئەکات . هەرکاتێك رێژەی ڤایرۆسەکە بەرزبۆوە ، هاوکات ئەنزیمەکانی جگەریش بەرزئەبنەوە ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە ڤایرۆسەکە بەرگری دژی دەرمانەکە پەیداکردوە . هەندێك نەخۆش پاش 1-2 ساڵ بەرگرییان پەیدا کردوە .

ئیمۆنۆگلۆبولینی دژی ڤایرۆسیB واتە Annatir دەدرێت بەوکەسانەی مەترسی تووشبونی HBV یان لێدەکرێت . ئەمیش وەك کوتان سوودی هەیە تا مرۆڤ تووشی ڤایرۆسەکە نەبێت .

**دەرمانیPegasys**

بە پێی راپۆرتێکی ر ت ج پاش توێژینەوەیەکی فراوانی 48 هەفتەیی لە 15 وڵاتدا ئەم دەرمانە نوێیە سەلماندی کە زۆر لە Lamivudin باشترە و ئەنجامی توێژینەوەکان وایانکردووە تا بۆ زەردوویی جۆری C ش بەکار بهێنرێت .

**سەرچاوەکان**


1. Magnus Lindh, Klinik betydelse av genotyper vid Hepatit B, Information, från Läkemedel verket, Årgång 15, Nr. 4, Juni-Juli 2004. Sida38-44.
2. Arauz-Ruiz P, Norder H, Robertson B Hm et al.Genotype H:a new Amerindian Gyotype of Hepatitis B virus revealed in Central America. J Gen Virol 2002:83:2059-73.
3. Norder H, Courouce A M and Magnus L O. Complete genomes, Phylogenetric relaterdenss, and structural proteins of six strains of the hepatitisB virus, four of eight represent two new genotype:Vorology 1994;198:489-503.


## زەردوویی جۆری C

### ڤایرۆسی C

ئەوەی شایەنی باسە ڤایرۆسەکە سەربەخێزانی (Flavivirus) ە و نزیکەی 200 ملیۆن کەس لە جیهاندا هەڵگری ڤایرۆسەکەن و نزیکەی 4,9 ملیۆنیان لە ئەمێریکادا دەژین و نزیکەی 10 ملیۆنیش لە ئەورووپای رۆژئاوادا دەژین . بڵاوترین زەردوویییە لە نێو ئەو کەسانەدا کە رۆژێك لە رۆژان خوێن یان فاکتۆری خەستیان وەرگرتووە ، ئەو راستیەش سەلمێنراوە ئەو کەسانەی کە چەند ساڵێك لەمەوبەر گاماگلۆبولینیان وەرگرتووە وەلێ ئەو جۆرە گاما گلۆبولینە لە جیهاندا تۆمار نەکراوە ئەوا تووشی ئەم زەردوویییە بوون . لە وڵاتە رۆژئاواییەکاندا نزیکەی لە 20٪ ی ئەوانەی کە زەردوویی کوتوپڕیان تووش بوە تووشی ڤایرۆسی C بوون. لە 30٪ هەموو چاندنەکانی جگەر دەگرێتەوە بۆ سۆ بەم ڤایرۆسە . سۆکە کە زۆرتر لە باشوری ئیتالیاو میسر بینراوە هۆی تووشبونیش بەم ڤایرۆسە دەگەڕێتەوە بۆ بەکارهێنانی دەرزی پەنگکێشان . تا ئەمڕۆ 6 جۆری genotype و ژمارەیەکیش subtype ی ڤایرۆسی C دۆزراوەتەوە . دەتوانین بە هۆی PCR وە دەستنیشان دەکرێت ئەوەی شایەنی باسە لەچەند توێژینەوەکی جودا ڤایرۆسەکە لە زەردوویی داری ڤایرۆسی A B.C.E دۆزراوەتەوە (39) .

* لینیێ و هاوەڵەکانی 1996 رایانگەیاند کە دوو ڤایرۆسی G یان لە دوو زەردوویداری جۆری C دۆزیوەتەوە . لە توێژینەوەی مریم ئالتەر ( لە مەڵبەندی کۆنترۆڵی نەخۆشییەکانی – ئەتڵەنتا) هاوەڵەکانیدا رایانگەیاند کە (40) :

- لە 45 زەردوویيداری A-E دا 4 نەخۆشیان ڤایرۆسی G تیادا دۆزراوەتەوە .
- لە 136 زەردوویيداری C دا 23 نەخۆشیان ڤایرۆسی G تیادا دۆزراوەتەوە .
- لە 100 زەردوویيداری A دا 25 نەخۆشیان ڤایرۆسی G تیادا دۆزراوەتەوە
- هەروەها لە 100 زەردوویداری B دا 32 نەخۆشیان ڤایرۆسی G تیادا دۆزراوەتەوە.

لە ماوەی 1 - 9 ساڵدا ئەو کەسانەی کە ڤایرۆسی G یان تیادایە دەستنیشانکراون پاشتر تووشی زەردوویی درێژخایەن بوون .ڤارڤێری ئاڵتەر (ئینستیتوتی تەندروستی نەتەوەیی ئەمێریکا) وهاوەڵەکانی رایانگەیاند :

- لە 13 نەخۆشدا کە خوێنیان وەرگرتوە A-G ، سیانیان ڤایرۆسی G یان تیادا دەستنیشانکرا .
- لە 63 زەردوویداری C دا 6 نەخۆشیان ڤایرۆسی G تیادا دۆزراوەتەوە .
- لە 100 ئایدزداردا 12 نەخۆشیان ڤایرۆسی G تیادا دۆزراوەتەوە

وەلێ تا ئەمڕۆ روون نەبۆتەوە ئایا ئەم ڤایرۆسە دەبێتە هۆی زەردوویی هەڵچو یان نا

لە توێژینەوەیەکی نوێدا (یابان) کە لە سەر 286 زەردوویداردا کرا ( 14) ، 83 یان زەردوویی B ،188 زەردوویی C ، 3 زەردوویی B،C و 12 یان ڤایرۆسی جۆری non-A,non-B یان تیادا هەبوە، لە 19 نەخۆشیاندا GBV-CRNA دۆزراوەتەوە هەروەها لە هەمان توێژینەوەدا کە لە سەر 186 زەردوویداری درێژخایەندا کراوە ، 64 یان بازەڵە و شێرپەنجەی جگەریان بووە ، 19 یان GBV-RNA یان تیادا دەرکەوتوە (41) .

**چارەسەرکردن**

ئینتێرفێرۆن مادەیەکە کەم یان زۆر کار دەکاتە سەر ڤایرۆسەکان ، یەکێك لەو ڤایرۆسانەی زەردوویی جۆری C یە گەر بێت و بتوانین برێك لە Intron یان pegIntron یان بکەینە لەشی نەخۆشەوە ئەمە مانای ئەوەیە کە رێژەیەکی زۆر ئینتێرفێرۆن دەچێتە نێو لەشەوە کە نزیکە لەو رێژەیەی دەبوایە لەش دروستی بکردایە . زۆرجاران دەبێتە هۆی ئەوەی کە سۆکە زۆر کەم ببێتەوە لەوانەشە سۆکە چاك ببێتەوە گەر بێت وخەپلەی Rebetol یش لەگەڵ Intron A بەکاربهێنرێت ئەوا ئەنجامی باشترین دەدات بە دەستەوە .

**تێبینی :** خەپلەی Rebetol نادرێت بە ئافرەتی سکپڕ چونکە کاردەکاتە سەر ئاولەمەو لەوانەیە کەم وکوڕ بێت ، هەروەها دەرمانەکە نادرێت بە پیاوێك گەر پیاوەکە نیازی منداڵی هەبێت چونکە دەرمانەکە کار لە سپێرم دەکات .

**چارەسەرکردنی زەردوویی تولانی جۆری C**

ئەوەی شایانی باسە لە 15-20٪ ی ئەو کەسانەی تووشی زەردەسۆی توندی جۆری C دەبن خۆیان چاك دەبنەوە هاوکات لە 70-80٪ یان رێرەوی سۆکەیان بەرەو باری درێژخایەنی گەشە دەکات .

ڤایرۆسی HCV سێ جۆر Genotyp ی هەیە وەك:

- جۆری Genotyp-1 لە هەموو جیهاندا بڵاوە
- جۆری Genotyp-2,3 لە سویدا بڵاوە .

نزیکەی 40 هەزار تووشبو بەم جۆرە ڤایرۆسە لە سویددا هەیە. ئەوەی راستی بێت Genotyp و HCVRNA بڕیار لەسەر چۆنیەتی چارەسەرکردن دەدەن . دوو دەرمان دژی ئەم هەوکردنە چەسەندکراوە ئەوانیش بریتین لە دوو شێوەی IFN و (Peg IFN) و Ribavirin

* دەرمانی Peg IFN

دەرمانێکی لەسەرخۆیە نزیکەی هەفتەیەك لە نێولەشدا کاردەکات و دەمێنێتەوە . لەبەرباشی کاری درێژخایەنی دەرمانەکە هەفتەی ژەمێك بۆ ماوەی یەك ساڵ دەدرێت بە نەخۆش .

* دەرمانی Ribavirin

هەرچەندە ئەم دەرمانە راستەوخۆکارناکاتە سەر ڤایرۆسەکە بەلاّم کارێکی فراوانی هەیە بە تایبەتی لەسەرسۆکە .

پێویستە ئەم دەرمانە تەنیا لە گەلّ IFN تێکەلّ بکرێت وەك خەپلە رۆژانە بە پێی کێشی لەش دەدرێت بە نەخۆش .

تێکەلّکردنی ئەنتیڤایرۆسەکان .

باشترین ئەنجامی دەستکەوتوو پاش تێکەلّکردنی ئەنتیڤایرۆسەکان بریتییە لە چارەسەرکردن بە IFN دژی زەردەسۆی جۆری C . ئەم دەرمانە هەفتانە 3 جاران بۆ ماوەی یەك سالّ ئەدرێت بە زەردوویپیدار . هاوکات تێکەلّکردنی دەرمانی IFN وRibavirin ئەنجامەکەی 2-3 جاران باشتر کردووە . ئەو نەخۆشەی Genotyp 2,3 یان هەیە ئەنجامی تێکەلّکردنەکە زۆر باشتربوە وەك لە جۆری Genotyp-1 . ئەنجامی توێژینەوەکان ئەو راستییەیان سەلماندوە تێکەلّکردنی Ribavirin لە گەلّ ژمێکی بەرزی PegIFN دا ئەنجامی باشیان داوە بە دەستەوە. ئەوەی شایانی باسە لە توێژینەوەیەکی نوێی سالّی 2004 دا سەلمێنرا کە تێکەلّکردنی هەردوو دەرمانی Pegasys و Copegus دەبێتە هۆی چاکبوونەوەی لە 62٪ ئەو ئەیدزدارانەی هاوکات ئەم جۆرە ڤایرۆسەیان تووشبووە .

## زەردوویی جۆری دێلتا

**ڤایرۆسی دیلتا**

یەکەمجار لەسالّی1977 دا (ریزێتۆ) ی ئیتالیایی باسی ئەم ڤایرۆسەی کردوە و پاشان ڤایرۆسەکە لە جیهاندا ناسراوە . ڤایرۆسی دیلتا زۆر گچکەیە و لە تاکە ئەنتیجینێکی پرۆتینی HDAg کەلە دەرەوە بە توێکلێکی HBsAg ی دەورەدراوە و دەکەوێتە Genome ی ڤایرۆسەکەوە و ئەمیش لە RNA ی هێلّدار ‌روست بوە . تیرەی ڤایرۆسەکە لە نێوان 35- 37 نانۆمیتردایە و کارەکانی خۆی چالاکانە ئەنجام دەدات .

ڤایرۆسەکە پێویستی بە ڤایرۆسی B هەیە (واتە ڤایرۆسەکە تووشی ئەو کەسانە دەبێت کە هەلّگری ڤایرۆسی جۆری B ن لە بەر ئەوە زۆر جیاوازە لە ڤایرۆەکانی دی) . لە قۆناخەکانی پێش سۆدا ڤایرۆسەکە لە نێو خوێندا دەجولّێت ، وەلّ زەرداوی خوێنی نەخۆش ڤایرۆسەکە دەگوێزێتەوە و بۆ یەکێکی دی . بەم شێوەیە ڤایرۆسەکە لە نێو جگەردا دەمێنێتەوە و دەبێتە هۆی زام کە چاکبوونەوەی زۆر گرانە . ڤایرۆسەکە دەبێتە هۆی سۆی کوتوپڕ و تولانیش . ئەگەر لە خوێندا دژەتەنی دژ بە ڤایرۆسی دێلتامان دەستنیشان کرد ئەوا دەزانین کە مرۆڤ تووشی ڤایرۆسەکە بووە .

رێژەوی بلاّوی نەخۆشییەکە ڤایرۆسەکە لەدنیادا بلاّوە بە تایبەتی لە ئیتالیا و ناوچەکانی دەریای سپی ناوین و باکوری ئەفەریقا و رۆژهەلاّتی ئەورپاو ئەمێریکای باشوردا . بە تەنیا لە باشوری ئیتالیادا رێژەی زەردوویی دێلتا لە نێوان 8- 20٪ دایە هەروەها ڤایرۆسەکە لە ئەورویا و ولاّتانی سکەندیناڤیادا بە رێژەی 2٪ دا هەیە و زیاتر لە نێوان پەنگ کێشەکاندا (ئەوانەی کۆکاین و پێکهاتوەکانیان بە دەرزی لەخۆ دەدەن) بلاّوە.

**ڕێگاکانی گواستنەوە**

هەروەکو ڕێگاکانی گواستنەوەی جۆریB ی وایە حوێن وپێکهاتوەکانی خوێن ڕۆڵی سەرەکی دەبینن لە گواستنەوەیدا. جاری واش هەبووە کە لە نێوخێزانیکدا نەخۆشێك ئەوانی دی تووش کردوە .

هەروەها دایك دەتوانێت پێش لە دایكبوون کۆرپەلەی خۆی تووش بکات (واتە کاتێك کۆرپەلە لە نێو پزداندایە)

**نیشانەکان**

ماوەی کڕکەوتنی ڤایرۆسەکە لە نێو 3-6 هەفتەدایە . لە وانەشە هەندێك جار نەتوانین تێکەڵبوونی سۆیەکی ڤایرۆسی D لە زەردوویییەکی تێکەڵ بە هەردوو ڤایرۆسی HBV+HDV جودابکەینەوە .

نیشانەکان لەسەر تێکەڵ بوون ( لەگەڵ ڤایرۆسی B) دا یان پیس بوونی سۆکە وقۆناخی سۆکە بەندە . بەگشتی زۆر بەنارەحەت دەست نیشان دەکرێت . وا دەرکەوتووە لە ئەوروپادا 39٪ ی ئەو کەسانەی کە ڤایرۆسی دێلتایان لەخوێندا دەستنیشانکراوە هاوکات تووشی زەردووی B جۆری هەڵچووبوون . لە ڕادە بەدەر زێدبوونی بیلیرۆبین و ئەنزیمەکانی جگەر ئەوە پیشان دەدات کە نەخۆش تووشی هەردوو ڤایرۆسی B و D بوویێت .

تێبینی: گەر ئەنزیمەکانی جگەرو بیلیروبین 2 ئەوەندە بەرزببنەوە ئەوا پێویستە پزیشك گوومان لەسۆیەکی دوو ڤایرۆسی بکات . سۆ بەم دوو ڤایرۆسە دەبێتە هۆی دروستبوونی زەردوویییەکی زۆر کوتوپڕ بە نێوی زەردوویە هەڵچوەکان . زۆر جاران ئەم جۆرە زەردوویە بە دوو قۆناخدا تێدەپەڕێت و دەبێتە هۆی دوو ئەوەندە زێدبوونی ئەنزیمەکانی جگەر ماوەی کڕکەتنی ڤایرۆسی دێلتا دیاری کراوە چونکە ڤایرۆسی B لەگەڵ میزدا دەکرێتە دەرەوە هەرکاتێك سۆ بە ڤایرۆسی دێلتا بەرەو پیس-بوون بڕوات ئەوا مەترسی لەسۆی ڤایرۆسیB پەیدادەبێت .

لە وانەشە هەڵگرێکی ڤایرۆسیB کە تووشی دێلتا ببێت چاك ببێتەوە بەڵام ڤایرۆسی B هەر بەردەوام دەبێت ، دەکرێتە دەرەوە یان نەخۆش دەمرێت .

**درمی ڤایرۆسەکە**

لەسەرەتای سۆکەدا خوێنی نەخۆش زۆر ڤایرۆسی تێدایە و هەمیشە خوێنەکەیان ڤایرۆسەکەی تێدا دەمێنێتەوە .

**ڕێڕەوی نەخۆشیەکە**

نزیکەی 2-20٪ ی تووشبووان بەم جۆرە زەردوویە دەمرن . پاش تریش 60-70٪ ی تووشبووانی ئەم جۆرە زەردوویە تووشی رزینی جگەردەبن.

**دەستنیشانکردن**

دەستنیشانکردنی ئەنتیجینی IgM anti-HD.HDAg لەپلازمای خوێندا و لە سەرەتای سۆکەدا نیشانەی سۆیەکی کوتوپڕە بەڵام دەستنیشانکردنی IgM anti-HD نیشانەی سۆیەکی تولانییە . لەکاتی پەیدابوونی زەردوویی دێلتای تولانیدا دژە تەنی سۆیەکی ڤایرۆسی B واتە ( HBsAg) پۆزە تیڤ دەبێت .

هەروەها دەتوانین دژە تەنی دژی ڤایرۆسی دێلتا واتە ( antiHD) لەپلازمای خوێنی نەخۆشدا دەستنیشان

بکەین . بۆ دڵنیابوون لە سۆی دیڵتا پێویستە دژە تەنی HDV یان RNA لە پلاسمای خوێنی نەخۆشدا هەبێت .

**چارەسەرکردن**

بەگشتی دەرمانی ئەلفا ئینتێرفیرۆن باشترین ئەنجامی داوە بەدەستەوە و پێویستە هەفتەی 3 ژەم بۆ ماوەی 3-6 مانگان بدرێت بە نەخۆش .

## زەردوویی جۆری E

**ڤایرۆسی E**

ڤایرۆسێکە لە جۆری RNA سەربە خێزانی Calcivirus ە تیرەکەی لە نێوان 27 –32 نانۆمیتردایە. ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسەکە لە نێوان 2-9 هەفتەدایە . لە ماوەی کرکەوتن وقۆناخی یەکەمی سۆکەدا دەتوانین ڤایرۆسەکە جودابکەینەوە . بەلآم دژەتەنی دژ بە ڤایرۆسەکە لە قۆناخە کوتوپڕەکاندا دەردەکەوێت .

**رێگاکانی گواستنەوە**

ئەم ڤایرۆسە وەك ڤایرۆسی جۆری A بە رێگای سوڕی دەم- پیساییەوە دەگوێزرێتەوە و ئەمیش دەبێتە هۆی درمە زەردوویی. ئەم جۆرە زەردووییە لە هیندستان ، پاکستان ، رووسیا ، چین ، ناوەڕست و باکوری ئەفەریقا ، پیرۆ و مەکسیکدا بەدی کراوە .

لە زۆربەی بارەکاندا ڤایرۆسەکە بە هۆی ئاوی پیس بوو بە ڤایرۆسەکە بلأودەبێتەوەو بە زۆری لاوان تووشی دەبن زۆرجاریش رێژەی مردن لە نێوان 1-2٪ دایە وەلێ رێژەی مردن لە نێوان ژنە سکپڕەکاندا دەگاتە 20٪ ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسەکە نزیکەی 6 هەفتەیە . نیشانەکانی ئەم جۆرە زەردووییە هەروەك نیشانەکانی زەردوویی جۆری A یە . زۆرجاران ئەو کەسانەی تووشی ئەم زەردووییە دەبن تەمەنیان لە نێوان 20-30 سالأندایە . لە کاتی سۆکە بەم ڤایرۆسە کوتوپڕ ئەم نیشانانە لە نەخۆشدا دەردەکەوێت ماندوویی و بێهێزی ، کەمبونەوە یان نەمانی ئارەزووی خۆراك خواردن ، ماسولکە ژانکردن هەروەها نەخۆش تووشی هێڵنجدان ورشانەوەش دەبێت .

**دەستنیشانکردن**

ئەم جۆرە زەردووییە لە ئەمێریکا و زۆربەی ولأتە ئەوروپاییەکاندا کەمە ، تەنیا گومان لەو کەسانە دەکرێت کە ئەو نیشانانەی سەرەوەیان هەیە و لە ناوچە درمییەکانەوە هاتوون یان گەڕاونەتەوە . لەم سالأنەی دواییدا تێستی سیرەمی ELISA توانیویەتی ڤایرۆسەکە دەستنیشان بکات هاوکات تێستی PCR دەتوانێت RNA HEV لە سیرەمدا دەستنیشان بکات .

**چارەسەرکردن**

لەوانەیە لە سۆی درێژخایەنەکاندا دەرمانی Ribavirin وInterferon وەك دژە ڤایرۆسێك کاربکەن .

# زەردوویی جۆری G

## ڤایرۆسی G

زەردوویی ڤایرۆسی G یان ڤایرۆسی GB-C دوو جۆر ڤایرۆسن کە سەر بەخێزانی Flavivirus ن . لە ساڵی 1995 دا دۆزراوەتەوە . دەتوانین بە هۆی تێستی PCR وە دەستنیشانی HGV RNA لە سیرەمی نەخۆشدا بکەین . زۆر گومان لەوە دەکرێت کە ڤایرۆسەکە بە هەردوو رێگای خوێن و هەروەها رێگای پیسایی-دەم دا دەگوێزرێتەوە و بڵاودەبێتەوە . لەزۆربەی بارەکاندا لە یابان و سوێدا ئەم جۆرە ڤایرۆسە لەو کەسانەدا دەستنیشانکراوە یان جوداکراوەتەوە کەخوێنیان داوە . جگە لەو ڤایرۆسانەی کە بە کورتی باسیان لێوە کرا هۆی دی هەن کە دەبنە هۆی زەردوویی گرنگترینیان (مەی) ە ، بەو جۆرە زەردووییەش دەگوترێت ( زەردوویی ئەلکهول) کە دووجۆرن :

- زەردوویی کوتوپڕی ئەلکهول: لەو کەسانەدا دەردەکەوێت کە لە ماوەیەکی کورتدا بە رێژەیەکی زۆر مەی دەخۆنەوە .
- زەردوویی تولانی ئەلکهول: لەو کەسانەدا دەردەکەوێت کە ماوەیەکی درێژ رۆژانە مەی دەخۆنەوە . لەم جۆرە زەردووییانەدا دەرکەوتووە کە هەندێکجار خانەکانی جگەر لەناو دەچن ودەمرن لەوانەشە جگەرتووشی زاماری و سۆی تێکەڵاو ببێت بەڵام مەرج نییە هەموو مەی خۆرێك تووشی گیروگرفتی زەردوویی سۆی خانەکانی جگەر ببێت

### ئاڵۆزکارییەکانی زەردووییە کوتوپڕەکان

زەردوویی جۆری B لە نێو مەی خۆر وپەنگ کێشەکاندا زیاترو بڵاوترە وەك لە نێو کەسانی تردا . تێکەڵبوونی سۆ بە ڤایرۆس ومەی دەبێتە هۆی بریندار بوونی خانەکانی جگەر . گەر مەی خواردنەوە کەمیش بێت لەلایەن ئەو کەسانەوە کە هەڵگری ڤایرۆسی B ن و زەردووییدارن ئەوا تەنیا برینەکانی سەر جگەر گەورە تر دەبن و پیس دەکەن . ئەو کەسانەی زەردووییدارن و مەی دەخۆنەوە ئەوا هێدی هێدی خانەکانی جگەریان دەمرن یان تووشی رزینی جگەر دەبن خراپتر لەو کەسانەی کە تووشی ڤایرۆسەکە نەبوون (I. 44) .

لە زۆربەی زۆری حاڵەتەکاندا گەر خێرا سۆ بە ڤایرۆسی B,C,D چارەسەر نەکرێت ئەوا سۆکە دەبێتە هۆی پەیدابوونی باری تولانی یان پیس بوونی سۆکە تا وای لێدێت زۆربە سەختی نەخۆشییەکە چارەدەکرێت یان زۆرجاریش هەر چارەی ناکرێت .

ئاڵۆزکارییەکی دی جگەر بریتییە لە گۆڕانکاری خانەکانی جگەر بۆ خانەی شێرپەنجەیی دروست دەکات ، هەر چەندە لەم ساڵانەی دواییدا بەهۆی دەرمانی (ئینتێرفیرۆن) ەوە چارەیەکی بۆ دۆزراوەتەوە ، بەڵام لە زۆر باردا نەخۆشییەکە دەبێتە هۆی مردنی نەخۆش .

ئاڵۆزکارییەکی دی زەردووییەکان بەتایبەتی جۆری B یان بریتییە لە باژەڵە ، لەم بارەدا قەبارەی سکی نەخۆش زۆر گەورە دەبێت و نەخۆش زۆر نارەحەت دەبێت و پێویستە ناو بە ناو سەردانی پزیشك بکات تاکو ئاوەکەی بە دەرزی لێدەربهێنرێت زەردووییە هەڵچوەکانیش جۆرێکن لە ئاڵۆزکارییەکی زەردوویی ڤایرۆسی B کە هەندێکجار دەردەکەون

**خۆپاراستن**

**بۆ خۆپاراستن پێویستە پەیڕەوی ئەم ڕێگایانەی خوارەوە بکرێت**

**1- خۆپاراستن لە ڤایرۆسەکە**

- زانیاری دان دەربارەی چۆنیەتی بڵاوبوونەوە و بەرگری تەشەنەکردنی ڤایرۆسەکان .
- کوتان بە دەرزی ئیمونۆگلۆبولین .
- خوێن وەرنەگرتن لە کەسانی نەناسراو بێ تێست کردنی خوێنەکە لە تاقیگادا
- بەکارهێنانی کۆندۆم لە کاتی پەیوەنی زایەندیدا (بۆ خۆپاراستن لە ڤایرۆسی جۆری B,C,D) .
- پاکژکردنی دەرزی وکەلوپەل میتالیەنەخۆشخانەکان وکوڵاندنیان لە 60 پلەدا .
- کەمکردنەوە یان پەیوەندی نەکردن بە نەخۆشانی بەشی دابڕاوە .
- بەکار نەهێنانی کەلوپەل نەخۆش لە لایەن کەسانی ساغەوە .
- پاکو خاوێنی گشتی مرۆ و گشت کەلوپەلێکی نەخۆش .

**2- خۆپاراستن لەکاتی چارەسەرکردندا**

- لە کاتی چارەسەرکردندا نابێت خوێنی تێست نەکراو بدرێت بە نەخۆش .
- بەکارهێنانی کۆندۆم لە کاتی پەیوەندی زایەندیدا.
- ڕێزگرتن لە پلانی پزیشك و پارێز لە خواردن .
- تێکەڵ نەکردنی نەخۆش لە گەڵ نەخۆشی دی دا تا زوو چاك ببێتەوە .
- پێویستە نەخۆش لە نەخۆشخانە بکەوێت وبمێنێتەوە تا چاك دەبێتەوە .
- پاکو خاوێنی ، ماندوو نەکردن ، قەدەخەکردنی مەی ، مەریوانە ، کۆکاین و پێکهاتوەکانی و جگەرە لە نەخۆش .

**3- کوتان دژی زەردوویی بۆ خۆپاراستن**

**ئەو دەرمانەی ( دەرزی) کەلە ئیمونۆگلۆبین پێکهاتوە و anti-HAV تیادایە زۆر کاریگەرن دژی زەردوویی جۆری A .**

- زۆر لە مێژە لە زەرداوی خوێنی تووشبوی زەردوویی B دا کوتانێك دەرهێنراوە ( کە 3 دەرزییە) مانگێك پاش یەکەم کوتان دووەمجار مرۆڤ دەکوترێت وسێیەم کوتانیش پاش 6 مانگان دەدرێت لە ماسولکەی بازوو .
- تا ئەمڕۆ زەردوویی جۆری Delta E,C کوتانیان نییە . نزیکەی 13 کوتان دژ بە زەردوویی جۆری B هەیە ، گرنگترینیان ئەمانەن :

1- دەرزی Engerix-B لە شێوەی دەرزیەکی یەکجاریدایە .
2- دەرزی H-B-Vax ئەمیش لە شێوەی 10 مایکرۆگرامدایە .
3- دەرزی HBIG لە هەموبارەکانی زەردووییB دا دەتوانرێت بدرێت لە مرۆڤ

**پێویستە بەپلەی یەکەم ئەم کەسانە خۆیان دژ بە زەردوویی جۆری B بکوتن:**

# دانساز ، پزیشکی ددان ، ئەو کەسانە لە تاقیگەکاندا مامەڵە لەگەڵ خوێن دەکەن .
# نێرباز ، داوێن پیسەکان (کەهاوسەری زۆریان هەیە) یان نەخۆشییە درمە زایەندییەکانیان تووش بووە .
# ئەو کەسانەی خەڵکی ئەو ناوچانەن کە ئەم جۆرە زەردووییەی تیادا بڵاوە .
# ئەو کەسانەی لە خوێنهێنەرەوە مەریوانە و کۆکاین و پێکهاتوەکانی تری تلیاك وەردەگرن .

# ئەو کەسانەی نەخۆشی هێمۆفیلیا یان هەیە ، یان هێمۆدیالیسا یان دەکەن .

# ئەو کەسانەی کە گەڕۆکن و پەیوەندی زایەندی فرەیان لەگەڵ کەسانی تردا هەیە .

# ساوای تازە لە دایك بووکاتێك زەرداوی خوێنی دایکی HBsAg پۆزەتیفە .

# ئەو کەسانەی لە ئەنجامی رووداوێکدا دەرزی خوێناوی یان لە نەخۆشخانە دا دەرزیەکی خوێناویان پیادا دەچێت .

سەرچاوەکان

1- د.زاهیر سوران . جگەر و زەردووییە توندە ڤایرۆسییەکان ، سوید، 1996 .

سەرچاوەکان

References
1.Viral Hepatitis,Aglobal health problem ,Wellcome.England
2.Feinstone Smetal., Hepatits A;Detction by immune lectro microscopy of a virus- like antigen association with acut illness, Science 182:1026,1973.
3.Gunter S;Virology of Hepatitis A:In Zuekerman A J (ed) ;Viral Hepatits and Liver Disease New Yourk Alan R Liss .1988, 3
4 .Rizzeto M et al Hepatits Delta Virus infection : Clinical and Epidemiological aspectes , In : Viral Hepatitis and Liver Disease New Yourk Alan R Liss 1988 ;389 .
5.Krugman Setal; Thenatural Hictory of Imfectious hepatitis ,Am J Med 1962;32:717.
6.Papaevangeiou Geya I; Delta infection with hepatits ,B, Lancet II :1983.917.
7. Hoofnagle J Het al; Type B hepatitis alter trnsfusion with blood containing antibody to hepatitis B corw antigen N Eng J Med 1987;298 : 1379.
8.William S. Robinson Hepatitis B virus & Hepatitis D virus: In: Principles and Practice of infectious Disease. Vol. 2.Fourth Edition.1995; 1406-1434.
9.Manule Battegay, Ian D.Gust, Stepen M. Feinstone Hepatitis A virus: In: Principles and Practice of infectious Disease. Vol. 2. Fourth Edition.1995; 1636-1662.
10.Stanlen M. Lemon, Hepatitis E virus: In: Principles and Practice of infectious Disease.4 th eds.1995; 1663-72.
11.Abram S.Benson,Editor: control of communicable diseases in Man, 15 th edition, American public Health Assn., USA 1990.
12.Viral Hepatitis; In Harrison, Principles of internal medicine, vol.2 international edition; 1991, 1322-1337.
13.R.L.Souham, textbook of Medicine, 2 nd ed, London 1994.
14.Morage C.Timbury, Notes on Medicine Virology, 10 th edition, UK 1994
15.P.R.Murray et al, medical Microbiology, Second edition, UK 1994
16.D.J.Weatherall et al, oxford textbook of medicine, Third edition, Section 21 STD and Sexual Health, UK 1995.
17.Esteban J I et al; hepatitis C virus antibodies among risk groups in Spain, J Hepa 1989, 6:201.
18.Van der Poel CL et al; anti-hepatitis C antibodies and non-A, non-B post transfusion hepatitis in the Netherlands. Lancet: 1989; 297.
20.Ticehurst J. Identification and characterization of hepatitis E virus. In Holinger FB, Lemon SM, Margolis HS, Eds. Baltimore: Williams & Wilkins; 1991,501-13.
21.Maim GH. Voiculescu, Infectious Disease, vol. 2. Editura Medicala, Bucharest 1990.
22.Tiollasis P, Pourcel C, Dejean A. The hepatitis B virus. Nature 1985; 317 489.
23.Kraweynski K. Hepatitis E. Hepatology. 1993; 17:932-41.
24.Rizzetto M. The delta agent. Hepatology. 1983; 3; 729.
25.Carey WD, et al. Viral Hepatitis in The 1990 s part III: Hepatitis C, Hepatitis E and other viruses, Cleve Cli J Med. 1992; 59:595-601.
26.A Clinical Guide to Hepatitis, ABBOTT, Diagnostic Division, July 1993/5. Germany.
27. Hepatitis Learnar. Second Edition Abbott Laboratories, Abbott Park Ilinois, USA 1994.
28.principles in practice Testing for Viral Hepatitis Abbott Diagnoses, USA 1992.
29.Gorden R. Dreesman, Georgory R. Reyes,. Hepatitis, In Encyclopedia of Microbiology, 1992, 371-79.
30.Hollinger, F.B.et al. Hepatitis B virus, In: Virology. Vol. 2, 1990; 2771-2236.
31.Standford T. Smulman, Viral Hepatitis, In: Infectious Disease 4 th eds, 1997; 19:281-95.
32.Mario Rizzetto et al. Epidemiology of Hepatitis Delta virus overview; The Hepatitis 1991
33.Lemon SM, Sh spiro The Value of immunization against hepatitis A. Infect Agents Dis. 1994; 3:38-49.
34.Lemon SM.In activated hepatitis A vaccines.JAMA.1994; 271 363-4.
35.Stanle M. Lemon and David L. Thomas, Vaccines to Prevent viral hepatitis .New Eng. J Med. 1997; 336:196-204.
36.Hepatitis Surveillance. Report no. 56. Atlanta: CDC. 1995.
37.Jermo B. Zeldis and Clyde S. Crumpacker. Hepatitis. In: Infectious Disease of the fetus newborn infant, 4 th eds. W. B. Saunders Company. 1995; 20:805-829.

38.Tobes Allander .Hepatitis virus infection molecular analysis of transmission and immunity. Karolinska institute. Stockholm. 1997; 5-15
39.John McConnell. Jury still out on verdict for hepatitis G virus. Lancet 1997, 349.857.
40.Miriam Alter. HGV infection in US patient with community acquired acute hepatitis. N Eng .J Med. 1997; 336 741-46,747-54.
41.Yoshiki Sugai et al. Infection with GB virus C in-patients with chronic liver disease. J Med. Virolo. 1997: 51.175-181.
42.MMMR. prevention and control of infections with hepatitis viruses in correctional setting, Jan 24.2004, vol 52.RR.1.
43. CDC, Hepatitis surveillance raport nr 58 2003.
44.Rekommendationer, behandling av kronisk hepatit C hos vuxna och barn, information.nr.6, okt.Stockholm. 1999, s. 5-7
45.Rekommendationer, behandling av kronisk hepatit C hos vuxna och barn, information.nr.4, jul .Stockholm. 2001, s. 5-9.
46.Två nya behandlingsrekommendationer för antiviral behandling av HIV-infektion, information.nr5.okt.Stockholm 2002.s.9-20, 55-60.
47.Ingrid Uhnoo, antivirallekämedels möjligheter och begränsningar, Medicament, nr.2, mars, stockholm 2003, s.24-29.
48.Ingrid Uhnoo, läkemedel mot virus –vad finns och vad behövs?, Medicament, nr.3, april.
49.Stefano Vella &Marco, antiviral therapy. infectious diseases, vol.two.Mosby.USA.2000. section 5, HIV and AIDS, p.26.1-26.10stockhol. 2002 s 22-37

## سکچوونه ڤایرۆسییەکان

بریتین لەو ڤایرۆسانەی کە لە جیهاندا دەبنە هۆی گیروگرفتی گەدە ، ریخۆڵە و بە تایبەتی سکچوون . گرنگترینیان بریتین لە:

– رۆتا ڤایرۆس (Rotavirus) .

– ئەدێنۆڤایرۆس (Adenovirus) .

– ئەسترۆڤایرۆس (Astrovirus) .

– کالیسڤایرۆس (Calisvirus) .

جگە لە بەکتریا و پاراسیت ئەو ڤایرۆسانەی سەرەوە هۆیەکی دی سکچوونن بە تایبەتی لە منداڵی ساوادا .

## سکچوون بە رۆتاڤایرۆس

ئەوەی لێرەدا دەمەوێت ئاماژەی پێبکەم و تایبەتە بە باسەکەمان بریتییە لە (رۆتاڤایرۆس) کە ساڵانە نزیکەی 111 ملێۆن منداڵ تووشی سۆی کوتوپڕ دەکات و نزیکەی 25 ملیۆنیان روو دەکەنە نەخۆشخانە بۆچارەسەرکردن ، لەمانە 2 ملیۆنیان چارەسەر وەردەگرن و نزیکەی 440 هەزاریان بە هۆی ئاڵۆزبوونی هەو کردنەکەوە دەمرن . هەندێك پسپۆر دەبێژن کە لە دنیادا لە هەر خولەکێکدا یەك منداڵ بەم ڤایرۆسە دەمرێت .
رۆتاڤایرۆس کۆمەڵێك ڤایرۆسن لە جۆری RNA دەبنە هۆی سۆکردنی گەدە و ریخۆڵەسۆ. ڤایرۆسەکە شێوەی بازنەییە دوو ناوکە کاپسیدو genom ی هەیە . تیرەی ڤایرۆسەکە لە نێوان 70–75 نانۆمیترە و 3 پرۆتینی هەیە و تەنیا دووانیان دەبینرێن و ئەمەش تایبەتە بە رۆتاڤایرۆس .

ڤایرۆسەکە لە هەموو جیهاندا بلاوە وهۆی سەرەکی سکچوونی منداڵە بە تایبەتی لە تەمەنی 6- 24 مانگیدا . ئەم ڤایرۆسە لەساڵی 1973 دا دەستنیشانکراوە . لە ولاّتە پیشەسازییەکاندا لە 50٪ ی هۆی سکچوون لە منداڵدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم ڤایرۆسە .

**جۆرەکانی ڤایرۆسەکە**

* رۆتا ڤایرۆسی A ، نزیکەی بە رێژەی لە 90٪ هەن و 4 جۆری سیرەمی هەیە بە رێگای پیسایی- دەم دا ڤایرۆسەکە لە یەکێکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ یەکێکی دی ، ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسەکە لە نێوان 1- 3 رۆژدایە .

**نیشانەکان**

سەرەتا نەخۆشییەکە بە ڕشانەوە دەست پێدەکات پاش 2 رۆژان سکچون دەردەکەوێت کە لە شێوەی ئاودایە ، نەخۆشیەکە 4- 6 رۆژان دەخایەنێت و جاری واشە دەکاتە 3 هەفتە .

* رۆتا ڤایرۆسی B ، تا ئەمڕۆ لە چین دا بینراوە و زیاتر لاوان وپیران تووشی سکچوونی کولێرایی دەبن .

* رۆتا ڤایرۆسی C ، زێدە تر لە باکوری ئەوروپادا هەیە و منالأنی قوتابخانە و لاوان تووش دەبن . لە سوێددا نەخۆشییەکە بە رێژەی 35٪ دەبینرێت .

**دەستنیشانکردن**

بەهۆی تێستی ELISA وە دەتوانین ئەنتیجینی ڤایرۆسەکە دیاری بکەین هەروەها بە هۆی میکرۆسکۆبی ئەلکترۆنیەوە دەتوانرێت ڤایرۆسەکە بناسرێتەوە .

**چارەسەرکردن**

بریتییە لە پڕکردنەوەی کەمی شلەو کالسیۆم و پۆتاسیۆم و کانزای نێو لەش . گەر نەخۆش برێك شەکرو خوێیاو بخواتەوە لەوانەیە چارەسەری ناتەواوی ئەو شلەو مادانە بکات .

**کوتان**

لە سەرەتای ساڵی 2006 دا (4) ئەنجامی دوو توێژینەوەی نوێ یەکێکیان توێژیارانی ئیسپانی و سوێدی ئەنجامیان دابوو کە نزیکەی 77 هەزار منداڵی لە خۆگرتبوو ئاماژەیان کرد کە کوتانێکی نوێیان دروست کردووەو لە 85-98 ٪ بەرگری دەداتە منداڵ بۆ ئەوەی تووشی ڤایرۆسەکە نەبن . ئەو دوو کوتان نوێیە لە شێوەی دلۆپ دان و نێویان (Rotarix & Rotateq) ە و یەکەمیان پەسەندکراوە کە بدرێت بە منداڵ و ئەوی تریان واچاوەڕوان دەکرێت لە ناوەڕاستی هاوینی 2006 دا بکەوێتەوە بازاڕەوە .

**تێبینی:**

رۆتاڤایرۆس لە بەشی پزیشکی گیانەواریدا زیاتر بایەخی پێدراوە .

**سەرچاوەکان**

**References**

1. Maim GH. Voiculescu, Infectious Disease, vol. 2. Editura Medicala, Bucharest 1990.
2. Tomas Bergström, Virusinfektioner, klinik, diagnostil och behandling Göteborg. 1997.
3. American Academy of Pediatrics.Rotavirus Infections.In: Peter G.ed.1997 Red Book:Report of the Committee on Infectious Diseases.24th ed Elk Grove Village,IL: American Academy of Pediatrics:1997:454
4. Roger L. Glass et al. The New England Journal of Medicine, vol 325: 23-33, jan 5 2006 nr.1.

# بەشی هەشتەم

## نەخۆشییە ڤایرۆسییەکان

1- ڤایرۆسی تامیسکی ئاسایی
2- ڤایرۆسی تامیسکی زاووزێ
3- سۆی زۆستەر (تەپخاڵ)
4- سۆی مۆنۆنوکلیۆس (نەخۆشی ماچ)
5- مێکوتە (ڤاریسێلا)
6- سۆی ڤایرۆسی سیتۆمیگال
7- ڤایرۆسی تامیسکی جۆری شەشەم (HHV-6)
8- ڤایرۆسی تایسکی جۆری حەوتەم (HHV-7)
9- ڤایرۆسی تامیسکی جۆری هەشتەم (HHV-8)

## ڤایرۆسە تامیسکییەکان

### پێشەکی

ڤایرۆسە تامیسکەکان کۆمەڵێك ڤایرۆسن زۆر لەمێژە ناسراون، مرۆ تووشی چەندان نەخۆشی دەکەن. لەنیوەی دووەمی سەدەی رابردوودا پاش ئەنجامدانی ژمارەیەك توێژینەوەی زانستییانە دەربارەی ڤایرۆسە تامیسکەکان و هەوکردنەکان روونکرایەوە کە ڤایرۆسەکان جیاوازن. هەوکردنەکان لەسەرخۆن و بەردەوامن، زۆرجاران هەندێکیان دەردەکەونەوە و نیشانەکانیان لە نیشانەی شوێنی، خانەیی، ئۆرگانی و تامیسکی گشتیدا دەردەکەون.

ئەوەی راستی بێت تا ئەمڕۆ نزیکەی 80 جۆر ڤایرۆسی تامیسکی دۆزراونەتەوە وەلێ زانستییانە سەلمێنراوە تەنیا 8-9 دانەیان مرۆڤ تووشی هەوکردنی جودا دەکەن. ڤایرۆسە تامیسکەکان زۆر بڵاون (هەندێك توێژەر لەنێو هەوکردنە ڤایرۆسە مرۆییەکاندا بەپلەی یەکەم دایاندەنێن) رۆژانەش رێدەتر بەرێژەی جیاواز لەهەموو جیهاندا بڵاودەبنەوە. لەزانستی پزیشکیدا هەوکردن بەڤایرۆسە هێرپسییەکان زۆر گرنگییان پێدراوە لەبەر ئەوەی رێگای گواستنەوەیان جیاوازە و دەبنە هۆی:

1- نەخۆشییە درمە زایەندییەکان (تامیسکی زاووزێ، نەخۆشیی مۆنۆنوکلیۆز، هەوکردنی سیتۆمیگال و ڤایرۆسی 7 و 8.
2- نەخۆشییە درمییەکان (مێکوتە و تامیسکی ئاسایی).

ئەوەی شایانی باسە هەردوو کۆمەڵە هەوکردنەکە بەشێکی گرنگی نەخۆشیداری نەخۆشییە هەوکردووەکانیان پێکهێناوە. گرنگیی ئەم کۆمەڵە ڤایرۆس و هەوکردنانە کاتێك زیادی کرد کە لەقۆناخێکی هەوکردن بە ڤایرۆسی HIV و نەخۆشیی ئەیدزدا وەك هەوکردنی تامیسکی دەردەکەون کە بە نەخۆشییە هەلپەرستەکان ناسراون.

**تایبەتمەندی سۆڤایرۆسییەکان**

- سۆکان لەسەرخۆن.
- سۆکان دەردەکەونەوە.

زۆرجاران لە تێستی سێری خوێندا نزیکەی لە 70-90٪ی گەورەساڵان هەڵگری دژەتەنی ڤایرۆسی تامیسکی یەکەمن. هەندێك ڤایرۆس وەك ڤایرۆسی تامیسکی ئاسایی 1، 2 و زۆستەرو مێکوتە چاکدەبنەوە وەلێ ڤایرۆسەکە لەلەشدا دەمێنێتەوەو پاش چەند مانگێك سەرلەنوێ دەبێتە سەرچاوەی تامیسکێکی نوێ یان دەبێتە هۆی نەخۆشیی زۆستەر.

لە ماوەی نێوان دەرکەوتنەکاندا ڤایرۆسەکە ناچالاکەو لەچەند خانەیەکی دەماردا دەمێننەوەو لەبەر ئەم هۆیەشە لەو ماوەیەدا بە نارەحەت یان هەر ناتوانین دەستنیشانی ڤایرۆسی تامیسك بکەین.

**مێژوو** (1، 2، 3، 47)

- نزیکەی 100 ساڵ پێش زاینن هێرۆدۆتوسی یۆنانی باسی تای تامیسکی کردووە.
- ئینگرنسیاسیس لەساڵی 1553 باسی نەخۆشیی مێکوتەی کردووە.
- ڤۆگێل یەکەم کەس بووە لەساڵی 1767 وشەی ڤاریسێلا (مێکووتە)ی نێوناوە.
- جان ئەسترۆك نوژداری شای فەرەنسا لەساڵی 1736دا یەکەم باسی لەسەر تامیسکی زاووزێ نووسیوە.
- ڤیلانو باتێمان یەکەم کەس بوون لەساڵی 1814 تامیسکی زۆستەریان لەهەرکردنی تامیسکی زاووزێو لێودا ناسییەوە.
- لەساڵانی 1888-1892دا ڤۆن بۆکای باسی مێکووتەی کردووە.
- سپروتو ئیڤاس لەساڵی 1921دا لە6 حاڵەتی تادا گەورەبوونی گرێ لیمفاوییەکانیان دەستنیشانکرد پاشتر بە(مۆنۆنوکلیۆز) ناسرا.
- گرالاند لەساڵی 1943دا روونیکردەوە کەتامیسکی زۆستەر ئەنجامی چالاکبوونەوەی ڤایرۆسی مێکووتەیە.
- ڤێلێر لەساڵی 1954 ڤایرۆسی ڤاریسیلای بەرێگای چاندن جوداکردووەتەوە.
- بورکێت لەساڵی 1958 ڤایرۆسی EBV لەلیمفۆمێکی سەرو ملدا ناسییەوە.
- ئیپستێنو هاوەڵەکانی لەساڵی 1984 تەنۆلکەی ڤایرۆسی EBV یان لەخانەو شانە وەرگیراوە نموونەییەکانی لیمفۆمی بورکێتدا ناسییەوە.
- سەلاحەدینو هاوەڵەکانی (ئەمەریکا) لەساڵی 1986 رایانگەیاند کەڤایرۆسێکی تریان لە6 نەخۆشدا جیاکردووەتەوەو لەکۆمەڵەی ڤایرۆسە تامیسکەکانەو پاشتریش ناوی HHV-6 ی لێنرا.
- لەساڵانی 1991-1992 دا ڤایرۆسی HHV-7 لەمرۆڤی لەشساخدا دەستنیشانکرا.

**شێوەی ڤایرۆسەکە**

ڤایرۆسی تامیسك ناوکە ترشی DNAی هەیە، تیرەی ڤایرۆسەکە لەنێوان 100-110 نانۆمیتردایەو هەریەکەیان لە 4 پێکهاتووی سەرەکی دروستبوون. ئەم کۆمەڵە ڤایرۆسە لە 3 کۆمەڵە ڤایرۆسی جیاواز پێکهاتوون کە مرۆ تووشی نەخۆشی دەکەنو ئەمانەن (1، 7).

***کۆمەڵەی Alphaherpesvirinae بریتین لە:**

- ڤایرۆسی تامیسکی ئاسایی Herpes simplex virus – 1 (HSV-1)
- ڤایرۆسی تامیسکی زاووزێ Herpes simplex virus-2 (HSV-2)
- ڤایرۆسی ڤاریسێلا زۆستەر Varicella zoster virus (VZV)

*** کۆمەڵەی Betaherpesvirinae بریتین لە:**

- ڤایرۆسی سیتۆمیگال Cytomegalovirus (CMV)
- ڤایرۆسی تامیسکی مرۆڤی جۆری شەشەم Human herpes virus-type 6 (HHV-6)

– ڤایرۆسی تایسکی مرۆڤی جۆری حەوتەم Human herpes virus-type 7 (HHV-7)

– ڤایرۆسی mouse cytomegalovirus 1 (لێرەدا لێی نادوێین)

*** کۆمەڵەی Gammaherpesvirinae بریتین لە:**

– ڤایرۆسی Epstein – Barr virus (EBV)

– ڤایرۆسی تامیسکی مرۆڤی جۆری هەشتەم Human herpes virus-type 8 (HHV-8)

**جۆرەکانی ڤایرۆسەکەو شوێنی سۆکە (1):**

– ڤایرۆسی تامیسکی ئاسایی دەبێتەهۆی: پوکەسۆو نێوپۆشەسۆی نێودەم، پەردەسۆی چاو، تامیسکی پێست، تامیسکی زاووزێ ، مێشکەسۆ.

– ڤایرۆسی تامیسکی زاووزێ دەبێتە هۆی: پوکەسۆو نێوپۆشەسۆی نێودەم، پەردەسۆی مەننگ، تامیسکی پێست، تامیسکی زاووزێ ، تامیسکی منداڵی ساوا.

– ڤایرۆسی ڤاریسێلا زۆستەر دەبێتە هۆی: نەخۆشیی مێکووتە (لەمنداڵو گەورەدا) ، زۆستەر (لەگەورەو تەمەنداردا).

– ڤایرۆسی ئێپستێن بار دەبێتە هۆی: نەخۆشیی ئاشقان، سۆی مۆنۆنوکلیۆزی کوشندە، لیمفۆمەی بورکێت، لێوکۆپلاکی مووداری نێودەم ، لیمفۆمەی خانەکانی B.

– ڤایرۆسی سیتۆمێگال دەبێتە هۆی: چاوەسۆ، سورێنچکەسۆ، سییەسۆ، زەردوویی، مێشکەسۆ.

– ڤایرۆسی تامیسکی مرۆڤی جۆری شەشەم دەبێتە هۆی: گوێیەسۆی ناوەڕاست ، تاو سوورکەی منداڵ.

– ڤایرۆسی تامیسکی مرۆڤی جۆری حەوتەم دەبێتە هۆی: سوورکەی منداڵ.

– ڤایرۆسی تامیسکی مرۆڤی جۆری هەشتەم: زۆر گومان دەکرێت رۆڵی لە سارکۆمی کاپوسیدا هەبێت.

**تێبینی: ڤیریۆن بریتییە لە تەنۆلکەی ڤایرۆس.**

## ڤایرۆسی تامیسکی ئاسایی

### ڤایرۆسی تامیسکی 1 (Herpes virus simplex)

**ئەم ڤایرۆسە دەبێتە هۆی تامیسکی لێوی سەروو و خواروو و لالغاوەکان**

**هۆزانی**

**ڤایرۆسێکە لەخێزانی ڤایرۆسی هێرپسە لەژێر خێزانی ئالفا هێرپس ڤایرۆس. تیرەی ڤایرۆسی تامیسکی ئاسایی نزیکەی 180 نانۆمیترەو ترشی DNA تێدایەو دوو جۆرن:**

*** جۆری یەکەم HSV-1، واتە تامیسکی ئاسایی، بە رێژەی لە 12٪ دەبێتەهۆی سۆ و برین لەسەروو نێوقەدەوە، سۆکە لێوەکان، پوک، چاو، کۆئەندامی ناوەندیی دەمار دەگرێتەوە.**

* جۆری دووەم HSV-2، واتە تامیسکی زاووزێ. بە ڕێژەی لە 88٪ دەبێتە هۆی سۆو برین لەخواروو نێوقەدەوە. سۆکە لەسەر کۆئەندامی زاووزێی دەرەوەی نێرو مێ دەردەکەوێت. ڤایرۆسەکە زۆر بەرگەی سەرماو هیشکی دەرەوە دەگرێت، وەلێ لەبەرزی پلەی گەرمادا هەستدارە (16).

**پەتازانی**

- ڤایرۆسی یەکەم، زۆر بلاوەو لە6 مانگییەوە تا 5-6 سالان تووشی منداڵ دەبێت، پاشتریش منداڵ دەبێتە سەرچاوەی سۆکەو ڤایرۆسەکەش دەبێتە هۆی سۆی تامیسکی جیاواز (12).

- ڤایرۆسی دووەم، لەتەمەنی هەرزەکاریدا (لەئەنجامی نەبوونی پاکوخاوێنیدا وەك لەکاتی نەخۆشییە درمە زایەندییەکاندا) دەردەکەوێت و لەتامیسکی کۆئەندامی زاووزێ لێپرساوە (20).

**ڕێگاکانی گواستنەوەی ڤایرۆسی 1و 2**

- پەیوەندیی ڕاستەوخۆ، دەمی (ماچکردن)، زاووزێیی (زایەندی)و بەدەگمەنیش لە ڕێگای دلۆپە ئاوی نێو کوونە لووت و گەرووەوە دەگوێزرێتەوە.

- پەیوەندیی ناڕاستەوخۆ، هەندێکجار تامیسك تووشی ئەو کەسانە دەبێت کە لەشوێنێکدا دەژین یان کاردەکەن وەك لەخێزنێکدا، لەنەخۆشخانەدا (کاتی بەکارهێنانی ئامێرو کەلوپەلی مێتالی ڤایرۆساوی پزیشکی).

- چاندنی گورچیلە ڕێگایەکی ترە بۆ گواستنەوەی جۆری دووەمی ڤایرۆسەکە.

**ماوەی تووشبوون**

ئەوەی ڕاستی بێت ماوەکە زۆر بەنارەحەت دیاردەکرێت چونکە زۆربەی زۆری تووشبوان بێنیشانەن و هەڵگری لەشساخی ڤایرۆسی جۆری یەکەمن.

جۆری دووەم لەشلەی نێو گولینکی ئەو ئافرەتانەدا یان لەکونی چووکی ئەو پیاوانەدا دەردەکەوێت کەزایەندی چالاکن.

بەلام ڕێژەی ڤایرۆسەکە لەبرینی تامیسك و تامیسکە نیشانەدارەکاندا نزیکەی 100 جار وەك لە تامیسکە بێنیشانەکاندا بەرزترە.

**شوێنی چوونە ناوەوەی ڤایرۆسەکان**: بریتییە لەپێست، ناوپۆشەکان (گەروو، کۆئەندامی زاووزێ) یان چاوە.

**تایبەتمەندیی سۆکە**: لەیەکەم سۆوە ڤایرۆسەکە لەخانەکانی لەشدا خۆیان جێگیر دەکەن و هەرچەندە ناوبەناو لەگەڵ میزو پیساییدا دەکرێتە دەرەوە، بەلام ڤایرۆسەکە هەر لەلەشدا دەمێنێتەوە (بەتایبەتی لەنێو لیمفەگرێکاندا)و لەوێدا دەچێتە قۆناخێکی لەسەرخۆوە، لەبەر ئەم لەسەر خۆییە زۆرجاران سۆکە دەردەکەوێتەوە زۆرجاریش تا مردنی مرۆڤ بەردەوامە.

**پێکهاتنی تامیسك**

چەند ڕۆژێك پێش دەرکەوتنی بلق یان برینێك شوێنێکی لەش (لالێو، لووت، لالغاوەو ئەندامی زاووزێ) دەخورێت. نزیکەی 2-3 ڕۆژ دواتر پێکهاتوویەك پێکدێت کەمێك دەکزێتەوەو دواتریش بلقێك دروست دەبێت کەشلەیەکی مەیلەو زەرد- سپی تیادایە بەپەردەیەکی زۆر تەنك و ناسك داپۆشراوەو بەئاسانی دەتەقێت. دوای تەقاندن و ونبونی بلقەکە شوێنەوار بەجێناهێڵێت، دروستبوون و کوێربوونەوەی بلقەکە نزیەکەی 10 ڕۆژ دەخایەنێت.

**یەکەم تامیسك**

ڤایرۆسی تامیسکی ئاسایی جۆری یەکەم دەبێتە هۆی زۆربەی ئەو سۆیانەی کەیەکەم جار لەتەمەنی منداڵیدا دەردەکەوێت. ئەم سۆیە ئاسانترەو تەنیا لە10٪ بارەکاندا دەبێتە هۆی نیشانە شوێنییەکان و گشتییەکان. ڤایرۆسەکە لە 2-12 رۆژدا کردەکەوێت.

هەندێك سۆی تامیسکی کەبۆ یەکەمجار دەردەکەوێت هەڵدەکەوێت کە رێڕۆیەکی سەختی ببێت بەتایبەتی لەمنداڵی ساواداو لەوانەیە ببێتە هۆی مردنی منداڵ. نیشانەکانی تامیسکە سەرهەڵدراوەکان زۆر ئاسانترە (بۆ ناسینەوە) وەك لە یەکەم سۆی تامیسکی.

**هۆی هەڵدانەوەی تامیسك**

لەم بارەدا هۆی چالاکبوونەوەی قۆناغی لەسەرخۆی ڤایرۆسەکە بەندە لەسەر: سەرما، نائارامی، خۆدانە بەرتیشك، پەلەپروزێ، بێنوێژی، نەخۆشییە تادارەکان (پەردەسۆی مێنینگۆکۆکی، ئینفلومنزا، سییەسۆ، مەلاریا... هتد).

چونکە ئەو بارو نەخۆشییانەی پێشتر ئاماژەکران دەبنەهۆی کەمبوونەوەو لاوازبوونی بەرگریی لەش دژ بەمیکرۆبەکان کە رێگاخۆشکەرن و هۆکاری یاریدەدەرن بۆ دووبارە دەرکەوتنەوەی سۆکە. گەر بێتو ڤایرۆسەکە بگاتە خوێن و بەخوێن و لیمفدا بگوێزرێتەوە بۆ ئەندامەکانی لەش ئەوسا مرۆ تووشی سۆی تامیسکی گشتی دەبێت کە هەموو لەش دەگرێتەوە.

**شێوەکانی تامیسکی ئاسایی**

**1- تامیسکی پێست**

هەموو کاتێك ڤایرۆسی تامیسك (لەهەر ئاستێکا بێت) دەتوانێت پێست تووش بکات بەتایبەتی لەسەر رووخسار، دەست و پێدا. هەردوو جۆری ڤایرۆسەکە 1 و 2 دەتوانن رووخسار تووشی تامیسك بکەن، بەڵام جۆری یەکەمیان زیاتر دەبینرێت.

**2- تامیسکی لاێو، لالغاوەو لالووت**

ئەم جۆرانە نیشانەکانیان باشتر دەدەکەون بەتایبەتی کاتێك تامیسکی سەرهەڵداوە بێت. ئەم جۆرە تامیسکە لەشێوەی بڵقدا دەردەکەوێت و کێم دەکات و پاش تەقاندنی بڵقەکە شوێنەوار بەجێدەهێڵێت، گەر بڵقەکان پیس نەبن بەبەکتریا ئەوا 7-10 رۆژ دەخایەنێت. هەندێك جار بڵقەکان لەشێوەی کۆمەڵێك بڵقدا (شەپۆلە بڵق) دەردەکەوێت.

**3- تامیسکی نینۆکی پەنجەکان**

لەساڵی 1924 دا (نیکۆلاو پۆینکلۆکس) لەسەر ئەم تامیسکەیان نووسیوە، زۆرجار ڤایرۆسەکە لەنەخۆشخانەدا تووشی کارمەندانی نەخۆشخانە دەبێت (وەك نەخۆشیی پیشەیی). نەخۆش هەست بەژان و کزانەوە دەکات و پاشتر بڵقێك لەپێستی پەیدادەبێت کەمێك رەقە. هەندێکجار پێویستە بە رێگای نەشتەرگەری بڵقەکە دەربکرێت کە لە 2-3 هەفتەدا چاك دەبێتەوە

**نیشانەکان**

لە نێو تامیسکە سۆییەکاندا ئەم خاڵانەی خوارەوە گرنگن (ئایا سۆکە یەکەمجارە یان سەریهەڵداوەتەوە، جۆری ڤایرۆسەکە، تەمەنی نەخۆش، شوێنی توێکاریی سۆکە)و رۆڵی تایبەتی لەچۆنیەتی دەرکەوتنی نیشانەکاندا دەبینن.

**- نیشانەی ناوپۆشەسۆی نێودەمو پووک**

تامیسکی نێودەمو سەرپووک زۆر گیروگرفت بۆ نەخۆش دروست دەکەن وەك: ئازار چەشتن لەکاتی جوین و قووتدانی خۆراکدا، سۆی بەکتریایی برینەکە، زیادبوونی لیك، بۆگەنکردنی نێودەمو ئاوسانی لیمفەگرێکان (28).

**- نیشانەی چاوەسۆ**

ئەوەی شایانی باسە لەپڕ چاو دەداتە ژان، پاشتر دەبێتە هۆی کزبوونی بینین. هەروەرها لەسەر سپێنەی چاو چەند پەڵەیەك پەیدا دەبێت ، زۆرجاریش سۆکە هەڵدەداتەوە، یان نەخۆش تووشی سووربوونەوەی یەکێك لەپێڵووەکانی (سەرەوە یان خوارەوە)ی چاو دەبێت.

**- نیشانەی شپرزەیی تامیسك**

کاتێك مرۆ تووشی نەخۆشییەك دەبێت لەلای گرنگ نییە، وەلێ کاتێك نەخۆشییە کۆئەندامی زاووزێ دەگرێتەوە ئەوسا مرۆ نائارامو شپرزە دەبێتو زۆرجاریش لەسۆکە رەشبین دەبێت. ئەوەی راستی بێت لەنێو سۆکاندا پاش سوزەنك سۆی تامیسکی زاووزێ بەپلەی دووەم دێتو ساڵانە نزیکەی 100 هەزار کەس لە ئەمێریکا تووشی ئەم جۆرە تامیسکە دەبێتو رۆژانەش لەزیادبووندایە. لە 80٪ی ڤایرۆسی جۆری دووەم هەڵدەداتەوە. لەژندا تامیسك دەکەوێتە سەر ملی زامان (رۆڵی لە دروستبوونی شێرپەنجەی زاماڵدا هەیە) ئەوانی دی لەسەر گولێنكو لێوەکانی گولینك دەبینرێت.

لە پیاودا زۆربەی بڵقەکان لەسەر پۆپەی چووکە (گلاندی پێنیان) یان لەسەر لەشی چووك دەردەکەون یان دەکەونە سەر دەوروبەری کۆم. لە هۆمۆرەگەزبازەکاندا تامیسك دەکەوێتە سەردەرچەی دەرەکی میز، میزڵدان یان رێکە.

**- نیشانەی نەخۆشیی تامیسك**

بریتییە لەسۆیەکی گشتیی تامیسکی (ژمارەی ڤایرۆسە لەخوێندا زۆر زیاد دەکات). زۆرجار لەئەنجامی سۆیەکی کوتوپڕی تامیسکیدا (لە 70٪ بەڤایرۆسی جۆری دووەم) تووشی منداڵی تازە لەدایکبوو دەبێت. لەم بارەدا (لەکاتی لە دایکبووندا) تامیسکی سەر لێوەکانی گولینکی (va[redacted]) دایك دەتەقن و پێکهاتووی نێو بڵقەکە لەزارو کونە لووتو چاوی زارۆکەوە دەچێتە ناوەوەو منداڵەکەی خۆی تووش دەکات.

**- نیشانەکانی تامیسکی شانەو نێوپۆشەکان**

کاتێك ژمارەی ڤایرۆسەکە لەخوێندا زۆر زیاد دەکات، ڤایرۆسەکە دەتوانێت جگەریش تووشی زەردوویی بکاتو خانەکانی سەر گورچیلە لە ناوبەرێتو هەروەها جومگەکانو سورێنچکیش تووشی هەوکردن بکات.

- نیشانەی دەماری

مێشکەسۆی ڤایرۆسی جۆری یەکەم زیادتر مەژی تووشی سۆ دەکات وەك لەجۆری دووەم. سەرەتا نەخۆش تووشی ژانەسەر، خەوالوویی، گەشکەو پاشتریش تووشی (لەهۆشخۆچوون) بێهۆشیی هەمیشەیی دەبێت، هەروەها نەخۆش تووشی گیروگرفتی قسەکردن یان دەروونی تر دەبێت، هەندێك جار نەخۆش تووشی لەرزین، شەپلەداری شوێنی یان گرژبوونی ماسولکەکان دەبێت. زۆرجار ئەم نیشانە دەمارییانە تەنیا لەمەرزەکارو گەورەدا دەبینرێت.

## ڤایرۆسی تامیسکی زاووزێ

### نیشانەکانی

1) سۆ

ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسەکە لەنێوان 3–20 رۆژدایە. ئەو شوێنەی کە بخورێت پاشتر دەبێت بەبرین، برینەکەش دەکزێتەوەو زۆر بەئازارە پاشان چەند بلقێك دەردەکەوێت و نێو بلقەکان شلەیەکی روونی تێدایە بەکۆمەل لەتەك یەکدان. پاش چەند رۆژێك شلەی روونی ناو بلقەکە لێل دەبێت و گۆیکەی بلقەکە پێست هەلدەدات و پاشتریش بلقەکە دەتەقێت و روویەکی گرنج گرنج بەجێدەهێلێت کە درەنگتر کوێر دەبێتەوەو نامێنێت.

- لە نێرینەدا برینەکە زیاتر لەسەر پۆپەو ملی نێوان پۆپەو بەشەی تری چووکدایە، زۆرجار ئەم سۆیە دەبێتە هۆی دەردانی شلەیەك کەزۆر بەئازارەو ژان دەخاتە دلی نەخۆشەوە.

- لە مێوینەدا برینەکە لەسەر گەورە لێوەکانی گولینك و دەوری کۆمدا دەردەکەون، لە 30٪ی نەخۆشەکان ئەم نیشانانەیان هەیە: تا، بێهێزی، ژانکردنی ماسولکەو ژانەسەر. لە 50٪یان لیمفەگرێکان دەئاوسێن و بەئازارن. لە 2–3٪ی ڤایرۆسەکان ئەندامی زاوزێ و مێشك تووش دەکەن.

2) جۆرە سەرهەلداوەکان

نزیکەی 70٪ی نەخۆشەکان تووشی سۆی زاووزێ و زایەندی دەبن و چاکیش دەبنەوە !

نزیکەی 30٪ی نەخۆشەکان ڤایرۆسەکەیان لەلەشدا دەمێنێتەوەو زوو زووش برینەکە لە هەمان شوێندا هەلدەداتەوە. ماوەی نێوان یەکەم برین و دەرکەوتنەوەی برینەکە لەنێوان 120 – 360 رۆژدایەو پاش 10 رۆژیش برینەکان هیشك دەبن.

### دەستنیشانکردن

لە کاتی دەستنیشانکردنی تامیسکدا زۆرجار نیشانەکان ئەوەندە یارمەتیدەرن کەپزیشك بێ گیروگرفت دەتوانێت دەستنیشانی تامیسك بکات. وەلێ هەندێك جۆری کلینیکییان هەر پێویستی بەتێستی تەواوکەری تر هەیە، وەك:

- وەرگرتنی نمونەیەك لەشوێنی بلقەکە.
- تاقیکردنەوە بۆ جوداکردنەوەی ڤایرۆسەکە لە گەل جۆری ئەنتیجینەکە
- چاندنی ڤایرۆسی تامیسکی، لەچاندندا گۆڕانکاریی خانەکان لە 1–3 رۆژدا دەردەکەوێت.
- تێیستی سیرەمی بۆ PCR دەستنیشانی ڤایرۆسەکە دەکات.

**ڕیژەوی سۆکە**

بەپێی جۆری تامیسکەکە، شوێنی سوکە ڕێژەوی سۆکە دەگۆڕێت، تامیسکی گشتی لەمندالی تازە لەدایکبوودا مەترسی زۆرە لەبەر ئەوە لە 70٪ بارەکاندا مندال دەمرێت. هەرچەندە سەر رووی پێست ناشیرین دەکەن وەلێ بەگشتی تامیسکەکانی سەر پێست باشن. زۆرجار تامیسکە سەرهەڵداوەکان دەبنەهۆی گیروگرفتی دەروونی یان زایەندی بۆ نەخۆش.

**چارەسەرکردن**

ئەوەی راستی بێت ڤایرۆسی تامیسکی 1 و 2 دەبنە هۆی نیشانەی جیاوازی پێست . هاوکات هەردوو ڤایرۆسەکە دەبنە هۆی سۆی مێشك کە ناسراوە بە (Herpes Incephalitis) هەروەها هەردووکیان دەتوانن لە زاماڵدا ئاولەمە تووشی ئاولەمەسۆی تامیسکی (Neonatal herpesinfection) بکەن .

تا ئەمڕۆ چەند دەرمانێك دژ بەڤایرۆسەکە بەکارهێنراوە، بەلام لەهەموویان باشتر کەئەنجامی بوو‌بێت دەرمانی ئەسایکلۆڤیر (زۆڤیراکس)ـە کە لەشێوەی خەپلەدا دەدرێت بە نەخۆش، هەر خەپلەیەك 200 ملگم (هەر 24 کاژێری 5 دانە بۆ ماوەی 5 رۆژ دەدرێت بە نەخۆش). هەروەها زۆڤیراکس لەچارەسەرکردنی تامیسکی زاووزێدا ئەنجامی باشی هەبووە، بەلام نەیتوانیوە نەهێڵێت تامیسکەکە هەڵبداتەوە. گەربێت و رۆژی 2- 5 دانە (200 ملگم) بۆ ماوەی 4-5 مانگ بدرێت بە نەخۆش ئەوا لەوانەیە رێگە لە دەرکەوتنەوەی تامیسك بگیرێت (ماوەی نێوان دەرکەوتنەوەکان کەمدەکاتەوە). وەلێ ئەمە مەترسیی ئەوەی لێدەکرێت ڤایرۆسەکە دژی دەرمانەکە بەرگری پەیدابکات. هەروەها دەتوانرێت بە رێگای خوێنهێنەردا هەموو 8 کاژێرێك 5 ملگم/کگم کێشی لەش، بۆ ماوەی 5 رۆژ دەرمانی زۆڤیراکس بدرێت بە نەخۆش.

- تامیسکی زاووزێی نیشانەدار: رۆژی 5 ژەم هەر ژەمێك 200 ملگم زۆڤیراکس لەدەمەوە بۆ ماوەی 5 رۆژ دەدرێت بە نەخۆش.
- تامیسکی مێشك: هەموو رۆژێك بە رێگای خوێنهێنەردا 30 ملگم/کگم کێشی نەخۆش و بۆ ماوەی 10 رۆژ یان زیاتر (یان هەر 8 کاژێرێك 10 ملگم/کگم بۆ ماوەی 10 رۆژ) زۆڤیراکس دەدرێت بەنەخۆش.
- دەرمانی valaciclovir واتە valtrex جۆرێکی تری ئەنتڤیرالی تامیسکە زۆر بەکارە.
- چارەسەرکردن بەهۆی تیشکی لاسەرەوە رێگایەکی ترە بۆ لابردنی برینی سەرپێست.

**خۆپاراستن**

- جوداکردنەوەی مندالی ساوا لە تامیسکدار.
- بەکارهێنانی دەستکێش لەلایەن کاربەدەستانی تەندروستی نێو نەخۆشخانەوە.
- گەر دایکێك تامیسکی زاووزێی لەسەر ئەندامی زاووزێی دەرەوەی هەبێت ئەوا پێویستە مندالەکەی بەهۆی نەشتەرگەرییەوە دەربهێنرێت تا مەترسیی تووشبوونی مندال کەمبکرێتەوە.
- گەر مندالەکە بەرێگای ئاساییدا لەدایکبوو ئەوا پێویستە دەرزی (گاماگلۆبولین 10٪ یان لە 16٪) بدرێت بە مندال.

# نەخۆشی زۆستەر (تەپخاڵ)

نەخۆشییەکی درمی سۆییەو بەزۆری تووشی ئەو کەسانە دەبێت کە تەمەنیان لەنێوان 10-19، 40-49، 60-69، 80-84 ساڵیدایە. زۆرجار سۆکە تامیسکی زۆستەریشی پێدەوترێت.

**هۆی نەخۆشییەکە**

جۆری سێیەمی ڤایرۆسی تامیسکە، شێوەیەکی شەش لای هەیە، تەنیا بەمیکرۆسکۆپی ئەلەکترۆنی دەبینرێت. تیرەی ڤایرۆسەکە لە نێون 160-200 نانۆمیتردایە.

یەکەم سۆی ڤایرۆسەکە بە مێکووتە ناسراوەو تووشی منداڵ دەبێت، وەلێ چالاکبوونەوەی ڤایرۆسەکە پێی دەوترێت زۆستەرو تووشی لاو یان بەساڵاچوو دەبێت. ئەمڕۆ ئەو راستییە سەلمێنراوە کەسەرچاوەی هەردوو ڤایرۆسەکە (زۆستەرو ڤاریسێلا) یەکن و لەژێر میکرۆسکۆپی ئەلەکترۆنیدا تەنۆلکەکانی ڤایرۆسەکە لەهەردوو سۆکەدا وەك یەکن (28،1) .

**رێگاکانی گواستنەوە**

ڤایرۆسەکە بە دوو رێگادا دەگوێزرێتەوە ، کە ئەمانەن:

1- رێگای راستەوخۆ، لەنەخۆشێکەوە بۆ یەکێکی دی بەهۆی چڵمی نێو لووت و لیکی گەرووەوە دەچێتە نێو نێوپۆشەکان و لەشەوەو لەبۆری هەناسەدا زیاد دەکات.

2- رێگای ناڕاستەوخۆ، بەهۆی کەلوپەلی پیسی نەخۆشەوە، لە نێو لەشدا سۆکە زیادتر تایبەتە بەپێست و پاشتریش خوێن هۆی سەرەکی بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسەکەیە.

**پەتازانی**

سۆکە لەهەموو جیهاندا بڵاوە، لەمرۆڤی ئاساییدا لە 15-25٪ی دانیشتوان تووشی زۆستەر دەبن، لەمرۆڤی تەمەندارد (سەروو 80 ساڵان) ـەوە رێژەکە دەگاتە نزیکەی لە 50٪. نابێت ئەو راستییەش فەرامۆش بکرێت کە سۆی زۆستەر وەرزی نییە وەك لەمێکووتەدا دەبینرێت. لەگەڵ زیادبوونی تەمەندا مەترسیی تووشبوون بە ڤایرۆسی زۆستەر زیادتر دەبێت.

**شوێنی زۆستەر**

ئەوەی راستی بێت زۆستەر بەم رێژانە لەم شوێنانەدا دەردەکەوێت (16):

- سەر – لە 25٪
- لامل و پەلەکانی سەرەوە – لە 12٪
- سنگ و پشت – لە 55٪
- ئەملا ولای گورچیلەکان – لە 14٪
- پێشەوەی ران و لاقەکان – لە 3٪
- زۆستەری گشتی – لە 1٪

**نیشانەکان**

ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسەکە لەنێوان 10-20 رۆژدایە، لەوانەیە 14-15 رۆژ بخایەنێت، وەلێ ڤایرۆسەکە لە 1-2 رۆژدا بڵاودەبێتەوە.

**گرنگترین نیشانەکان ئەمانەن:**

**ماوەی دەرکەوتن**

پاش ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسەکە سۆکە هەموو لەش دەگرێتەوە بەتایبەتی پێستی سەر، ناوپۆشەکان، پەلـەکان و لەئەندامێکـەوە دەگاتـە ئەنـدامێکی دی. سـەرەتا لەشـی نـەخۆش (بەتایبـەتی شـوێنی هەوکردنەکە) ژاندەکات، شێوەی ژانەکە وەك ئازاری سووتاوی یان بڕینی چەقۆوایەو لەوانەشە ئازارەکە تەنیا پێست بگرێتەوە یان لەقولاییدا بێت. لە 60-90٪ی زۆستەردارەکان ئازاری توندیان هەیە کە 1-2 رۆژ دەخایەنێت کاتێك ئازارەکە کەمدەبێتەوە نوختەی (خاڵی) سوور لەسەر پێست دەردەکەوێت کە لەژێر فشاری پەنجەدا نامێنێت و هێدی هێدی بڵقی خڕ لەقەبارەی سەرە دەرزیدا دروستدەبێت، دەرکەوتنی بڵق نیشانەیەکی گرنگە بۆ دەستنیشانکردن (28). بڵقەکان شلەیەکی ساف و بێڕەنگیان تێدایە وەك دڵۆپە شەونم وایە گەر پەستانی بخرێتە سەر ناوەکەی فیچقە دەکات و بەتاڵ دەبێتەوە. بڵقی سەر رووەکان بەپێستی (کاڵ) زۆر تەنك و ناسك دەورە دراون، هەندێکجار شلەی ناوە بڵقەکە لێڵ و پیس دەبێت، هەندێکجاری تر لەسێیەم رۆژو چوارەم رۆژدا راستەوخۆ بڵقەکان توێخ هەڵدەدەن و هیشك دەبن و شێوەی پەڵەیەك وەردەگرن. پەڵەکانیش ماوەیەکی کورت دەمێنن، لەماوە ی 10 رۆژدا بڵقەکان هیشك دەبن و پاشتر پەڵەکان دەردەکەون

گەر لەسەر سۆی زۆستەرەوە پێست یان بڵقەکان پیسیان کرد ئەوا برینەکان زۆر درەنگ چاك دەبنەوە. هەروەها بڵقەکانی نێوپۆشی نێودەم، چاو، ئەندامی زاووزێ بەهۆی شێدارییانەوە درەنگ چاکدەبنەوە. نابێت ئەو راستییەشمان لەیاد بچێت کە زۆستەردار تووشی ژانەسەر، هێڵنج و رشانەوە، تا و ئاوسانی گرێ لیمفەگرێکان دەبێت و ئەوسا مرۆ هەست دەکات نەخۆشە. گەر بێتو ڤایرۆسی زۆستەر تووشی ئەو کەسانە ببێت کە کۆئەندامی بەرگرییان بێهێزەو نزمبووەتەوە (ئەیدزدار) ئەوا لەوانەیە سۆکە ژیانی نەخۆش بخاتە مەترسییەوە (لەم بارەدا بڵقەکان نزیکەی 2-3 هەفتە دەخایەنێت).

**تێبینی**: هەندێکجار ئازاری زۆستەر لەپڕ دەداتە بەشێکی لەش و نزیکەی هەفتەیەك دەخایەنێت، ئەوەی جێی سەرنجە کەتوندی ئازارەکە لەسەر تەمەن بەندە، لەمنداڵ و لاودا ئازارەکە مامناوەندییە.

**زۆستەر زیاتر تووشی ئەم کەسانە دەبێت** (1، 16).

- تەمەندار، لەسەروو 80 ساڵانەوەیە.
- مەیخۆرەکان.
- شێرپەنجەدارەکان.
- تووشبووان بە HIV و ئەیدزداران.
- ئەو کەسانەی گورچیلە یان مۆخی برپەیان تیادا چێنراوە.
- ئەو کەسانەی نەخۆشیی Hodgkin دارن.

**رێڕەوی نەخۆشییەکە**

بە گشتی نەخۆشییەکی سووکەو بەرەو چاکبوونەوە دەچێت، وەلـێ هەندێکجار مەترسیی ئاڵۆزبوونی نەخۆشییەکەی لێدەکرێت. پاش سۆ بەرگریی لەش دژ بە نەخۆشییەکە زیاد دەکات. ئەو کەسانەی تووشی شێرپەنجەی خوێن، نەخۆشیی Hodgkin یان ئەوانەی ماوەیەکی زۆر بە دەرمانی کۆرتیزۆن چارەسەری نەخۆشیی تریان کردبێت ئەوا تووشی بارێکی تایبەتی نەخۆشییەکە دەبن.

**ئاڵۆزكارییەكان**

- ئاڵۆزكارییە ڤایرۆسییەكان: هەوكردنی ڤایرۆسی سییەكان، مێشكو پەردەی مەننگ.
- ئاڵۆزكارییە باكتریاییەكان: كێمكردنی بڵقەكان بەباكتریای ستریپتۆكۆك بێتا هێمۆلیتیك، گەر باكتریاكە ستافیلۆكۆك بێت ئەوا زۆرجار لەشێوەی دومەڵدا بڵاو دەبێتەوە یان وەك هەوكردنی سییەكان دەردەكەوێت.

**دەستنیشانكردن**

دەتوانین دەستنیشانی نەخۆشییەكە بكەین گەربێت (بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەكە، پەیوەندیكردنی راستەوخۆ بە نەخۆشێكەوە، نیشانەكانی نەخۆشییەكە، بەرزی ئیمونۆگلۆبولینی جۆری IgM، جیاكردنەوەی ڤایرۆسەكە بەهۆی چاندنی شانەكانەوە یان ئەنجامی تێستی زەرداوی خوێن) ئەنجام درابێت. ئەوەی راستی بێت تێستی PCR دەستنیشانی ڤایرۆسەكە دەكات.

**چارەسەركردن**

- نابێت نەخۆش بشۆرێت تاتوێخە هەڵدراوەكان هیشك دەبن.
- برژاندنەوەی بلۆقەكان بەهۆی ئەلكهولەوە.
- پێویستە برینەكان بەهەتوانی ئەنتیبایۆتیك چەوربكرێن.
- پێویستە بە غەرغەرەكرد برینی نێوپۆشی دەم پاك بكرێتەوە.
- بەكارهێنانی ئەنتیبایۆتیك لەكاتی پیسبوون یان كێمكردنی سۆكاندا: دەرمانی ئۆكساسیلین بۆ ستافیلۆكۆك.

دەرمانی پەنسیلین G یان ئێریترۆمایسین بۆ ستریپتۆكۆك.

دەرمانی پەنسیلین G بۆ پنێومۆكۆك بەكاردەهێنرێت ، هەروەها سەلمێنراوە كە هۆرمۆنی كۆرتیزۆن لەسەرەتای نەخۆشییەكەدا بەسوودە.

**خۆپاراستن**

- پێویستە نەخۆش جودابكرێتەوە (بە تایبەتی منداڵ).
- پاكژكردنی كەلوپەلی بەكارهێنراوی نەخۆش.
- ئەو كەسانەی بەرگری لەشیان دژی ڤایرۆسەكە نزمبووەتەوە، دەتوانن لەسێیەم رۆژی تووشبووندا دەرزی گاماگلۆبولینی تایبەتی دژی ڤایرۆسی زۆستەر (5 ملیلیتر لەماسولكە) یان بدەن.

## سۆی مۆنۆنوكلیۆس

یەكێكە لە نەخۆشییە درمە زایەندییەكان ، بەسۆی مۆنۆنوكلیۆس ناسراوەو تایبەتە بە لاوی 15-25 ساڵان. نێوی (نەخۆشی ماچ) یشی لێنراوە .

**هۆی نەخۆشییەكە**

ڤایرۆسێكە بەنێوی (Epstein-Barr virus (EBV، دەبێتە هۆی سۆی لیمفۆسایتەكانی B ، لە ئەفریقا دەبێتە هۆی لیمفۆمای Burkitts ، شێرپەنجەی لووت و گەروو (46).

**مێژوو**

- لە ساڵی 1889دا بۆ یەکەمجار لەسەر گرێ لیمفاوی ئاوساوی تادار نووسراوە.
- لە ساڵی 1920دا زاراوەی مۆنۆنوکلیۆز هاتە ئاراوە.
- پاول و بونێل لەساڵی 1932دا بۆ یەکەمجار دەستنیشانی دژەتەنی ڤایرۆسەکەیان کرد.
- لە ساڵی 1964دا ڤایرۆسی EBV و گرێ لیمفاوی ئاوساوی تادار دۆزرایەوە.

**پەتازانی**

ڤایرۆسەکە بە ڕێژەیەکی زۆر لەشیری دایک و لیکی نێودەمدا دۆزراوەتەوە، ئەم ڕێژە زۆرە هۆی بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسەکەی ئاسانکردووە. لە هەندێك وڵاتدا لە 100 هەزار کەسدا 45 یان ئەم نەخۆشییەیان تووش دەبێت. لە 25-70٪ی بارەکاندا (کیژانی 14-16 ساڵان و کوڕانی 16-18 ساڵان) تووش دەبن.

**ڕێگاکانی گواستنەوە**

ڤایرۆسەکە ڕاستەوخۆ لەکاتی ماچکردندا بەئاسانی لە لیکی نێودەمەوە دەگوێزرێتەوە.

هەروەها بە ڕێگای خوێن و چاندنی مۆخی ئێسکدا ڤایرۆسەکە دەگوێزرێتەوە.

**نیشانەکان**

ماوەی کڕکەوتنی ڤایرۆسەکە لەنێوان 4-8 هەفتەدایە، هەندێکجار نیشانەی وەك: تا (39-40 پلە)یەو نزیکەی 7-14 ڕۆژ یان زیاتر دەخایەنێت. نیشانەی سەرەکیی سۆکە ملەخرێیە (مەرازەکان) زۆر دەئاوسێن کەنزیکەی 7-10 ڕۆژ دەخایەنێت دروزنە پەردەیەکی زۆر ناسك و تەنك مەرازەکان دادەپۆشێت.

نیشانەیەکی تر ئازارە بەتایبەتی لەکاتی جوین و قووتدانی خۆراکدا، هاڵاوی دەمیش بۆنێکی زۆر ناخۆشی لێدێت (26). لەم کاتەدا دەنگی نەخۆش گڕدەبێت، جاری وادەیە نەخۆش ناتوانێت هیچ قسەبکات و بەسەر ڕاوەشاندن وەڵامی پرسیارەکانی پزیشك دەداتەوە. زۆرجار جگەرو لە 80٪ سپڵیش گەورەدەبێت. ئەو لاوانەی ئەم نیشانانەیان تیادا دەردەکەوێت دەتوانن پاش 3-4 هەفتە بگەڕێنەوە قوتابخانە (49).

- لە 40٪ ی بارەکاندا ڤایرۆسەکە دەبێتە هۆی سۆی مۆنۆنوکلیۆسە (1).
- لە 75٪ ی بارەکاندا لەسەرەتای سۆکەدا ڤایرۆسەکە دەبێتە هۆی سۆی مۆنۆنوکلیۆسی کوشندە.
- لە زۆربەی بارەکاندا ڤایرۆسەکە لەلیکی لاو یان ئەیدزداردا دۆزراوەتەوەو دەبێتە هۆی لیوکۆپلاکی مووداری نێودەم oral hairy leukoplakia
- لە ساڵی 1985دا بۆکێت ڕایگەیاند کەڤایرۆسەکە دەبێتە هۆی لیمفۆما (لیمفۆمی بۆکێت)و شێرپەنجەی لووت و گەروو، ئەوەی ڕاستی بێت لیمفۆمەکە تووشی منداڵی ژێر 16 ساڵان دەبێت (1، 46).

**ڕێڕەوی نەخۆشییەکە**

لە1-3 هەفتەدا نەخۆش چاك دەبێتەوە. بەگشتی ڕێڕۆی نەخۆشییەکە باشەو سۆکە کوشندە نییە. لەوانەیە ڤایرۆسەکە لە نزیکەی 2 ساڵی داهاتوودا هەڵبداتەوە.

**ئاڵۆزكارييەكان**

- نزمبوونەوەی خڕۆكەسوورەكان و خانە دەنكۆڵەدارەكان.
- مێشكەسۆ.
- نەخۆشیی Guillain-Barre.
- زەردوویی.
- پەردەسۆی دەرەوەو ناوەوەی دڵ.
- گیرانی بۆرییە هەواییەكان.

**دەستنیشانكردن**

ئەوەی شایانی باسە تێستە تاقیگاییەكان دەتوانن دەستنیشانی دژەتەنی تایبەتی دژی ڤایرۆسی EBV بكەن. هەروەها لەكاتی سۆی EBV دا ئیمونۆگلۆبولینەكانی، IgA, IgM, IgG زۆر بەرز دەبنەوە، بەرزبوونەوەی IgM ماوەی 1-2 مانگ بەرزدەبێتەوە. لە 15-25٪ی بارەكاندا ڤایرۆسەكە لە لیكی گەرووی ئەیدزدارەكاندا دەستنیشانكراوە.

**چارەسەركردن**

ئەوەی شایانی باسە سۆكە چارەسەركردنێكی تایبەتی نییە تالێرەدا لێی بدوێین. وەلێ چارەسەركردنی نیشانەكانی ، تاو ئازاری گەروو بە ئازارشكێنەكانی وەك ئەسپرین و پاراسیتۆڵ چارە دەكرێت. هاوكات پێویستە هەوڵ بدەین بەربەستی ئاڵۆزبونەكانی هەوكردنەكە بكەین. هەروەها دەرمانی زۆڤیراكس و ئینتێرفێرۆن ئەلفا زۆر چالاكن بۆ وەستاندی زیادبوونی ڤایرۆسەكە

**خۆپاراستن**

پێویستە مرۆڤ ئاگاداری خۆی بێت نەماچی هەڵگرانی ڤایرۆسەكە بكات نەبهێڵێت نەخۆشیش ماچی بكات.

**تێبینی:** لەم ساڵانەی دواییدا سەلمێنراوە كە ڤایرۆسی EBV لەمنداڵدا دەبێتە هۆی شێرپەنجەی بوركیتی ئەفریقایی و هەروەها لەئەوروپاو ئەمێریكای باكووردا دەبێتە هۆی شێرپەنجەی ملی زاماڵ. ئەمەش ئەو راستییە دەسەلمێنێت كە ڤایرۆسەكە رۆڵی لە دروستبوونی شێرپەنجەو لیمفەدا هەیە.

## مێكووتە

نەخۆشییەكی زۆر درمە ، لە كوردەواریدا بە مێكووتە ناسراوە ، زۆرجار تووشی منداڵ دەبێت.

**مێكووتە:** بریتییە لەپەیدابوونی زیپكەو بلّق لەسەر پێستی منداڵ تا 15 ساڵان و جاری وایە تا تەمەنی 20 ساڵان مرۆڤ دەیگرێت.

**هۆكارەكان**

ئەو هۆكارانەی دەبنە هۆی دەركەوتنی مێكووتە لەگەورەدا بریتین لە: تەمەنداری ، سۆی HIV، نەخۆشیی ددان، سووتاندن بە هەتاو، مەیخۆری ، شێرپەنجە ، نائارامی دەروونی، چارەسەركردن بەتیشك ، چارەسەركردنی كیمیكی، نەشتەرگەری و هەندێك نەخۆشی تر.

**هۆزانی**

ڤایرۆسێکه نزیکەی 160– 200 نانۆمیتر دەبێت و لەناوەڕاستیدا ترشی ناوکی DNA تیایەو شێوەی لەڤایرۆسی زۆستەر دەکات. زیاتر لەسەد ساڵ دەبێت کەپەیوەندیی نێوان زۆستەرو ڤاریسێلا زانراوە (49) هەروەها سەلمێنراوە کەتەنیا enveloped virion ی ڤایرۆسەکە دەبێتەهۆی نەخۆشیی مێکووتە.

**پەتازانی**

یەکێکە لەنەخۆشییە سۆ درمییەکانی هەموو کۆمەڵگایەك، بە ڕێژەی جیاواز بڵاوە (بەتایبەتی لەنێو منداڵدا)، هەندێکجار دانیشتووان بەکۆمەڵ نەخۆشییەکە دەگرن. زۆرجار لەبەر کەمبوونەوەی بەرگری و ناتەواوی لەش هەوکردنەکە لە تەمەندارادا دەبینرێت مێکووتە لەوەرزی زستان و بەهاردا زیاتر بڵاوە، وەلێ بەدەگمەن لەهاویندا دەردەکەوێت، (دەتوانین بڵێین ڤایرۆسەکە وەرزی لەسەرخۆیە). سەرچاوەی سۆکە مرۆڤەو منداڵ تووشی تای منداڵی دەکات. ڤایرۆسەکە زۆر لە زۆستەر درمی ترەو تەنانەت بە ئاستەم پەیوەندیکردن دەبێتە هۆی تووشبوون. لە75٪ی منداڵ تا تەمەنی 15 ساڵی تووشی مێکووتە دەبن، لە 90٪ یان تا تەمەنی 20 ساڵی تووش دەبن.

**ڕێگاکانی گواستنەوە** (3)

– ڕاستەوخۆ، ڤیرۆنی ڤایرۆسەکە دەتوانێت لەیەکێکەوە (بەهۆی دڵۆپی شلەی نێو لووت و گەروو) بە هەوادا بگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤێکی ترو تووشی ڤایرۆسەکەی بکات .

– ناڕاستەوخۆ، ڤایرۆسەکە بەهۆی کەلوپەلی تازە پیسبووی ڤایرۆساوی بەکارهێنراوی نەخۆشەوە، لەرێگەی پێستی برینداڕو نێوپۆشەکانەوە یەکێکی تر تووش دەکات.

شوێنی چوونە ناوەوەی ڤایرۆسەکە کونە لووت و دەموچاوە .

– هەندێکجار لە ڕێگای گۆڕینی هەوای ژوورێکەوە بۆ ژوورێکی تر یان لە نەۆمێکەوە بۆ نهۆمێکی تر ڤایرۆسەکە دەگوێزرێتەوە. (درمێتی ڤایرۆسە زۆر بەرزەو نزیکەی 6 ڕۆژ دەخایەنێت).

**نەخۆشیداری ڤایرۆسەکە**

کاتێك ڤایرۆسەکە بەلووت، گەروو یان چاودا دەچێتە نێو لەشەوە، هەر لەو کاتەوە ڤایرۆسەکە لەبۆرییەکانی هەوادا زیاددەکەن و پاشتر خۆیان دەترنجێتە نێو بۆرییەکان و دوایش دەڕژێنە نێو موولوولەکانی خوێنەوە. زیادبوونی ژمارەی ڤایرۆسەکە لەخوێندا دەبێتەهۆی یەکەم خوێنی ڤایرۆساوی (primary viremia)، ڤایرۆسەکە بە نێو هەموو ئەندامەکانی لەشدا بە تایبەتی بەشانەکاندا بڵاودەبێتەوەو لەوێدا دەبێتە هۆی دروستبوونی برین. لەبەرئەوەی پێست شوێنێکی لەبارە بۆ زیادبوونی ڤایرۆسەکە ئەوسا برین و زیپکەکان دەگەنە سەر پێست. لە یەکەم سۆوە تا دەرکەوتنی بڵقەکان 14–15 ڕۆژ دەخایەنێت.

پاشتر ڤایرۆسکە لەخوێندا هێدی هێدی زیادو تەشەنەدەکات و دووەم خوێنی ڤایرۆساوی (secondary viremia) دەردەکەوێت. لە 1–4 ڕۆژدا (پاش دەرکەوتنی دوا زیپکە) لە خوێندا دژەتەنی تایبەت بە ڤایرۆسەکە دەردەکەوێت.

**پەیوەندیی نێوان زۆستەرو مێکووتە** (17،16).

– لە میکرۆسکۆپی ئەلەکترۆنیدا شێوەی گەردیلەکانی هەردوو ڤایرۆسەکە وەکویەکن.

– لەچاندنی شانەییدا، کاری هەردوو ڤایرۆسەکە لە گۆڕانکاری خانەکاندا وەك یەکن.

تێبینی: مێکووتە وەڵامی بەرتەکی مرۆڤێك پێکیهێناوە کە بەرگریی نییە.
تێبینی: مێکووتە وەڵامی بەرگری مرۆڤێك پێکیهێناوە کە نیوە بەرگری لە بەرنەم هەمان ڤایرۆسدا هەبێت.

**نیشانەکان**

ماوەی کڕکەوتنی ڤایرۆسەکە لە نێوان 14-15 رۆژدایە، هەندێکجار لە نێوان 10-12 رۆژدایە یان لەوانەیە 3 هەفتە بخایەنێت.

**ماوەی درمێتی**

سەرەتا، 1-2 رۆژ پێش دەرکەوتنی زیپکەکانو تا دەرکەوتنی دوا زیپکەی نزیکەی 6 رۆژ دەخایەنێت، لەوانەیە لەمنداڵی ساوادا ماوەکە نەبێت وەلێ لەمنداڵی گەورەشدا 2-3 رۆژ دەخایەنێتو ئەم نیشانانەی هەیە:

ژانسەر، ماندوویی، تا (38-40 پلە)، ئازارێکی توند (نەخۆش هەست دەکات دەرزی بەلەشیدا دەکەن یان نەخۆش هەست بە سووتانەوەو کزانەوە دەکات) بەتایبەتی لەئاستی ئەو دەمارانەدا کەپێستەکەی تووشی گۆڕانکاری دەبین (زیپکەو بڵقیان لێدێت). هەندێکجار ڤایرۆسەکە دەبێتە هۆی سڕبوونی شوێنی سۆکە یان ئاوسانی لیمفەگرێکان ! هەندێکجاری تر لەگەڵ ئەو نیشانانەدا چەند پێکهاتوویەکی سەرپێی (دەردەکەونو نامێنن) شێوەی سوورکە دەردەکەوێت.

**ماوەی دەرکەوتن**

هەندێکجار ماسولکەی کەللەسەرو رووخساری نەخۆش ژان دەکاتو بۆیە مرۆ وا دەزانێت ددانی دێشێت.

سەرەتا زیپکەکان لەسەر پێستی سەر (ئەملاولای گوێچکەو لالێو) دەردەکەون . پاشتر رووخسارو (سكو سنگو پشت)و پەلەکان دەگرێتەوە. زیپکەو بڵقەکان نێودەمیش دەگرنەوەو دەبنەهۆی ئازارو منداڵ تووشی گیروگرفتو نارەحەتی خۆراك جوینو قووت دان دەبێتو نێودەمیش لیکی زۆری تێدەڕژێت.
هەندێکجار سۆکە چاویش دەگرێتەوەو لەم بارەدا چاو دەیەشێتو ترس لەنەخۆش دەنیشێتو فرمێسکی زۆریش لەچاو دێتە دەرەوە.

سەرەتا زیپکەی 2-6 ملیمەتری شێوە بازنەیی یان هێلکەیی سوور دەردەکەوێت. لەچەند کاژێرێکدا زیپکەکان گەورە دەبنو پاشتر دەبن بەبڵقی سوور (بڵقەکان زیاتر لەسەر پێستن وەك لەنێو پێستدا بن)و نێویان شلەیەکی سافو روونی تیادایە کەنێوی (دڵۆپە شەونم)ی لێنراوە. گۆپکەی بڵقەکان زۆر تەنکن گەر بەئاستەم پەنجەیان بەربکەوێت دەتەقەنو هەموو شلەکەی نێوی دێتەدەرەوە.

گەر بڵقەکان نەتەقن ئەوا لەئاستی گۆپکەکەدا دەتەپنو دادەمرکێنەوە. پاشتر چرچو لۆچ دەبنو خێرا کەمێك هەوایان تێدەچێتو شێوەی بەرزو نزم وەردەگرن. هەندێکجار مێکووتە تەپڵی سەرو بن گوێکانو نێو دەمو مەرازەکانی نێو زاریش دەگرێتەوە.

لە کۆتاییدا پاشماوەی بڵقەکان هیشكو رەق دەبنەوە بێئەوەی شوێنەوار بەجێبهێڵن، ماوەکە نزیکەی 10-20 رۆژ دەخایەنێت. هەندێکجاری تر بڵقەکان بە باکتریای ستافیلۆکۆکەس هەودەکەن و شلەی نێو بڵقەکە کێم دەکاتو لەوانەیە پاش هیشکبوونەوەو رەقبوونەوە شوێنەوار بەجێبهێڵن.

ژمارەی زیپکەو بلّقەکان لەنێوان 10-100 دانە دایەو لەسەر پەلەکان زیاترن‌و جارجارێك بلّقەکان لەپی دەست‌و پاش دەگرنەوە.

**تێبینی:** بنکەو لێواری بلّقەکانی مێکووتە سوورن‌و کەمێك بەرزن‌و ئاوساون، ناوەڕاستی بلّقەکان مەیلەو زەردەو شلەیەکی تیادا دەجولێت وەلێ بلّقی سورکە هەمووی سوورەو گچکە تریشە.

**تێبینی:** بە دەگمەن گۆڕانکاریی پێست دەبێتەهۆی خوێنبەربوون‌و لاڕەشەو نەخۆش بە دەست ئازاری شێوە سووتاوی‌و کزانەوەوە دەناڵێنێت

**جۆرە کلینیکییەکانی مێکووتە** (47,26,1)

- مێکووتەی سەخت ئەم جۆرە درمە لەو کەسانەدا دەردەکەوێت کەنەخۆشیی تر وەك شێرپەنجە، نەخۆشیی خوێن، نەخۆشیی کەمبوونەوەی گاماگلۆبولینەکان یان نەخۆشیی Hodgkin یان هەیە، یان ماوەیەکی زۆر بە کۆرتیزۆن چارەسەری خۆیانیان کردووە.

- مێکووتەی خوێنبەربوون، بەدەگمەن دەبینرێت، لەم حاڵەتەدا بلّقەکان خوێنیان لێدێت (خاڵی سوور یان پەڵەی شینی خوێنی مەیو)، میزو رشانەوەی خوێناویش دەبینرێت لەم بارەدا خوێنبەربوون دەبێتەهۆی مردنی نەخۆش.

- مێکووتەی گانگرێناوی (لاڕەشە). لەکاتی لەباردا شلەی نێو بلّقەکان تووشی بەکتریای ستریپتۆکۆکەس دەبن‌و جگە لە سۆکە ڤایرۆسییەکە سۆیەکی بەکتریایشی دەچێتە سەرو گانگرێنەیەکی گەورە دروست دەبێت

- مێکووتەی بلّقی، زۆر بەدەگمەن دەردەکەوێت.

- مێکووتەی سووك ، زۆرجار لەمنداڵی بچوکدا تەمەن 3-6 مانگدا دەردەکەوێت (بەرگرییان لەدایکەوە وەرگرتووە).

- مێکووتەی زگماکی، لە24٪ی بارەکاندا منداڵ لە پزداندا تووشی ڤایرۆسەکە دەبێت.

- مێکووتەی پاش لەدایکبوون، بەدەگمەن دەردەکەوێت.

**تێبینی:** منداڵی گەورەو لاو نیشانەی قورستریان تیادا دەردەکەوێت وەك لەمنداڵی گچکە.

**تێبینی:** زۆرجار مێکووتەدار خوشك‌و براکانی خۆی تووش دەکات، لەم بارەدا ئەو خوشك‌و برایانەی پاش یەکەم منداڵ مێکووتە دەگرن نیشانەکانیان زۆر بەهێزتر دەبێت.

**ئاڵۆزکارییەکان**

- بۆرییە سۆی هەواییەکان (سییەسۆ)

- گیروگرفتی هەرس‌و خوێن هێنانەوە.

- کێمکردنی بەکتریایی لە ئاستی پێستدا.

- شەپلّەداری دەماری 7 (دەماری رووبزوێن) و پەیدابوونی گیروگرفتی بینین.

**دەستنیشانکردن**

پێش دەرکەوتنی گۆڕانکارییەکانی پێست، دەستنیشانکردن زۆر گرانە، وەلێ پاش دەرکەوتنی زیپکە، گۆڕانکارییەکانی پێست (بلّق‌و زیپکە) دەستنیشانکردن ئاسانتر دەکەن.

**تێبینی:** هەموو دایکێك لەیەکەم هەفتەی نەخۆشییەکەدا دەزانێت کەمنداڵەکەی مێکووتەی گرتووە یان نا؟

دژەتەنی تایبەت دژ بەڤایرۆسەکە لە1-4 رۆژدا (پاش دەرکەوتنی دوا زیپکە) دەردەکەوێت هەروەها دەتوانرێت دژەتەنی تایبەتی دژی ڤایرۆسەکە بەهۆی تێستی سیرۆزانی PCR ەوە دەستنیشان بکرێت.

رێژەی نەخۆشییەکە باشە تائێستا کەس بەمیکووتە نەمردووە، منداڵ ماوەی 2 هەفتە بەدەست زیپکەو بڵقەکانەوە زۆر شپرزە دەبێت. تەمەندار ماوەیەکی زۆر بەرگەی ئازاری سوکە دەگرێت.

**چارەسەرکردن**

- زۆر پێویستە بە رێکوپێکی نەخۆش جودابکرێتەوەو بحەوێتەوە، پاکوخاوێن رابگیرێت، خۆراک بخوات و نینۆکی بکرێت. (بۆ ئەوەی لەکاتی خوراندندا بە نینۆک بڵقەکان نەتەقێن و زیاتر هەو نەکەن).
- سەردانی نەخۆش ناکرێت، دەست بۆ زیپکەو بڵقەکان نابرێت تا نەتەقن.
- گەر بەتەواوی بڵقەکان هیشك نەبێتەوە نابێت نەخۆش خۆی بشوات.
- پێویستە دەرمانی دژی ئازارو هەوکردن بدرێت بەنەخۆش و گەر پێویستی کرد هەتوانی ئەنتیبایۆتیك لەبرینەکان بدرێت.
- هەندێکجار دەتوانرێت بڵقەکان بتەقێنرێت و بەدەرمانی پاکژکردنەوە (مێنتۆڵ- فینۆڵ - 2٪) ببرژێنرێنەوە یان بۆدرەی وشکبوونەوە لێبدرێت.
- دەمشۆری بەچای رازیانە تابرینەکانی نێوزار چاك ببنەوە.
- دەرمانی دژە هیستامین بۆ منداڵی گچکە بەسوودە تاخۆی نەخورێنێت و بڵقەکان نەتەقێنێت.
- پێویستە دەرمانی دژی ئازارو ئەنتیبایۆتیك بدرێت بەنەخۆش تا ئازارو سۆ لاوەکییەکان دابمرکێنێتەوە.
- دەرمانی دژی ڤایرۆس وەك زۆڤیراکس و ئەلفا ئینترفیرۆن (تەنیا لەمیکووتەی سەختدا دەدرێت بەنەخۆش) زۆڤیراکس بەم شێوەیەش دەدرێت بەگەورە:
- رۆژی پێنج جار هەر ژەمێك 800 ملگم بۆ هەفتەیەك دەدرێت بەنەخۆش.

**خۆپاراستن**

- پێویستە نەخۆش 7 رۆژ (لەماڵەوە یان لەنەخۆشخانە) جودابکرێتەوە.
- منداڵ دەتوانێت بۆ 7 رۆژ لە باخچەی منداڵان و قوتابخانە بمێنێتەوە پاشتر پێویستە 11 رۆژ جیابکرێتەوە.
- پاکژکردنی بەردەوامی کەلوپەلی تازە بەکارهێنراوی نەخۆش.
- ئیمونۆگلۆبولینی تایبەتی مرۆ دژی میکووتە زۆستەر بەسوودە گەربێت و لە یەکەم رۆژی سوکەدا لەمرۆ بدرێت.
- کوتانی دژی میکووتە بەناوی Varilix لەشێوەی دەرزیدایە زۆر بەسوودە.

**تێبینی:** مەرج نییە هەموو منداڵێك میکووتە بگرێت !

# سۆی ڤایرۆسی سیتۆمێگال

یەکێکە لەو سۆیانەی لەهەموو جیهاندا بڵاوەو دەبێتە هۆی سۆی لیمفۆسایتەکانی B، لە 80-100٪ مرۆڤی کامڵ تووش دەبێت و زۆرجاریش بێ نیشانەیە. سۆکەو نەخۆشییەکە دەبنە هۆی گیرگرفتێکی گرنگی تەندروستیی دانیشتووان، چونکە:

- هۆیەکی گەورەی ناتەواوی (سەقەتی) منداڵی تازە لە دایکبووەو دەبێتە هۆی گێلی منداڵ.
- تایبەتمەندی سۆی ڤایرۆسی بەردەوامی هەیە. یەکێکە لەنەخۆشییە درمە زایەندییەکان کە لەرێگای زایەندەوە دەگوێزرێتەوە.
- پاش ئەندام چاندن یان خوێن وەرگرتن وەك زەردوویی سیتۆمێگال دەردەکەوێت.

**مێژوو**

- گودپاستویرو تالبۆت لەساڵی 1921دا ڤایرۆسەکەیان ناونا سیتۆمێگال.
- شمیس لەساڵی 1955دا ڤایرۆسەکەی لەگلاندەکانی لیکی مرۆڤدا جیاکردەوە.
- ڤێلیرو رۆۆ لەساڵی 1957دا لەچەند ئەندامێكو میزی منالێکی مردوودا ڤایرۆسەکەیان جیاکردەوە.

**هۆی نەخۆشییەکە**

یەکێکە لەو ڤایرۆسانەی سەر بە ڤایرۆسی هێرپیسەو ناوی ڤایرۆسی تامیسکی پێنجەمی لێنراوەو زیاتر کورتکراوەی CMV بۆ بەکار دەهێنرێت، ڤیرۆنی ڤایرۆسەکە لەنێوان 180-200 نانۆمیتردایەو ناوکە ئەسیدی DNA ی تێدایە. ئەوەی شایانی باسە لە دەرەوەی لەشدا ڤایرۆسەکە ماوەیەکی کورت دەژی.

**تێبینی**: ڤایرۆسی سیتۆمێگالی ئاژەڵیش هەیە کە هیچ گرنگییەکیان بۆ مرۆڤ نییە.

**پەتازانی**

هەوکردن بەڤایرۆسی سیتۆمێگال زۆربڵاوە، رێژەی دژە تەنی تایبەت لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا لە 70-80٪و لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا لە نێوان 90-100٪یە، زێدەترنەخۆشییەکە تووشی کیژۆڵە (منداڵ) دەبێت. هەندێکجار لەکاتی لەدایکبوونەوە سۆکە دەست پێدەکاتو جاری واش هەیە منداڵی تووشبوو دەتوانێت دایکوباوکی خۆی تووش بکات !! ڤایرۆسەکە چەندین ساڵ هێواشەو بەردەوامیش دژی لەش کاردەکاتو جارجاریش لەگەڵ میزو لیکدا دەکرێتە دەرەوە (1).

**رێگاکانی گواستنەوە**

ڤایرۆسەکە لە میز، لیك ، شلەی گولینك ، سپێرمو شیری دایکیشدا هەیە.

- پێش لەدایکبوون لەوێڵاشەوە ئاولەمە لە زامالدا تووشی ڤایرۆسەکە دەبێت.
- هەروەها لەکاتی لە دایکبوونو پاش لەدایکبوونیشدا منداڵ تووش دەبێت.
- لە 50٪ی تووشبووان بە رێگای زایەند تووشی ڤایرۆسەکە دەبن.
- رێگای خوێن ، پاش وەرگرتنی خوێنی ڤایرۆساوی.
- چاندنی ئەندامێکی سۆکردوو (چاندنی گورچیلەو دڵ... تاد).
- منداڵ دەتوانێت راستەوخۆ بەهۆی شلەی نێو لەشەوە یان کەلوپەلەوە کەسانی تر تووش بکات.

تێبینی: لەوانەیە ماوەی درمێتی ڤایرۆسەکە مانگ، ساڵ و لەوانەشە تامردن بخایەنێت. پاش تووشبوون بەپێچەوانەوەی هەموو ناتەواوییەکی بەرگرییەوە ڤایرۆسەکە نابێتە هۆی پەیدابوونی بەرگری پاش سۆ بەڵکو دەبێتە هۆی چالاکبوونی سۆکە.

**جۆرەکانی:**

**1- زگماکی**

ئەم جۆرە سۆیە لەجۆری دووەم گیروگرفتی زیاترە چونکە:

- هەمیشە بێنیشانەیە.
- لەوانەیە ئاولەمە لەمەرسێ قۆناخی سکپڕیدا تووش ببێت.
- هەموو سۆیەکی ئاولەمە دواتر دەبێتەهۆی دووبارە چالاکبوونەوەی ڤایرۆسەکە.
- لە 10000 منداڵی ئینگلیستاندا نزیکەی چوار منداڵیان تووشی ئەم سۆیە دەبن.

ئەوەی شایانی باسە لەم سۆیەدا منداڵ بێنیشانەیەو تەنیا بە ڕێگای ڤایرۆسزانییەوە ڤایرۆسەکە دەستنیشان دەکرێت. زۆربەی منداڵان بە ئاسایی گەشەدەکەن، بەڵام هەندێکیان نیشانەی تووشبوونی دەمارییان تیادا دەردەکەوێت. هەروەها هەندێکجاری تر نیشانەی وەک: گەورەبوونی سپڵ و جگەر، نزمبوونەوەی خەپلەکانی خوێن، کەمخوێنی هێمولیتیك دەبینرێت (26).

هەندێکجاری تر لە 10٪ی بارەکاندا ڤایرۆسەکە دەبێتەهۆی کەللە گچکەیی منداڵ. جاری واش هەبووە منداڵ تووشی گیروگرفتی بینین بووە.

**2- پاش لەدایکبوون**

لەمنداڵی گەورەدا ڤایرۆسەکە دەبێتەهۆی ناتەواوی فەرمانەکانی جگەرو پەیدابوونی زەردوویی. هەروەها لەلاواندا سۆکە دەبێتە هۆی تای زەردوویی‌دارو سۆی مۆنۆنوکلیۆز. ئەو ڕاستییەش روونبووەتەوە کەئەو کەسانەی کۆئەندامی بەرگرییان ناتەواوە زیاتر تووشی سییەسۆ،سۆی شانەکان، سورێنچك و جگەر دەبن. تۆرەسۆی چاو بە ڤایرۆسکە گیروگرفتێکی گەورەی ئەیدزدارانە کە لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی کوێربوونیان.

**نیشانەکان**

بەپێی تەمەن نیشانەکانی سۆی ڤایرۆسی سیتۆمێگال دەکرێت بە 3 جۆرەوە:

* لە منداڵی تازە لەدایکبوودا. * لە منداڵدا. * لە گەورەدا.

هەروەها نەخۆشییەکە بەدەگمەن تووشی گەورە دەبێت و زۆرجاران بێنیشانەیە وەلێ بە دەگمەن دەبێتە دەرکەوتنی نیشانەی کوتوپڕ کە زۆرجاران گیروگرفتێکە بۆ پسپۆڕی ڕێوماتیسم .

**هەندێك کەسیش ئەم نیشانانەیان هەیە:**

- تای تولانی (لە نێوان 39-40 پلەدا).
- زەردوویی سیتۆمێگال (تا، بێهێزی، جومگە ژانکردن، جگەرگەورەبوون، گەورەبوونی لیمفەگرێکان).

**دەستنیشانکردن**

* نیشانەکان.

* ئەنجامی تێستە تاقیگاییەکان.

* جیاکردنەوەی ڤایرۆسەکە لەمیز، خوێن، لیك.. تاد.

* تێستی سێری PCR.
* تاقیکردنەوەی شانەیی.
* تێستی ELISA زۆر بەسوودە بۆ دەستنیشانکردنی دژەتەن و جیاکردنەوەی جۆرەکانی ئیمونۆگلۆبولینەکان.
* تێستی ڤایرۆسزانی.

**چارەسەرکردن**

تاکو ئەمڕۆ هیچ دەرمانێک نییە ڤایرۆسەکە لەناوببات، بەڵام ئینترفیرۆن ئەلفاو زۆڤیراکس لە دامرکاندنەوەی نیشانەکان و زیادبوونی ڤایرۆسەکەدا ئەنجامی باشیان داوە بەدەستەوە.

## ڤایرۆسی تامیسکی جۆری 6

ئەم ڤایرۆسە هۆی سۆی تامیسکی جۆری شەشەمە، یەکەمجار سەلاحەدین و هاوڕێکانی لە 1986دا لە ئەمێریکا تێبینی ڤایرۆسەکەیان کرد کە لەجۆری DNA یەو زۆرجاران لەمنداڵدا دەبینرێت (1). ڤایرۆسی 6 و 7 سەر بە خێزانی Betavirus ن و هەردووکیان زۆر نزیکن لە یەکترییەوە . لە منداڵ و گەورەدا ڤایرۆسەکە بەدەگمەن دەبێتەهۆی نەخۆشیی قورس، جگە لە مێشکەسۆ و پەردەسۆی مەنتگ و سیەسۆ و زەردوویی نەبێت. لەژێر میکرۆسکۆپی ئەلەکترۆنیدا ڤیریۆنی ڤایرۆسەکە شێوەیەکی بازنەیی هەیەو نزیکەی 170-200 نانۆمیترەو لەشێوەدا زۆر لەڤایرۆسی سیتۆمێگال نزیکە (37). ئەم ڤایرۆسەش 2 جۆرن ، جۆری HHV-6A. HHV-6B .

**پەتازانی**

لە ئامارێکدا دەرکەوتووە کەبەهۆی تێستی IFA وە لە 20-40٪ ی دانیشتووانی ئاسایی هەڵگری ڤایرۆسەکەن، وەلێ ڤایرۆسەکە بە ڕێژەیەکی زیاتر لەو کەسانەدا کە شێرپەنجەی لیمفۆما یان HIV پۆزەتیفن دەبینرێت. هەروەها لەئامارێکی تری ئەمێریکاییەکاندا بە هۆی تێستی ELISA وە دەرکەوتووە کە لە 448 خوێندەردا 80 کەسیان هەڵگری ڤایرۆسەکە بوون.

لە ئامارێکی تردا لەمنداڵە تازە لە دایکبووەکاندا (تەمەنیان لەنێوان 6-12 مانگاندا بووە) ئەنجامدراوە لە 70٪یان تووشی ئەم ڤایرۆسە بوون. ئەمەش ئەوە دەگەیێنێت کە لەزۆربەی بارەکاندا منداڵ دژەتەنی تایبەتی دژ بە ڤایرۆسەکەی لەدایکەوە وەرگرتووەو لەبەر ئەم هۆیەشە دژەتەنەکان بەردەوام چەند مانگێک دەستنیشان دەکرێت.

**ڕێگاکانی گواستنەوە**

- ڤایرۆسەکە بە ڕێگای لیکی ناودەمەوە لەکاتی ماچکردندا دەگوێزرێتەوە.
- هەروەها ڤایرۆسەکە لەدایکەوە (بەوێڵاشدا) دەگوێزرێتەوە بۆ منداڵ.

**نیشانەکان**

**لە منداڵدا:**

ئەوەی ڕاستی بێت لەمنداڵدا نیشانەکان جیاوازن وەک لە گەورەدا، منداڵ ماوەی 3-4 ڕۆژ تای لێدێت. جارجاریش تووشی سۆی بۆرییەکانی هەناسە دەبێت و لیمفەگرێکانی لامل گەورەدەبن.

نیشانەی سەرەکی سۆکە بریتییە لە دەرکەوتنی پەڵەی سوور (لەسەر باڵو ناوشانو لامل) لەیەکەم 48 کاژێردا سۆکە وەك سوورکە وایە. هەندێکجار سۆکە پیس ئەکاتو هەوکردنیی مەننگو مێشك دەردەکەوێت.

**لە گەورەدا:**

زۆرجار نیشانەکانی ڤایرۆسەکە وەك نیشانەکانی نەخۆشیی ئاشقان، حاڵەتی سییەسۆ یان وەك زەردوویی‌یەکی هەڵچوو دەردەکەوێت.

**نیشانەکانی**

ئاوسانی لیمفەگرێکانی لامل (ماوەی 1-3 هەفتە).

هەندێکجار سووکە ژانەسەرو بێهێزی ماسولکەییو بێتاقەتی نەخۆش دادەگرێت.

**دەستنیشانکردن**

جیاکردنەوەی ڤایرۆسەکە لە لیکی تووشبوودا مەرجی سەرەکی دەستنیشانکردنی ڤایرۆسەکەیە.

سەرەتا بەرزبوونەوەی رێژەی IgG، پاشتریش IgM دەردەکەوێت، دەرکەوتنی ئەم دوو جۆرە ئیمونۆگلۆبولینە بۆ دەستنیشانکردن بەسوودە. لەوانەشە ڤایرۆسەکە لە لیكو خوێنی مرۆڤی بێنیشانە (هەڵگری ڤایرۆسەکە) دا بێت. تاکە رێگا (لەکاتی سۆی کۆئەندامی ناوەندیی دەماردا) بۆ دەستنیشانکردنی ڤایرۆسەکە بریتییە لە گرتنی CSFو پاشتر چاندنی ڤایرۆسەکەیە. زۆرجار لەکاتی چارەسەرکردندا گانسیکلۆڤیرو فۆسکارنێت زۆر لەزۆڤیراکس بەکارترن.

## ڤایرۆسی تامیسکی جۆری 7

ئەم ڤایرۆسە بە ژمارە 7ی ڤایرۆسی هێرپس ناسراوە. لەساڵی 1990دا ڤایرۆسەکە لە T-lymphocyt ەکانی مرۆڤێکی لەشساغی بێنیشانەدا جیاکراوەتەوە. ڤایرۆسەکە زیاتر لە منداڵی بچوکی ژێر 3 ساڵدا لەشێوەی تای سێ رۆژەدا بەدیکراوە. (ڤایرۆسی جۆری 6 هێرپسیش دەبێتە هۆی تای 3 رۆژە). زۆرجار ڤایرۆسەکە دەبێتە هۆی هەوکردنێکی بێنیشانە. ئەوەی راستی بێت تا ئەمڕۆ بەباشی زۆر لایەنی هەوکردنە کەو نیشانەکانی نازانرێت.

بەڵام هەندێکجار پەڵەی سووری نێو شانو مل لە تووشبوودا بینراوەو ڤایرۆسەکەش بەتێستی ڤایرۆسزانیو سێرۆزانی دەستنیشانکراوە.

تێستی سێرۆزانی هەردوو ڤایرۆسەکە لە رێگای تێستی PCR وە دەستنیشان دەکات .

## ڤایرۆسی تامیسکی جۆری 8

ئەم ڤایرۆسە بەژمارە 8 ی ڤایرۆسی تامیسك ناسراوە. ڤایرۆسێکی Gammaherpesvirus ە لە ساڵی 1994 لە ئەیدزدارێکدا دۆزراوەتەوە . ئەمیش وەك ڤایرۆسی 6و 7 زۆر زانیاری تەواوی لەسەر بڵاونەبووەتەوە چونکە تا ئەمڕۆ توێژینەوە لەسەری بەردەوامە.

لەساڵی 1996–1997دا دەرکەوتووە کەڤایرۆسەکە تووشی مرۆڤی لەشساغ و HIV پۆزەتیڤیش دەبێت. لەفێبرواری 1997دا لە باسێکدا نووسەر (47) ئاماژە دەکات کە لە بیستوچوار HIV پۆزەتیڤی هۆمۆرەگەزبازدا 6 یان HHV-8 DNA یان لەنێو سپێرمدا دۆزراوەتەوە، هەروەها لە 15 نەخۆشی سارکۆمی کاپۆسیدا 3یان HHV-8 DNA یان تیادا دەستنیشانکراوە.

لە هەمان باسدا شەش HHV-8 DNA یان لەخوێندا دۆزیوەتەوە. لەئەنجامی ئەم باسەدا گومان دەکرێت کە ڤایرۆسی ژمارە 8 بە رێگەی زایەنددا بگوێزرێتەوە (45). ئەوەی شایانی باسە کەئەم جۆرە ڤایرۆسە لەتەمەنی منداڵیدا تووشی مرۆ نابێت بەڵکو زیاتر تووشی گەورە دەبێت. هاوکات روونبووەتەوە کەزیاتر لە نێو هۆمۆرەگەزبازەکاندا بڵاوەو ئەوان تووشی سارکۆمای کاپۆسی دەکات. هەروەها بۆمان دەرکەوتووە کەسارکۆمای کاپوسی تووشی نائایدزدارانی رۆژهەڵاتی ناوین دەبێت. لەمانگی مارسی 1997 دا لەتوێژینەوەیەکی نوێدا (لەخوێنی خوێندەرە ئەمێریکاییەکاندا) راگەیەندرا کەڤایرۆسەکە تووشی مرۆڤی لەشساغ دەبێت، ئەمەش ئەو راستییە دەسەلمێنێت کەڤایرۆسەکە بە رێگای خوێندا دەگوێزرێتەوە.

## چارەسەرکردنی سۆ تامیسکییەکان

ڤایرۆسە تامیسکسەکان لە هەموو جیهاندا بڵاون ، ئەم کۆمەڵە ڤایرۆسە یەکێکن لە دێرینترین ڤایرۆسییەکانی مرۆ کە ژمارەیان گەیشتۆتە 8 جۆری جیاواز . ئەوەی شایانی باسە ئەم ڤایرۆسانە دەبنە هۆی یەکەم هەکردن (primary infection) تایبەتمەندی سەرەکی ئەم کۆمەڵە ڤایرۆسە بریتییە لە توانای دەرکەوتنەوە و چالاکبوونەوەیان و دەرکەوتنەوەی نیشانەکانی سۆکە . ئەم تایبەتمەندیانەش لە کاتی هەوکردن بە ڤایرۆسی (HSV-1, HSV-2, CMV, EBV, VZV) دا دەبینرێن .

### ئەنتیڤایرۆسی تامیسکی ئاسایی جۆری HSV-1, HSV-2

گرنگترین ئەو دەرمانانەی لە سۆ ڤایرۆسەکاندا بەکاردەهێنرێت بریتین لە :

– دەرمانی Acyclovir =Zovirax یەکەمین ئەنتیڤایرۆسە دژی تامیسکی جۆری 1 و 2 بەکاردەهێنرێت . هاوکات دەتوانین دژی ڤایرۆسی CMV, EBV, HHV-6 بەکاربهێنرێت لەبەرئەوەی ئەنجامی باشی هەبوە .

– دەرمانی Valcyclovir =Valtrx

– دەرمانی Famvir = Famciclovir دژی ڤایرۆسی HSV-1,2 بەکاردەهێنرێت .

– دەرمانی Denavir = Penciclovir بۆ چارەسەرکردنی شوێنی هەردوو تامیسکی 1 و 2 بەکاردەهێنرێت .

– دەرمانی Gancyclovir لە رووی پێکهاتنەوە وەك Acyclovir وایە , هاوکات هەمان میکانیسمی کارکردنی هەیە . دەرمانەکە زۆرباش کاردەکاتە سەر ڤایرۆسی . ئەوەی راستی بێت Gancyclovir یەکەم دەرمانە دژی ڤایرۆسی ناوبراوە مەبەستی خۆپاراستن وچارەسەرکردن بەکاردەهێنرێت .

– دەرمانی Foscarnet =Foscavir تەنیا لە شێوەی دەرزیدا هەیە . دەرمانەکە دژی هەموو ڤایرۆسە تامیسکییەکان بەکار دەهێنرێت , تەنانەت دژی ڤایرۆسیHIV بەکارهێنراوە و ئەنجامی باشی هەبوە بەتایبەتی لەکاتی هەکردنی چاودا

– دەرمانی Cidofovir =Virtide ئەمیش وەك دەرمانی Foscavir لە شێوەی دەرزیدا هەیە . زۆر بە باشی کاردەکاتە سەر Human papilloma virus.

ئەمیش نزیکەی هەفتەیەك لە لەشدا دەمێنێتەوە لەبەرئەوە هەفتانە دەدرێت بە نەخۆش بە مەرجێ ئەنتیڤایرۆسەکانی دی کارنەکەنە سەر هەوکردنەکە . لە ناوەندی سالی 2002 دا لە شێوەی خەپلەدا دروستکراوە.

سەرچاوەکان


References

1.Leslie Collier and John Oxford: Human Virology, Chapter fifteen, Oxford University Press 1993.
2.N. Cajal: Treatment of Medical Virology, vol 1. Medical Edition, Bucherest 1990.
3.Marin GH. Voiculescu: Infectious Diseases, vol 2. Medical Edition; 1990; 112-134.
4.Mikronyhet, information från mikrobiologiska universitetslaboratorierna, nr 3 sep 2000.
5.Abrām S. Benson: Editor Control of Communicable Diseases in Man, 15th edition, USA 1992.
6.Laurence Cory: Herper Simplex Virus, In Harrisons, Principles of interna medicine, 1991; 135:681-686.
7.Morag C. Timbyru: Notes on Medical Virology, 10th edition. UK 1994.
8.P. R. Murray, et al: Medical Microbiology, Second edition, UK 1994.
9.D J Weatherall et al: Oxford textbook of medicine, Third edition, Section 21 STD and Sexual health, 1995
10.Stephen E. Straus. Herpesvididae: In: Principles and Practice of infectious Diseases, 4rth eds 1995: 114-119.
11.Laurence Peiperl. Manual of HIV/AIDS Therapy: Herpes viruses; 1993, 77-79.
12.Chan MF and SL Frideman. CMV and the gastrointestinal system 1992.
13.W. Laurence Drew, et al In: The Medical Management of AIDS, Management of Herpes virus infection, 1992; 359-383, Third Edition, USA
14.Cory L. Spear PG: Infections with HSV (part 1 and 2) N Eng J Med 1986; 314: 686-791. VE9-VoV.
15.MJ Wood and Pj Easterbrook: Klinikerns handbook om Herpes Zoster, London 1995.
16.M. J Wood: Herpes Zoster en översikt , Wellcome Sverige AB, 1994.
17.Ronald T D Emond, HAK Rowland and Philip D Welsby: Herpesvirus group, In: Color atlas of Infectious Diseases, part 1 of 2, Glaxo Wellcome, London 1995.
18.Meyers, J: Congenital Varicella in Term Infants. Risk Reconsidered, J Infect. Dis. 1974; 29, 215.
19.Neumann, C: Perinatal Varicella, Lancet. 1965; II 1159.
20.Weller, TH: Varicella and Herpes Zoster, New Engl J. Med 1983, 305, 1362.
21.Handesfeld, H. H, et al: CMV in sex parteners: Evidence for sexual transmission, J. Infec. Dis. 1985; 151, 344.
22.Pass, R: Epidemiology and Transmission of CMV, J Infect Dis. 1985; 125, 243.
23.Stango, S. Whitley, R: CMV and E B-Virus Infectins, New Engl. J Med. 1985; 313, 1270.
24.Corey, L., Psear, P: Infections with Herpes simplex Virus, New Engl. J. Med. 1989; 314
25.Martin S. Hirsch: Cytomegalivirus Infection, In, Harrisons, Principles of internal medicine, 1991; 692-695.
26.Robert T. Scholly: Epstein-Barr Virus Infections, Inledning Infectious Mononucleosis In Harrisons, Principles of internal medicine, 1991; 160; 689-692.
27.Weller TH: Varicella and Herpes Zoster N Engl J Med 309; 1362; 1434, 1983.
28.Corey L: Genital Herpes Simplex Virus Infections: Clinical manifestations, course, and complications. Ann Intern Med 1983; 98: 958.
29.Cory L, Spearr P: Infections with herpes simplex viruses. N Engl J Med 1986; 314: 686, VE9.
30.E. Tjotta. Herpes Simplex Virus (HSV1 and HSV2). In: Apractical guide to clinical virology. 1989; 18:95-100.
31.R. Winsnes and A. Winsnes. Varicella-Zoster Virus (VZV) - Varicella. In: A practical Guide to Clinical Virology. 1989; 19:101-106
32.A. B. Dalen. Cytomegalovirus (CMV). In In. A pracitacal Guide to Clinical Virology. 1989; 21:109-113.
33.E. Tjojtta. Epstein-Barr Virus. In A practical Guide to Clinical Virology 1989; 22:116-119.
34.Martin S. Hirsch. Herpes Simplex Virus In Principles and Practice of Infectious Diseases, 4th eds, 1995.
45.Richard J. Whitley. Varicella-Zoster Virus In: Priciples and Practice of Infectious Diseases, 4th eds, 1995.
36.William L. Irving. Herpesvirus-6, Infections and Immunity. In: Encyclopedia of Immunology, 1992; 672-673.
37.Barbara A. Blacklaws, A. A. Nash Herpes Simplex Virus, Infections and Immunity. In: Encyclopedia of Immunology, Vol 2 1992; 670-671.
38.Gao S-J. et al: HHV-8 antibodies among American, Italians and Ugandans with and thout Kaposis Sarkoma, Nature Med. 1985, 2: 925-928
39.Benita Zwegberg Wirgart, Early diagnosis of CMV infections using monoclonal antidies and DNA
40.Straus: Herpes simplex virus and allt relatives. In: Mechanisms of Microbial Diseases. 2 eds. 1993; 40: 504-20.
41.E. Littler and K. Powell, Herpesviruses. In: Encyclopedia of Microbiology, vol 2 D-L 92, 381-91.

42.Ann M. Arvin and Yvonne A. Maldonado, Other viral infections of the ftus and new..rn. In: Infectius Diseases of the fetus newborn infant, 4th eds. W. B. Saunders Company. 95. 18. 745-756.
43.David A Rizzeri, et al: Clearance of HHV-8 from peripherial blood mononuclear cells th aportease in inhibitor. Lancet 1997; 349: 775-76.
44.Mark R. Et al: Detection of human herpesvirus 8 DNA in semen from HIV- infected individuals but not healthy semen doners, AIDS 1997; 11: f15-f19.
45.Kerstin I: Falk: Epstein-Barr virus gene methylation and variation inlatency. Karolinska institut, Stockholm 1997; 9, 12, 14.
46.David j Blakborum, et al. Infections HHV-8 in a healthy north American blood donor. Lancet 1997; 349: 309-11.
47.Donald Armstrong, Jonathan Cohen, et al. Infectious Diseases, vol one, mosby 1999.
48.Information..org..ng 9. Nr 3. Juni 1998. svensk läkemedelsinformation, från Läkemedelsverket, Stockholm.
49.Iwarson-Norrby, infektionsmedicin, epidemiologi, klinik och terapi, Säve Förlag 1998, Stockholm.
50.Rekommendationer, behandling av kronisk hepatit C hos vuxna och barn, information.nr.6, okt.Stockholm, 1999, s. 5-7.
51.Rekommendationer, behandling av kronisk hepatit C hos vuxna och barn, information.nr.4, jul .Stockholm. 2001, s. 5-9.
52.Två nya behandlingsrekommendationer för antiviral behandling av HIV-infektion, information.nr5.okt.Stockholm 2002.s.9-20, 55-60.
53.Ingrid Uhnoo, antivirallekämedels möjligheter och begränsningar, Medicament, nr.2, mars. stockholm 2003, s.24-29.
54.Ingrid Uhnoo, läkemedel mot virus –vad finns och vad behövs?, Medicament, nr.3, april.
55.Stefano Vella &Marco, antiviral therapy, infectious diseases, vol two Mosby.US. section 5. HIV and AIDS, p.26.1-26.10stockholm. 2002. s 22-37.
56. Iwarson-Norrby, Infektionsmedicin, epidemiologi, klinik, terapi, Sverige, 2004.

# بەشی نۆهەم

## نەخۆشییە ڤایرۆسییەکان

1- ریترۆڤایرۆسەکان
2- سۆی HIV
3- ئەیدز
4- سۆ هەلپەرستەکان (تێکەڵ)

## ریترۆڤایرۆسەکان

ریترۆڤایرۆسەکان کۆمەڵێکی گەورەی ڤایرۆسەکان پێك دەهێنێت کە زۆرجار دەبنە هۆی سۆی درێژخایەن (10-15 ساڵ)، وەك لەسۆی ڤایرۆسی HIV و نەخۆشیی ئەیدزدا دەبینرێت : تیرەی ریترۆڤایرۆس نزیکەی 100 نانۆمیترە. لەساڵی 1950 دا یەکەم ریترۆڤایرۆس لە شێرپەنجەداریکدا جیاکرایەوە. وەلێ لەساڵی 1978دا HTLV-1 جیاکرایەوە.

### جۆرەکانی ریترۆڤایرۆسەکان

1- ریترۆڤایرۆسەکانی ئاژەڵ

- ڤایرۆسی (visna/Maedi) دەبێتە هۆی هەوکردن لەمەڕداو کوشندەیە
- ڤایرۆسی سۆی مێشکی بزن.
- ڤایرۆسی کەمخوێنی سۆیی ئەسپ.

2- ریترۆڤایرۆسەکانی مرۆ

- ڤایرۆسی HTLV-1 هۆی سەرەکیی شێرپەنجەی لیمفۆسایتەکانی T و نەخۆشیی (Sezary) یە.
- ڤایرۆس HTLV-2 دەبێتە هۆی شێرپەنجەی موودار.
- ڤایرۆسی HTLV-3 ناسراوە بە ڤایرۆسی HIV-1 و دەبێتە هۆی نەخۆشیی ئەیدز.
- ڤایرۆسی HIV-2 ناسراوە دە بێتە هۆی نەخۆشیی ئەیدز.

ئەوەی راستی بێت جۆری یەکەمو دووەم سەر بە ئۆنکۆڤایرۆسن وەلێ جۆری سێیەمو چوارەم کە بە HIV-1, 2 ناونراون، سەر بە لێنتی ڤایرۆسن. ئەوەی شایانی باسە بەگەردیلەی ڤایرۆس دەوترێت (ڤیرۆین) ئەمەش لە 2 بەش پێکهاتووە:

1- ئەلبومین.
2- ناوکی ئەسیدی DNA یان RNA.

# سوّى HIV

له هاوینی 1979دا چەند لاوێکی دانیشتووانی شاری نیویۆرك چوونە لای پزیشك بۆ چەند نیشانەیەکی شێرپەنجەو سارکۆمای کاپوسی، هەمان نیشانە لەگەڵ سۆی سییەکاندا لەچەندین هۆمۆرەگەزبازدا دەرکەوت. لە ساڵی 1981 دا چەند پزیشکێکی ئەمێریکا لە گۆڤاری پزیشکی (New England Journal of Medicine) دا باسی جۆرێك سۆی سییە کانیان بڵاوکردەوە کە پێشتر تووشی چەند هۆمۆرەگەزباز بوو بوو.

دوو ساڵ پاشتر (لوك مونتاگنیر) لە ئینستیتوتی پاستیۆر لەپاریس ڤایرۆسێکی دۆزییەوە کە تائەو دەمە نەدەزانرا چ ڤایرۆسێکەو سەر بەکام خێزانە. پاشتریش روون بووەوە کە ڤایرۆسەکەی پاریس ئەو ڤایرۆسەی کە (رۆبرت گالۆ)ی ئەمێریکایی جیایکردبووەوە لە بنچینەدا یەك ڤایرۆسن‌و ئەو ڤایرۆسەیە کەدەبێتە هۆی بێهێزی‌و ناتەواوی کەمبوونەوەو نەمانی بەرگریی لەش، واتە نەخۆشیی ئەیدز.

زیاتر لە 24 ساڵ بەسەر باسکردنی نەخۆشییەکەدا تێپەریوە، بەڵام رۆژ بە رۆژ ترسی سۆ بەڤایرۆسەکەو نەخۆشییەکە زیاتر دەبێت چونکە ڤایرۆسەکە لە زۆربەی وڵاتاندا لەجاران خێراتر بڵاودەبێتەوە. هەرچەندە لەسەرەتادا واباس دەکرا گوایە ڤایرۆسەکە تەنیا هۆمۆرەگەزبازەکان دەگرێتەوەو ئەیدزیش هەر تایبەتە بەوان. هەروەها دەگوترا کەئەیدز تەنیا لە ئەفریقادا هەیە، بەڵام ئەمرۆ سەلمێنراوە سۆ بە ڤایرۆسەکە هەموو کەس دەگرێتەوە بێجیاوازی تەمەن، وڵات، رەگەز، نەژاد، ئایین‌و ڤایرۆسەکەو نەخۆشییەکەش لەهەمو جیهاندا هەیە.

تەنانەت لەساڵی 1988دا لە باشووری کوردستاندا چەند کەسێك تووشی ڤایرۆسی HIV بوون، یەکێك لەوانە منداڵێکی کوردی هێمۆفیلیادار بووە کە لەساڵی 1987 لەبەغداد خوێنی تێکراوەو لەرێگەی خوێنەوە تووشی ڤایرۆسەکە بووبوو

هەروەها ئەمرۆ ژمارەیەك کورد کە لە ئەورووپاو ئەمەریکا دەژین تووشی ڤایرۆسەکە بوون، واتە هەڵگرانی ڤایرۆسەکەن، هەروەها چەند کەسێکیش بەئەیدز مردوون. پێویستە ئەو راستییە فەرامۆش نەکرێت کەهەڵگرانی ڤایرۆسی HIVو ئەیدزدار هیچ تاوانیان نییە کەتووشی ڤایرۆسەکە بوون، هەروەها تووشبوون بە ڤایرۆسی HIV مانای ئەوە نییە نەخۆش نابێت لەنێو کۆمەڵدا بژی یان دەبێت بمرێت یان بکوژرێت. ئەوەی راستی بێت تەنیا مرۆڤی نەزان بیر لەکوشتن‌و لەناوبردنی مرۆڤێکی تر دەکاتەوە. بەپێچەوانەوە پێویستە مرۆ یارمەتیی دەروونی‌و کۆمەڵایەتیی نەخۆش بدات‌و وەك نەخۆشەکانی تر تەماشا بکرێت‌و مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت.

چونکە تەنیا 30٪ی هەڵگرانی ڤایرۆسەکە دەزانن چۆن‌و بەکام رێگا تووشی ڤایرۆسەکە بوون، وەلێ لە 70٪ی تووشبووان نازانن چۆن تووشی ڤایرۆسەکە بوون. هەروەها لە 50٪ ئەمانیش دان بەوەدا نانێن بەکام رێگا تووشی ڤایرۆسەکە بوون‌و تەنیا لە 10٪ی هەڵگرانی ڤایرۆسکە دانیان بە رێگای تووشبوونی ڤایرۆسەکەدا ناوە !

لەبەرئەوە کاتی ئەوە هاتووە ئامارێك بە ئەو کوردانە بکرێت کەتووشی ڤایرۆسەکە بوون، چونکە تائێستا نازانین ژمارەی کوردە تووشبووەکان چەندن. چونکە بەپێی ئامار دەتوانرێت سنوور بۆ بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسەکە لەکوردستاندا دابنێین !

**مێژووی سۆی HIVو ئەیدز (سەرچاوە کوردییەکان ژ 6.)**

- یەکەمجار زەریاوانێکی ئینگلیز لەساڵی 1959دا بە نەخۆشیی ئەیدز مرد !
- لەساڵی 1981 بۆ یەکەمجار لەرۆژنامەو تەلەفزیۆنی وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمێریکادا باسی نەخۆشییەکی نوێ کرا.
- رێکخراوی کۆنترۆڵی نەخۆشییەکانی ئەمێریکا لەساڵی 1982دا پێناسەی ئەیدزی کرد.
- (لوك مونتاگنیر) لەساڵی 1983دا ئەو ڤایرۆسەی دۆزییەوە کەدەبێتەهۆی ئەیدز.
- باسی پەتازانیو بەرگریزانی سۆی HIV لەساڵی 1984دا نووسرایەوە.
- پەتازانیو خۆپاراستنی سۆکە لەساڵی 1985دا نووسرایەوە.
- لەساڵی 1985دا لەوڵاتی سینیگال، رۆژئاوای ئەفەریقا ڤایرۆسی HIV-2 دۆزرایەوە.
- رێکخراوی کۆنترۆڵی نەخۆشییەکانی ئەمێریکا لەساڵی 1986دا HIV-1, 2ی جیاکردەوە.
- ئەو ڤایرۆسەی کەلوك مونتاگنیر لەساڵی 1986 دۆزییەوە ناوی HIV لێنرا.
- یەکەمجار لەساڵی 1987دا باسی کاری دەرمانی AZT لەسەر سۆکە کرا.
- یەکەم منداڵی کورد لەساڵی 1987دا لەبەغدا پاش خوێن وەرگرتن تووشی ڤایرۆسی HIV بوو!!
- یەکەم HIV پۆزەتیڤ لەساڵی 1988 لەشاری سلێمانی (کرێکارێکی میسری) دەستنیشانکرا.
- لە ساڵی 1988دا جیهان نەخۆشیی ئەیدزی وەك گیروگرفتێکی جیهانی دەناسێت.
- لە ساڵی 1988دا باسی سۆکە لەمنداڵدا کرا.
- لە ساڵی 1989دا روونبووەوە کەڤایرۆسکە لەرێگای دەرزی بەنگ کێشەکانەوە دەگوێزرێتەوە.
- لە ساڵی 1991دا باسی ئەوە کرا چۆن ڤایرۆسەکە راستەوخۆ شانە لیمفاوییەکان دەپێکێت.
- لە ساڵی 1991دا ددان بەو راستییەدا نرا کە دەردەبارێکە یەکێکە لەگرنگترین نەخۆشییەکان کەتووشی ئەیدزدار دەبێت.
- لە ساڵی 1992دا دەرکەوت کەئەیدزدارە سیلدارەکان بەرگرییان دژی ئەنتیبایۆتیك پەیداکردووە.
- تێستی (Polymerase Chain Reaction) (PCR) لە ساڵی 1993دا بۆ دەستنیشانکردنی دژمتەنی ڤایرۆسەکە بەکارهێنرا.
- لە ساڵانی 1994-1996دا زۆربەی جۆرە سێرییەکانی ڤایرۆسەکەو چۆنیەتی دابەشبوونی جوگرافییان لەجیهاندا دەستنیشانکرا.
- لە ساڵانی 1995ەوە توێژینەوە لەسەر نیشانەی لاوەکی دەرمانەکان و چارەسەری جینی بەردەوامە.
- لە کۆتایی ساڵی 2003 دا (ر ت ج) رایگەیاند نزیکەی 45 ملیۆن کەس هەڵگریHIV ن. (سوود لەسەرچاوەی 8 وەرگیراوە).

**پەتازانی**

لەسەرەتادا وادەزانرا کەسۆی ڤایرۆسی HIV چەند کەسێکی دیاریکراو یان ناوچەیەك یان وڵاتێك دەگرێتەوە بەڵام ئەمڕۆ ئەو راستییە روونبووەتەوە کە ڤایرۆسەکە لەهەموو جیهاندا بڵاوبووەتەوە. رێژەی بڵاوی سۆی ڤایرۆسەکەو ئەیدزداران زۆر زیادی کردووەو تەنانەت لەم ماوەی 15 ساڵەی دواییدا هەندێك ناوچەو وڵاتی دیکەشی گرتووەتەوە کە پێشتر ڤایرۆسەکەی تیادا بڵاونەبووبووەوە.

وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناڤین ئەمڕۆ لەجاران زیاتر هاریکاری یەکترو رێکخراوە بیانییە جیهانییەکان دەکەن لەپێناوی دانانی سنورێك لەپێناو بڵاونەبوونەوەی ڤایرۆسەکەدا. گەر سەیری ئامارە جیاجیاکان بکەین دەبینین هیچ کەمبوونەوەیەکی گەشبین بەدیناکرێت. بە پێی ر ت ج لە ساڵی 1991-2001 دا عێراق 124 ئەیدزدار و 222 هەڵگری ڤایرۆسەکەی تۆمارکردوە کە زۆربەیان نێرینەی هێمۆفیلیاداربوون و لە

ڕێگای خوێنەوە تووشی ڤایرۆسەکە و پاشتر ئەیدز بوون (54) . لە مانگی ئۆکتۆبەری 2005 دا بەرپرسانی تەندروستی ئێران رایانگەیاند کە نزیکەی 300 کوردی رۆژهەلاتی کوردستان کە دانیشتوانی شاری سنە ن تووشی ڤایرۆسەکەبوون ، زۆربەی زۆریان لە ڕێگای لێدانی دەرزییەوەیە لە خوێنهێنەرەکانیان تووشی ڤایرۆسەکە بوون

لە 21 ی نۆڤەمبەری 2005 دا ر ت ج رایگەیاند کە ڕێژەی تووشبوون بە ڤایرۆسەکە لە ئەفریقادا کەم بۆتەوە وەلێ ڕێژەی تووشبوون لە جیهاندا بە رادەیەکی دراماتیکی بەرزبۆتەوە بە تایبەتی لە ولأتانی سۆڤییەتی کۆندا .

## هۆی سۆی HIVو ئەیدز

هۆی سەرەکی سۆکە ڤایرۆسێکە لە خێزانی ڕێترۆڤایرۆس لەجۆری لێنتی (لاتینی مانای هێواش یان لەسەرخۆ)و ناوە کورتکراوەی HIV بۆ بەکاردەهێنرێت. بەشەکانی ڤایرۆسەکە شێوەیەکی بازنەیی هەیە، تیرەی ڤایرۆسەکە نزیکەی 110 نانۆمیترەو لەدەرەوە بەبەشێکی پرۆتینی دەورەدراوە. هەرچەندە لەکاتی سۆ کەدا ڤایرۆسەکە دژە تەنێکی زۆر لەناو خوێنی نەخۆشدا دروست دەکات، بەلأم ڤایرۆسەکە هەر دەتوانێت لەناو خوێندا بمێنێتەوە. ئەوەی راستی بێت ڤایرۆسەکە چەند ناوێکی تری وەك LAV (lymphoadenopathy Virus) و HTLV-3 هەبووە پێش ئەوەی ر ت ج ناوی HIVی لێبنێت. ئەوەی شایەنی باسە زیادبوونی ڤایرۆسی HIV بەخۆکۆپی کردن هەزاران جار لەڤایرۆسەکانی تر خێراترە.

هەروەها سەلمێنراوە کە پێویستە نزیکەی 100 میکرۆلیتر لەخوێنی تووشبوو بەڤایرۆسەکە بچێتە ناو لەشەوە تا مرۆڤ تووشی ڤایرۆسەکە ببێت، وەلێ لەهەوی زەردوویی جۆری B دا تەنیا 10 میکرۆلیتر لەخوێنی تووشبوو پێویستە بۆ تووشبوون بەزەردوویی B. ئەمەش ئەو راستییە دەسەلمێنێت کە ڤایرۆسی HIV یەکێکە لەسۆ بەناوبانگەکانی سەدەی بیست .

## ڤایرۆسی HIV

ئەم ڤایرۆسە سەر بەخێزانی ڕێترۆڤایرۆسە لەجۆری لێنتی، وەکو هەموو ڤایرۆسەکانی تر لەناوك coreو Envelop پێکهاتووە کەچەند ئەنزیمێکی تایبەتی تیادایە کەترشەلۆکی RNA دەگۆڕێت بۆ DNA.

ناوی coreی Genome ی لێنراوە چونکە نهێنی بە رووگرەمادەکان دەگوێزنەوەو بڕیاری گەشەکردنو زیادبوونو زۆربەی تایبەتمەندییەکانی ڤایرۆسەکەش دەدات. هەروەکو ئەو ناوکە ئەسیدانە وایە کە لە ناوکی زۆربەی خانە زیندووەکاندا هەیە. Genome ی ڤایرۆس بەوە جیادەکرێتەوە کە دەتوانێت خۆی لەناو ناوکە ئەسیدەکاندا ونبکات و ببێت بە بەشێکی گرنگ لەناوکی خانەکە و هاوکات هەموو بڕیارێکیش بدات.

خێرایی زیادبوونی ڤایرۆسەکە 1000 جار لەخێرایی زیادبوونی ڤایرۆسەکانی تر زیاترە و لەبەر ئەم خێرایی زیادبوونەشە لەهەر ملیلیترێکی خوێنی تووشبوودا نزیکەی 10-100 هەزار ڤایرۆسی چالاکی تێدایە. ئەم ژمارە زۆرە دەبێتە هۆی ئەوەی کەڤایرۆسەکە بەئاسانی لە ڕێگای دەمی برین و رووشاوییەوە خۆی بخزێنێتە ناو ناوپۆشی لێو، دەم، کۆم، گولینکو پاشتریش بگاتە ئەندامەکانی تر یان لە ڕێگای دەرزییەوە راستەوخۆ بگاتە ناو لەش. شارەزایانی بواری ڤایرۆسزانی دەبێژن کە نزیکەی 100 میکرۆلیتر لەخوێنی ڤایرۆساوی بەسە بۆ تووشبوون بەڤایرۆسی HIV.

**جۆرەکانی ڤایرۆسەکە**

تا ئەمڕۆ بەچەند شێوەیەك باسی جۆرەکانی ڤایرۆسەکە کراوە ، بەلام پاش ساڵی1995 زۆر لەشارەزایانی ئەیدز جۆرەکانی ڤایرۆسەکەیان بەم شێوەیە داناوە:

1- جۆری HIV-1:

لەهەموو جیهاندا بلاوە، زۆربەی زۆری توێژەران ئەم جۆرەیان کردووە بەسێ (3) گرووپی ترەوە بەناوی گرووپی (major) M ,(outlier)O و (nover or non-o-non-m) N.

گرووپی M: تا ئەمڕۆ 9 جۆری (A, B, C, D, F, G, H, J,K) سیرەمی ناسراوەتەوە لە گرووپەکانی تر بلاوترن و هەر جۆرێکیان تایبەتە بە ولاتێك یان بە چەند ولاتێك.

جۆری C بلاوترین جۆری ڤایرۆسەکەیە. جۆری سیرەمی K لەساڵی 1999دا لەلایەن گرووپێك توێژەری فەرەنسییەوە دەستنیشانکراوەو زیاتر لە ولاتی کامیرۆندا بلاوە. وەلێ جۆری سیرەمی E تا ئەمڕۆ نەدۆزراوەتەوە.

گرووپی O: ئەمیش 3 جۆری سیرەمی (o1, o2, o3) هەیە هەریەکێکیان تایبەتە بە ولاتێك یان بەچەند ولاتێك.

گرووپی N: واتە جۆری سیرەمی(novel or non-o-non-m) .

2- جۆری HIV-2:

دووەمین جۆری ڤایرۆسەکەیەو سەلمێنراوە زیاتر لە رۆژئاوای ئەفەریقادا بلاوە دەبێتە هۆی نەخۆشیی ئەیدزو پێنج (A, B, C, D, E) جۆری سیرەمی هەیە. ئەم جۆرە لەو نەخۆشانەدا جیاکرانەوە کە نەخۆشیی Aids Related Complex (ARC) یان هەبووە. لە 1٪ دا هۆی تووشبوون دەگەڕێتەوە بۆ ئەم جۆرە ڤایرۆسە.

وا دەرکەوتووە کەڤایرۆسەکە لە ئەورووپادا زۆر کەمە بەلام لەولاتی پورتوگال بەرێژەی لە 13٪ لەنێو ئەو کەسانەدا دەبینرێت کەتووشی نەخۆشییە درمییە زایەندییەکان لە 29٪ی ئەو کەسانەی لەهەمان کاتدا تووشی دەردەباریکەو سۆی HIV بوون. ئەم جۆرە ڤایرۆسە زیاتر لەڤایرۆسی SIV دەکات نەك لەڤایرۆسی HIV-1.

**چۆن ڤایرۆسەکە دەچێتە ناو خانە لیمفاوییە یاریدەدەرەکانەوە**

1- ڤایرۆسەکە خۆی لە ئەنتیجینی سەر رووی لیمفۆسایتە یاریدەدەرەکان CD4 نزیك دەکاتەوەو تا پێیانەوە دەنووسێت.

2- ڤایرۆسەکە توێکڵەکەی خۆی دادەماڵێت خۆی دەترنجێنێتە ناو RNA.ەوە.

3- بەیاریدەی ئەنزیمی (Reverse transcriptase) ناوکە ئەسیدی RNA ی ڤایرۆسی HIV دەگۆڕێت بۆ DNA.

4- ڤایرۆسەکە دەچێتە نێو DNAی خانە یاریدەدەرەکانەوەو لەوێدا خۆی وندەکات.

5- ڤایرۆسەکە ناوکە ئەسیدەکە داگیردەکاتو دەبێتە بڕیاردەری DNAی خانەکەو لەبەر ئەمەیە ملیۆنەها خانەی کۆپیکراوی وەکو خۆی دروست دەکاتو پاشتریش خانەکە دەدڕێو دێنە دەرەوەو هێدی هێدی خانەکانی دراوسێیانو خانەی نوێش تووشدەکەن.

**ڕێگاکانی گواستنەوە**

ئـەوەی شـایانی باسـە هـەموو سـۆیەك هۆیـەکی هەیـە لـەم بـارەدا ڤایرۆسـەکە پێویسـتی بـە ڕێگـای گواستنەوەو هۆکاری یاریدەدەر هەیە تا لەیەکێکەوە بگوێزێتەوە بۆ یەکێکی دی.

سـۆی ڤایرۆسـی HIVو نەخۆشـیی ئەیـدز وەك یـەك نـین و بگـرە جیاوازییـەکی زۆر لەنێوانیانـدا هەیـە. بەلایەنی کەمەوە ڤایرۆسەکە پێویستی بە 8-10 ساڵ یان زیاتر هەیە تا مرۆ تووشی نەخۆشیی ئەیدز دەبێت.هـەروەها تـا ئـەمڕۆ ژمارەی هـەموو تووشبووان لـە هیچ کۆمەڵگایـەك نازانرێت. ئـەوەی تـا ئێستا ئاشکرایە ژمارەی ئەو کەسانەیە کە HIV پۆزەتیڤن و تۆمارکراون. بەڵام هـەرگیز نـازانین ژمـارەی پۆزەتیڤە تۆمارنەکراوەکان چەندن، چونکە کارێکی بێهوودەیە.

ڤایرۆسەکە تەنیا بەم ڕێگایانەی خوارەوە دەگوێزرێتەوە:

1- ڕێگای زایەندی

ڕێگـای سـەرەکیی گواسـتنەوەی ڤایرۆسـەکەیە، چونکە لـە 70-80٪ی تووشبووان بـەم ڕێگایـە تـووش دەبن، هەروەها لە 5-10٪ی هۆمۆرگەزبازەکاندا نێر + نێر، لە 70٪ی هێتێرۆرەگەزباز نێر + مێ، مێ + نێر، واتە بەهەموو شێوەکانی زایەندی دەگوێزرێتەوە، ڕێژەی ڤایرۆسەکە لە سپێرم و شلەی نێو گولینکی ژندا زۆر بەرزە.

2- ڕێگای خوێن

نزیکـەی لـە 3-5٪ی تووشـبووان بـە ڕێگـای خوێنـەوە تووشـی ڤایرۆسـەکە دەبـن، (بەتایبـەتی هیمۆفیلیـاداری جۆری A یـان کەفاکتۆری 8 یـان ناتـەواوە یـان هیمۆفیلیـاداری B واتـە فاکتۆری 9یـان ناتەواوە). مەترسی بڵاوبونەوە بەم ڕێگایەدا کەمبۆتەوە چونکە پێش بەکارهێنان هەموو خوێنێت تێست دەکرێت ئینجا دەدرێت بە نەخۆش .

3- ڕێگای بەکارهێنانی دەرزی

لە 5٪ی بارەکاندا ڤایرۆسەکە لەڕێگەی دەرزی لێدانی خوێنهێنەرەوە (بەنگکێشەکان یـان برینپێچەکانی نەخۆشـخانەکانەوە) دەگوێزرێتـەوە، هەرچـەندە ئـەمڕۆ ترسـی تووشـبوون یـان گواستنەوەی ڤایرۆسـەکە بەدەرزی برینپێچـەکان لـەماڵ و نەخۆشـخانەکاندا زۆر کەمبووەتـەوە، چونکە لـە زۆریـەی وڵاتانـدا ئـەمڕۆ دەرزی پلاستیکی بۆیەك جار بەکاردەهێنرێت.

4- ڕێگای دایك بۆ ئاولەمە

لە ئاماری جیاجیادا دەرکەوتووە کەنزیکەی لە 8-10٪ی هەڵگرانی ڤایرۆسەکە بەم ڕێگایە تووشبوون، لەوانەیە پێش لە دایکبووندا یان پاش لە دایکبوون (کاتێك ئاولەمە لەزامالدایە)، لەکاتی لـە دایکبووندا یـان پـاش لـە دایکبـوون بـەهۆی خـوێن یـان شـیری دایکـەوە سـاوا تـووش ببێـت. هـەروەها تووشـبوونی ئاولەمە کاتێك لەنێو زامالدایە زۆر گیروگرفت بۆ پزیشك و دایکوباوکان دەخوڵقێنێت.

5- چاندنی ئەندام

هەرچەندە ژمارەی ئەو کەسانەی کەبەڕێگای چاندنی ئەندامێك یـان شـلەیەکی نـاو نەخۆشییەك تووشـی ڤایرۆسەکە بووبن کـەمن، وەلـێ گواسـتنەوەی (سـپێرم، گورچیلەو شـلەی تـر) دەبنـە هـۆی گواسـتنەوەی ڤایرۆسەکە.

**نیشانەکانی سۆکە**

زۆرجار مرۆڤی تووشبوو پێی وایە تووشی سۆیەکی ئاسایی بووەو بێئەوەی بیر لەHIV بکاتەوە، لێرەدا نیشانەکانی سۆکە لە 3 خاڵی گرنگدا کۆدەکەمەوە کەئەمانەن:

1- سۆی کوتوپڕی بێنیشانە.

2- سۆی کوتوپڕی نیشانەدار.

3- گەورەبوونی لیمفەگرێکان.

**ماوەی کڕکەوتنی ڤایرۆسەکە**

بریتییە لەو کاتەی کەڤایرۆسەکە دەچێتە ناو لەشەوە تا دەرکەوتنی نیشانەکانی سۆکە، ئەم ماوەیەش لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی ترو لەتەمەنێکەوە بۆ تەمەنێکی تر جیاوازە.

- گەر ڤایرۆسەکە بە رێگای زەیەنددا بچێتە ناو لەشەوە ئەوا ماوەی کڕکەوتنەکە لە نێوان 10-14 مانگدایە.

- گەر ڤایرۆسەکە لە رێگای خوێن یان دەرزی لێدانەوە بگاتە ناو خوێن ئەوا ماوەی کڕکەوتنەکە لە نێوان 1-3 مانگدایە.

- لە سۆ بێنیشانەکاندا ماوەکە لە نێوان 6-12 هەفتەدایەو پاشتر دژەتەنەکان دەردەکەون.

**1- سۆی کوتوپڕی بێنیشانە**

بەگشتی لەسەرەتادا نەخۆش باری ژیانی باشەو کارو ژیانی کۆمەڵایەتی بەئاسایی ئەنجام دەداتو هیچ نیشانەی نەخۆشیی پێوە دیارنییە. بەڵام لە راستیدا هەڵگری ڤایرۆسەکەیەو بەو رێگایانەی پێشووتر باسکران دەتوانێت ڤایرۆسەکە بگوێزرێتەوە بۆ یەکێکی دی، جاری واش هەیە بارە سۆییەکە ماوەیەکی زۆر دەخایەنێت.

**2- سۆی کوتوپڕی نیشانەدار**

لەم بارەدا نەخۆش نیشانەی گشتیو نیشانەی تووشبوونی ئەندامەکانی تیادا دەردەکەوێت، بەڵام نیشانەکان زۆر تایبەت نین. لەسەرەتادا تووشبوو هەندێک نیشانەی سۆی ڤایرۆسی تیادا دەردەکەوێت.

**گرنگترین نیشانەکانی ئەم قۆناغە :**

- نیشانە گشتییەکان، ماوەی 3-14 رۆژ تالێهاتن، ژانکردنی گەروو، ئاوسانی لیمفەگرێکان، ژانکردنی جومگەو ماسولکەکان، لەش داهێزران، نەمانی ئارەزووی خواردن، کەمبوونەوەی کێشی لەش.

- نیشانە دەمارییەکان، ژانەسەر، ژانکردنی قوڵایی چاو، سۆی پەردەی مێشک و دەمار.

- نیشانەکانی پێست، دەرکەوتنی پەڵەی سوورو پەمەیی، ئاڵۆش، قژوەرینو سەر رووتانەوەو پەیدابوونی برینی سەر پێستو ناوپۆشەکان.

- نیشانەکانی گەدە، کاندیدەی ناودەمو گەروو، رشانەوەو سکچوون.

- نیشانەکانی هەناسە، کۆکەیەکی بەردەوامو هەمیشەیی.

- دەرکەوتنی لیمفۆسایتە تایبەتەکان لەناو خوێنی تووشبوودا.

پاش دەرکەوتنی ئەم نیشانانە هەڵگری ڤایرۆسەکە (جارێکی دی) دەکەوێتە باری بێنیشانەیی و نیشانەیەکی ون دەبن و هێدی هێدی ڤایرۆسەکە لە لەشدا زیاتر دەبێت و دەبێتە هۆی بێهێزی و ناتەواوی کۆئەندامی بەرگری.

### 3- گەورەبوونی لیمفەگرێکان

پاش دەرکەوتنی نیشانەکان و نەبوونیان لیمفەگرێکان (زیاتر لەیەك سانتیمەتر) گەورە دەبن بە تایبەتی لە (بن باخەڵ، لامل، ژێرکاکیلەی خوارەوە) کەمزێکەی 3 مانگ بە گەورەیی دەمێننەوە. د.پیتر پیۆت لێپرسراوی پرۆگرامی ئەیدزی نەتەوە یەکگرتووەکان (UNAIDS) قۆناخەکانی سۆی HIV و ئەیدزی بەم شێوەیە نووسیوەتەوە (13):

**یەکەم قۆناخی کلینیکی**

1- بێنیشانە (چالاکییەکانی تووشبوو ئاساییە)

2- بەردەوام گەورەبوونی لیمفەگرێکان.

**دووەم قۆناخی کلینیکی**

3- کەمبوونەوەی کەمتر لە 10٪ی کێشی لەش.

4- سۆی گچکەی پێست و ناوپۆشەکان.

5- لە ماوەی 5 ساڵدا نەخۆش تووشی سۆی ڤایرۆسی زۆستەر دەبێت.

6- سۆی بەکتریایی بۆری هەناسە.

(لەم قۆناغەشدا هەڵگری ڤایرۆسەکە چالاکییەکانی بەئاسایی ئەنجامدەدات).

**سێیەم قۆناخی کلینیکی**

7- کەمبوونەوەی زیاتر لە 10٪ی کێشی نەخۆش.

8- زیاتر لەمانگێك سکچوونێکی بێچارە.

9- تالێهاتن (بەرزو نزم یان نەگۆڕ) زیاتر لەمانگێك.

10- لیوکۆپلاکی ناودەم (بریتییە لەپەیدابوونی موو لەسەر زمان و ناودەم).

11- دەردەباریکەی سییەکان (پاش چەندین ساڵ).

12- سییەسۆ وەك بەپرۆتۆزۆر یان بەکتریا.

13- کاندیدەی ناودەم .

**چوارەم قۆناخی کلینیکی**

14- مەڵبەندی کۆنترۆڵی نەخۆشییەکانی ئەمەریکا پێناسەی هەڵگری HIV بەم شێوەیە نووسیوەتەوە (بریتییە لەکەمبوونەوەی زیاتر لە 10٪ی کێشی لەش. سکچوون زیاتر لەمانگێك. تای بێچارە زیاتر لەمانگێك و بێهێزی و لاوازی).

15- سۆی سییەکان بە PCP.

16- سۆی تۆکسۆپلاسما.

17- سۆی کریپۆسپۆریدیۆسیس لەگەڵ سکچوون زیاتر لەمانگێك.

18- سۆ بەکریپۆکۆکۆسیس.

19- سۆی ڤایرۆس سیتۆمێگالۆ تر جگە لەجگەر، سپڵ و گرێ لیمفاوییەکان.

20- سۆ بەڤایرۆسە تامیسکەکان.

21- سۆی مەننگ و مێشك.

22- سۆ بەهیستۆپلاسما.

23- کەڕووی سورێنچك و بۆری هەناسە و بۆریچکە هەواییەکان و سییەکان.

24- سۆ بەمیکۆباکتریۆم.

25- سۆ بەسالمۆنێلا.

26- دەردەباریکەی دەرمووەی سپییەکان.

27- لیمفۆما.

28- سارکۆمای کاپۆسی.

29- سۆی مێشک بەڤایرۆسی HIV.

بەمەدا بۆمان روون دەبێتەوەو دەتوانین بڵێین جگە لەڤایرۆسی HIV ئەیدزدار تووشی کۆمەڵێک سۆی (ڤایرۆسی، بەکتریایی، پاراسیتیی و کەڕوو) ی تریش دەبێت.

**تێست لەتاقیگادا**

لەم بارەدا گرنگترین تێستی تاقیگایی کە لەبوونی ڤایرۆسەکەو سۆکە دڵنیامان دەکات بریتییە لەتێستی ELISA بۆ دەستنیشانکردنی ڤایرۆسی HIV، پاشتریش بۆ دڵنیابوونیش زۆر پێویستە تێستی (western blot) ئەنجام بدرێت یان پاش ماوەیەکی تر هەمان تێست دووبارە بکرێتەوە. لە هەندێک وڵاتدا بۆ دڵنیابوون لە پۆزەتیفی ئیلایسا تێستی (RIBA) کە هەرزانترە بەکار دەهێنرێت چونکە چەند هەفتەیەک پاش تووشبوون بەڤایرۆسەکە دژەتەنەکانی ڤایرۆسەکە لەخوێندا دەردەکەون. بوونی دژە تەنی تایبەتی دژ بەڤایرۆسەکە ئەوە دەگەیەنێت کەمرۆ هەڵگری ڤایرۆسەکەیەو دەتوانێت مرۆڤێکی لەشساغ بەو رێگایانەی پێشووتر تووش بکات تێستە تاقیگاییەکانی تریش وەک تێستی فەنکشنەکانی بەرگری، کەمبوونەوەی ژمارەی خرۆکە سوورو سپییەکان، نزمبوونەوەی ژمارەی CD4 (گەر بەراوردی ژمارەی نێوان T4/T8 بکرێت) ئەوا ژمارەی CD4 دەکەوێتە ژێر 350/ میکرۆلیترەوە. بەرزبوونەوەی ژمارەی گاما گلۆبولینەکان هەریەکەیان گرنگییەکی تایبەتی خۆیانیان هەیە، هەروەها کەمبوونەوەی لیمفۆسایتە یاریدەدەرەکان CD4 مانای ئەوەیە کە سۆکە کۆئەندامی بەرگریی لاواز کردووەو کاتێکی لەبارە بۆ دەرکەوتنی سۆیە هەلپەرستەکان، پاشتر لەم بارەدا سۆکە رووەو ئەیدزو دواقۆناغ مردن دەڕوات.

**تێبینی**: تێستی RIBA زۆر هەستدارترەو هەرزانتریشە وەک لە تێستەکانی تر.

**گرنگی تێستی HIV**

- بە هۆی ئەم تێستەوە دەتوانین دەستنیشانی دژەتەنی تایبەتی ڤایرۆسی HIV بکەین.
- لە ئەنجامی تێستەکەدا ژمارەی مرۆڤە پۆزەتیڤەکانمان بۆ دەردەکەوێت.
- دەتوانین ئاماری زانستی ئەنجام بدەین.
- بە پێی ژمارەی تووشبووان دەتوانین پلانی خۆپاراستن دابنێین.

**تێستی دژەتەنی HIV**

نزیکەی 3 مانگ پاش تووشبوون بە HIV، لەش دەکەوێتە دەرکردنی دژەتەنی تایبەتی دژ بەڤایرۆسەکە. هۆی دەرکردنی دژە تەنەکان دەگەڕێتەوە بۆ وەڵامدانەوەی لەش دژ بەبوونی ڤایرۆسەکە. بوونی دژە تەنەکان مانای ئەوە نییە کەمرۆڤ ئەیدزیەتی، بەڵکو ئەوە دەسەلمێنێت مرۆ تووشی ڤایرۆسەکە بووە (HIV پۆزەتیڤ)و پاشتریش تووشبوو دەتوانێت کەسانی تر تووش بکات.

هەموو کاتێک بۆ دڵنیابوون لەدەستنیشانکردنی میکرۆئۆرگانیسمێک پێویستە تێستی بەکتریا، ڤایرۆس، پاراسیت و کەڕوو بکرێت.

ئەوەی راستی بێت ڤایرۆسی HIV لەناو خوێن، میز، سپێرم، فرمێسک، لیک، مۆخی بڕبڕەی پشت و شلەی ناو گولینکدا جیاکراوەتەوە، جا لەبەرئەوە زۆر پێویستە لەکاتی گومانکردن لەسۆی ڤایرۆسی HIV باشتر

وایە نموونەیەکی خوێن وەربگیرێت و بنێررێت بۆ تاقیگای ڤایرۆسی بۆ دەستنیشانی دژەتەنەکانی ڤایرۆسەکە بکرێت (تێستی ELISA لەهەموو تاقیگاکاندا ئاسانترەو خەرجی کەمیشی دەوێت تا دژەتەنەکان بناسرێتەوە)، دەنا جیاکردنەوەی خودی ڤایرۆسەکە کات و پارەیەکی زۆری پێویستەو هاوکات کارێکی زۆرگرانە.

لەم سۆیەدا خوێن وەرگرتن بۆ تێست کردن وەکو تێستەکانی تر وایە تەنیا ئەوە نەبێت کەپێویستە پەرستار لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ خوێندا وردتر و هێمن تر و باشتر ئاگاداری خۆی بێت. هەرچەندە دەتوانین شلەی تری ناو لەش وەربگرین بۆ تێست کردن بەڵام بەرزی رێژەی ڤایرۆسەکە لە خوێندا وەك لەناو هەموو شلەکانی تردا بەرزترە. هەروەها پاکوخاوێنی نەخۆش و کاربەدەستانی نەخۆشخانەکان مەرجێکی سەرەکییە.

**سوودی تێستەکە**

دەستنیشانکردنی سۆکە زۆر گرانە و زۆرجار نیشانەکانی سۆکە پزیشك بە هەڵەدا دەبات یان بەپێی نیشانە هاوبەشەکانی سۆکە پزیشك بیر لە شێرپەنجە یان سۆیەکی ڤایرۆسی تر دەکاتەوە. پێویستە بۆ دڵنیابوون لەسۆکە تێستی دژەتەنی تایبەتی دژ بە ڤایرۆسەکە ئەنجام بدرێت. چونکە مرۆڤ زۆرجار بێنیشانەیە و پێنازانێت هەڵگری ڤایرۆسەکەیە و هاوکات ڤایرۆسەکەش دەگوێزێتەوە بۆ یەکێکی تر. لەلایەکی ترەوە هەر کاتێك توانیمان ژمارەی هەڵگرانی ڤایرۆسەکە بزانین ئەو دەم بە ئاسانی ئامارێك دروست دەکەین، کە لەسەر بنچینەی ئەو ئامارە پلانی خۆپاراستن و نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسەکە دادەرێژرێت و هاوکات ئەوەی پێویستە مرۆڤی لێ ئاگاداردەکرێت.

**کێ پێویستە تێستی HIVی بۆبکرێت؟**

- ئەو کەسانەی گومان لەخۆیان دەکەن کە تووشی ڤایرۆسەکە بوون.
- ئەو کەسانەی کە هۆمۆو هێترۆ رەگەزبازن.
- پێویستە هەموو ژنێکی ئاوس لەیەکەم سێ مانگی ئاوسیدا تێستی HIV بکات.
- ئەو کەسانەی کەخوێن دەدەن (هەموو خوێندەرەکان).
- هەموو نەوزادێك (نۆبوو).
- ئەو کەسەی کە ئەندامێکی لەشی دەبەخشێت بۆ چاندن لەمرۆڤێکی تردا.
- پێش هاوسەرێتی پێویستە (نێرینەو مێوینە) تێستی خۆیان بکەن.

**ئەنجامی تێستەکە**

**تێستی HIV ی پۆزەتیڤ**: مانای ئەوەیە کەئەو کەسە تووشی ڤایرۆسەکە بووەو دەتوانێت کەسێکی تر تووشبکات.

**تێستی HIV ی نێگەتیڤ**: مانای ئەوەیە کەئەو کەسە تووشی ڤایرۆسەکە نەبووە.

*** هەوکردنی کوتوپڕ بە ڤایرۆسی HIV**

ئەوەی شایانی باسە لە 5 ساڵانەی دووایدا بەشێکی گرنگ کە بریتییە لە چۆنیەتی دەستنیشانکردنی هەوکردنی کوتوپڕ بە ڤایرۆسەکە کەوتۆتە باس و لێکۆڵینەوە کە ئەنجامی باشی بە دەستهێناوە ئەمەش یارمەتی زوو دەستنیشانکردنی هەوکردنە کوتوپڕەکە بکرێت و بەیارمەتی دژە ڤایرۆس توانراوە کۆنترۆڵیش هەوکردنەکە بکرێت .

نیشانە گرنگەکانی ئەم قۆناخە کوتوپڕە بریتین لە:

- تالیهاتن بە ڕێژەی لە 80٪.
- گۆرانکاری پێست 51٪ .
- بریتی چاو 37٪ .
- ژانە جومگە 54٪ .
- کەمروونیشە 44٪ .
- نەمانی ئیشتیهای خۆراك 54٪ .
- نزمبوونەوەی کێشی کەش بە ڕێژەی زیاتر لە 2,5 کیلۆگرام 32٪ .
- ژانە ماسولکە49٪ .
- تا و گۆرانکاری پێست 46٪.

سوود لە سەرچاوەی ژمارە (56) وەرگیراوە .

لەئەنجامی ئەو توێژینەوانەی کە کراون روون بوەتەوە کە قۆناخە کوتوپڕەکە لە نێوان 7-10 رۆژدایە ، زۆر بە دەگمەن لە سەروو 2 هەفتەوەیە . ئەو توێژینەوانەی کە بەم نزیکانە ئەنجام دراون ئەو راستیانە دەسەلمێنن کە تێستی(branched chain DNA,PCR and GenProbe) هەرچەندە ئەم تێستە لە 100٪ هەستداربووە بەلام 2-5٪ ئەنجامی پۆزەتیفی بە هەلە داوە بە دەستەوە .

## ئەیدز

ئەیدز بریتییە لەبێهێزیو کەموکوڕیی کۆئەندامی بەرگریی لەش دژی HIVو لە قۆناخێکی دواتردا نەخۆش تووشی هەندێك سۆی هەلپەرستی ڤایرۆسیو بەکتریایی و مشەخۆری و کەڕوویی تریش دەبێتو پاش ئەوە ماوەیەکی نادیار دەژی.

**نیشانەکانی ئەیدز**

چەند ساڵێك پاش سۆکە بەڤایرۆسەکەو لاوازبوونو ناتەواوی بەرگریی لەش، نەخۆش وای لێدێت بەتەواوی لەکاردەکەوێتو چیتر ناتوانێت چالاکییەکانی رۆژانەی ئەنجام بدات.

لە توێژینەوەی جیاجیادا روونبووەتەوە کە لەپێنج ساڵی یەکەمدا تەنیا سێیەکی هەڵگرانی ڤایرۆسەکە نیشانەی سۆکەیان هەبووە. نزیکەی لە25٪ی تووشبووان هەندێك نیشانەی سۆی ڤایرۆسی وەك (ماندووبوون، نزمبوونەوەی پلەی گەرما بۆ ماوەیەکی درێژو سکچوونو لاوازبوون)یان هەبووە. پاشتریش تووشبوو کۆمەڵێك نیشانەی کلینیکی کە بە(**نیشانە گەورەکان**) دەناسرێت تیادا دەردەکەوێت، هاوکات چەند نیشانەیەکی تر کە بە(**نیشانە گچکەکان**) دەناسرێن دەردەکەوێت.

**نیشانە گەورەکان**

- کەمبوونەوەی پتر لە 10٪ ی کێشی لەشی نەخۆش.
- سکچوونی تولانی پتر لەمانگێك.
- ژانەسەر پتر لەمانگێك.

**نیشانە گچکەکان**

کۆکەی بەردەوام، پێستەسۆ، تامیسکی زۆستەر، بۆقژەی ناودەم و گەروو، تامیسکی لالێو، ئاوسانی لیمفەگرێکان، وەلێ بوونی سارکۆمی کاپۆسی و پەرەسۆی مێشکی کوتوپڕ بە کرپیتۆکۆکەس بەتەواوی نەخۆشی ئەیدز دەستنیشان دەکات.

**دەستنیشانکردن**

بۆ دەستنیشانکردنی سۆکە زۆر پێویستە لەناو خوێندا دژەتەنی دژی ڤایرۆسەکە یان ئەنتیجینی ڤایرۆسەکە بدۆزرێتەوە. وەلێ شارەزایان لەبواری ئەیدزدا پێیان وایە کە (دوو نیشانەی گەورەو نیشانەیەکی گچکەی هەستپێکراو یان بینراو) بەسە بۆ دەستنیشانکردنی ئەیدز.

**تاقیگا**: ئەوەی راستی بێت جگە لەو نیشانانەی کەپێشتر باسیان لێوەکرا دڵنیاترین رێگا بۆ دەستنیشانکردنی زۆربەی نەخۆشییە ڤایرۆسییەکان بریتییە لەجیاکردنەوەی ڤایرۆسەکە یان دەستنیشانکردنی دژەتەنی تایبەتی دژ بەڤایرۆسەکە.

لەکاتی سۆی ڤایرۆسی HIV دا لە تاقیگادا توانراوە ڤایرۆسەکە لە هەموو شلەکانی ناو لەشی ئادەمیزاددا بدۆزرێتەوەو هەروەها دەرکەوتووە کە:

- دژەتەنی دژی ڤایرۆسەکە پۆزەتیڤە.
- ئەنتیجێنی ڤایرۆسەکە پۆزەتیڤە
- بەرزبوونەوەی گاماگلۆبۆلینەکان
- بەرزبوونەوەی ئەنتیجێنی P 24.
- بەرزبوونەوەی دژەتەنی P 24.
- نزمبوونەوەی هیمۆگلۆبۆلینی ناوخوێن.
- نزمبوونەوەی رێژەی نیوترۆفیلەکانی خوێن.
- نزمبوونەوەی لیمفۆسایتە یاریدەدەرەکان.
- نزمبوونەوەی خەپلەی خوێن.
- نزمبوونەوەی ئینتەرفیرۆن.
- نزمبوونەوەی ئینتەرلیۆکینی 2 (ڤایرۆسی HIV لیمفۆسایتەکانی T لە ناودەبات).

**چی پێویستە مرۆ بیکات؟؟**

لە ئەنجامی ئەو توێژینەوەو ئامارانەدا کەپەیتا پەیتا دەکەوێتە بەردەستی پزیشکان، تا ئەمڕۆ مرۆ بەئەنجامی جیاجیا گەیشتووە کە گرنگترینیان ئەمانەن:

– بۆ هەموو کەسێك روونبووەتەوە کە (تا ئەمڕۆ) نەکوتان دژی ڤایرۆسەکە، نە دەرمان بۆ لەناوبردنی ڤایرۆسەکە هەیە.

– پێویستە مرۆڤ ئاگاداری تەندروستیی خۆیی و خەڵکی بێت و لەکاتی زایەندندا کۆندۆم بەکاربهێنێت تاخەڵکی تووش نەکات.

**گەر گومان لە نەخۆش بکرێت ئەیدزدارە، پێویستە ئەم تێستانە ئەنجام بدات:**

**1- تێستی خوێن.**

**کەمخوێنی، کەمبوونەوەی ژمارەی خڕۆکەی سپی و سوورەکان.**

**2- تێستی بەگری**

- **لیمفۆسایتی B (بەرگری هۆمۆراڵ).**
- **تەواوکەر، دژەتەنی ئاوتۆمات، ئیمیونۆگلۆبولینەکان.**
- **لیمفۆسایتی B (بەرگری خانەیی).**
- **تێستی PPD (بۆ نەخۆشیی سیل - تێستی Mantoux).**
- **تێستی گۆڕانی لیمفۆسایتە بلاستەکان.**
- **ڕێژەی نێوان T4 و T8.**

**3- بایۆکیمیکی: ئیمونۆگلۆبولینەکانی بێتا 2 زۆر زیاد دەکەن.**

**4- جیاکردنەوەی ڤایرۆسەکە: جیاکردنەوەی تەنۆلکەی ڤایرۆسەکە یان پێکهاتووی تەنۆلکەی ڤایرۆسەکە.**

**5- ئینتەرفیرۆن: زۆر نزم دەبێتەوە.**

**6- ئینتەرلیوکینی 2: زۆر نزم دەبێتەوە.**

**7- دەستنیشانکردنی تاقیگایی سۆ هەلپەرستەکان.**

**تێبینی: لەم ساڵانەی دواییدا تێستی RIBA بۆ دڵنیابوون لەپۆزەتیڤی تێستی ELISA بەکاردەهێنرێت و زۆر بەسوودەو خەرجیشی کەم تێدەچێت.**

**تێبینی: زۆر پێویستە ئەم کەسانە لەژێر چاودێری تێستکردنی HIV دا بن:**

**خوێنـدەرەکان، سـکپڕەکان، لاوان (هۆمـۆو هێترۆڕەگـەزبان) و ئـەو کەسـانەی لـەو وڵاتانـەوە دێـن کەڤایرۆسەکەی زۆر تیادا بڵاوە.**

**نیشانەکانی هەوکردنەکە لەمێوینەدا**

**نیشـانەکانی سـۆی ڤایرۆسـەکە لـە نێـوان ژن و پیـاودا، گـەورەو منداڵـدا، ڕەش پێسـت و سـپی پێسـتدا جیاوازە، هەروەها دەرکەوتنی نیشانەکان بەندە لەسەر بەهێزیی کۆئەندامی بەرگریی ئەو کەسە. ئەوەی ڕاسـتی بێـت ناسراوترین سۆ کـە زۆرجار تووشـی مێوینـە دەبێـت و وەك نیشـانەیەکی سـەرەکی دەدرێتـە قەڵەم بریتییە لەکەڕووی گولینگ، ئاوسانی لیمفەگرێکاَن و سۆی بەکتریایی سییەکان.**

**نابێـت ئـەوەشمان لـەیاد بچێت کـە نیشـانەکانی سییەسـۆی سـترێپتۆکۆکوس یـان سـۆی هـایمۆفیلوس ئینفلوەنزاش لەپیاویشدا دەردەکەوێت.**

**ئەو کەسانەی کەهەڵگری ڤایرۆسەکەن سۆ بەکترییایەکانیان زیاتر تیادا دەردەکەوێت، لەبەرئەوە زۆرجار مـرۆڤ بەهەڵـەدا دەچێـت و نـە نـەخۆش و نـە پزیشـك بیر لـە سـۆی HIV ناکەنـەوە. تووشـبوو پێـی وایـە کەتووشی بەکتریایەکی ئاسایی بووەو بەئەنتیبایۆتیك چارەسەردەکرێت.**

**مەڵبەنـدی کـۆنترۆڵی نەخۆشـییەکانی ئـەمێریکا ڕایگەیانـد کەزۆربـەی HIV پۆزەتیڤـەکان لـەقۆناخێکی دواتردا ژمارەی CD4 ی لەژێر 200 خانەوەیە/ میکرۆلیتردایە، لەم بارەدا سۆ هەلپەرستەکان دەردەکەون. بەڵام کاتێك مێوینـە HIV پۆزەتیڤـە ئـەوا بۆقڕەی سورێنچك زۆرجـار بەرێـژەی 25٪ دەردەکەوێت، بـەڵام ڕێژەکە لەپیاودا تەنیا لە 3٪ دایە. (ئەم ڕێژانە لە گۆڕاندایە)**

ئەوەی شایانی باسە تامیسکی ئاسایی و تامیسکی زاووزێ لەمێوینەدا لە 16٪ دایە بەڵام لەپیاودا لە 3٪ دایە. هەروەها رێژەی سورێنچکەسۆ بە ڤایرۆسی تامیسی سورێنچك لە نێرینە و مێوینـەدا وەکو یەکە. مەترسیی سۆی ڤایرۆسی پاپیلۆمایی مرۆڤ بەتایبەتی جۆری 16و 18 لەئافرەتە HIV پۆزەتیڤەکاندا زیاترەو ناسراون ، دەبنە هۆی کارسینۆما (جۆرێکە لە شێرپەنجەی ملی زامال).

ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە ئەو خانانەی کەهەڵگری ڤایرۆسەکەن و ژمارەی CD4 یان لەنێوان 200-500 دایە زیاتر تووشی کەرووی ناوپۆشی گولینك دەبن وەك لەوانی تر. لەم ساڵانەی دواییدا فەرەنگی سەرەتایی و لاوەکی و هەروەها فەرەنگی دەماریش لە HIV پۆزەتیڤەکاندا زۆربووە. سۆی تریپۆمۆناس یەکێکە لەو سۆیانەی زیاتر تووشی خانمە HIV پۆزەتیڤەکان دەبێت.

**رێگاکانی تووشبوونی کۆرپەلە**

توێژیاران توانیویانە ژمارەیەکی زۆر لەڤایرۆسەکە لەسپێرم و شلەی نێو ملی زامال (مندالدان)ی ژندا جیابکەنەوەو زۆرجار واتێبینی کراوە کەڤایرۆسەکە بەم رێگایانەدا گوێزراوەتەوە:

- پێش لە دایکبوون، لە رێگای وێڵاشەوە، ئاولەمە تووشی ڤایرۆسەکە دەبێت (ئاولەمە پەیوەندیی راستەوخۆی بە وێڵاشەوە هەیە).
- لەوانەیە لەکاتی لە دایکبووندا لەکونە لووت ، دەموچاوەوە مندال تووشی ڤایرۆسەکە ببێت.
- زۆرجار پاش لە دایکبوون لە رێگای شیردانی دایکەوە ساواکە تووش دەبێت.
- لە وانەیە لە رێگای بەکارهێنانی دەرزی خوێنهێنەرەوە تووش ببێت (لە ناو نەخۆشخانە).

**نیشانەکانی مندالی HIVی پۆزەتیڤ**

هەموو سۆیەك زوو یان درەنگ نیشانەکانی دەردەکەوێت. لە کاتی سۆدا بە ڤایرۆسی HIV مندالیش وەك گەورە چەند نیشانەیەکی هاوبەش و هاوکات چەند نیشانەیەکی تری تیادا دەردەکەوێت کە لە گەورەدا نییە. بەمانایەکی تر سۆکە لەمندالدا ئالۆزترە وەك لەگەورەدا، گرنگترین نیشانەکانیش ئەمانەن:

- ئاوسانی لیمفە گرێکانی لامل و بن هەنگڵ
- سپڵ و جگەر گەورە دەبن کە دەبنە هۆی ئاوسانی سك، سووتانەوەی جگەرو گەدە.
- مندال لەسەرخۆو بەهێواشی گەشە دەکات.
- سکچوون ، زۆرجار مندال تووشی سۆی گوێچکە دەبێت.
- هیشکبوونەوەی ناودم، سورێنچك. پەردەی ناوەوەی گەدەو ریخۆڵە کە دەبێتە هۆی سووربوونەوەو کزانەوەو مندال زۆر وەڕس دەکەن بەتایبەتی لەکاتی شیرخواردندا.
- مندال تووشی سووربوونەوەو سییەسۆ دەبێت، کەدەبێتە هۆی گیروگرفت لەکاتی هەناسەداندا، هۆی هەناسە توونـدیش دەگەڕێتەوە بـۆ کەمبوونـەوەی ئۆکسـجین لەخوێنـدا. هـەروەها سییەسـۆ لەمندالـدا زۆر تونـدترە وەك لەگەورەدا.
- گەر ڤایرۆسەکە بگاتە کۆئەندامی دەمار، مندال تووشی شەپلەی دەست یان پێ دەکات.

هەندێك لـەو مندالانـەی کـە لەزامالـدا تووشـی ڤایرۆسـەکە بـوون، پـاش لـەدایکبوون لـەم نیشـانانەیان تیادادەرکەوتووە:

* گیروگرفتـی گەشـەکردن، گچکـەیی کەللەسـەر، شێواوی کەللەسـەرو نێسـکی دەموچـاو، تـەوێڵ قۆقزی، لووت فشی.

ئەو منداڵانەی پاش لەدایکبوون تووشی ڤایرۆسەکە دەبن، ئەم نیشانانەیان تیادا دەرکەوتووە:
- کێش کەمی، سکچوون، تا، سۆی هەندێك ئەندامو کۆئەندامەکانی لەش.
- گەر ئەم نیشانانە بە بەردەوامی تەشەنە بکەن بێ چارەسەرکردن ئەوا لەماوەیەکی کورتدا منداڵ دەمرێت.
- زۆرجار منداڵی ئەیدزدار زۆر بەئاسانی تووشی مایکۆباکتریای دەردەباریکە دەبێت، کە ئەمڕۆ بووەتە گیروگرفتێکی گەورە لەرێی پزیشکاندا لەبەرئەوەی منداڵی سیلدار ناتوانێت وەك گەورە تفو بەڵغەم بکاتە دەرەوە تا زوو دەستنیشانی بەکتریاکە بکرێت.
لەساڵی 1987دا مەڵبەندی کۆنترۆڵی نەخۆشییەکانی ئەمێریکا لە راپۆرتێکدا دەبێژێت ئەو منداڵانەی پێش تەمەنی یەك ساڵییان تووشی ڤایرۆسەکە دەبن رێژەوی سۆکەیان زۆر خێراترە، هاوکات لەمنداڵانی دیکەش کەمتر دەژین.
دەستنیشانکردن لە منداڵدا
دەستنیشانکردنی بەپەلەی ئەولەمە (ئەو منداڵەی لەسکی دایکیدایە) زۆر گرنگە، لەبەرئەوەی تازووتر هەڵگری ڤایرۆسەکە دەستنیشان بکرێت ئەوا زۆر باشترە بۆ منداڵ. هەروەها دەستنیشانکردنی کۆرپەلە گەلێك گرانە، چونکە ئەو کارە پەیوەندی بەو دژە تەنانەوە هەیە کە لەخوێنی منداڵدایە. منداڵ ئەو دژە تەنانەی لەرێگای وێلاشەوە لەدایکی وەرگرتووە، لەبەرەئەوە لەم کاتەدا دایك هەڵگری دژەتەنی ڤایرۆسەکەیەو لە 100٪یش منداڵەکەش هەڵگری تەنیا دژەتەنەکانە. چونکە وەك ئەوە وایە راستەوخۆ تێستی خوێنی دایکەکە بکرێت.
پاش ماوەیەك هێدی هێدی ساوا دژەتەنەکانی دایکی وندەکاتو ئەنجامی تاقیکردنەوەش لەسەری زۆر لاواز دەبێت (لەبەرئەم هۆیەشە تا ئێستا چەند بارێك راگەیەنراوە کەمنداڵێکی HIV پۆزەتیڤ چاکبووەتەوە !!( پاش 6-12 مانگ، بگرە تا 15 مانگ تێستکردنی ڤایرۆسەکە (زۆرجار) نێگەیتڤ دەبێت، وەلێ لێی دڵنیانین. چونکە هەندێك منداڵ دژەتەنیان درەنگتر تیادا دەردەکەوێت پاش ئەوەی کۆئەندامی بەرگریی منداڵ بەهێز دەبێتو گەشەدەکاتو دژەتەنی سەربەست دەردەدات. گەر تێستی HIV بۆ دووبارە بکرێتەوە، ئەوسا ئەنجامی راستترمان دەست دەکەوێت. ئەوەشمان بۆ سەلمێنراوە کاتێك ئاولەمە لە 14-15 هەفتەدایە دەتوانرێت ڤایرۆسەکە جیابکرێتەوە. لە لایەکی ترەوە وا روویداوە کە ژنێکی سکپڕ بەدووانە، یەکێك لەمنداڵەکانی هەڵگری ڤایرۆسەکە بووەو ئەوی تریان نێگەتیڤ. روونکردنەوەی ئەم دیاردەیە زۆر گرانەو ئاڵۆزە، هەروەها مەترسیی زۆرە منداڵەکەی تریش تووشببێت. لەکاتێکدا دایك HIV پۆزەتیڤەو یەکێك لە دووانەکە پۆزەتیڤەو ئەوی تریان نێگەتیڤ، ئەوا بەهیچ جۆرێك نابێت دایکەکە نەشیر نەخوێن بە منداڵەکانی (نە بە کەسانی تر) بدات.
تێبینی: ژمارەی CD4 لەمنداڵدا زۆر بەرزترە وەك لەمنداڵی گەورەو گەورەدا.
خۆپاراستن
هەمووماں دەزانین کەخۆپاراستن گەلێك باشترە لەچارەسەرکردن، بەڵام کاتێك باس دێتە سەر ئەیدز زۆر پێویستە مرۆڤ ئاگاداری خۆی بێت تا تووشی ڤایرۆسەکە نەبێت، چونکە تا ئێستا هیچ دەرمانێك نییە ڤایرۆسەکە بکوژێتو هیچ کوتانێکیش نییە تامرۆڤ بتوانێت بەرگری پەیدا بکاتو تووشی ڤایرۆسەکە نەبێت.

بەڵام باشترین خۆپاراستن تا ئەمڕۆ بەکارهێنانی کۆندۆمە لەکاتی زایەنددا چونکە لە 70-80٪ی بارەکاندا ڤایرۆسەکە بەم ڕێگایەدا دەگوێزرێتەوە. هەروەها پێویستە مرۆڤ لەژنە سۆزانییەکان دوور بکەوێتەوەو زۆر باشیشە گەر بەنگ کێش دەرزی خوێنهێنەری پاکژی یەکجاری بەکاربهێنێت و دەرزییەکەی خۆی نەدات بە هاوەڵەکانی و لەوانیش دەرزی بەکارهێنراو وەرنەگرێت !

چارەسەرکردن

ئەوەی ڕاستی بێت پاش دەستنیشانکردنی ڤایرۆسەکەو پێش دەستکردن بەچارەسەرکردن پێویستە پزیشک پلانێك بۆ چۆنیەتی چارەسەرکردن دابنێت کە لەم خاڵانە پێکهاتبێت و بەپێی توانای بەردەست ئەنجام بدرێن:

1- دەرمانی ئەنتی HIV زیادبوونی ڤایرۆسەکە ڕابگرێت.

2- ڕاستکردنەوەی فەنکشنەکانی کۆئەندامی بەرگری.

3- چارەسەرکردنی سۆ هەلپەرستەکان (بەکتریا، ڤایرۆس، پاراسیت، فونگ).

4- چارەسەرکردنی شێرپەنجەکان (کاپوسی و لیمفۆما.. تاد).

پاش باسکردنی لایەنەکانی سۆی ڤایرۆسی HIV، بۆمان ڕوونبووەوە کە ڤایرۆسەکە دەبێتەهۆی کەمبوونەوەی بەرگریی لەش و پاشتریش دەبێتەهۆی نەخۆشیی ئەیدز.

پێویستە بەپێی ئەو دەرمان و زانیارییانەی لەبەردەستدایە چارەسەری سۆکە بکرێت تادەگاتە لای پزیشکی تایبەتمەندی ئەیدز. زۆر پێویستە ئەو دەرمانانەی لەچارەسەرکردنی سۆی ڤایرۆسی HIV و ئەیدزدا بەکاردەهێنرێت ئەم تایبەتمەندییانەی تێدا بێت:

- دەرمانەکە زیادبوونی ڤایرۆسەکە (لەنێو خانە تووشبووەکاندا) ڕابگرێت.
- دەرمانەکە نەهێڵێت ڤایرۆسەکە خانەی نوێ تووش بکات.
- دەرمانەکە نەهێڵێت ڤایرۆسەکە خانە تووش نەبووەکان تووش بکات.
- دەرمانەکە نەهێڵێت HIV ڤایرۆسەکە لەنێو ناوکی خانەدا خۆی بشارێتەوە.
- دەرمانەکە کاری ڤایرۆس لەسەر کۆئەندامی بەرگری ڕابگرێت.
- دەرمانەکە بگاتە ناو مەژی و کار بکاتە سەر ئەو خانانەی تووشی ڤایرۆسەکە بوون.
- پێویستە بە ڕێگای جیاواز بەرگری بەهێزنین.

ئەوی شایانی باسە لەم ساڵانەی دواییدا ژمارەیەکی زۆر توێژینەوە لەسەر چۆنیەتی چارەسەرکردن ئەنجامدراون جا لەبەرئەوە زۆر گرنگە پێش دەستپێکردن بەچارەسەرکردن ئەم خاڵانە لەیاد نەکرێت:

- پێویستە بزانین ژمارەی CD4ی نەخۆش چەندە و بەپێی ژمارەی ئەوان نەخۆش چارەبکرێت.

- بەرزیی ڕێژەی HIV-RNA و نزمی ژمارەی CD4 دەبێتە هۆی بێهێزی کۆئەندامی بەرگریی و ئەیدز. هاوکات ئەو دوو ڕێژەیە یاریدەی چۆنیەتی چارەسەرکردنی سۆکەش دەدەن.

- نەخۆشییە هەلپەرستەکان ئەو کاتە دەردەکەون کە ژمارەی CD4 بگاتە ژێر 300 دانەوە لە ملیلیترێکدا.

- پێویستە پزیشك پێش بێهێزبوونی کۆئەندامی بەرگری دەست بەچارەسەرکردن بکات.

- مەبەستی سەرەکی لەچارەسەرکردنی ئەنتیڤایرۆسی HIV بریتییە لەراگرتنی ڤایرۆسەکە تا خۆی کۆپی نەکاتەوە.

گرنگترین ئەنتی HIVـەکانی ئەمڕۆ ئەمانەن:

| ناوی دەرمان | ناوی کیمیکی |
|---|---|
| AZT + 3TC | Combivir |
| 3TC, Lamirvdine | Epivir |
| Ddc, Zalcitabine | Hivid |
| AZT, Zidovudin | Retrovir |
| DDI, didanosin | Videx |
| D4T, Stavudin | Zerit |
| Abacavir | Ziagen |
| Efaviren | Stocrin |
| Viramune | Nevirapin |
| Agenerase | Amprenavir |
| Cixivan | Indinavir |
| Fortovase | Saquinavir |
| Invirase | Saquinavir |
| Kaletra | Liponavir |
| Norvir | Ritonavir |
| Viracept | Nelfinavir |

تێبینی: دەرمانی Epivir نەبێت ئەوانی تر هەموویان نیشانەی لاوەکی جیاوازیان هەیە.

تێبینی: هەموو ئەو دەرمانانەی سەرەوە 2 یان 3 لەیەک کاتدا دەدرێت بەنەخۆش بەمەبەستی کەمکردنەوەی بەرگریی ڤایرۆسەکە دژی ئەنتیڤایرۆسەکان.

**گیروگرفتەکانی چارەسەرکردن**

ئەوەی شایای باسە ئەم سۆیە وەك هەموو سۆ بەکتریایی، ڤایرۆسی، فونگەکان یان پاراسیتەکانی تر چەند گیروگرفتێك دێنێتە ڕێی پزیشك و زۆرجار بەزیانی نەخۆش دەگەڕێتەوە، گرنگترینیان ئەمانەن:

- هەر نەخۆشێك ژەمێکی پێدەکەوێت.
- هەندێکجار نەخۆش ناچار دەبێت واز لەدەرمانێك بهێنێت (بە نەخۆش ناکەوێت) و یەکێکی تر بەکاربهێنێت.
- ڤایرۆسەکە دژی AZT بەرگریی پەیداکردووە (لەو کەسانەدا کەماوەیەکی درێژ چارەسەر دەکەن).
- لەکاتی بەکارهێنانی دۆزی بەرزدا ، ژەهری دەرمانەکە زۆر کاردەکاتە سەر ئەندامەکانی نەخۆش.

**تێکەڵکردنی دەرمان**

ئەوەی شایانی باسە چەند ساڵێك دەبێت شارەزایان تێبینی ئەوەیان کردووە کە تاکە دەرمانێك وەك AZT کارێکی دیاریکراو دەکاتە سەر ڤایرۆسەکە و زۆر بەباشی ڕێڕەوی سۆکە ناگۆڕێت. لەئەنجامی توێژینەوەی ئەم چەند ساڵانەی دواییدا توێژیاران گەیشتوونەتە ئەو بڕوایەی کە کاری 2 یان 3 دەرمان زۆر باشترە وەك لەکاری تاکە دەرمانێك هاوکات بووەتە هۆی درێژبوونەوەی ژیانی نەخۆش.

**پلانی نوێی ئەمڕۆی چارەسەرکردن بەم شێوەیەیە:**

- پێویستە ئەو دەرمانانە لەگەڵ یەکتری بگونجێن.
- ڕێژەی بەگریی ڤایرۆسەکە بەرانبەر دەرمانەکە کەم بێت.
- ڕێژەی ژەهراویبوونی نەخۆش بەدەرمانەکان کەم بێت.
- بەپێی توانا خەرجیی دەرمانە بەکارهێنراوەکان کەم بکەوێت.

**شێوەکانی تری چارەسەرکردنی HIV**

ئەوەی راستی بێت چەندە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی دژی HIV لەناوبەرێك بەردەوامە ئاواش لەبواری بەرگریزانی و جینزانیدا هەوڵی باش و سەرکەوتووانە بۆ چارەسەرکردنی سۆکە یان نەخۆشییەکە دراوە. لەساڵی 1994ەوە باسی شێوەی تری چارەسەرکردن (چارەسەرکردنی جینی و بەرگری) دەکرێت و تا ئەمڕۆ لەژێر توێژینەوەدایە، وەلێ لەم دوو بارەدا ئەم پرسیارانە قووتدەبنەوە:

- ئایا چارەسەرکردنی جینی و بەرگری ڤایرۆسەکە لەناودەبەن تا سۆکە هەڵنەداتەوە؟
- ئایا نەخۆش بەتەواوی چاك دەبێتەوە؟
- ئایا ئەم دوو رێگا نوێیە خەرجی زۆری تێدەچێت یان نا؟
- ئایا ئەم دوو رێگایە ئاسانە تا لە هەموو جیهاندا بەکاربهێنرێت؟

**شێوەی چارەسەرکردنی ژنی سکپڕوکۆرپەکەی**

لە هەفتەی 14ی سکپڕییەوە پێویستە دایك رۆژانە 500 ملگم لە AZT وەربگرێت. گەر منداڵ بەئاسایی لەدایك ببێت، پێویستە پێش ژانی سکپڕ بەنیو کاژێر لەگەڵ ئاوی دڵۆپاودا (لە 30 خولەکدا) 2 ملگم کگم دەدرێت بە دووگیان. بەردەوام تا ناوك بڕین پێویستە لەخوێنهێنەرەوە 1 ملگم کگم AZT بدرێت بە دایك.

گەر ساواکە بە نەشتەرگەری لەدایك ببێت، پێویستە 2 ملگم لە 1 کاژێردا (4 کاژێر پێش نەشتەرگەری) بدرێت بەسکپڕ.

هەر کاتێك ساوا توانی شلەمەنی قووتبدات پێویستە لەیەکەم 24 کاژێری پاش لەدایکبووندا (ماوەی 4 هەفتە) رۆژی 4 جار 2 ملگم کگم AZT ی بدرێت بەساواکە.

**چارەسەرکردنی سۆی ڤایرۆسی HIV**

هەمووومان ئەو راستیە دەزانین کە هەوکردن بە ڤایرۆسیHIV و نەخۆشی ئەیدز کێروگرفتێکی گەورەی جیهانە ، تا ئەمڕۆ نزیکەی زیاتر لە 70 ملیۆن کەسی تۆمارنەکراو تووشی ڤایرۆسەکە بوون ساڵانە ڤایرۆسیHIV ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووانی جیهان لە نێو دەبات و لەبەر ئەوەش بۆتە هۆی چوار هەمی مردن لەجیهاندا . ئەوەی راستی بێت HIV ڤایرۆسێکی RNA یە ( لە نێوخانەدا بەکەماڵی ئیسراحەت پاڵی لێداوەتەوە) و سەر بە کۆمەڵە ڤایرۆسی لێنتی یەو 2 جۆری سێری HIV-1,2 لێ جودا کراوەتەوە ، جۆری HIV-2 زێدەتر لەئەفریقادا بلاو بووەتەوە . لە کاتی هەوکردنەکەدا لیمفۆسایتە یاریدەدەرەکان T- Helper Lymphocyte واتە ( +CD4) دەبنە قوربانی یان نێچیری ڤایرۆسەکە.

هێدی هێدی ژمارەی لیمفۆسایتەکان کەم دەبێتەوە ئەم کەمبوونەوەیە دەبێتە هۆی نزمبونەوەی بەرگری لەش دژی میکرۆئۆرگانسیمەکان چونکە لیمفۆسایتەکان رۆڵی سەربازیان هەیە و بەرگری لە لەش دەکەن . کەمبوونەوەیان دەبێتە هۆی بێهێزی کۆئەندامی بەرگری ولەش دژی هەوکردن لاواز دەکەن .

ڤایرۆسەکە دەتوانیت ببێتە هۆی هەوکردنی کوتوپڕ یان تولانی ، زۆرجاران ڤایرۆسەکە دەبێتە هۆی هەوکردنی لەسەرخۆ ئەوسا مرۆڤ چەند ساڵێك هەڵگری ڤایرۆسەکەیە بێئەوەی هیچ نیشانەیەکی سەرنج راکێشەری تیادا دەربکەوێت . پاش هەوکردن ڤایرۆسەکە لە ماوەیەکی نادیاردا کۆئەندامی بەرگری بێهێزو لاواز دەکات و پاشتر بە هۆی چەندین سۆی هەلپەرستی جودا و شێرپەنجەوە لە ئەنجامدا نەخۆش دەمرێت .

لەم بارەدا مەبەستی سەرەکی چارەسەرکردن بریتییە لە :

- راگرتنی بەرزبونەوەی ریژەی ڤایرۆسەکە

- هەوڵدان بۆ دروستکردنەوەی کۆئەندامی بەرگری تا رێگا لەدەرکەوتنی هەوکردنە هەلپەرستەکان و ئالۆزکارییەکانی هەوکردنەکە بگرین. هەرکاتێك رێژەی CD4 و T-cell بگاتە ژێر 200 دانەوە ئەو کاتە مەترسی تووش بوون بە سۆ هەلپەرستەکان و ئەیدز زێد دەکات . لەم سالأنەی دوایدا بە رێگای تێستی PCR لەتاقیگەدا توانراوە رێژەی HIV دەستنیشان بکرێت دیاری کردنی ئەم رێژەیە زۆر سوود بەچارەسەرکردنی ئەنتیڤایرۆسی بەتایبەتی لەشێوەی تێکەڵ کردندا دەدات . هەرکاتێك رێژەی ڤایرۆسە لەبەرگیراوەکان بگەنە ژێر 50 HIV RNA/Copies/ml ەوە ئەوسا پێویستە ئەنتیڤایرۆسە کان بە ژەمی زیاتر تێکەڵ بکرێت و بدرێت بە نەخۆش . پێویستە رۆژانە نەخۆش لەژێر چاودێری دابێت بە مەبەستی باش کردنی باری نەخۆش و سەرکەوتنی باری ستراتیژی چارەسەرکردن . نێوی ئەو ئەنتیڤایرۆسانەی پەسەند کراون دژی ڤایرۆسی HIV بەکار دەهێنرێن ، جوداکردنەوەیان و شێوەی بەکارهێنانیان :

**1- کۆمەڵەی ( Nucleotide Reverse Transcriptase Inhibitors, NtRTIs) ئەم دەرمانانە دەگرێتەخۆی:**

zidovudin(AZT,ZDV) =Retrovir
lamivudin (3TC) = Epivir
didanosin(ddl) = Videx, VidexEC
zalcitabin(ddc) = Hivid
stavudin (d4T) =Zerit
abakavir (ABC) = Ziagen
tenofovir (TDF)
emitricitabin(FTC)

**2- کۆمەڵەی ( Non-Nucleoside Analogue Reverse Transcriptase Inhibitors, NNRTIs) ئەم دەرمانانە دەگرێتەخۆی :**

nevirapin (NVP) =Viramune
efavirenz(EFV) = Stocrin . Sustiva

**3- کۆمەڵەی ( Protease inhibitors, PI) ئەم دەرمانانە دەگرێتەخۆی :**

ritonavir (RTV) =Norvir
indinavir (IDV) =Crixivan
saquinavir(SQV) = Fortovase ,Invirase
nelfinavir (NFV) = Viracept
amprenavir (APV) = Agenerase
lopinavir,Ritonavir (LPV) = Kaletra
fosamprenavir(fAPV) (from july 1993)
atazanafir

گەر پێشوتر نەخۆش دەرمانی وەرنەگرتبێت (یەکەم چارەسەرکردن) بەم شێوەیە بەکاردەهێنرێت :

-2 NRTI + 1 NNRTI
-2 NRTI + 1 PI

هەروەها دەتوانین 3 دەرمانی NRTI بدەین بە نەخۆش .

هەروەها دەتوانین بە شێوەیە دەرمان بدەین بە نەخۆش بەلأم پێویستە رێکبخرێت (#) .

amprenavir 600 mg x 2 + ritonavir 1000 mg x 2
indinavir 400-800 mg x 2 + ritonavir 100mg x 2 (#)
saquinavir 100mg x 2 + ritonavir 100mg x 2
iopinavir + ritonavir 400/100 mg x 2

تێبینی: کاتێك تێبینی بکەین ڤایرۆسەکە بەرگری دژی دەرمانەکە پەیداکردوە ئەوا پێویستە تێکەڵکردنەکە بگۆردرێت .

## **مێتودێکی نوێی چارەسەرکردنی ڤایرۆسی HIV**

**لەو رۆژەوە کە ڤایرۆسی HIV دۆزراوەتەوە تا ئەمڕۆ ژمارەیەکی زۆر لە توێژیاران و هاوکات چەندین کۆمپانیای دەرمان بەرهەمهێنان سەرقاڵی دروستکردنی دەرمانێکی لەبارن تاکو ڤایرۆسەکە بکوژێت ، هەرچەندە ئەمە کارێکی ئاستەم بوو وەلێ ئەمڕۆ بەشێکی زۆری ئەو ئاواتەی هەڵگرانی ڤایرۆسی ناوبراو هاتەدی و توانرا کە سەرکەوتنێکی زۆر باش لەم بوارە گرنگەدا ئەنجام بدرێت . لەوانەشە ئەم هەنگاوە مەزن و سەرکەوتووە رێگا خۆش بکات تاکو مێتودی نوێ دژی چەندین ڤایرۆسی دی کە چارەیان نییە بدۆزرێتەوە .**

**حەشارگاکانی ڤایرۆسیHIV**

**- مێشک ،**

**ڤایرۆسی HIV دەتوانێت لە نێو مێشکدا خۆی بشارێتەوە ، وەلێ دژە ڤایرۆسەکان ناتوانن یان بە نارەحەتی دەگەنە نێو مێشک .**

**- خوێن ،**

**یەکێك لە گیروگرفتە گەورەکانی چارەسەرکردن بریتییە لە توانای ڤایرۆسی HIV کە خۆی لە نێو بەرگرییە خانەکاندا حەشاردەدات و ئەم خانانەش لە نێو خوێنی نێو لەشدا هەس .**

**- کۆئەندامی زاوزێی نێرینە ،**

**دەرمانی ئەنتیڤایرۆس گیروگرفتی ئەوەی هەیە ناتوانێت بکاتە نێو تۆماو (سپێرم) ، وەلێ تا ئەمڕۆ نازانرێت بۆچی ؟؟**

**لە دوا ژمارەی گۆڤاری پزیشکی The Lancet ی رۆژی 12 ی ئاوگوستی ساڵی 2005 دا توێژینەوەیەکی توێژیارانی ئەمێریکایی بڵاوکردەوە کە وا پێدەچێت بتوانرێت چارەسەری سۆ بە ڤایرۆسیHIV بکرێت . مێتودە نوێکە بریتییە لە :**

**ڤایرۆسی HIV لە نێو هەندێك خانەدا بە تایبەتی خانە بیرەوەرییەکاندا Memmory Cells (LT5) دا خۆیان حەشاردەدەن کە سەربە کۆئەندامی بەرگری لەشن لەبەرئەوە ئەو دەرمانانەی تا ئەمڕۆ دژی ڤایرۆسەکە بەکاردەهێنران کاریگەری راستەوخۆیان لەسەر ڤایرۆسەکە نەبووە وەلێ ئەنتیڤایرۆسەکە دەبێتە هۆی درێژبوونەوەی تەمەنی نەخۆش دەنا نەیاندەتوانی نەخۆش چاك بکەنەوە . بۆ ئەوەی بگەنە ئەو ڤایرۆسانەی کە خۆیان ناچالاك کردووە یان شاردۆتەوە توێژیاران رۆژانە 2 جار و بۆ ماوەی 3 مانگ دەرمانی Valporat یان داوە بە 4 نەخۆش کە چەند ساڵێك دەرمانی دژی ڤایرۆسی ناوبراو دەخۆن و سۆیەکی لەسەرخۆیان هەیە .**

**ئەوەی جێی سەرنجە دەرمانی ناوبراو دەبێتە هۆی چالاککردنەوەی ڤایرۆسەکە و کۆپیکردنەوەی خۆی . ئەمەش دەبێتە هۆی دەرکەوتنی ئەو ڤایرۆسانەی کە خۆیان مت کردبوو . هاوکات بە رێژەیەکی بەرز ئەنتیڤایرۆسی دژی ڤایرۆسیHIV دراوە بەو نەخۆشانە ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە ئەو خانە بیرەوەرییانەی کە تووشی ڤایرۆسەکە بوون بمرن . توێژینەوەکە لەسەر 4 نەخۆش کراوە وەلێ لە 3 یاندا ڤایرۆسەکە بە رێژەی لە 75٪ دا نزمبۆتەوە .**

ئەو کەسانەی کە لەشییان بە باشی وەڵامی چارەسەرکردنەیان داوەتەوە بە ڕێژەی لە 84٪ ڤایرۆسی HIV یان لە لەشدا نەماوە . لە ئەنجامی ئەم مێتودە نوێییەدا تێبینی کراوە نیشانەی لاوەکی هەندێك ئەنتیڤایرۆس زێدی کردووە .

**سەرنج**

– دەرمانی Valporat (دژی نەخۆشی پەرکەم بەکاردێت) .

– خانەی بیرەوەری (LT5) ، لە وەڵامدانەوەی بەرگری ناوەنجیدا بە توانان و دووبارە ئەنتیجینەکان دەناسنەوە .

**سەرچاوە**

1-Illustratrerad vetenskap nr. 15 2005.

**سەرچاوەکان**

References
1.Rekommendationer. behandling av kronisk hepatit C hos vuxna och barn, information.nr.6, okt.Stockholm. 1999, s. 5-7.
2.Rekommendationer, behandling av kronisk hepatit C hos vuxna och barn, information.nr.4, jul .Stockholm. 2001, s. 5-9.
3.Två nya behandlingsrekommendationer för antiviral behandling av HIV-infektion, information.nr5.okt.Stockholm 2002.s.9-20, 55-60.
4.Ingrid Uhnoo, antivirallekämedels möjligheter och begränsningar, Medicament, nr.2, mars, stockholm 2003, s.24-29.
5.Ingrid Uhnoo, läkemedel mot virus –vad finns och vad behövs?, Medicament, nr.3, april.
6.Stefano Vella &Marco. antiviral therapy. infectious diseases, vol two. Mosby. USA.2000. section 5, HIV and AIDS, p.26.1-26.10stockhol. 2002. s 22-37

# سۆ هەلپەرستەکان

**کاتێك مەڵبەندی کۆنترۆڵی نەخۆشییەکانی ئەمێریکایی سوّی HIVو نەخۆشیی ئەیدزی بەجیهان ناساند، ڕۆژانە لەجیهاندا ژمارەیەك تووشبووی نوێ بەڤایرۆسی HIV دەستنیشان دەکرێت. سۆکە بەردەوام بە وڵاتانی جیهاندا بەرێگای خوێنی ئاڵوودە، دەرزیی پیسبوو، زایەندی، چاندنی ئەندامو لەدایکەوە بۆ ناولەمە دەگوێزرێتەوە. هەروەها ڕۆژانە ژمارەیەکی زۆر لەم تووشبووە پۆزەتیڤانە لەیەکێك لەقۆناخەکانی سۆی ڤایرۆسەکە (کاتێك ڤایرۆسەکە بەتەواوی کۆئەندامی بەگری لەکاردەخات) تووشی ئەیدز دەبێت. لەماوەی چەند ساڵێکدا ئەیدزدار "ماوەکە لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی تر بەپێی تەمەن، ڕەگەز، قۆناخی سۆکە جیاوازە" هەموو نیشانەکانی تیادا دەردەکەوێت. نابێت ئەو ڕاستییەش فەرامۆش بکرێت کە لەشی هەموو کەسێك وەك یەك بەرگەی میکرۆئۆرگانیسم (بەکتریا، ڤایرۆس، پاراسیت، فونگ، پرۆتۆزوا) ناگرێت لەبەرئەوەی لەشی هەر مرۆڤێك بەرتەکێکی تایبەتی بەرامبەر بە ئەنتیجێن هەیە.**

**دەتوانین بڵێین کەهەندێك لەم هەلپەرستانە بەئاسانی چارەیان ناکرێتو کوتان و دەرمانیان نییە، هەندێکی تریان وەکو دەردەیاریکەوفەرەنگی ئەنتیبایۆتیکی دژی بەکتریاکە کاریان تێناکات، لەبەرئەوەی میکرۆبەکە بەرگریی دژ بەئەنتیبایۆتیك پەیداکردووە.**

**ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە بێنەوەی تێبینی بکرێت هەموو کاژێرێك ژمارەی HIV یە پۆزەتیڤەکان لەزیادبووندایە هەروەها ڕۆژانەش ژمارەیەکی نادیار لەئەیدزدارەکان بەم سۆ هەلپەرستانە دەمرن.**

ئەوەی شایانی باسە سۆکان بریتین لەو کۆمەڵە سۆیانەی لەقۆناخێکی درەنگتری سۆی ڤایرۆسی HIV دا تووشی ئەیدزدار دەبن.

هەرچەندە (کاتی دەرکەوتنی سۆکان نازانرێت) بەڵام وەك بەناوەکانیاندا دیارن بەشوێن هەڵێکدا دەگەڕێن و لەبارترین کاتیش ئەو قۆناغەیە کەکۆئەندامی بەرگریی لەش ناتەواوەو لاواز دەبێت و چیتر توانای بەرگریکردنی لەشی نامێنێت (کاتێك ژمارەی CD4 زۆر کەمدەبنەوە)، ئەوسا ڕێگە بۆ میکرۆئۆرگانیسم خۆش دەبێت (وا قەبڵێنراوە کەپاش 6-7 ساڵ پاش سۆی ڤایرۆسەکە)و بەئاسانی لەش تووشی کۆمەڵێك نەخۆشی دەبێت. گەر لەکاتی خۆیدا چارەنەکرێن ئەوا هەندێکیان دەبنە هۆی سەرەکیی مردنی ئەیدزدار. جگە لەم سۆ هەلپەرستانەی کە لەم کتێبەدا نووسراوەتەوە هەڵگری ڤایرۆسەکە یان ئەیدزدار تووشی چەند گیروگرفتێکی تر دێت کە دەتوانین بە ئاڵۆزکارییەکان ناویان ببەین (جگە لەخوێنبەربوون و نیشانە گلاندییەکان) واتە هەر کۆئەندامێك لەلایەکەوەو بەجۆرێکی جیاواز تووشی ناتەواوی و گیروگرفت یان مەترسی دەبێت.

**جیاکردنەوەی نەخۆشییەکان بەپێی جۆری میکرۆئۆرگانیسمەکە:**

### * کۆمەڵی پاراسیتەکان(مشەخۆرەکان)

1- لە 80٪ی سییەکانی ئەیدزداران تووشی پنیومۆسیستی کارینی دەبن. پاراسیتەکە دەبێتە هۆی سۆی توندی سییەکان و لە 14٪ی ئەیدزداران لەماوەی 18 مانگدا دەمرن.

2- لە 4٪ی ئەیدزداران تووشی سۆی تۆکسۆپلاسمای کۆئەندامی ناوەندیی دەماردەبێت.

3- ڕیخۆڵەسۆی ئیسۆس پۆریاسیس، مرۆڤ تووشی سکچوونیش دەبێت.

### * کۆمەڵی بەکتریاییەکان

4- سییەسۆ بە "میکرۆباکتریا " کەدەبێتە هۆی نەخۆشیی دەردەباریکە.

5- سییەسۆ، سۆی ئێسك و جومگەکان بەمیکۆباکتریای ئاڤیوم، کانەساسی.. تاد.

6- سۆی مێشك، پێست و چاو بە "ترێپۆنیما پالیدیۆم" کەدەبێتەهۆی فەرەنگی.

7- ڕیخۆڵەسۆ بەسالمۆنێلا، شگێلا و کامپیلۆباکتێر کەدەبنە هۆی سکچوون.

### * کۆمەڵی ڤایرۆسییەکان

8- پێستەسۆی ڕووخسار، لێوەکان و ئەندامانی زاووزێ بەڤایرۆسی تامیسکی ئاسایی 1-2.

9- پێستەسۆی ڕووخسارو ئەندامی زاووزێ بەڤایرۆسی تامیسکی زۆستەرو ڤاریسێلا.

10- لە 15-30٪ی ئایدزداران تووشی سۆی گەروو، سورێنچك، تۆڕەی چاو، مێشك، جگەر، بۆری زراو، پەنکریاس و سییەکان بەڤایرۆسی سایتۆمیگال دەبن و ڤایرۆسەکە دەبێتە هۆی کوێری.

11- سۆی ڤایرۆسی پاپیلۆم، زۆرجار برینەکە دەکەوێتە سەر دەوروبەری کۆم، گولینك و پۆپەی چووك.

### * کۆمەڵی کەڕووەکان

12- سۆی گولینك و سورێنچك بەکاندیدە، زۆرجار بەبۆقژەی ناودەم ناسراوە.

13- لە1٪ی ئەیدزداران تووشی سییەسۆ، سپڵ، مۆخی مێشك، پێست بەهیستۆپلاسمۆسس دەبن.

14- لە 8٪ ئەیدزداران تووشی سۆی مێشك و سییەکان بەکریپتۆکۆکەس دەبن.

### * شێرپەنجەکان

15- سارکۆمای کاپوسی

یەکێکە لەشێرپەنجە گرنگەکان کەزۆرجار تووشی پێست، ناودەم، گەدەو ریخۆڵەو لیمفەگرێکانی ئەیدزدار دەبێت، ماوەیەکی زۆر بێنیشانەیە، پاش دەستنیشانکردنی سارکۆماکە ئەیدزدار نزیکەی 20-29 مانگ دەژی.

15-لیمفۆما

سێ جۆر لیمفۆما لەنەخۆشدا دەردەکەوێت، ئەمانیش تووشی کۆئەندامی ناوەندیی دەمار، هەناو، ریخۆڵەو گەدە دەبێت.

جگە لەو میکرۆئۆرگانیسمانەی پێشوو لەش دەکەوێتە بەر شالاوی چەند پرۆتۆزۆرو بەکتریایەکی تر کە بە رێگەی زایەندی لەنێو هۆمۆرەگەزبازو هیترۆرەگەزبازەکاندا دەگوێزرێتەوە هەروەها لەقۆناخێکی سۆی ڤایرۆسی HIV دا نەخۆش تووشی ژمارەیەك لەنەخۆشییە درمە زایەندییەکان دەبێت.

ئەم نەخۆشییانە بەزۆری تووشی مرۆڤی ئاسایی دەبێت و هەریەکەیان دەبێتە هۆی کۆمەڵێك سۆ وەك سۆی کۆئەندامی ناوەندیو دەرەوەی دەمار کەدەبێتە هۆی شەپلەداریی ئەندامەکانی لەش یان گۆرانکاری لەکەسایەتیو هەڵسوکەوتی نەخۆشدا.

هەروەها چەند نیشانەیەکی تری وەك بێهێزی، تووڕەیی، بوورانەوە (لەهۆش خۆچوون) دەردەکەوێت. نەخۆش دەکەوێتە بارودۆخێکی نائاساییەوە کەزۆر تایبەتە بە ئەیدزدار.

زاراوە پزیشکییەکان:

سێری: سیرەمی خوێن، زەرداوی ناوخوێن.

میکرۆئۆرگانیسم: ئەو میکرۆبانەن کەزۆرجار بەمیکرۆسکۆپ (ئەلەکترۆنی) دەبینرێن.

فونگ: کەروو (بریتییە لەجۆرێك میکرۆبی نەخۆشیدار).

لیمفۆسایت: گچکەترین پێکهێنەری خرۆکە سپییەکانن (بەشێکی خانە بێدەنکۆڵەکانن) کاری سەرەکییان بەرگریکردنە لە لەش دژی میکرۆب.

ئەنتیجین: بریتییە لەهەموو تەنێکی بێگانە کەکار دەکاتە سەر لەش.

ئۆرگانیسم: لەش.

ئاولەمە: ئەو کۆرپەیەی (پێش لەدایکبوون) لەنێو زامانْدایە.

توێژینەوە: باس

ئامار: تۆمارکردنو ژماردنی (نەخۆش، تووشبوو ... هتد)

ترۆمبۆسایت: خەپلەکانی خوێن.

نیۆترۆفیل: خانە هاوتاکان.

هۆمۆرەگەزباز: ئەو نێرەی پەیوەندیی زایەندنی لەگەڵ نێرێکی تردا هەبێت.

هیترۆرەگەزباز: ئەو نێرەی پەیوەندی زایەندی لەگەڵ نێرو مێدا هەبێت.

ر ت ج: رێکخراوی تەندروستی جیهانی.

پزدان : زامالْ : منداڵدان .

دەردەبارێکە : سیل .

سەرچاوە کوردییەکان:


1- زاهیر سوران، چەند راستییەك دەربارەی نەخۆشیی ئەیدز، مامۆستای کورد ژمارە 28، 1996، ل 57-56 ستۆکهۆلم.

2- زاهیر سوران، هەوکردن بەڤایرۆسی HIV و ئەیدز . چاپی یەکەم ، 1993 سوید

3- زاهیر سوران، ڤایرۆسێکی نوێ دەبێتەهۆی نەخۆشیی ئەیدز، دلانپار، ژمارە 3 ، 1994، ل 25-27 هێلسنکی.

4- زاهیر سوران، ژنو ئاوس، ڤایرۆسی HIVو ئەیدز، دلانپار، ژمارە 1، 1995، ل33-35 هێلسنکی.

5- زاهیر سوران، ژنه سوزانییەکان و هەوکردن بەڤایرۆسی HIV، دیدار، ژمارە 19، 1996، ل 26، ستۆکهۆلم.
6- زاهیر سوران، هەوکردن بەڤایرۆسی HIV و نەخۆشیی ئەیدز، چاپی دووەم، 1998 (لەسەر ئەرکی وەزارەتی رۆشنبیری - هەولێر لە چاپدراوە).

## سەرچاوەکان

References

1.Gallo. R. C. and Jay. G (eds) The Human Retrovirus Academic Press, San Diego, 1991.
2.WHO: Current and future dimensiouns of HIV/AIDS pandemic. A capsule Summary Sep. 1990. WHO/GPA/SFI/90.
3.WHO: Breastfeeding /breast milk and (HIV). Weekly Edidemiological Record 1988; 62: 245
4.A. Sejattler, J Altekruger, Microbiologie medicala. Buchurest 1994.
5.WHO: Counselling and AIDS guidlines: GPA/WHO/Geneva/1988
6.WHO: Guide to planering helath promotion for AIDS prevention and Control. Geneva 1989.
7.WHO: AIDS: The current global situation of HIV/AIDS pandemic. Week Epide. Rec 1993; 68: 193-197.
8.The AIDS Manual. Acomprehensive retrence on HIV/AIDS, 3rd edt. 1994 Australia.
9.AIDS Disease and Diagnosis. Murex Diagnosis Limited, 1991. 1-5 UK.
10.Wilson. J. Prevention of Infection – the role of conselling women and AIDS conterence, post house hotel, Edinburg 1988.
11.Ted Lankester MA. Setting up Community heal the programme, UK 1992; 272-279.
12.Barnett I. Blaiki P. AIDS in Africa, Its present and Future impact. London. Belhaven Press. 1992.
13.Piot Peter. AIDS in Africa. Amanual for physicians 1992; 23-24. WHO Geneva.
14.Piot Peter and Laga M. Epidemiology of AIDS in the developing world In Textbook of AIDS medicine. Baltimore: Williams & Wilkins Company 1993.
15.Weiss RA. How does HIV cause AIDS? Science; 1993; 260: 1273-1278
16.Paoe J. Liautand B, et al. Characteristics of AIDS in Haiti N Eng J Med 1983, 309: 945-950
17.CDC. Pneumocystis pneumonia – Los Angeles. MMWR, 1988: 30: 250-252. Pneumocystis pneumonia.
18.CDC. Kaposi sarcoma and Pneumocystis pneumonia among homosexual men. New Yourk City and California. MMWR; 1981; 30: 305-308.
19.CDC. Update: Aquired Immunodeficiency Syndrome – United States 1981-1988. MMWR; 38:229-236.
20.Buehler JW. Berkelman R and Stehe – Green JK. The completens of AIDS survellance. J Aquires immunodeficiency syndrome. USA. 1992.
21.Lwvy Ja. Greenspan D: HIV in Saliva (letter). Lancet 1988; 2: 1248
22.Fauci AS: AIDS: Immunopathogenic mechanisms and reseaarch strateges. Cli Res. 1987; 35 503-510.
23.Tindall B and Cooper DA. Primary HIV infection: Host responces and intervention strategies. AIDS. 1991; 5:1-12.
24.Green and D Miller, AIDS the story of a Disease, Grafton Books, 1986; 40-49.
25.Zahir Suran, Sexually Transmitted Diseases, Advices & Prevention Stockholm 1995; 28-34
26.Zahir Suran. Hiv infection adn AIDS, 1993; 10-11. Sweden.
27.WHO, Guidlines for Clinical Managment of HIV infection in Adults – WHO; Global program on AIDS, Geneva. December 1991 (WHO/GPA/IDS/HCS/91.6).
28.AIDS/HIV Treatment Directory, Publised by AmFar, vol 5. No. 4. 1992. 5-9 USA
29.Heagarty MC. Abrams Ej. Carring for HIV-infected woman and children N Eng J Med 1992. 326: 887-88.
30.Zahir Suran. Typical and Atypical Mycobacaterium infection in Evolution of HIV/AIDS infection. "Carol Davila Universitet" Bucharest. 1996.
31.Leslie Collier and John Oxford, Human Virology, Oxford University Press. 1993: 290-295. Oxford
32.Arye Rubinstine and Theresa A. Calvelli: Pediatric Acquired immunodeficiency Syndrome. In: Samter s Immunologic Diseases, Fifth Edition Volume 1, 2. 1995.
33.Sharily K el al: Acquierd Immunodeficiency Syndrom. in: Clinical Immunology Principles and Practic, Mosby 1996; 44. 707-38.
34.Mark W. et al: HIV infection and AIDS in Children In: Clinical Immunology Principles and Practic, Mosby 1996; 45: 739-50.
35.Gottlieb MS, et al: Pneumocystis carinii pneumonia and mucosal candidiasis in previosly helathy homosexual men: evidence of a new acquierd cellular immunodeficiency, N Engl J med 1981; 305: 1425.
36.Gallo RC, el al: Isolation of human T-cell leukemia virus in acquierd immunodeficiency syndrome (AIDS), Science 220: 865, 1983.
37.Stockholm Country Council HIV/AIDS program, preevnt, test, car Stockholm L Landsting 1996.
38.Blattner Wa: HIV epidemiology: past, present and future FASEB J S 1991. 2340
39.Arye Rubinstine adn Theresa A. Calvelli: Pediatric Acquierd immunodeficiency Syndrome In: Samter s Immunologic Diseases,, Fifth Editon Volume 1, 2, 1995.
40.Roy M. Anderson and Robert m. May. The population biology pf the interaction between HIV-1 and HIV-2: Coexistence or competetive exclusion? AIDS 1996; 10: 1663-1673
41.Birgitta U. Mueller and Phillip A. Pizzo. Acquired immunodeficiency syndrome in The Infant in: Infectious Diseases of The fetus newborn infant. 4th (ed)s. 1995; 9: 377-95.

42.John P. Phair et al· Human immunodeficiency virus infection and AIDS. In: Infectious Diseases 5[th] eds. 1997; 23: 344, 60, 39. CDC: HIV/AIDS surveillance report, july 1994.
43.Jonathan Vogel and Gilbert Jay AIDS, in· Encyclopedia of Microbiology, Vol 1. 1992; 1: 17-28.
44.Jay A. Levy. Viral and immunologic factors in HIV infection. In: The Medical Managment of AIDS 3[rd] (eds). 1992: 2: 18-33.
45.Julie Louise Gerberding. HIV transmission to provideers and their patients. In: The Medical managment of AIDS, 3[rd] (eds) , 1912M 4, 54.65.
46.William A. O Brien and Roger J Pomerantz. HIV infections and Associated Diseases. In: Viral pathogenesis, edited by Neal Nathanson, et al: 1997.
47.Jack S: Remington and Jerme O Klein In Infectious Diseases of the Fetus Newborn Infant. 4[th] Edition 1995.
48.Paolo Rossi. Studies on mother – to-child transmission of Human Immunodeficiency Virus type-1. Doctoral dissertaton. DCD Sweden 1992.
49.Counselling Fuidelines for HIV Testing Canadian medical association 1995.
50.Patricia Kissinger. Psychosocial chareaceteristics of HIV-Infected Adolescents in Nwe Orleans. J. Adol Health 1997; 20.258.
51.AIDS image of the epidemic, WHO. Geneva 1994.
52.Horsburg. G R. Ou, C. Y. Jason, J et al· Duration of human immunodeficiency virus infection before detection of antibody. Lancet 1989; 2: 637-640.
53.Annette Alaeus, Signifacance of HIV-1 Geneticc Subtype. Scand J infect Dis 32:455-465
54.Communicable Disease Profile, IRAQ, updated 19 March 2003. WHO/CDS/2003.19.
55. Hecht FM et al.use of laboratory tests and clinical symtoms for identification of primary HIV infection. AIDS 2002,16:1119-1129.
56. Marcus Altfeld and Bruce D.Walker, Acute HIV-1 Infection, From Hoffmann, Kamps, et al. HIV medicine, USA. 2003. 4751
##: Mary Kay Kindhauser, Global defence against the infectious disease threat, WHO/CDS/2003.15.

# بەشی دەهەم

## هەوكردنی ڤایرۆسی دی

1- سورێژە
2- سورێژەی ئەڵمانی
3- ڤایرۆسی پاپیلۆم
4- گۆێ ڕەپە
5- ئینفلوەنزا
6- ئینفلوەنزای باڵندە

## سورێژە – سورکە

نەخۆشییەکی کوتوپڕی سۆیی درمە لەباشووررو ڕۆژهەلاتی کوردستاندا زۆر بلاوەو بەزۆری تووشی منداڵ دەبێت. تا ئەمرۆ نەخۆشییەکە لەجیهاندا (بەتایبەتی لەو ولاتانەدا کەباری ژیان تیایاندا نزمەو هەژارن) بلاوە. هەموو ساڵێك نزیکەی 45 ملیۆن منداڵ تووشی سورێژە دەبن و نزیکەی 7–8 ملیۆنیش دەمرن. لەساڵی 1994دا (ر ت ج) وایپێشبینی دەکرد ساڵانی پاشتر لە 9٪ نەخۆشییەکە کەمبێتەوە.

**هۆزانی**

هۆی سورێژە ڤایرۆسێکی جۆری RNA یە لەخێزانی پارامیکسۆ ڤایرۆس و 6 پێکهاتووی پرۆتینی دروستییانکردووە. تیرەی ڤایرۆسەکە لەژێر مکیرۆسکۆپی ئەلەکترۆنیدا نزیکەی 100–250 نانۆمیترە، لەچڵمی لووت، لیکی ناو گەروو، بۆری هەرس، چیکڵدانۆچکەکان، شلەی ناوچاو، خوێن و بڵقی پێستدا هەیە.

**چڕی سورێژە**

بەشێوەیەکی گشتی سورێژە خێرا بلاودەبێتەوە، هەموو تەمەنێك دەگرێتەوە، وەلێ بەزۆری تایبەتە بەمنداڵ. هەموو 2–3 ساڵ سورێژە لەمانگەکانی زستان و بەهاردا زیاتر دەردەکەوێت. سەرچاوەی نەخۆشییەکە مرۆڤە. درمێتی سورێژە دەگاتە لە 95٪ (5–6 ڕۆژ پێش گۆڕانکارییەکانی پێست و 7 ڕۆژ پاش گۆڕانکارییەکانن).

**مێژوو**

- ڕازی نوژداری عەرەب لەساڵی 860-932 یەکەم کەس بوو کەباسێکی لەسەر سورێژە نووسیوە.
- سیدێنهام لە 1670دا سورێژەی لە سورێژەی ئەڵمانی جیاکردەوە.
- لەساڵی 1918 پرۆسەی خۆپاراستن دژی سورێژە خرایەگەڕ.
- لەساڵی 1963ەوە لەهەموو جیهاندا کوتانی دژی سورێژە بەکاردەهێنرێت.

**ڕێگاکانی گواستنەوە**

1- گواستنەوەی ڕاستەوخۆ، لە ڕێگەی دلۆپ و چڵم و لیکی ناودەم یان ناو بۆری هەناسەی نەخۆشەوە دەبێت لەکاتی قسەکردن، کۆکین و پژمینیدا پرژەی ناودەم و لووت دێتەدەرەوە (سۆیەکە سۆایی یە) یەکێکی دی تووش دەکات.

2- گواستنەوەی ناڕاستەوخۆ، لە ڕێگەی کەلوپەلی نوێی پیس بوو بەچڵم و لیکی نەخۆشەوە دەبێت. گەر ژنی دووگیان تووش ببێت، ئەوا ڤایرۆسەکە لە وێلاش دەپەڕێتەوەو ئاولەمە تووش دەکات، گەر منداڵ جارێك تووشی سورێژە ببێت ئەوا جارێکی تر نایگرێتەوەو بەرگرییەکی تایبەتی درێژخایەن (بەرگری پاش سۆکردن) پەیدادەکات.

**نەخۆشیداریەتی**

ڤایرۆسەکە لە ڕێگەی سۆوە خۆی دەگەیەنێتە ناوپۆشی لووت، گەروو و چاو، پاشتر دەکاتە شانە لیمفاوییەکان و لەوێدا زیاد دەکەن. کاتێك ژمارەی ڤایرۆسەکە زیاد دەکات ئەوسا ڤایرۆسەکان روودەکەنە خوێن و ئەندامەکانی دراوسێ و یەکەم نیشانەی سورێژە دەردەکەوێت. کاتێك ژمارەی ڤایرۆسەکە لەخوێندا کەمبووەوە ئەوسا دژەتەنی دژ بە ڤایرۆسەکە لەنێوان 7-10 رۆژدا دەردەکەون. پاشان بەردەوام و بەردێژیی ژیان دەمێننەوە و بەرگریی پاش سورێژە دروست دەبێت.

**نیشانەکان**

ماوەی کڕکەوتنی ڤایرۆسەکە 10 رۆژە، هەندێکجار کڕکەوتن 8 رۆژ دەخایەنێت. هەندێکجاری دی ماوەکە درێژترە (گەر تووشبوو پێشتر دەرزیی گاماگلۆبولینی لەخۆی دابوو بەمەبەستی خۆپاراستن) ئەوا ماوەی کڕکەوتن درێژ دەبێتەوە و دەگاتە 28 رۆژ.

ماوەی دەرکەوتن: لەکاتی دەرکەوتنی یەکەم نیشانەوە دەست پێدەکات، سەرەتا لە 2-3 رۆژدا ئەم نیشانانە دەردەکەون:

تا لێهاتن، بێهێزیی و بێتاقەتی، خەواڵوویی، چاویەشە، گەر نەخۆش دەرمانی دژ سۆ بخوات ئەوا نیشانەکان ون دەبن. لە دووەم یان لە سێیەم رۆژدا تا نزم دەبێتەوە، ئەمەش نیشانەی توندبوونی ڕێرەوی سورێژەیە، پاشتر پێست شەقار شەقار دەبێت و تا بەرزدەبێتەوە و نزیکەی 5-7 رۆژ دەخایەنێت. بەرزبوونەوەی تا دەبێتە هۆی تێکچوونی باری نەخۆش و سورێژەدار بێڕەنگ و خەواڵوو دەبێت.

سەرەتا لیمفەگرێکانی لامل و بن هەنگڵ و پشت مل و ئەملاولای سنگ ئاوساون و تەنیا لەکاتی دەست خستنە سەریاندا هەستیان پێ دەکرێت. ناوپۆشەکانی لووت و دەم و چاو دەگۆڕێن، ئاو و چڵم بەلووتدا دێتەخوارێ، پێڵووی سەرەوە ریپۆقاوییە، زۆرجاریش پێڵوی خوارەوە ئاوساوە، چاو فرمێسکی پێدا دێتەخوارەوەی و نەخۆش لە ڕووناکی دەترسێت. ڕووخساری نەخۆش ئاوساوە، نێو کونە لووتەکان سووردەبنەوە، فرمێسکی بەردەوام وا لەسورێژەدار دەکات (دەموچاوی گریاوی) دەربکەوێت. نەخۆش بۆ بارێکی وادەگەڕێت کەخۆی دەیەوێت، سەرەتا نەخۆش وشکە کۆکەی هەیە. پاش دەرکەوتنی پەڵەکان ناودەم و مەڵاشوو و پوك سووردەبێتەوە و خاڵی سووری پێوە دەبینرێت (نیشانەیەکی گرنگی سورێژەیە پێش دەرکەوتنی پەڵەکان لەقەبارەی سەرەدەرزیدان، لێوارەکانیان سورێکی گەشەوچەند رۆژێك دەخایەنن) وەك نوختەی خوێنتێزاو وان، لەسەر زمانە بچکۆلە پەیدا دەبن.

**نیشانەی (Koplik)**: بریتییە لەکۆمەڵێك پێکهاتووی شێوە خاڵی و سوورو سپیی بریقەداری ناسك لەناو زاری نەخۆش دێت کەبۆ دەستنیشانکردنی سورێژە زۆر بەسوودە.

هەندێکجار سورێژەدار ئەم نیشانانەشی هەیە: رشانەوە، سکچوون، لەبەشی چەپی ژێر جگەردا نەخۆش هەست بەئازار دەکات، وەك ئازاری ریخۆڵەکوێرە دەردەکەوێت.

ماوەی کۆتایی، 3–4 رۆژ پاش دەرکەوتنی یەکەم نیشانە پێست شەقار دەبێت.

لە چواردەهەمین یان شازدەهەمین رۆژدا ئەم نیشانانە دەردەکەون: زۆرجار لە پشتی گوێچکەوە (لەنزیك مووی سەرەوە) پێست شەقار دەبێت، بۆ رۆژی دوایی ناوچەی لامل و سنگ و سکیش دەگرێتەوە. لەرۆژی سێیەمی ماوەکەدا دەست و پێ وهەموو لەش دەگرێتەوە. لە رۆژی چوارەمدا گۆڕانکاری سەرتاپای پێست دەست پێدەکات، بلقی لێدێت پاشان سوور هەڵدەگەرێت. خاڵە سوورەکان لە ژێر فشاری پەنجەدا وندەبن، پاش 5–6 رۆژ خاڵە سوورەکان وەك پەڵەی بچوك دەردەکەون و لە 6–7 رۆژدا نامێنن.

**جۆرەکانی نەخۆشییەکە**

1– بەپێی جۆری خاڵە شێوە نوختاوییەکانی سەر پێست:

* جۆری سوورو سپی. * جۆری خاڵ خاڵاوی سوور.

* جۆری بلقاوی – دەگمەنە. * جۆری بێ گۆڕانکاریی پێست.

2– بەپێی بەهێزی نیشانەکان ئەمانەن:

* جۆری خوێنبەربوو. * جۆری ژەهراویبوو.

3– بەپێی تەمەن:

* جۆری بەرمەمکانە * جۆری منالی گچکە. * جۆری منداڵی گەورە.

**مەترسییەکان** (16)

– کۆئەندامی هەناسە: سییە سۆ، ئاوسانی گەروو وەلاشوو، سۆی سیکڵدانۆچکەکان و بۆرییەکانی هەوا.

– کۆئەندامی هەرس: سۆی ناودەم ، سووبوونەوەی ناوپۆشی گەدە، ریخۆڵەکوێرە.

– سۆی گوێی ناوەڕاست، سۆی گلاندی ماستۆید، سووربوونەوەو برینداربوونی چاو، دومەڵ و بلق.

– کۆئەندامی ناوەندیی دەمار: لەساوادا فێلێهاتن، لەهۆش خۆچوون و سۆی مێشك.

– هەندێکجار ژن لە 12 هەفتەی سکپڕیدا تووشی ڤایرۆسەکە دەبێت.

لەم بارەدا لە 50٪ی ئاولەمە سەقەت دەبن، بەڵام تا تەمەنی ئاولەمە (سکەکە) گەورەتر بێت مەترسیی ناتەواوی ئاولەمە کەمتر دەبێتەوە. (بە رای هەندێك پزیشك باشتر وایە ئاولەمە لەباربرێت).

– گەر سورێژەدار تووشی دەردەباریکە ببێت ئەوا رێڕەوی دەردەباریکە هێواش، چالاك و توند دەکات.

**دەستنیشانکردن**

– دەستنیشانکردن بەپێی زانیاری پەتازانی، تاقیگایی و بەرزبوونەوەی لیمفۆسایتەکانەوە دەبێت.

– جیاکردنەوەی ڤایرۆسەکە لەلیکی ناودەم و گەروو، چڵمی ناولووت، بۆریی هەناسە و خوێندا زۆر گرنگە.

- دەستنیشانکردنی دژەتەنی دژە بەڤایرۆسەکە.
- لەهەندێك باردا پێویستە نەخۆش بکوترێت (وەك تێستێك) بۆ دەستنیشانکردن.

**زۆر پێویستە سورێژە لەم نەخۆشییانە جیابکرێتەوە:**

گرانەتا، رەشەگرانەتا، زەردوویی ڤایرۆسی، ئینفلوەنزا، مەننگی و مەلاریا.

**خۆپاراستن**

- جیاکردنەوەی نەخۆش. - کوتان دژی سورێژە.

پێش دروستکردن و بەکارهێنانی کوتانی دژی سورێژە نەخۆشییەکە زۆر بڵاوبوو وەلێ لەسەرەتای سەدەی بیستدا رێژەی تووشبوون بەم نەخۆشییە زۆر کەمبووەوە و گۆڕانکارییەکی باش بەسەر جیهاندا هاتووە.

هێدی هێدی پلەی پاکوخاوێنی و رێکخستنی کۆمەڵ و باری تەندروستی و خۆپاراستن لە نەخۆشییە درمە سۆییەکان زۆر باشتر بوو تا وای لێهاتووە خەڵکی خۆیان بەشوێن کوتانی دژی نەخۆشییەکاندا دەگەڕێن. لەزۆربەی وڵاتاندا کوتان هەیە و دژی سورێژە بەکاردەهێنرێت. بۆ نمونە پاش ساڵی 1982 لە سوێددا هەموو منداڵێك دووجار دژی سورێژە دەکوترێت. یەکەم جار لەتەمەنی 18 مانگیدا، دووەم لەتەمەنی 12 ساڵیدا، وەلێ لە ئەمێریکادا لەتەمەنی 12-15 مانگیدا یان لەتەمەنی 6-12 ساڵیدا منداڵ دەکوترێت.

**سەرچاوەکان**


Refereces

1.Anne A.Gershon,.Measles virus(Rubeolla) In infectious Dis,Mandell;Doglas and Bennetts.4thg eds.1995 137:1519-26.
2.Norrby E, Oxman MN Measles in field BN.ed vorology NW:Raven press:1990:1013-44.
3.A-Paunescu-Podeanu. Principalele in practica medicala vol2, ed med. bucurest.1983
4.Haris M et al. Measles and multiple sclerosis Brit Med J.1973,3:2 612
5.Jespersen.C.S.et.al. Measles as acause of fetal defects acta pediatr scand.1977;66:367.
6.Katz S. Measles-forgotton but not gone New eng J Med 1985:313.577
7.Modlin, D.Severe Measles in the tropics. Brit Med J 1969,1:297
8.Cl.Taindel. Rujola.in boli infectionase sub redation Marin Voiculescu Edi Did si ped.Bucurest 1980
9. MMWR. CDC Measles prevention,1987,44,427
10.MMWR, Measles.USA: 1950-1984 IBID Annual summary 1988,33,64-65.
11.Lous Z.Copper, Stephen R Preblud and Charles A Alford, Jr Rubella In infectious Diseases of the fetus newborn infant,4th eds. W.B.Saunders company 1995,6 268-295.
12.MMWR.CDC. recommended childhood immunization schedule-United States. 1996:456:635-39.
13.MMWR.CDC. recommended childhood immunization schedule-United States 1997;46 235-39


## سورێژەی ئەڵمانی( درکە)

نەخۆشییەکی سۆیی درمە، بە رێژەی گۆڕاو لە باشووری کوردستاندا هەیە.

**هۆی سورکە**

ڤایرۆسێکی لیمفۆترۆپە بە ناوی ڤایرۆسی روبیلۆلەو سەر بەخێزانی تۆگا ڤایرۆسە (Togavirus) ە لە جۆری RNA و تەنیا یەك جۆری سێری هەیە.

**مێژوو** (9)

- نەخۆشییەکە لەژێر ناوی نۆژداری ئەڵمانی Rötheln دا نووسراوە.

- نوژداری چاوی ئوسترالی (گریگ) لەساڵی 1941دا لەسەر نیشانەکانی سوورێژەی ئەڵمانی نووسیوە.

- (پارکمان)و هاوەڵەکانی لەساڵی 1962دا ڤایرۆسی سوورێژەی ئەڵمانییان جیاکردەوە.

- لەساڵی 1969دا یەکەم کوتان دژی ڤایرۆسەکە دروستکرا.

**پەتازانی**

سەرچاوەی نەخۆشییەکە مرۆڤە، درمی نەخۆشییەکە زۆر بەرزەو نزیکەی 5 رۆژ گۆڕانکاری بەسەر پێستدا دێت. ئەوەی شایانی باسە 10-15 ساڵ لەمەوبەر نەخۆشییەکە لەناو منداڵدا زۆر بڵاوبوو. لەساڵی 1946دا نزیکەی 12 ملیۆن‌و نیو تووشی ئەم جۆرە سوورێژەیە بوون، بەڵام پاش 1969و دروستکردنی کوتانی دژی سوورێژەی ئەڵمانی مەترسیی نەخۆشییەکە زۆر کەمبووەتەوە.

**تایبەتمەندی ڤایرۆسەکە**

تەنۆلکەی ڤایرۆسەکە شێوەی بازنەیی هەیەو تیرەیان لەنێوان 60-70 نانۆمیتردایەو ناوکیان بە لیپۆپێپتید دەورەدراوەو دوو ئەنتیجینی هەیە. یەکەمیان ئەنتیجینی جۆری V یە کەدەبێتە هۆی خێرا دروستکردنی دژەتەن، ئەوی تریان ئەنتیجینی S ە کە وەڵامی دژەتەن نەداتەوە. ڤایرۆسەکە بە ئیسەرو گەرما هەستدارە بەڵام بەرگەی سەرما دەگرێت.

**رێگاکانی گواستنەوە**

- ڤایرۆسەکە بەرێگەی هەناسەدان (پرژەو دڵۆپی پژمین‌و کۆکین) دا دەگوێزرێتەوە 5-7 رۆژ پێش‌و 4-5 رۆژیش پاش گۆڕانکارییەکانی پێست دژە تەنی دژ بەڤایرۆسەکە لەناو خوێن‌و شلەی ناو لووت‌و گەرووداا بە باشی دەستنیشان دەکرێت.

- هەروەها دایك لەوێڵاشەوە ڤایرۆسەکە بۆ ئاولەمە دەگوێزێتەوە (لەشێوەی سەرپێ، هەمیشەیی‌و گەشەکردوودا دەردەکەوێت).

**تێبینی**: زۆرجار منداڵ پاش تەمەنی 6 مانگ تووشی ڤایرۆسەکە دەبێت چونکە لەو تەمەنەدا دژەتەنی بەرگریی ناو وێڵاش لە دەستدەدەن.

**نیشانەکان**

ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسەکە 16-18 رۆژەو لەوانەیە ماوەکە لە نێوان 2-3 هەفتەدا بێت.

ماوەی تەشەنەکردنی نەخۆشییەکە لە نێوان 2-5 رۆژدایە، ئەم نیشانانەش دەردەکەون:

خۆراك نەخواردن، ئاوسان‌و سووربوونەوەی ناو گەروو، گیروگرفت لەقووتداندا، خوێنبەربوون، تای نەگۆڕ، لیمفە گرێکانی لامل‌و ژێر چەناگەو پشتی مل دەئاوسێن و ماوەی چەند هەفتەیەك گەورەدەبن.

ماوەی دەرکەوتن، لەم ماوەیەدا چەند پێکهاتوویەکی گچکەی بازنەیی مەیلەو پەمبەیی لەسەر رووخسار دەردەکەون. پاش 24 کاژێر دەداتە دەست‌و یا بێنەوەی شوێنەوار بەجێبهێڵن لە 1-3 رۆژدا وندەبن. لەکاتی دەرکەوتنی پێکهاتووەکاندا تا نزم دەبێتەوە و پاشتریش نامێنێت، بەدەگمەن سپڵ گەورە دەبێت هەندێکجار جومگە و ماسولکەکان ژان دەکەن.

ماوەی چاکبوونەوە، لەم ماوەیەدا تا نزم دەبێتەوەو نامێنێت، گۆڕانکارییەکانی پێست نامێنن‌و تەنیا ئاوساوی لیمفە گرێکانی دەمێنێتەوە.

**ئاڵۆزكارییەكان**

سۆی جومگەكان، مەننگی، هەوكردن، تووشبوونی ئاولەمە بەڤایرۆسەكەو گیروگرفتی دڵو چاوو بیستن.

**دەستنیشانكردن**

– جیاكردنەوەی ڤایرۆسەكە لەلیك، بەڵغەم، چڵم، شلەی ناو زامانی، خوێن، مۆخی ئێسكو میزدا.

– دووبارەكردنەوەی تێستی سێری، لەماوەی 5-10 رۆژدا دژەتەنی IgM دەردەكەوێت و پاشتریش نامێنێت لەم بارەدا تەنیا دژەتەنی IgG و IgA دەمێننەوە، گەر جارێكی تری دژەتەنی IgM بەرزببێتەوە مانای ئەوەیە سۆكە نوێیەو بەلام دەركەوتنی دژەتەنی IgG مانای ئەوەیە سۆكە كۆنە یان سەری هەڵداوەتەوە.

– لە خوێنی پەراوێزەكاندا peripherial blood دا، خرۆكە سپییەكان كەم دەبنەوە وەلێ لیمفۆسایتەكان بەرزدەبنەوە.

– لە 2-5 رۆژی نەخۆشییەكەدا پلاسمۆسایتەكان بەرزدەبنەوە، بەڵام لە7 رۆژدا نزم دەبنەوە.

**رێرەوی نەخۆشییەكە**

بە گشتی باشەو هێدی هێدی نەخۆش چاك دەبێتەوە. گەر ئاولەمە تووشی ڤایرۆسەكە ببێت ئەوا دەبێتە هۆی لەدایكبوونی منداڵێكی ناتەواو.

**چارەسەركردن**

* دەرمانی لەناوبردنی ڤایرۆسەكە نییە.

* خۆراك زۆر بەسوودە بۆ نەخۆش.

* پێویستە دەرمانی هێمن كردنەوەو دژی مەننگی بدرێت بە نەخۆش

* پێویستە خرۆكەی سوور لەخوێنهێنەرەوە بدرێت بەنەخۆش.

**خۆپاراستن**

پێویستە دەرزیی گاماگلۆبولین (لەشێوەی كوتاندا) بدرێت لەمرۆڤ (لە ماسولكەی سمت) بە مەبەستی خۆپاراستن.

**كوتان**

سەیری سورێژە بكە.

**سەرچاوەكان**


References

1.Marin Gh. Voiculescu, German measles, In. Infectious diseases, Ed Med 1990; 44; 65-77.

2.Schiff G. Et al· Transmission of rubeolla from newborns infants, J Amer Med ass 1965; 191, 843.

3.Anne A. Gershon Chickepnex Measles and Mumpsl In· Infectious Diseases of the fetus newborn infant, 4th eds. W. B Saunders Company. 1995, 13. 565-603.

4.Lenke, R. Maternal Rubeolla after 18 weeks. Lancet. 1987; 11, 690

5.Miller, E et al. Consequences by Rubeolla in pregnancy, Lancet 1982, 11, 781.

6.CDC, Recommanded childhood immunization schedule. United States. MMWR, 1996; 45; 35-8

7.CDC , Recommanded childhood immunization schedule. United States. MMWR, 1997; 2· 35-39

8.Lous Z. Cooper, Stephen R Preblud and Charles A. Alford. Jr. Rubella. In Infectious Diseases of the fetus newborn infant, 4th eds W. B Saunders Company. 1995; 6 268-295

9.Leo Flamhle. Rubella från Exantemsjukdomar. Infektionskliniken Malmö allmäna sjukhus,1994, Ss.20-22.

## ڤایرۆسی پاپیلۆمە

ئەم ڤایرۆسەش دەبێتە هۆی چەندین نەخۆشی و شێرپەنجەی پێست . ناسراوترینیان بالوکەی سەر پێست و بالوکەی سەرکۆئەندامی زاوزێیە، هاوکات ڤایرۆسی جۆری 16 و18 یان دەبنە هۆی شێرپەنجە . ئەوەی تایبەتە بە باسەکەمان بریتییە لە بالوکە کە پێستە سۆیەکی زۆر بڵاوە بە تایبەتی لە تەمەنی منداڵیدا .

## بالوکە

بریتییە لە پێکهاتوویەکی گچکەی سنورداری سەر پێست ، هەندێکجار وەك بەرزبوونەوەیەکی بچوکی قەبارە جیاوازی مەیلە وسپی بە تایبەتی لەسەر پەنجەکانی دەست و قاچ دەردەکەوێت.

**هۆزانی**

هۆی سەرەکی دروستبوونی ئەم پێکهاتووەی سەر پێست (بالوکە) دەگەڕێتەوە بۆ ڤایرۆسی پاپیلۆمی مرۆ(Human Papillomavirus (HPV)،.

ئەوەی راستی بێت نزیکەی 80 جۆر ڤایرۆسی پایلۆم هەیە بەڵام تەنیا جۆرە کانی 1,2, 3, 4, 7, 10 , 26, 27 . 28 . 29 . 41 ,48 . 57 . 60 . 63 . 65, 75 . 76, 77 . 78 دەبنە هۆی دەرکەوتنی بالوکە.

بالوکە ناسراوترین و دیارترین هەوکردنی ڤایرۆسییە کە تووشی پێست دەبێت گەر بەراورد بکرێت لە گەڵ پێستدا ئەوا ئەمیان پێکهاتوویەکی کەمێ رەقباوی هەیە . سەرچاوەی هەوکردنەکە مرۆڤە .

بە گشتی بالوکە لە نێوان تەمەنی 8- 10ساڵاندا دەبینرێت بەڵام زۆر بە دەگمەن تووشی منداڵی ساوای ژێر 3 ساڵان دەبێت .

**رێژەی تووشبوون**

لە منداڵی تەمەن 4 تا 6 ساڵاندا رێژەکە 5-10٪ یە ، لەتەمەن 16 تا 18 ساڵاندا رێژەکە دەگاتە لە 15-20٪ . ئەوەی راستی بێت لێوارەکانی بالوکەی سەرپەنجەکانی پێ کەمێك رەقترن وەك لە بالوکەی سەر پەنجەکانی دەست

نابێت ئەو راستییەشمان لە بیر بچێت کە ڤایرۆسی پاپیلۆم دەبێتە هۆی کۆندیلۆم کە بریتین لە هەوکردنی شێوە بالوکەیی لە سەر دەوروبەری کۆمدا دەردەکەون و هەروەها دەبنە هۆی هەوکردنی نێوپۆشەکان .

**رێگاکانی گواستنەوە**

ڤایرۆسەکە راستەوخۆو ناراستەوخۆ زۆر بە ئاسانی لە یەکێکی نەخۆشەوە خۆی دەگەیەنێتە یەکێکی لەش ساغ ، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە ئاستی بالوکەکەدا خانەکانی پێست رۆژانە هەزاران ڤایرۆس دەردەدەن ، جا لەبەرئەوە مەترسی ئەوە زۆرە کە لە شوێنێکی تری لەشدا یان یەکێکی دی تووشی ڤایرۆسەکە بکات . ئەوەی راستی بێت خوێن نابێتە هۆی گواستنەوەی ڤایرۆسەکە .

راستەوخۆ ڤایرۆسەکە دەتوانێت یەکێکی دی لە رێگای خشترێژی ئەرزی زووری دووشکردنی مەلەوانگاکا ئەوە تووش بکات.

لەم بارەدا پەنجە بالوکاویەکانی قاچ خانە ڤایرۆسییەکان بەسەرخشتەکاندا بڵاودەکەنەوە و مرۆڤیش بە پێی پەتی دێت و دەچێت و پزیشکی ناوی بەردەکەوێت و ئەوسا تووشی ڤایرۆسەکە دەبێت . ئەو کەسانەی پێستیان قڵیشاوە یان برینیان لەسەر پێستی قاچ هەیە زیدتر تووشی ڤایرۆسەکە دەبن . مەرج نییە هەموو کەسێك وەك یەك تووشی ڤایرۆسەکە ببێت هۆی ئەم جیاوازیەش نازانرێت .

**رێڕەوی بالوکە**

لە وانەیە هەموو جۆرەکانی بالوکە بێچارەسەرکردن و شوێنەوارجێهێشتن نەمێنن یان لە نێوان مانگ-ساڵدا چاك ببنەوە .

**ماوەی کڕکەوتنی ڤایرۆسەکە**

ئەم ماوەیە جیاوازە و نزیکەی چەند مانگێك دەخایەنێت .

**چارەسەرکردن**

زۆر ئاسانە ، بە گشتی بالوکە خۆیان چاك دەبنەوە یا بە دەرمان لە نێو دەچن . هەروەها بە رێگەی نەشتەرگەری و چارەسەرکردنی تیشکی لاسەر دەتوانرێت بالوکە لابرێت . هەروەها هەتوانی ڤیتامین A جۆرێکی تری چارەسەرکردنە .

**سەرچاوەکان**


د. زاهیر سوران ، بالوکە ، گۆڤاری ڕێوان ژمارە 69، سلێمانی- کوردستان ، 2004 .

References

1-Tomas Bergström, virusinfektioner, klinik, diagnostik och behandling Glaxowellcome AB, Göteborg , Papillomvirus, 1977. sida 68-69

2-Abram S. Benenson, editor Control of Communicable Diseases in man, fifteenth edition, warts, viral, USA. p.481-482,1990.

3-Sten H Vermund, Sibylle Kristensen & Maria L Smith Papillomavirus infections, STD, infectious diseases, Donald Armstrong and Johathan Cohen, vol 1, USA 1999

4-Hans-Inge Peterson, Chirurgia Minor, Handledning I lilla kirurgien för läkare, sjuksköterskor och studerande, sida 11-12, Warnw Förlag 2001

5-Hans Rosrsman, Alf Björberg, Anders Vahlqvist. Dermatologi venereologi, sida 214-216, Sweden 2000.


## گوێ ڕەپە

نەخۆشییەکی سوێی گوتوپڕی درمە کە دەبێتە هۆی سوێی گلاندەکانی لیك، پانکریاس، کۆئەندامی دەمارو گونەکان.

**هۆزانی**

ڤایرۆسێکە بەناوی (ڤایرۆسی مومپس) سەر بەخێزانی (پارامیسکۆ ڤریدیا) یە کە دوو ڤایرۆسی پارا ئینفلوەنزاو Newcastle یش دەگرێتەوە. ڤایرۆسەکە شێوەی بازنەیی هەیەو قەبارەکەی لە نێوان 120-200 نانۆمیترە. لەپلەی گەرمیی ژووردا چەند رۆژێك دەژی بەڵام پاش 3-4 کاژێر توانای هەوکردن لە دەست دەدات. هەروەها دەتوانین لە 20 پلەدا بۆ ماوەی ساڵێك ڤایرۆسەکە هەڵبگرین. لەگەرمیدا بۆ ماوەی 20 خولەكو لە55 پلەدا هەر ناچالاکە. لەبەر تیشکی وەنەوشەییدا لە 30 چرکەداو لەخەستیی کەمی فۆرمۆلو فینۆڵدا ناچالاك دەبێت بێئەوەی توانای ئەنتیجینی لەدەست بدات.

ڤایرۆسەکە لەقۆناخە جیاوازەکانی (6 رۆژ پێش دەرکەوتنی نیشانەکانو 9 رۆژ پاش نیشانەکان) سۆکەدا لە لیکدا جیاکراوەتەوە . هەروەها ڤایرۆسەکە لەخوێن، میز، شیری ژن یان مەیموونـدا جیاکراوەتەوە.

**مێژوو** (5)

- میپۆکرات بۆ یەکەمجار لەسەر نەخۆشییەکەی نووسیوە.
- هامیلتۆن لەساڵی 1700دا ئاوسانی گوێی بە نیشانەی گوێ ڕەپە داناوە.
- ڤۆنشتاین لەساڵی 1916دا تاقیکردنەوەی چاندنی لیکی لەپشیلەدا ئەنجامدا.
- یۆهانسو گودپاستویر لەساڵی 1914-1935دا دەستکردانە نەخۆشییەکەیان لەمەیمووندا ئەنجامدا.
- هابیل لەساڵی 1945دا ڤایرۆسەکەی جیاکردەوە.
- لەساڵی 1950دا یەکەم کوتان لەڤایرۆسی مردووی گوێ ڕەپە دروستکرا.
- بویانکو هیلمان لەساڵی 1966دا رایانگەیاند کەکوتانیکی باشیان دروستکرد.

**پەتازانی**

گوێ ڕەپە لەهەموو جیهاندا بڵاوە، هەندێکجار لەشێوەی بڵاوبوونەوەی شێوە پەلەدا لەقوتابخانە و سەربازگادا دەردەکەوێت. ئەوەی جێی سەرنجە گوێ ڕەپە لە دووەم تەمەنی منداڵیدا (لاوی) دا لەزستانو بەهاردا دەردەکەوێت.

لە 30-40٪ی خەڵکی بێنەوەی هەستی پێبکەن تووشی ڤایرۆسەکە دەبن، لەبەرئەوە ناتوانین ژمارەی تووشبووان بقەبلێنین.

**رێگاکانی گواستنەوە**

- رێگای راستەوخۆ، بە هۆی پرژە یان دلۆپی کۆکەو پژمینەوە دەبێت.
- رێگای ناڕاستەوخۆ. بەدەگمەن بەهۆی کەلوپەلی تازەی ڤایرۆساوی نەخۆشەوە دەبێت.

**ماوەی درمێتی:** نزیکەی 6 رۆژ پێش دەرکەوتنی نیشانەکان درمێتیی ڤایرۆسەکە بەرزە.

**نیشانەکان**

ماوەی کڕکەوتنی ڤایرۆسەکە لە نێوان 14-18 رۆژدا یان لە نێوان 12-23 رۆژدایە.

**شێوەی هاوبەشی سۆکە**

سەرەتا نەخۆشییەکە بە لەرزو تا، ژانەسەر، ژانکردنی ماسولکەو ئازاری شێوە پاڵەپەستۆ لەسەر ئەملاولای گلاندەکانی لیک دەردەکەوێت.

لەیەکەم 3 رۆژدا تالیهاتن لەنێوان 37-40 پلەدایەو پاش هەفتەیەک ئاوساوی گلاندی پارۆتید دەڕەوێتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ باری پێشووی خۆی. پاشتر گلاندی لیک دەئاوسێ و بەئاسانی پەنمانی لاملو ژێرچەناگە دەبینرێت کە دەبێتە هۆی بریسکانەوە، کشاندنی پێستو خواربوونی رووخسارو پاشتر شێوەی هەرمێ وەردەگرێت.

**لە کاتی تێڕوانینیدا:** گلاندی پارۆتید ئاوساوە کەمێک رەقە و بەئازارە، لەکاتی دەست لەسەر دانانیدا زۆر بەئازارە، زمان بەڵخی گرتووە، زۆرجارسۆکە گلاندێک دەگرێتەوەو پاش 2-4 رۆژ ئەوەی تریش تووش ئەبێت. پەنمانی گلاندی پارۆتید دەبێتە هۆی گیروگرفت و ئازار لەکاتی جوینو قووتدانی خۆراکدا، کەمبوونەوەی لیکی ناودەمو وشکبوونەوەی ناودەم.

لەماوەی 7-10 ڕۆژدا پەنماوی هەردوو گلاندەکنی پارۆتید نامێنن بێئەوەی کێم بکات پاشتریش گلاندی ژێر چەناگە (پیاودا) دەنیشێتەوە، گلاندی ژێر ئەملاولای زمانە بچکۆلەومەلاشووی ناوەوە دەئاوسێ و نەخۆش کەمێك تاداره.

**هەندێکجار سۆکە ئەم ئەندامانە دەگرێتەوە:**

- ئاوسانی گونەکان، تاکێك یان هەردوو گونەکان بە ڕێژەی 12-25٪ لەکاتی باڵقیدا دەئاوسێن. ئەوەی راستی بێت گون ئاوسان بە دەگمەن لەلاوی ژێر تەمەن 14 ساڵیدا دەبینرێت.
- زۆرجار 4-5 ڕۆژ پاش سۆی گلاندە پارۆتیدەکان گونەکانیش دەئاوسێن و ژان دەکەن، نەخۆش تووشی ژانەسەر، بێئارامی و هێڵنج و رشانەوە دەبێت.

**تێبینی:** سۆکە کار ناکاتە سەر دروستکردنی سپێرم.

- سۆی پەنکریاس ، سۆیەکی هاوبەشی ڤایرۆسییە، دەبێتە هۆی ژانکردنی بەشی سەرەوەی سك (هەندێکجار ژانە سك درامایە) ناوچەی سك گرژو رەق دەبێت، هاوکات نەخۆش تووشی رشانەوەو بێئیشتیهایی دەبێت.
- سۆی پەردەی ناوەوەی دڵ، بەگشتی سۆکە نابێتە هۆی گۆڕانکاری لەهێڵکێشیی دڵدا ECG و سۆکە ئاسانەو زوو نامێنێت.
- سۆی جومگەکان ، لە گەورەدا پاش 30 ساڵ دەردەکەوێت.
- کۆئەندامی ناوەندیی دەمار، لە25٪ ی گوێ رەپەدا کۆئەندامی ناوەندیی دەمار تووشی ڤایرۆسەکە دەبێت و دەبێتەهۆی سۆی مێشك.

**کورتەی نیشانەکان**

**1- گلاندەکان:**

- گلاندی پارۆتید 60-70٪ .
- گلاندی ژێرچەناگەو زمان 10٪ .
- گلاندی سەر گونەکان 25٪ (پاش باڵقبوون).

**2- دەمارەکان:**

-مۆخی ناو بڕبڕەی پشت 50٪ .
- مەننگ 1-10٪ .
- نیشانەی مەژی زۆر کەمە.

**3- باری تر:**

- هێڵکێشیی دڵ بە ڕێژەی 5-15٪ نائاساییە .
- فەنکشنی گورچیلە بە ڕێژەی لەسەروو 60٪ ناتەواوە.

**گوێ رەپەی دووگیان**

ئەوەی شایانیباسە تا ئەمڕۆ بەتەواوی ڕوون نەبووەتەوە ئایا ڤایرۆسەکە لە وێلاشەوە دەپەڕێتەوەو لەزاماڵدا ئاولەمە تووشدەکات یان نا؟ هەندێك توێژیار دەبێژن ڕێژەی مەترسیی تووشبوون بەڤایرۆسی گوێ رەپە لەیەکەم 3 مانگی سکپڕیدا لە 20 ٪ دایەو کە دەبێتە هۆی ناتەواوی ئاولەمە.

**دەستنیشانکردن**

بە پێی نیشانەکانی گوێ ڕەپەو ئاوسانی هەردوو گلانی پارۆتید بۆ کێمکردن.

* **تێستی تاقیگا**

- کەمبوونەوەی ژمارەی خرۆکە سپییەکان (یان ژمارەیان ئاساییە).
- بەرزبوونەوەی لیمفۆسایتەکان، لە پلاسمۆسایتدا خانەی Turck دەردەکەوێت.
- گەر ڤایرۆسەکە سۆ بە گون و پەنکریاس بکات ئەوا ژمارەی خرۆکە سپییەکان دەگاتە سەروو لە 20 هەزارەوە.
- لە 90٪ی نەخۆشەکان ڕێژەی (ئەمیلاز) یان لەخوێن و میزدا نزیکەی 3 هەفتە بەردەوام هەن و زیاددەکات.

* **تێستی تایبەتی**

جیاکردنەوەی ڤایرۆسەکە لەلیك یان لەشلەی مۆخی بڕبڕەی پشتدا (لەتاقیگای ڤایرۆسزانیدا ئەنجام دەدرێت)و بەیاریدەی میکرۆسکۆپی ئەلەکترۆنی لەکاژێرێکدا دەبینرێتەوە.

* تێستی سێری زەرداوی خوێن.

* تێستی بەرتەکی RFC.

* بەرتەکی HAI (بۆ سۆکردنی مەننگ، مێشك بەکاردێت).

ئەنتیجینی ڤایرۆسەکە لەڤایرۆسی ناچالاکی سۆکردنی پارۆتیدی مەیموون وەردەگیرێت و دەکرێتە ژێر پێستەوەو لە 48 کاژێردا 10 ملیمەتر گەورەدەبێت.

**ڕێژەوی نەخۆشییەکە**

بە گشتی زۆرباشە، بەدەگمەن نەخۆش لەکاتی سۆکردنی مەژیدا دەمرێت.

لە ساڵی 1972 ڕاگەیەنرا کە 70 کەس بەگوێ ڕەپە مردن.

**چارەسەرکردن**

- لەبەر نەبوونی دەرمانی دژە ڤایرۆسەکە پێویستە ئەم خاڵانە لەبیر نەکرێت:
- پێویستە 2 هەفتە نەخۆش بحەوێتەوە ( لە کاتی پیسبوونی سۆکەدا لەنەخۆشخانە یان ماڵەوە جیابکرێتەوە).
- پارێزکردن، پێویستە نەخۆش شلەمەنی زۆر بخواتەوە، گەر بەنکریاس سۆ بکات ئەوا پێویستە نەخۆش شیرینی، خۆراکی سوێری و بێچەوری بخوات.

**خۆپاراستن**

- پێویستە لەکاتی سۆی گوێ ڕەپەدا نەخۆشییەکە ڕابگەیەنرێت و نەخۆش 14 ڕۆژ جیابکرێتەوە.
- پێویستە نەخۆش پاکوخاوێن ڕابگیرێت.
- کوتانی گوێ ڕەپە لەساڵی 1967ـەوە بەکاردەهێنرێت، لە 95-98٪ دا ئەنجامی باشی هەبووە.
- کوتانی دژی گوێ ڕەپە پاش یەك ساڵ بەتەنیا یان لەگەڵ کوتانی سیانەدا لەمنداڵ دەدرێت.

**سەرچاوەکان**

References
1.Reed D et al.A mumps epidemic in St.George Island, Alaska, J Amer Med Ass 1967;199:967
2.MMWR. Mumps vaccine, 1977; 48,393.
3.Stephen G.Beum, Nathan Litman, Mumps virus, in Infectious Diseases, 1995;135.1496-1501
4 Abram S.Beneson, Control of Communicable Diseases in men. ed 15th. Amer publ health Ass. 1990, 293-296

# ئینفلوەنزا

یەکێکە لەنەخۆشییە درمەکانی کۆئەندامی هەناسە، لەقۆناخێکی ژیاندا مرۆڤ جارێك یان چەند جارێك تووشی نەخۆشییە کە دەبێت. ئەوەی شایانی باسە لەساڵی 1952دا (ر ت ج) پرۆگرامی جیهانیی ئینفلوەنزای دامەزراند، پاشتر بۆ سەرکەوتنی پرۆگرامەکە مەڵبەندی جیهانی ئینفلوەنزای سەر بە ئینیستیتوی نەتەوەیی- لەندەن هاریکاری لە گەڵیاندا کرد.

ئامانجەکانی هەردوو رێکخراوەکە بریتی بوون:

1- لە بڵاوبوونەوەی (پەتازانی) ئینفلوەنزا بگەن.

2- لەسەر ئاستی جیهاندا ڤایرۆسی ئینفلوەنزا جیابکرێتەوەو کوتانێکی بۆ دروستبکرێت.

کارەکانی مەڵبەندی جیهانی ئینفلوەنزا (6) :

1- کۆکردنەوەو پاشان دابەشکردنی زانیاری دەربارەی جۆرەکانی ڤایرۆسی ئینفلوەنزا.

2- ئامۆژگاری دان دەربارەی ئینفلوەنزاو کوتانی.

3- کۆکردنەوەی باسو توێژینەوەی تایبەت بەتاقیگا.

4- فێرکردنی تەکنیکی (لەخولی تایبەتی) ژمارەیەکی گچکە لە کادیرە میوانەکان.

ئەوەی راستی بێت ئەمڕۆ لەو پرۆگرامەدا 112 مەڵبەندی نەتەوەیی ئینفلوەنزا لە 83 وڵاتدا بەشداری تیادادەکەنو لە 3 مەڵبەندی هاوکاری سەرەکی توێژینەوەی ئینفلوەنزا لە لەندەن، ئەتڵەنتاو مێلبۆرندا کۆبوونەتەوە. هەر 3 مەڵبەندەکەی سەرەوە رێکوپێك راپۆرتی خۆیان دەربارەی نەخۆشییە درمییەکان بۆ ر ت ج دەربارەی توێژینەوەو لێکۆڵینەوە لە ئەنتیجین، زگماکزانی، سێرۆزانیو کوتانی نوێ دەنێرن. نابێت ئەو راستییە لەیادبکەین کەپەتاو ئینفلوەنزا یەك جیاوازییان هەیە ئەویش بریتییە لە:

ئەو کەسەی تووشی ئینفلوەنزا دەبێت لەپڕ تایەکی بەرزی لێدێت. زۆرجار شەوانە ژانە سەر، ژانە ماسولکە، ئازاریی گەروو کۆکەو ماندوویی لەگەڵدایە. گەر سییەکانی نەخۆش تووشی ڤایرۆسەکە یان باکتریا ببێت ئەوا نەخۆش تووشی هەوکردنی سییەکان دەبێت. یان هەر کاتێك مرۆڤ چەند رۆژێك تای لێهات یان سنگی ژانی کرد (پێش ئەوەی دەرمان بخوات بەمەبەستی چاکبوونەوە) پێویستە خۆی بگەیەنێتە لای پزیشك. هەموو دەزانین کوتانی دژی نەخۆشییەکە هەیەو بەکاردەهێنرێتو بەسوودە بۆ مرۆڤ وەلێ دژی پەتاو هەڵمەتو سەرمابوون کوتان نییە. ئینفلوەنزا زیاتر تووشی لاوان دەبێت وەك لەکەسانی دی، رێژەی نەخۆشییەکە لە مرۆڤی لەشساخدا باشەو نەخۆش زوو چاکدەبێتەوە.

## هۆی ئینفلوەنزا

هۆی پەتاکە ڤایرۆسێکە بەناوی میکسوڤایرۆس ئینفلوەنزا، سەر بەخێزانی ئۆرپوڤیر یانایە وەلێ لەجۆری RNAیە، بەپەردەیەکی زۆرتەنك داپۆشراوە تیرەکەی 80 - 120 نانۆمیترە. ڤایرۆسی ئینفلوەنزا پێکهاتووە لە دوو رووپۆشە مۆلێکیولی Hemagglutinin کورتکراوەی H یان HA ی بۆ بەکاردەهێنرێت و مۆلیکیولی Neuraminnindas و کورتکراوەیN یان NA یان بۆ بەکاردەهێنرێت .

نزیکەی 16 جۆری H و 9 جۆری N هەیە و ئەمانە دەتوانن بە نزیکەی 80 شێوە لە باڵندەدا تێکەڵ بن . سێ تێکەڵبوونیان تووشی مرۆ دەبێت و جۆری A بریتین H1N1, H3N2 وەلێ ساڵانە جۆری B دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوە .

**مێژوو** (19 . 28):

- لە ساڵانی 1889 - 1890 دا پفیفر باسیکی لەسەر ڤایرۆسی ئینفلۆنزا نووسیوە.
- سمیس ئەندریڤیس و هاوەڵەکانی لە 1933دا ڤایرۆسەکەیان جیاکردەوە.
- فرانیس و ماگیل لەساڵی 1939دا ڤایرۆسی جۆری B یان جیاکردەوە.
- تایلۆر لەساڵی 1950دا ڤایرۆسی جۆری C ی جیاکردەوە.
- پاش ساڵی 1977 چەند جۆرێکی نوێی ڤایرۆسەکە دەرکەوت کە ئەمانەن:
- جۆری (A (H3 N2) A (H1 N1 لەگەڵ ژمارەیەك جۆری ناوچەیی (واتە لە ناوچەیەدا دەردەکەون) کە ئەمانەن: Aی بەرازیل، Aی سینگافوری 1978 - 1986 . A/1/86
- لەم ساڵانەی دواییدا جۆری A/Shanghai/1/86, A/Sochuan/2/97 یش دەرکەوتوون.
- لەساڵی 2000 دا جۆرێکی نوێ بەناوی ئینفلۆەنزای مۆسکۆ پەیدابوو نیشانەکانی زۆر توندترە لە جۆرەکانی سەرەوە.

**جۆرەکانی ئینفلۆەنزا**

ڤایرۆسەکە چەند جۆرێکی جیاوازی هەیە گرنگترینیان جۆری A, B, C یە. جۆری A, B دەبنە هۆی کۆنە ئینفلۆەنزا.

**جۆرە سێرییەکانی ڤایرۆسی A:**

- A0 - لەساڵی 1932 جیاکراوەتەوە.
- A2 - تا ساڵی 1957 هەبووە.
- A1 جۆری ئاسیایی - لەساڵانی 1957 - 1958 دا بڵاوبووەتەوە.

هەروەها لەساڵی 1968 دا جۆری هۆنگ کۆنگ دەرکەوت.

ئەوەی شایانی باسە لەساڵی 1977 دا جۆرێکی تری ئینفلۆەنزا دەرکەوت کە بووە هۆی بڵاوبوونەوە لە ئاسیاو ئەورووپادا.

ڤایرۆسی جۆری A یان دەبێت بەچەند جۆرێکی سیرەمییەوە کە ئەمانەن: H1 H2 H3 هەندێك جار ئەم جۆرە بە جۆری هۆنگ کۆنگ ناودەبرێت. ئەو ڤایرۆسانەی کە دەبنە هۆی ئینفلۆەنزا ناوی پیتەکانی ,A, B C یان لێنراوەو وەلێ گرنگترینیان ئەمانەن:

* جۆری A، بڵاوترینیانە، و 3 جۆری سیرەمی A2. A1. A0 هەیە .
* جۆری B، ئاسایی سنووردارە، زۆرجار تەنیا ناوچەیەك دەگرێتەوە.
* جۆری C، تەنیا چەند نیشانەیەکی سەرمابوون دەدات بە نەخۆش.

**بەپێی ئەنتیجینەکان ڤایرۆسەکە 2 جۆری هەیە:**

- ئەنتیجینە گەورەکان، ئەنتیجینەکان دەگۆڕێن و پاش 10 -14 ساڵ دەردەکەون و دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی ئینفلۆەنزایی بێ سنوور.

- ئەنتیجینە گچکەکان، هەموو ساڵێك یان لەماوەی چەند ساڵێکدا جارێك دەردەکەون و دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەی گشتی.

**پەتازانی**

ئـەوەی راسـتی بێـت ئینفلـوەنزا لـەپڕ دەردەکـەوێت و لەماوەیـەکی کورتـدا ژمارەیـەکی زۆر لەخـەڵکی تووشدەبن و دواتریش زۆربەی زۆری جیهان دەگرێتەوە.

- ڤایرۆسی جۆری A دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی بێ سنوور.
- ڤایرۆسی جۆری B دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی سنووردار.
- ڤایرۆسی جۆری C زۆر بەدەگمەن دەردەکەوێت.

لە کاتی بڵاوبوونەوەکاندا ئینفلوەنزا لە 10-30٪ ی دانیشتووان دەگرێتـەوە، بۆ نموونـە ئینفلۆنزای ڤایرۆسی A2/Hong Kong بۆ ماوەی 3 مانگ لە 27٪ ی دانیشتووانی ئەمێریکای گرتـەوە، جاری وایـە بڵاوبوونەوەکـە 50-75٪ ی دانیشتووانی جیهـان دەگرێتـەوە. هـەموو 2-3 ساڵ جارێك بڵاوبوونـەوەی ئینفلـوەنزای A دەردەکـەوێت، وەلـێ جـۆری B هـەموو 3-6 سـاڵێك دەردەکـەوێت. لەلایـەکی تـرەوە روونبووەتەوە کە نەخۆشییەکە زیاتر تووشی ئەو کەسانە دەبێت کە لەساڵانی 1947-1951 تووشی ڤایرۆسەکە نەبوون (واتە ئەو منداڵانەی پاش 1951 لەدایکبوون بەرگریان نییە). ئەوەی شایانی باسە بڵاوبوونـــەوەی جـــۆری B لەســـاڵانی 1979- 1980، 1981-1982، 1985- 1986 دەرکـــەوتووە. هەروەها هەمان ڤایرۆس لەسەپتەمبەری 1968دا لە تاران بڵاوبووەتەوە.

**ئینفلوەنزای A (H3 N2):**

لە ئۆکتۆبەری 1996 دا لەئەفەریقا، ئەمێریکا و ئاسیا و ئەوروپادا بڵاوبووەتـەوە، هـەروەها لەئۆکتۆبـەر- سێپتەمبەری هـەمان ساڵدا لـە رۆژئاوای ئەوروپا، رووسیا، یابان و ئەمـەریکای باکووردا بڵاوبووەتـەوە. هەروەها لەجەنیوەری و فێبرواری 1997دا بڵاوبووەتەوە.

**ئینفلوەنزای A (H1 N1)**: لەئەرجەنتین، چین، رۆمانیا، رووسیا، سویسرا و سینگافۆردا دەرکەوتووە.

**ئینفلوەنزای B**: ئەم جۆرە لە نێوان مانگی ئۆکتۆبەر - نۆڤەمبەری 1996دا دەرکەوتووە، هـەروەها لە نۆڤەمبـەر- دیسـەمبەردا لەچـین و ئێرلەنـدا دەرکـەوتووە. لـە سـەرەتای 1997دا جـۆری B زیـاتر لـە (بەلەڕووس، چیك، ئەڵمانیا، ئیسرائیل، ئێرلاند، ئوسترالیا، شیلی، فینلاند، هۆنگ کۆنگ، ئیتالیا، یابان، رۆمانیا، سینیگاڵ، سلۆڤاکیا و سویسرا) دا دەرکەوتووە.

لەساڵانی 1996 -1997 دا ئەم جۆرە ئەنتیجێنیانە جیاکراونەتەوە:

- A/Anckland/6/96.
- A/Brazil/140/96.
- A/Chile/2110/96.
- A/Nagasaki/191/96.
- A/poitiers/191/96.
- A/Zambia/546/96.
- A/Swetzerland/608/96.
- A/Beijing/292/95.

**بڵاوبوونەوە جیهانییەکانی ئینفلوەنزا**

- لـە سـەدەی 14هەمدا (یەکـەمین بڵاوبوونـەوەی ئینفلوەنزا دەرکـەوت) تـا ئـەمڕۆ 31 جار نەخۆشییەکە بڵاوبووەتەوە.

- گەورەترین بڵاوبوونەوەی ئینفلوەنزا لەساڵانی 1918– 1919 دا لە ئیسپانیاوە هاتووە، ئەو ساڵە 15 ملیۆن کەس مردن.

- هەمان نەخۆشی گەیشتووەتە سویدو 25 هەزار سویدیش مردوون.

- لەساڵی 1957– 1958 دا نزیکەی 33٪ ی دانیشتووانی جیهان تووشی ئینفلوەنزا بوون وەلێ رادەی مردن لەچاو ساڵانی 1918 – 1919 دا زۆر زۆر کەمتربوو.

- لەساڵی 1957 دا جارێکی تر هەمان ئینفلوەنزا بڵاوبووەوە.

- لەساڵی 1968 بڵاوبوونەوەیەکی تری ڤایرۆسەکە لە هۆنگ کۆنگ دەرکەوت.

هەردوو جۆرەکەو جۆرە ئیسپانییەکەش بەهۆی جۆرێکی گۆڕاوی نوێوە ماوەیەك بەناو سەربازگاکانی ئەمەریکادا بڵاوبووەتەوە. لەکۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیدا وڵاتانی فەرەنساو ئەڵمانیا تووشی نەخۆشییەکە بوونو پاشتریش نەخۆشییەکە گەیشتە ئاسیا.

یەکەمجار نەخۆشییەکە لە ئیسپانیادا بڵاوبووەتەوەو بەشێکی زۆری جیهانی گرتەوەو لەبەرئەوە پاشتر ناوی (نەخۆشیی ئیسپانی) لێنرا.

- لە ساڵی 1977 دا دوو جۆر ئینفلوەنزای B، A بڵاوبووەوەو هەریەکەیان ماوەی 6–8 هەفتەیان خایاند.

- ئینفلوەنزای ساڵی 1968 بەهۆی دوو جۆری B.A ەوە بوونو لە سینگافۆر جیاکرانەوە کە ئەمانیش هەمان جۆری ڤایرۆسی هۆنگ کۆنگ بوون واتە جۆری (H3 N2).

**رێگاکانی گواستنەوە**

راستەوخۆ لە رێگەی دڵۆپ یان پرژەی کۆکەو پژمینەوە شلەی ناو دەمو لووتەوە کەڤایرۆسەکەی تیادابێت.

ڤایرۆسەکە دەبێتە هۆی تووشبوونی مرۆڤێکی تر، ئەمەش ئەو راستییە دەسەلمێنێت کە ئینفلوەنزا زۆر درمییە. ماوەی درمێتی ڤایرۆسەکە لە نێوان 3–5 رۆژدایە. بەرگری پاش ئینفلوەنزا تایبەتە بەجۆری ڤایرۆسەکە.

**سەرچاوەی نەخۆشییەکە:**

مرۆڤی تووشبوو، نەخۆش، لەشساخی هەڵگری ڤایرۆسەکەیە.

**بەرگری**

ئەوەی شایانی باسە هەندێك لەنەخۆشییە سوکردووەکان (ڤایرۆسی، باکتریایی) پاش چاکبوونەوەیان بەرگرییەکی تایبەت لەناو لەشی نەخۆشدا بەجێدەهێڵن کە بە(بەرگریی تایبەتی جۆری پێشوازیکەری ڤایرۆسی) ناسراوە، هەروەك لەسوکردن بەڤایرۆسی ئینفلوەنزادا دەبینرێت.

لەم بارەدا لەخوێندا دژەتەنی تایبەت بەرامبەر ئەنتیجێنی کەپسیدە ناوکییەکانو ئەنتیجێنی داپۆشەری ڤایرۆسەکە پەیدا دەبێت.

**تێبینی:** تەنیا لەسوکردنی ئینفلوەنزادا (دژە تەنی تایبەتی بەرامبەر ئەنتیجێنی داپۆشەری ڤایرۆسەکە) دەردەکەوێت.

دەستنیشانکردنی دژەتەنەکان

- تێستی هاوسەنگکردن

لەکاتی سۆکردنی ڤایرۆسی ئینفلوەنزادا، ڤایرۆسەکە بۆرییەکانی هەناسەدان تووشدەکات و لەوێدا دەچێتە ناو ناوپۆشی بۆرییەکانی هەناسەدانەوە، تیایدا زیاددەکات و دەبێتەهۆی کەمبوونەوەی خەستی (چڕی) دیواری ناوپۆشەکە تا خانە پێشوازیکەرەکانی سەر روو بەتەنیا دەمێنێتەوەو ئەوسا ڤایرۆسەکە دەچێتە ناوەوە. ئا بەم جۆرە خانە ناوپۆشەکان دەڕوشێن و لەخانەکانی تری ناوپۆش جیادەبنەوەو پاشتر ژەهری ڤایرۆسەکە کار دەکاتە سەر هەموو لەش و دەبێتەهۆی دەرکەوتنی ژانەسەر، تا، ماسولکەژانکردن، بێهێزی، لەش داهێزران و بێتاقەتی.

- خوێنی ڤایرۆساوی: یەکێکە لەو بارە ئالۆزنەی لەکاتی ئینفلوەنزادا بەدەگمەن دەردەکەوێت، گەر سکپڕ تووشی ئینفلوەنزا ببێت ئەوا دەبێتە هۆی ناتەواوی ئاولەمە (سەقەتی ئاولەمە).

نیشانەکان

بەپێی جۆری ڤایرۆسەکەو شوێنی لەلەشدا نیشانەکانی ئینفلوەنزا دەگۆڕێت، ئەمەش لەسەر باری تەندروستیی (نەخۆشی تر، لەشساخی)، یان هەندێکجار بەندە لەسەر جۆری ئەو باکتریایەی لە گەڵ سۆکردنی ئینفلوەنزادا تێکەڵدەبێت.

هەروەها دەبێتە هۆی ئالۆزبوون و گۆڕانکاری لە ڕێرەوی نەخۆشییەکەدا. ماوەی کرکەوتنی ڤایرۆسەکە لە نێوان 24–28 کاژێردایەو دواتریش ڤایرۆسەکە دەبێتە هۆی:

- سووربوونەوە یان سۆکردنی بۆرییەکانی هەناسەدان.
- مردن و لەناوچوونی خانە.

ماوەی دەرکەوتن

زۆرجار لەسەرەتادا نەخۆشییەکە بەتایەکی قورس (39 – 40) پلەی گەرما، ژانکردنی ماسولکە، ژانەسەر، بێهێزی و لەش داهێزران دەستپێدەکات و مرۆڤ لەجێگادا دەمێنێتەوە. هەندێکجار لە بڵاوبوونەوەکانی کۆندا نەخۆش لە هۆش خۆی چووەو بەئاسانی لەنێوان شەوو رۆژێکدا مردووە.

ماوەی دەستپێکردن

بە گشتی نیشانەکانی ئەم ماوەیە ژاراوین، بەتایبەتی لەسەرەتادا دەبنەهۆی گیروگرفتی هەناسەدان. تا لێهاتن، سەرەتا تایەکی توند 3–5 رۆژێ (هەفتەیەک تێناپەڕێت) نەخۆش دادەگرێت. گەر تا لەهەفتەیەک زیاتر درێژە بکێشێت ئەوا ئینفلوەنزا ئالۆزبووەو مەترسیی تری لێدەکرێت، تا شێوەی پیتی V هەیە. رووخسار کەمێك ئاوساوەو پێڵوی سەروو و خوارووی چاویش ئاوساون و زۆرجار فرمێسکیان لێدێتە دەرەوە، ترس لە نەخۆش دەنیشێت و زۆرجار تامیسکی لێو لەنەخۆش دێت. ژانە سەر زۆر بەهێزەو بەردەوام ناوچەوان و پشتی چاوی نەخۆش دەگرێتەوە.

نەخۆش بە نارەحەتی شان و قۆڵی دەجوڵێنێت چونکە ماسولکەکان زۆر ژاندەکەن. بەئاشکرا دەبینرێت نەخۆش لاوازو بێهێزەو زۆرجاریش بێخەو یان خەواڵوو دەبێت و هەندێکجار خۆراکی بۆ ناخورێت یان نەخۆش تووشی گیروگرفتی دەروونی دەبێت. زۆرجار نیشانەکانی هەناسەدان لەنەخۆشدا دیار نین، تەنیا لووتگیران و سووربوونەوەو کەمی پەنماوی ناو گەروو و کونەلووتەکان دەبینرێت.

هەندێکجاری تر سنگی نەخۆش دەیەشێت و جاروبار هێشکە کۆکەیەکی زۆر نەخۆش لەپەلوپۆ دەخات. هەندێکجاریش لە تێڕوانینی پشت و سنگدا نیشانەی سوکردنی بۆریچکەکان بە دیدەکرێت.

دڵ و بۆرییەکانی خوێن، لێدانی دڵ ڕێکوپێکە و لەسەرخۆ کەمدەبێتەوە، پەستانی خوێن نزمدەبێتەوە، ئەو کەسانەی پەستانی خوێنیان بەرزە لە کاتی ئینفلوەنزادا پەستانی خوێنیان نزم دەبێتەوە و لێدانی دڵ بەئاستەم دەگاتە گوێ.

کۆئەندامی هەرس، زمانی نەخۆش بەڵخێکی سپیی لەسەر کەڵەکەدەبێت کە بە(زمانی چلچرا) ناسراوە، لەملاولای زمانە بچکۆلەوە پەڵەی سووری ئاوساوی شێوە شووشەیی دەبینرێت، فارینجەکان و گەروو سوورن، زمان پەنما و سپییە، لەپاشۆکی زماندا خوێنهێنەرەکان دەردەکەون (زۆر گرنگە بۆ دەستنیشانکردن).

هەندێك جار برینی گچکەی ناڕێکی زەردباوی بەفایبرین داپۆشراو دەردەکەوێت. هەندێکجاری تر ئەم بارە دەبێتەهۆی برینداربوونی مەرازەکان و بەدەگمەن دەبێتە هۆی مردنی خانەکانی مەرازە و هەندێکجاری تریش زمان پەنماوە.

لەبەر بێهێزی نەخۆش خۆراکی پێناخورێت، هێڵنج دەدات یان دەڕشێتەوە. هەندێکجار سوکردنەکە تووشی جگەر دەبێت و ئەنزیمەکانی جگەر بەرزدەبنەوە و هاوکات سپڵ کەمێك گەورە دەبێت یان ئاساییە. لە میزدا کەمێك ئەلبومین دەردەکەوێت یان میزی نەخۆش خوێناوییە.

خوێن، نزمبوونەوەی خڕۆکە سپییەکان (نیوترۆفیل، ئیۆزینۆفیل)، بەرزبوونەوەی هۆرمۆن، خوێن پژانی لووت، تف و بەڵغەمی خوێناوی، لەژندا دەبێتە هۆی درێژبوونەوەی (زیاتر لە 5 ڕۆژ) ماوەی بێنوێژی.

**ڕێڕەوی نەخۆشییەکە**

لە ماوەی 3-5 ڕۆژدا تا نزمدەبێتەوە و نەخۆش ئارەقەیەکی زۆردەکاتەوە و هێدی هێدی نیشانەکانی نەخۆشییەکە نامێنن و دەڕەوێنەوە. نیشانەکانی ئینفلوەنزای جۆری B,A لەیەکەوە نزیکن وەلێ ڕێڕەوی جۆری C ئاسانترە و نیشانەکانی وەك سووکە هەڵامەتێك وایە.

**ئاڵۆزکارییەکان**

*** ئاڵۆزکارییەکانی هەناسەدان**

- سوکردنی گلاندەکانی ئەملاولای گەروو و دەبێتەهۆی پەیدابوونی شلەیەکی خەست کەزۆر بەگرانی لادەچێت لە 33٪ی بارەکاندا ڕێڕەوی نەخۆشییەکە (لەمنداڵدا) مەترسی پەیدادەکات و پێویستە لە دەرەوە کونێك بکرێتە بۆری هەناسەدان تا نەخۆش هەناسە بدات.
- گەورەبوون و سوکردنی بۆرییە هەوایەکانی ناو سییەکان (لەمنداڵ و پیردا کوشندەیە).
- زۆرجار لەسەرەتای نەخۆشییەکەدا سییەکانی نەخۆش تووشی ڤایرۆسەکە دەبێت، لە 20٪ی هەموو سوکردنی سییەکان دەگرێتەوە.
- سوکردنی تێکەڵی سییەکان (زۆرجار تووشی ئەیدزدار دەبێت).
- زۆرجار سۆی باکتریایی سییەکانیش دەبینرێن.

*** ئاڵۆزکارییەکانی دڵ و بۆرییەکانی خوێن**

- سوکردنی پەردەی ناوەندیی دڵ، گۆڕانکاری بەسەر وندەی Tی هێڵ کێشی دڵدا دێت.

* ئالۆزکارکانی دەمار

- سۆی مەننگ ، شەپلەداری دەماری بینین و بیستن ، پەیدابوونی ئازار لە دەمارەکاندا.

**ئینفلوەنزای مەترسیدار**

لەم بارەدا پێویستە نەخۆش لەنەخۆشخانە بمێنێتەوە، چونکە مەترسیی هەناسەدانیان لەرێدایە، بەپێی توانا پێویستە نەخۆش جیابکرێتەوە.

پێویستە لە ژوورێکدا تەنیا 1-3 جێگەی نەخۆشیی تیادابێت و زوو زوو پاکژبکرێتەوە. هەر کاتێک گومانکرا نەخۆش ترسی تووشبوونی سییەکانی لێکرا ئەوا پێویستە ئەنتیبایۆتیک و ئۆکسجین بدرێت بە نەخۆش.

هەروەها لەکاتی دەرکەوتنی مەترسییە دەمارییەکاندا پێویستە پێکهاتووەکانی کۆرتیزۆن بدرێت بە نەخۆش.

**ئینفلوەنزا و سکپڕی**

ڤایرۆسی ئینفلوەنزا دەتوانێت لەوێڵاش بپەڕێتەوە و خۆی بگەیەنێتە ئاولەمەو تووشیبکات (زۆرجار دەبێتەهۆی ناچوستی لە گەشەکردن و سەقەتبوونی ئەندامەکانی لەشی ئاولەمەدا). ئەوەی راستی بێت تێبینیکراوە کە لەبڵاوبوونەوەکانی ساڵانی 1957- 1958دا ئینفلوەنزا زیاتر تووشی ژنی سکپڕبووە.

**مردن**

رێژەی مردن بە نەخۆشییەکە لەسەر زۆری (ژمارە) جۆرە سەختەکان (ژەهراوییەکان)، بارودۆخی ئابووری- کۆمەڵایەتی و ئالۆزکارییەکانی سییەکان بەندە. زۆرجار (ژنی سکپڕ، پیر، منداڵی ساوا و نەخۆش) تووشی ئینفلوەنزا دەبن.

تا ژمارەی مردووان زۆربێت ئەوە دەگەیەنێت کەڤایرۆسەکە ترسناکترە. بۆ نموونە لەژمارەی 22ی جەنیوەری 1997دا رۆژنامەی Mainichi Shimbun رایگەیاند 116 کەس لەباشووری رۆژهەڵاتی یاباندا (تەمەنیان لەژێر 60 ساڵانەوە بووە) بە ئینفلوەنزا مردوون ، لێپرسراوانی تەندروستیی یابان ناوی ئەم ڤایرۆسە نوێیەیان بە HongKong A نێونرا.

**دەستنیشانکردن**

زۆرجار بەئاسانی نەخۆشییەکە دەستنیشاندەکرێت، ژانەسەر، تا، لەش داهێزران و دەرکەوتنی خوێنهێنەرەکانی پاشکۆی زمان زۆر گرنگن بۆ دەستنیشانکردن.

* دەستنیشانکردنی هۆی ئینفلوەنزا بە هۆی:

- جیاکردنەوەی ڤایرۆسەکە لەشلەی ناو لووت و گەروودا (لەسەرەتادا) واتە لە 1-3 رۆژدا.
- تێستی ئیمونۆفلۆرەسچێنت ڤایرۆسەکە دەبینێتەوە.
- تێستی سێری، واتە:

1- تێستی PCRو HAI بینینی دژەتەنی ڤایرۆسەکە.

2- تێستی ELISA

- لە سەرەتای ساڵی 2001ـەوە لەبەشی نەخۆشییە درمەکانی نەخۆشخانەی کارۆلینسکا لە ستۆکهۆڵم تێستێکی خێرا بەکاردەهێنرێت کە دەتوانێت (لە نێوان 10- 15 خولەکدا) دەستنیشانی ڤایرۆسی ئینفلوەنزا بکات وەلێ ناتوانێت جۆری ئینفلوەنزا جیابکاتەوە.

**چارەسەرکردن**

لە پراکتیکدا هۆی ئینفلوەنزا چارەسەرناکرێت، بەڵام دەرمانی (ئەمانتادینو ریمانتادین) تا رادەیەك بەسوودن گەر بێتو لە سەرەتای نەخۆشییەکەدا بدرێن لەنەخۆش.

**ئەوەی راستی بێت زۆر پێویستە چارەسەری ئەم بارانەی خوارەوە بکرێت:**

- بەپێی توانا رێگا نەدرێت مەترسییەکان دەربکەون، ئەویش بە رێزگرتن لە پاکوخاوێنیو خزمەتکردنو پشوودان بە نەخۆش.

- زۆر پێویستە بەپێی نیشانەکان (شینبوونەوە، تای بەرز) جۆری ژەهراوی ئینفلۆنزا بناسرێتەوەو بەزووترین کات نەخۆش بگەیەنرێتە نەخۆشخانە.

- زۆر پێویستە ئەو کەسانەی کەمەترسیی تووشبوونیان لێدەکرێت وەك (سکپڕ، ئەیدزدار، مەست، نەخۆشی دڵو بۆرییەکانی خوێن، شەکرەدار، ئاوبەنگدار، ئەو کەسانەی سییەکانیان تووشی سۆی تر بووە بناسرێنەوە)؛ ئەوەی راستی بێت لە کاتی بڵاوبوونەوەی ئینفلوەنزادا تەنیا لە 5–10٪ ی نەخۆشەکان پێویستیان بە نەخۆشخانە هەیە.

- لەسەرەتای ساڵی 2001ـەوە دەرمانی Zanamavır (Relenza) دژی ئینفلوەنزا بەکاردێت 48 کاژێر پاش دەرکەوتنی نیشانەکان. ئەم دەرمانە لەشێوەی هەڵمژیندایەو رۆژانە دووجارو هەرجارێکیان نەخۆش دوو مژ هەڵدەمژێت بۆ ماوەی 5 رۆژ.

**لەباری ئینفلوەنزای ئاساییدا**

پێویستە نەخۆش لەماڵەوە بمێنێتەوەو پشوودانو دەرمانی دژی تاو ژانەسەر (ئەسپرینو پاراسیتۆڵی بدرێتێ)، بۆ کۆکەوماسولکە ژانکردنیش دەرمانی تری بدرێتێ تا نیشانەکان بڕەوێنەوە. زۆر پێویستە خۆراكو ڤیتامین C بدرێت بە نەخۆش بۆزیادکردنی بەرگریی لەش.

**تێبینی:** پێویست ناکات لەم بارەدا ئەنتیبایۆتیك بدرێت بەنەخۆش.

گەر نەخۆش تووشی سی یە سۆ ببێت ئەوا پێویستە هەر 8 کاژێرێك 500 ملگم کەپسولی تێتراسایکلین یان هەر کاژێرێك 250 ملگم ئەمپیسیلین بۆ کەمکردنەوەی مەترسیی سۆکردنە باکتریاییەکان بدرێت بە نەخۆش.

**خۆپاراستن**

ئەمرۆ مرۆ دەتوانێت خۆی بکوتێت تا تووشی ئینفلوەنزا نەبێت، لە زۆربەی وڵاتاندا کوتانی جیاواز هەیەو بەکاردەهێنرێت، وەلێ تەنیا لە 60–80٪یان بەکارنو نزیکەی 1–2 ساڵ دەخایەنێت.

**ئەوەی راستی بێت 2 جۆر کوتان هەیە کەئەمانەن:**

- کوتان بەڤایرۆسی ئینفلوەنزای ناچالاك، (لە 3 جۆر ڤایرۆس پێکهاتووە، 2 جۆری ڤایرۆس Aو جۆرێکی ڤایرۆس B) کوتانەکە لەشێوەی دەرزی دایە لە ژێرپێست دەدرێت. نیشانە لاوەکییەکانی ئەم کوتانە: ژانەسەر، تا، ئازاری ماسولکە، پەنمانو سووربوونەوەو ئازاری شوێنی دەرزییەکە.

- کوتان بەڤایرۆسی زیندوو، نزیکەی 35 ساڵە ئەم جۆرە کوتانە لەروسیاو هەندێك وڵاتدا بەکاردەهێنرێت. کوتانەکە زۆرخێرا بەرگری لە لەشدا دروستدەکات (بەتایبەتی لەئاستی بۆرییەکانی هەناسەداندا).

**تێبینی: نابێت ئەم کوتانە لەمنداڵ، تەمەندار، دووگیان و ئەو کەسانەی کە نەخۆشیی تریان هەیە بدرێت.**

1- **لەزۆربەی وڵاتاندا کوتانی** Vaxigrip, Fluzone (subvirion), Begrivac Fluvacci, Fluarix **ئەنجامی باشی هەبووە.**

2- **کوتانی** ACT-HIB **و بریتییە لەجۆرێك لە کوتان دژی ئینفلوەنزا.**

**تێبینی: تا ئەمڕۆ هیچ دەرمانێك نییە ڤایرۆسەکە لە ناوبەرێت.**

**پێویستە کوتانی دژی ئینفلۆنزا بدرێت لەم کەسانە:**

- **ئەو کەسانەی (تەمەن گرنگ نییە) فەنکشنی سییەکانیان نزمبۆتەوە یان بێهێزە.**
- **تەمەنداران (لەسەروو 64 ساڵانەوە)، مەترسیی ئەوەیان لێدەکرێت لەئەنجامی تووشبوونی ئینفلوەنزادا بمرن.**
- **منداڵ یان لاو کاتێك ماوەیەکی درێژ بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیی تر (ئەسپرین) ی بەکارهێنابێت.**
- **ئەو کەسانەی کە نەخۆشیی زیندەپاڵی وەك شەکرە، نەخۆشیی گورچیلە متد هەیە.**
- **ئەو کەسانەی راستەوخۆ پەیوەندی بە ئینفلوەنزادارەوە دەکەن.**
- **ئەو نەخۆشانەی گیروگرفتی درێژخایەنی دڵو بۆرییەکانی خوێنو سییەکانیان هەیە.**
- **هەر کەسێك بخوازێت خۆی بکوتێت بۆ ئەوەی تووشی ئینفلوەنزا نەبێت.**

**بە گشتی**

**پێویستە هەموو وڵاتێك بەڕێوەبەرایەتیی چاودێریکردنی ئینفلوەنزا ئاگاداربکات لە:**

**– ژمارەی تووشبووان، جۆری ڤایرۆسەکە، ئەنجامی تێستی زەرداوی خوێن، هەروەها لێپرسراوان لەبڵاوبوونەوەی بە ئاگابن.**

**– پێویستە لێپرسراوانی تاقیگای ڤایرۆسزانی لەئەنجامی تێستەکان لێپرسراوانی ر ت ج ئاگاداربکات هاوکاریی توند لە نێوانیاندا هەبێت.**

**– پێویستە پێش هاتنی وەرزی ئینفلوەنزا دانیشتووان ئاگاداربکرێن تا بەپێی توانا خەڵکی خۆیان بکوتن.**

**سەرچاوەکان**


References

1.Frances T, Salk JE, Quinlligang JJ. Experience with vaccination against influenza in the spring Of 1974 Am J Pub Health 1974;137:1013-16.

2.Payne AM-M. The influenza programme of WHO. Bull WHO 1953,8:755-74

Influenza, The WHO programme. WHO Chronicle,1979;33:7-8

4.Frank Fenner, Burets contribution to influenza research In:Options for the control of influenza I I.Cairns,Australia 4-9 maj, 1996.

5.Finner F, Frank Macfarlane Burnet His Rec Aust Sci 1987 (1), 39-77.

6.Burnet FM. Bacterialphage and cognate phenomena.In:Med. Rese Conun. Great Britain.A system of bacteriology in relation to medicin.london His majesty s stationary office,1930 vol7:463-509.

7.Alan W Hampson and Nancy J Cox global surveillance for pandemic influenza:are we prepared? In:options for the control of influenza 1996.50-60-

8.L.R.Haaheim, Influenzaviruses.in Apractical guide to clinical virology,1989;10:47-51.

9.Robert G webters et al:Influenza viruses In encyclopedia of virology 1992

10.Krug RM.: the influenza viruses NW Plenum press 1989

11.Kilbourne ED (ed),. Influenza NW plenum press 1987.

12.Fields BN et al.(eds) .Virology 2th ed p 1091 NW Ravian press.

13.Thomason D.Thomson R Influenza Ann Pickett-thomas res Lab.1993;9:4

14.Hope-Simpson RE.The transmission of epidemic influenza NW plenum press 1992

15. Fry J. Lung involvement in influenza.Br Med J 1951.2 135
16 Robert F Betts:Influenza virus In:principles and practices of infectious Diseases.4th eds 1995 1546-67.
17.Marin GH.Voiculescu. Boli infectioanse. Edi Medicala 1990 54 161-86-
18. Raphael Doli. Influnza,In Harisson,principles if internal medicine.1991.695-700
19.CDC.Prevention and control of influenza.MMWR.1989 38 297
20.Kilbourne.E.D. Influenza,encyclopedia of microbiology, vol2.1992.505-20
21.WER.WHO/no 5,7,9. Geneva.1997
22 www-micro.msb.le.ac.uk.224/viral path.html. AJC.1995
23.Edwin D. Kilbourne, Influenza Encyclopedia of Microbilogy, vol 2. 1992. 505-20
24.Kilbourne, E. D. Influenza, Plnum Medical books, 1987, New Yourk
25.Weekly Epidemiological Record. WHO/no. 5, 7, 9 1997 Geneva
26.Lancet, Vol 349, February 1, 1997; 332.
27.Ann M. Arvin and Yvonne A. Maldonado, Other viral infections of the fetus and newborn. In Infectious Disease of the fetus newborn infant, 4th eds. V. B. Saunders Company 1995; 18. 745-56
28.Om Influensa, SBL, Vaccin AB and Smittskyddsinstitutet

# ئینفلوەنزای باڵندە

ئینفلوەنزای جۆری A نەخۆشییەکی ڤایرۆسییە ، ئەم جۆرەیان واتە (H5N1) لە باڵندەوە مرۆ تووش دەبێت ، ئەو جۆرەیە کە چەند مانگێکە لە باشوری ئاسیادا بڵاوبۆتەوە . تەنانەت لە سەرەتای ساڵی 2006 دا یەکەم قوربانی بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسەکە لە باکور باشوری کوردستاندا راگەیەندرا و زیانێکی گەورەی ئابووری ، دەروونی، کۆمەڵایەتی بە دانیشتوان گەیاند و تا چاپکردنی ئەم کتێبە هێشتا نەخۆشییەکە بە تەواوی کۆنترۆڵ نەکراوە .

**مێژوو**

رێکخراوی تەندروستی جیهانی(WHO) زاراوەی (Avian Influenza) ی بۆ داناوە وئەم ئینفلوەنزایە بە ترسناك دەزانن لە بەر ئەوەی :

نزیکەی 8 ساڵان لەمەوبەر (DR.Johan Hultin) کە لە سوید لە دایك بوەو ئەمڕۆ لە ئەمێریکا دەژێت و کاردەکات گەیشتە ئەلاسکا و لە ژێر ئەو شاخە بەفرینانەدا قەبرێکی هەڵدایەوە کە لە ساڵانی 1918-1919 دا بە هۆی نەخۆشی ئیسپانی (Spanish flu) یەوە مردبوو . ئەو توانی نمونەیەك لە خانەی سییەکانی ژنێکی ئاسکیمۆیی دەربهێنێت ، کە گەڕایەوە ئەو نمونەیەی دا بە (Jeffry Taubenberger) کە لە (Armed Forces Institute of Pathology) کاری دەکرد . ئەمیش هەستا بە توێژینەوە لە سەری و جارێکی دی ئەو ڤایرۆسەی دروستکردەوە کە بە (H1N1) ناسراوە و لە ساڵی 1918-1919 بوە هۆی مردنی نزیکەی 40-50 ملیۆن مرۆڤ . پاش پێکەوەنانی هەر 8 جینی ڤایرۆسەکە ساڵی 2003 ویستی ئەنجامی توێژینەوەکانی بڵاوبکاتەوە بەڵام کاربەدەستانی ئەمێریکا لە گەڵ گۆڤاری Science دا رێکەوتن کە بەشێکی سنوورداری توێژینەوەکە بڵاو بکرێتەوە نەبادا تیرۆریستان سوودی لێوەرگرن و بەکاری بهێنن ! ئەوەبوو لە ژمارە 7 ی ئۆکتۆبەری ساڵی 2003 دا گۆڤاری ناوبراو بەشێکی توێژینەوەکەی بە ناوی Characterization of the Reconstructed 1918 Spanish Influenza Pandemic Virus دا بڵاوکردەوە . هەر هەمان ساڵ ئاماژە بەو راستییە کرا کە ڤایرۆسی (H1N1) ی نەخۆشی ئیسپانی زۆر لە ڤایرۆسی (H5N1) ی ئینفلوەنزای باڵندەی ئاسیا نزیکە. هەرچەندە ئەنفلوەنزای باڵندەی ساڵی 1968 ی هۆنگ کۆنگ و ئەمەی ئەمڕۆ جیاوازن ، بەڵام پسپۆران هەر دەترسن لەوەی نەبادا ئەم ڤایرۆسەش هەمان ڤایرۆسی ساڵی 1918 بێت !!

ئەوەی ڕاستی بێت نزیکەی 80 جۆر ڤایرۆس تووشی باڵندەکان دەبن وەلێ باڵندە تەنیا تووشی دوو ڤایرۆسیان دەبێت ئەوانیش جۆری H5 و H7 و دەبنە هۆی مردن . پێشووتر ڤایرۆسەکە تووشی باڵندە دەبوو بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا تێبینی کراوە ڤایرۆسەکە دەتوانێت مرۆڤیش تووش بکات و بیکوژێت .

**تێبینی** : Hemagglutinin (H) و Neurominidas (N) دوو پێکهاتووی دەرەکی ڤایرۆسەکەن و نزیکەی 16 جۆری H ی ئەنفلوەنزە جۆری A هەیە .

**هۆزانی**

هۆی نەخۆشییەکە ڤایرۆسێکی ئینفوەنزای جۆری A و 3 جۆری هەیە کە ئەمانەن:

1- جۆری (H5) ، لە مرۆدا بینراوە و دەشبێتە هۆی مردن . (ئەمرۆ باسی لێوە دەکرێت) .

2- جۆری (H7) ، بە دەگمەن بینراوە .

3- جۆری (H9) ، توانای تووشبوونی زۆر نزمە وەلێ لە مرۆڤدا بینراوە .

**سەرچاوەکانی ڤایرۆسەکە**

بریتین لە پەلەوەری زیندوو (مریشك ، مریشکی هێلکەکەر ، کەڵەشێر ، قەلەموون ، مراوی ، قاز ..تاد) .

پەلەوەری مردوو یان سەربڕدراو کە تووشی ڤایرۆسەکە بوون .

**ڕێگاکانی گواستنەوەی ڤایرۆسەکە**

- ڕاستەوخۆ، باڵندەی تووشبوو لە گەڵ ڕیقنەکەیدا ڤایرۆسەکە دەکاتە دەرەوە و پەیوەندی ڕاستەوخۆ بە پیسایییەکەوە دەبێتە هۆی تووشبون .

- لەوانەشە پەیوەندی ڕاستەوخۆ لە گەڵ باڵندە نەخۆشەکەدا ڕێگایەکی دی تووشبوون بێت . ئەو کەسانەی تووشی ڤایرۆسەکە بوون لەو شوێنانەدا ژیاون کە باڵندەی مردووی تیادا دۆزراوەتەوە یان پەیوەندی ڕاستەوخۆیان لە گەڵ باڵندەی نەخۆشدا هەبووە .

زۆر گومان دەکرێت کە باڵندە کۆچکەرەکان هۆی بڵاوبوونەوەو گواستنەوەی ڤایرۆسەکە بن لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دی .

ماوەی کڕکەوتنی ڤایرۆسەکە لە نێوان 1-3 ڕۆژدایە .

**مەترسی چەندە تا مرۆ تووش ببێت ؟**

گەر مرۆ پەیوەندی زۆر و چڕی بە باڵندەی نەخۆشەوە نەبێت ئەوا مەترسی تووشبوون نییە یان هەر زۆر کەمە . لەو چەند ملیۆن مرۆڤەی لە ئاسیادا دەژین و مامەڵە لە گەڵ باڵندەدا دەکەن چەند کەسێکیان تووشی ڤایرۆسەکە بوون و لە نەخۆشخانەدا ماونەتەوە و لە ساڵانی 2005-2006 دا دەستنیشانی ڤایرۆسەکەیان بۆکراوە. هەرچەندە ئەمرۆ مەترسی ڤایرۆسەکە لە سەر مرۆ کەمە بەڵام مەترسی ئەوە هەیە کە ڤایرۆسەکە خۆی بگۆڕێت و (وەك ئەمرۆ دەبینرێت) و لە ماوەیەکی کورت دا ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوان تووشبکات و ببێتە هۆی بڵاوبوونەوەیەکی (Pandemic) خێرا ئەوسا نەتوانرێت کۆنترۆڵ بکرێت . ئەوەی ڕاستی بێت زۆربەی جۆرەکانی ئینفلوەنزا لە باڵندەوە دێت بەڵام ئەوەی ئەمرۆ باسی لێوە دەکەین خێراتر مرۆ دەکوژێت ، لەبەرئەوە مەترسی لێدەکرێت ببێتە هۆی نەخۆشی ئیسپانی !

**مەترسی مردن**

**هەر لە 4 کەس کە تووشی ڤایرۆسەکە بوون 3 یان مردوون ، لە ساڵی 2003 وە تا 6 ی فێبرواری 2006 165 کەس تووشی ڤایرۆسەکەبوون و 88 یان مردوون (3) .**

**ئایا ڤایرۆسەکە لە نێو مرۆڤدا بڵاودەبێتەوە ؟**

**ئەمرۆ کەس ناتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە ، پسپۆرانی سوێند دەبێژن تا ئەمرۆ زانستیانە نەسەلمێندراوە کە ڤایرۆسەکە لە نێوان مرۆڤدا بڵاودەبێتەوە، بەڵام تا ژمارەی تووشبوان زێد بێت ئەوا مەترسی بڵاو بوونەوەی لە نێوان دانیشتواندا زێدە تر دەبێت . گەر مرۆڤێك تووشی 2 جۆری ڤایرۆسەکە ببێت لەوانەیە ڤایرۆسەکە گۆرانکاری بەسەر خۆیدا بهێنێت و بۆ خانەکانی لەشی مرۆ بشێت (لە بارێت) ئەوسا مەترسی لە نێو مرۆڤدا زێدەتر دەبێت . ڤایرۆسی ئەنفلومنزای ساڵی 1997 لە باشوری ئاسیادا بە هۆی جۆری H5N1 –Virus ەوە بووە ، وەلێ دەرنەکەوتووە ئایا ڤایرۆسەکە خۆی دەگۆڕێت تا لە نێو مرۆڤدا بڵاوببێتەوە (مرۆڤێکی تووشبو یەکێکی لەش ساخ تووش بکات) . لەبەرئەم هۆیمیە کە بڵاوبوونەوەی ساڵی 1997 ی هۆنگ کۆنگ لەوەی ئەمرۆی ئیندۆنیسیا جیاوازترە .**

**ئایا ڤایرۆسەکە لە رێگای مریشکەوە بڵاودەبێتەوە ؟**

**هەرچەندە ڤایرۆسەکە لە لەشی مریشکی سەربڕراو یان هێلکەکەی دا هەیە وەلێ مەترسی تووشبون بە گۆشت و هێلکە زۆر کەمە یان نییە. بەڵام بۆ دڵنیابوون باشترە گۆشت و هێلکە لە 70 پلەی گەرمی دا بکولێنرێت بۆ ئەوەی ڤایرۆسەکە بکوژێت**

**نیشانەکان**

**ساڵی 1997 لە چین نیشانەکانی ئینفلوەنزاکە سووك بوون وەك :**

- **تالێهاتن .**
- **کۆکە .**
- **گەروو ئێشە**
- **سوکە ژانەسەر.**
- **گیروگرفتی گەدەو ریخۆڵە .**

**لە 18 نەخۆشدا 7 یان مردن بەڵام هەندێك نەخۆش نیشانەی سییە سۆیان هەبووە هاوکات ژانە ماسولکە . کارکردنە سەر جگەر، ناچوستی گورچیلە و گۆرانکاری رێژەی پێکهاتەکانی خوێنی تیادا دیاری کراوە .**

**لە ساڵانی 2003–2005 دا لە ئاسیادا نیشانەکان بەم جۆرە بوون :**

- **تالێهاتن (لە سەروو 38 پلەوە بووە) .**
- **کۆکە .**
- **پشوسواری .**
- **نیشانەی سییەسۆی کوتوپڕ .**

**دوو منداڵ کە تووشی ڤایرۆسەکە بوون سکچوون و مێشکە سۆیان تیادا دەرکەوتووە و لەم بارەدا رێژەی مردن بەرزە .**

**دەستنیشانکردن**

دەتوانرێت لە ڕێگای تێستێکی گەروو (خێرا) وە دەستنیشان بکرێت

**خۆپاراستن**

– لەو وڵاتانەدا کە ڤایرۆسەکە بڵاوبۆتەوە پێویستە مرۆ ڕاستەوخۆ مامەڵە لە گەڵ باڵندە نەکات.

– پێش کولانە پاککردنەوە دەستکێش بەکابهێنەو پاکژکردن و شوشتنی دەستەکانی بە سابون و ئاو یان ئیسپرتۆ پێویستە .

– هەڵگرتنی مریشکی بەستوو لە نێو بەفرگردا هیچ لە ڤایرۆسەکە ناگۆڕێت ، وەلێ بە کوڵاندن لە 70 پلەدا ڤایرۆسەکە دەمرێت .

– پێویستە هەمووان لە بیریان نەچێت کە هێلکەی دەڵەمە ، هێلکەو ڕۆن ، بە هیچ جۆرێك گۆشتی بەرکوڵ یان نەکوڵاو نەخۆن .

**کوتان**

تا ئەمڕۆ کوتان دژی ڤایرۆسەکە نییە ، وەلێ هەوڵێکی چڕوپڕ لە ئارادایە بۆ دروستکردنی کوتانێك دژی ڤایرۆسەکە چەند ساڵێکی گەرمکە .

**دەرمان**

هەردوو دەرمانی (Tamiflu=Oseltamivir) (Flumadine=Rimantadine) کە لە شێوەی حەب بۆ گەورەساڵان و شلەدا بۆ منداڵدا دروستکراوە بەشی خۆیان کاریگەری یان هەیە ، وەلێ پسپۆرانی سوێد دەبێژن هیچ توێژینەوەیك لە مەڕ کاریگەری دەرمانی ناوبراو لە سەر مرۆ نەکراوە لەبەرئەوە ئەنتیڤایرۆسەکە سوودی نییە یان سوودەکەی سنووردارە .

بەڵام لە هەموو کاتەکاندا دامرکاندنەوە یان ڕەوینەوەی نیشانەکانی سۆ ڤایرۆسییەکە زۆر یارمەتیدەرە بۆ باشبوونی باری نەخۆشییەکە .

**سەرچاوەکان**


1.www.av.se ©
2.www.cdc.gov 050910 ©
3.www.who.int 050909 ©
4.www.dn.se 050105 ©
5.www.svd.se 051001 ©
6.www.netdoktor.se 051020 ©
7.www.smi.se 051021 ©

# بەشی یازدەهەم

## نەخۆشییە تێکەڵەکان

1- مەلاریا
2- جیاردیا
3- دیزانتێری ئەمیبیایی
4- سۆی تۆکسۆپلاسما
5- کرمەکان (دەزوولییەکان ، پانەکان و درێژەکان) .
6- کەڕووەسۆکان (کەڕووەبەرزەکان و کاندیدە)

## مەلاریا

یەکێکە لە ناسراوترین نەخۆشییەکانی هێڵی ئیستیوا، لەکوردەواریدا (لەرزوتا) یان (سێ بەڕۆ)ی پێدەوترێت. هەڵکەوتنی جوگرافی کوردستان وایکردووە کە نەخۆشییەکە سەرتاپای کوردستان بگرێتەوە. پاراسیتەکە دەچێتە ناوخڕۆکەی سووری خوێنەوەو دەبێتە هۆی تەقاندنی خڕۆکەکان ، تالێهاتن، کەمخوێنی و گەورەبوونی سپڵ.

**مێژوو**

یەکێکە لەنەخۆشییە دێرینە ناسراوەکان، ئەفریقا سەرچاوەی هاتنی نەخۆشییەکەیەو لەوێوە بە ڕۆژهەڵاتی ناڤین و ئەوروپاو ئاسیادا بڵاوبووەتەوە.

- هیپۆکراتی مەلاریاناس یەکەم کەس بوو لەسەر نەخۆشییەکەی نووسیوەو پاشتر هەرخۆی ناوی (لەرزوتا)ی لێنا.
- پێلێتێرو هاوەڵەکانی لەساڵی 1820 دەرمانی کینینەیان دۆزییەوە.
- لاڤێران لەساڵی 1880 دا پاراسیتی مەلاریای لەخوێندا دەستنیشانکرد کەدەبێتەهۆی مەلاریا.
- ماك كالوم لەساڵی 1897 دا لەسەر سووڕی زایەندی مێشوولەکەی (لەمرۆڤدا) نووسی و (رووس)یش ئەو ڕاستییەی سەلماند کە مێشوولە دەبێتەهۆی گواستنەوەی نەخۆشییەکە.
- بیگنامی و هاوەڵەکانی لەساڵی 1898 ڕۆڵی گرنگی مێشوولەی ئەنۆفیلسیان سەلماند.
- لەساڵی 1924 و 1933دا هەوڵدرا بۆ دروستکردنی دەرمانی دژی مەلاریا. بەڵام پاشتر دەرمانی کینین دروستکرا .
- لە ساڵی 1942 دا بۆیەکەمجار دەرمانی DDT دروستکرا بەڵام لە ساڵی 1944 دا بۆ یەکەمجار لە ئیتاڵیا بەکارهێنرا .
- شۆرت و هاوەڵەکانی لەساڵی 1948دا سووڕی دەرەکیی خڕۆکە سوورەکانیان دەستنیشانکرد.

لەم ساڵانەی دواییدا توانراوە دەرمانی نوێ دژی ئەو جۆرانەی پلاسمۆدیۆم دروست بکرێت کەبەرەنگاری دەرمانە کۆنەکان دەبوونەوەو بەرگرییان پەیدا کردبوو. بە ڕای شارەزایان بۆ بەهێزکردنی کاریگەریی دەرمانەکان باشتر وایە دەرمانەکان تێکەڵبکرێت. لەڕاستیدا جۆری تریش لە (پلاسمۆدیۆم) هەیە وەلێ لەمرۆڤدا نابێتە هۆی مەلاریاو بگرە لەئاژەڵدا دەبینرێن.

**هۆی مەلاریا**

پاراسایتێکە لەپۆلی سپۆرۆزۆر (sporozoare) لەخێزانی پلاسمۆدیدای (plasmodidae) لەجۆری پلاسمۆدیۆم (plasmodium)، ئەوەی راستی بێت 4 جۆر پلاسمۆدیۆم دەبنەهۆی مەلاریای مرۆڤ کەئەمانەن:

1- پلاسمۆدیۆمی ڤیڤاکس ، ماوەی کرکەوتن لە نێوان 13-15 رۆژدایە (لەکوردستاندا بلاوە).

2- پلاسمۆدیۆمی فالسیپارەم، ماوەی کرکەوتن لە نێوان 10-12 رۆژدایە.

3- پلاسمۆدیۆمی مەلاریا، ماوەی کرکەوتن لە نێوان 27-42 رۆژدایە

4- پلاسمۆدیۆمی ئۆڤالیَ، ماوەی کرکەوتن لە نێوان 13-15 رۆژدایە.

**پەتازانی**

مەلاریا بەشێکی گەورەی رووبەری زەوی گرتووەتەوە، لەم سالأنەی دواییدا دەرکەوتووە نەخۆشییەکە لەهەندێك ناوچەدا نەماوەو لەهەندێك ناوچەی تردا زۆر کەمبووەتەوە. بەلأم وەك یەکێك لەگیرۆگرفتە سەرەکییەکانی تەندروستی لەناوچەکانی هێڵی ئیستیواو ژێر هێڵی ئیستیوادا هەر ماوە. زێدەتر منداڵ تووشی مەلاریا دەبێت . سالأنە ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی تۆمارکراو تووشی مەلاریا دەبێت. سالأنە نزیکەی 270 ملیۆن مرۆتووشی نەخۆشییەکە دەبێت و نزیکەی 2 ملیۆن بە نەخۆشییەکە دەمرن .

هەروەها تا ئەمرۆ سالأنە لە نێوان مانگەکانی مەی- نۆڤەمبەر ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووانی شارە گەورەکان و گوندەکانی سەرانسەری کوردستانی گەورە (تۆمارنەکراو) تووشی مەلاریا دەبن.

**سووڕی پلاسمۆدیۆم**

1- **سووڕی نازایەندی** ( لە لەشی مرۆڤدا ئەنجام دەدەرێت) ئەمیش 2 سووڕە:

- **سووڕی دەرەوەی خرۆکە سوورەکان.**

- سووڕی ناو خرۆکە سوورەکان. (هەردووکیان لە لەشی مرۆڤدا ئەنجام دەدرێت).

2- **سووڕی زایەندی** ( لە لەشی مێشوولەی ئەنۆفیلسدا ئەنجام دەدەرێت).

**1- سووڕی نازایەندی**

*** سووڕی دەرەوی خرۆکە سوورەکان**

لەو کاتەوە دەست پێدەکات کە مێشوولەکە ژمارەیەکی زۆر لەسپۆرۆزۆیت (شێوەیەکی پاراسایتەکەیە ناوکی هەیە) دەکاتە ناو خوێنەوەو لە سووڕی خوێنەوە سپۆرۆزۆیتەکان دەگەنە جگەر. 1-2

لەخانەکانی پەردەی دەرەوەی جگەردا ژمارەیەکی زۆر پلاسمۆدیۆم (درێژی هەر یەکەیان 30-50 میکرۆن) نیشتەجێ دەبن. هێدی هێدی سپۆرۆزۆیتەکان گەورە دەبن و دەبنە مێرۆزۆیت (40 هەزار لەفالسیپارۆم، 10 هەزار لەڤیڤاکس و 15 هەزار لەئۆڤالیَ) دروستدەبێت. لەئەنجامدا مێرۆزۆیتەکان دەکرێنە دەرەوەو دەخزێنە ناو خرۆکە سوورەکانەوە، ئەم سووڕە 1-2 هەفتە دەخایەنێت و بێنیشانەیە!! هەندێکجار لەجگەردا پلاسمۆدیۆمی ڤیڤاکس و ئۆڤالیَ ماوەی مانگ یان ساڵ خۆیان مت دەکەن (دەنوون) و پاشتر بەپێگەیوی دێنەدەرەوە. (سووڕی ناو خرۆکەی سوور دەست پێدەکات).

*** سووڕی ناو خرۆکە سوورەکان**

لەو کاتەوە دەستپێدەکات کە مێرۆزۆیتی پلاسمۆدیۆمە نێرەکانی ناو جگەر هێرش دەکەنە سەر خرۆکە سوورەکان، پاشتر مێرۆزۆیتەکان دەبن بە (ترۆفۆزۆیت) کەشێوەیەکی بازنەیەکی پرۆتۆپلاسمیان هەیە.

ترۆفۆزۆیتــەکان زۆر خێــرا (لــەناو خڕۆکــە ســوورەکاندا) لەســـەر هیمۆگلــۆبینی نــاوخوێن گەشــەدەکەن (مشەخۆر).

هێندێ هێندێ ترۆفۆزۆیتە بازنەییەکان شێوەی (شیزۆنت) وەردەگرن کەبەشێکی زۆری ڕووبەری خڕۆکە سوورەکان داگیردەکەن ئـەمانیش دەگـۆڕێن و دەبن بە (ڕێرۆزێتـە).کە گـەورەبوون دەبنـەهۆی تەقاندنی خڕۆکە سوورەکان و ئەوسا مێرۆزۆیتەکان دێنەدەرەوە. (لەم کاتـەدا نەخۆش لەرزوتای لێدێت) دووبـارە مێرۆزۆیتــەکان هێــرش دەکەنــە ســەر خڕۆکــە ســوورەکان و جــارێکی تــر (لــە 48 کــاژێردا ســـووڕی پلاسمۆدیـــۆمی ڤیڤــاکس، 72 کــاژێر ســـووڕی پلاسمۆدیـــۆمی مـــەلاریا، 36-48 کــاژێر ســـووڕی پلاسمۆدیۆمی فالسیپارەم) لەناو خڕۆکە سوورەکاندا دووبارە دەبێتەوە.

پاش 6-7 سووڕی وا بۆ جۆری مەلاریا و 7-8 سووڕی تری بۆ فالسیپارەم، هەندێك لەمێرۆزۆیتەکان باش گەورە دەبن وەلێ بزێویان کەم دەبێتەوە

2- سووڕی زایەندی

سووڕەکە لە لەشی مێیەی مێشوولەی ئەنۆفیلسدا ئەنجامدەدرێت. پاش زاووزێکردن مێشووله گامێتی نێرو مێ دەخوات و لەگەدەی مێشوولەکەدا گچکەگامێتی (نێر) و گەورە گامێتی (مێ) دروست دەکات. گچکە گامێتێك دەچێتە ناو گەورە گامێتێکە، ئەمەش دەبێتـەهۆی دروستبوونی (زیگۆت)، لەماوەی 24 کـاژێردا زیگۆتـەکان دەگـۆڕێن بـۆ (ookinete)ی بزێـو، پاشـتریش ئەمانـە لـەدیواری گـەدەی مێشـوولەکەوە دەپەڕێنـەوە و دێنــە دەرەوە و خۆیــان گیردەکــەن دەگــۆڕێن و دەبــن بــە(oocyst)، کاتێــك ئەمانــە دەتــەقن ژمارەیەکی بێشوومار لە (سپۆرۆزۆیت) و خۆیان دەگەیەننـە ناو لیکی مێشوولە و لەکاتی پێوەداندا وەك شـرنقە ژمارەیـەکی زۆر لـەم سپۆرۆزۆیتانە دەکرێنـە نـاو موولوولـە باریکـەکانی خـوێنی مرۆڤـەوە. بـەم شێوەیە سووڕی یەکەم کۆتایی دێت.

- سووڕی پلاسمۆدیۆمی ڤیڤاکس 27-42 ڕۆژ دەخایەنێت.
- سووڕی پلاسمۆدیۆمی فالسیپارەم 13-15 ڕۆژ دەخایەنێت.
- سووڕی پلاسمۆدیۆمی مەلاریا 15-30 ڕۆژ دەخایەنێت.
- سووڕی پلاسمۆدیۆمی ئۆڤالی 27-42 ڕۆژ دەخایەنێت.

ڕێگاکانی گواستنەوە

هـۆی ســەرەکی گواســتنەوەی پاراسـایتەکە مێشـوولەی ئەنۆفیلســە، نزیکـەی 400 جـۆر ئـەنۆفیلس لەجیهاندا هەیە، بەڵام تـەنیا 100 جۆریـان پلاسمۆدیۆم دەگوێزنـەوە و لـەمانیش 35 جۆریـان بـەرگرییان بەرامبەر دەرمانی DDT پەیداکردووە.

ماوەی پێویست بۆ دروستبوونی سپۆرۆزۆیتەکان بەپێی جۆری پاراسیتەکەو پلەی گەرمیی دەوروبەر لـەنێوان 10-30 ڕۆژدایــە. ڕێگایــەکی تــر کەســەلمێنراوە بریتییــە لەخوێنــدان و خــوێن وەرگــرتن کەپاراسیتەکە دەگوێزرێتەوە وەك ڕوویداوە . لەبەرئەوە لەزۆربەی وڵاتاندا ئەو کەسانەی لەو ناوچانەوە هاتوون کەمەلاریایان زۆر تیادایە بۆ بانکی خوێنیان لێوەرناگرن تا بیدەن بەکەسانی تر!!( ناسراوترین جۆر پلاسمۆدیۆمی مەلاریا بووە کەبەهۆی خوێن وەرگرتنەوە بڵاوبووەتەوە).

**ماوەی درمێتی**

ماوەکە ئەوەندە دەخایەنێت تاکو گامۆسایتەکانی پاراسایتەکە لەناو خوێنی نەخۆشدا بەردەوام هەبێت، ماوەکەش بەپێی جۆری پلاسمۆدیۆمەکە دەگۆڕێت. بۆ نموونە جۆری مەلاریا ماوەی 10 ساڵ لەناو خوێندا دەمێنێتەوە، جاری وا هەبووە نزیکەی 20 یان 35 ساڵ لەناو لەشدا ماوەتەوە لەوانەشە تا مردن بمێنێت.

بەڵام ڤیڤاکس نزیکەی 1-3 ساڵ لەناو خوێندا دەمێنێتەوە، جۆری فالسیپارەم نزیکەی یەک ساڵ دەمێنێتەوە. هەروەها مێشوولە مێیەکان بە درێژایی ژیانیان (1 مانگ یان زیاتر) دەبنەهۆی گواستنەوەی پاراسیتەکە. نەخۆشییەکە هەموو کەسێك تووش دەکات هەندێکجار مەلاریا لەدایکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ئاولەمەو منداڵێکی مەلاریادار لەدایك دەبێت.

**نیشانەکانی درمی**

پلاسمۆدیۆم لە 10-12 ڕۆژدا کردەکەوێت، بەڵام فالسیپارەم لە 13-15 ڕۆژدا کردەکەوێت، هەروەها ماوەی کرکەوتنی ڤیڤاکس و ئۆڤالی درێژترەو لەنێوان 27-42 ڕۆژدایە. هەندێکجار ماوەی کرکەوتنی جۆری مەلاریاو ڤیڤاکس درێژترن و دەگەنە 8-10 مانگ.

ئەوەی شایانی باسە نیشانەی سەرەکیی مەلاریا بریتییە لە (لەرزوتا)ی ڕێك و تایبەت بەنەخۆشییەکە (تەنیا جۆری ئیستیوایی نەبێت) لەرزوتاکەی نارێکە. لەئەنجامی زیادبوونی پاراسیتەکەدا خڕۆکە سوورەکان ژەهرێك دەردەکەن کاردەکاتە سەر مەڵبەندی گەرمیی مەژی و دەبنەهۆی تاو پاشتریش بێشوومار زیادبوونی ژمارەی پاراسیتەکە خڕۆکە سوورەکان دەتەقێنێت و لەناویان دەبەن. لەهەندێك جۆری مەلاریادا تا لە 48 یان لە 72 کاژێردا دووبارە دەبێتەوە.

سەرەتا یەکەم تووشبوونی مەلاریا بەلەرزو تای نارێك، ژانەسەر. لەش داهێزران، گیروگرفتی گەدەو ڕیخۆڵە دەست پێدەکات کە هەندێکجار لەگەڵ هەندێك نەخۆشیی دی تووشبوودا پزیشك بە هەڵەدا دەبات.

1- مەلاریای پلاسمۆدیۆمی ڤیڤاکس

سەرەتا تا لێهاتن 18 ڕۆژ دەخایەنێت لە80٪ی بارەکاندا تا سێ نیشانەی سەرەکیی هەیە، کەئەمانەن:

- لەپڕ لەرزلێهاتن، لەم بارەدا لەرز ئەوەندە بەهێزە مرۆڤ گوێی لەشەقەی ددانی نەخۆشەو هەرچی هەوڵیش دەدرێت بۆ گەرمبوونەوەی نەخۆش بەفیڕۆدەچێت. زیادبوونی ژمارەی لێدانی دڵ، ڕووخسار خاکییە، ماوەی لەرزەکان نیو کاژێر تا کاژێرێك دەخایەنێت.

- تالێهاتن، پلەی گەرمیی لەش دەگاتە 40-41 پلەو پێست وشك دەبێت. زیادبوونی لێدانی دڵ، بێئارامی، تینوێتی، ژانەسەر، ڕشانەوە سکچوون ئۆقرە لەنەخۆش دەبڕن، بەگشتی ئەم نیشانانە نزیکەی 2-6 کاژێر دەخایەنێت.

- لەپڕ نزمبوونەوەی تا، پاش نزمبوونەوەی تا نەخۆش ئارەقەیەکی زۆرو پاشتر باری باش دەبێت، بەڵام بێهێزی و ماندوویی هەر پێوە دیار دەمێنێت.

هاوکات پلەی گەرمی ئاسایی دەبێتەوەو دەگاتە 37 پلە.

ڕۆژی دووەم ، تا نزم دەبێتەوەوباری نەخۆش باشتر دەبێت.

ڕۆژی سێیەم ، واتە پاش 48 کاژێر نەخۆش وەك یەکەم جاری لێدێتەوەو ڕۆژی دواتریش(چوارەم) و هەروەها. پاش 48 کاژێر ئەم نیشانانە لەماوەی چەند هەفتەیەك دووبارە دەبێتەوە. لەکاتی تاوە تاکاندا هەندێك نیشانەی تر لەنەخۆشدا دەردەکەون، گرنگترینیان بریتین لە:

تامیسکی لالێوی سەروو و خواروو، هەندێك نیشانەی سوورەتا، فشاری خوێن، گەورەبوونی جگەرو سپڵ، ڕشانەوە، نەمانی ئارەزووی خواردن، سکچوونی شێوە دیزانتری و کەمبوونەوەی میزکردن.

**نیشانە هاوبەشەکانی مەلاریا**

تالێهاتن، لەرز، ژانەسەر، هێڵنجدان و ڕشانەوە، ئازاری پشت، سکچوون، ژانی جومگەو ماسولکەکان، نەمانی ئارەزووی خواردن.

**2- مەلاریای پلاسمۆدیۆمی فالّسیپارەم (مەلاریای ئیستیوا)**

توندترین و سامناکترین جۆری مەلاریایە، لەزۆربەی زۆری بارەکاندا نەخۆش دەمرێت. لەیەکەم ڕۆژەوە پزیشك هەست بەتوندی و بەهێزیی نیشانەکان دەکات: تالێهاتن ناڕێکەو بەرزە، تاوی لەرزەکان بە ڕێکی دووبارەو سێ بارە دەبنەوە، ماسولکە ژانکردن، لەش داهێزران، ڕشانەوە (نەخۆش یان زەرداو یان ئاو دەهێنێتەوە) ژانەسەر، هەناسەتوندی ، نائارامی.

هەندێکجار نەخۆش لەهۆش خۆی دەچێت و لەخۆی بێئاگادەبێت هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نزمبوونەوەی پەستانی خوێن. ڕۆژانە نەخۆش تای ناڕێکی لێدێت، هاوکات لەوانەیە نەخۆش تووشی سییەسۆ، ناچوستیی دڵ و بۆرییەکانی خوێن، گیروگرفتی گەدەو ڕیخۆڵەو ناچوستیی توندی گورچیلەو بگرە گورچیلە ڕاوەستان دەبێت. گەر لەکاتی خۆیداو بە ڕێکوپێکی چارەنەکرێت، ئەوا نەخۆش دەمرێت.

**3- مەلاریای پلاسمۆدیۆمی مەلاریا**

لەم جۆرەدا هەموو 72 کاژێرێك تاوە لەرزوتا دووبارە دەبێتەوە (واتە هەردوو ڕۆژ بێ تا). ئەم جۆرە مەلاریایە بەرەو جۆری درێژخایەنی دەڕوات و زۆرجاریش بێنیشانەیە.

**4- مەلاریای پلاسمۆدیۆمی ئۆڤاڵی**

جۆرێکی مامناوەندیی مەلاریایە هەندێکجار نەخۆش زۆر بێهێزە وەك لەجۆری ڤیڤاکسدا دەبینرێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم جۆرە نابێتە هۆی مردنی نەخۆش. تا ئەمڕۆ نازانرێت ئایا ئەم جۆرە هەڵدەداتەوە یان نا وەلێ دەزانرێت کەپاراسیتەکەی سووڕی دەرەوەی خڕۆکە سوورەکانیان هەیە.

**تێبینی**: لە ساڵی 1997دا مەڵبەندی خۆپاراستن و کۆنترۆڵی نەخۆشییەکانی ئەمێریکا ڕایگەیاند کە دوو منداڵ دەستنیشانکراون کە لەدایکیانەوە (لەکاتی سکپڕیدا) تووشی مەلاریا بوون.

**مەترسییەکانی مەلاریا**

| | | |
|---|---|---|
| - زەردوویی مەلاریایی. | - کەمخوێنی. | - تەقینی سپڵ. |
| - سۆی بەکتریایی. | - گورچیلەسۆ. | |

**دەستنیشانکردن**

- گرنگترین نیشانەی مەلاریا لەرزوتاو ئارەقەکردنەوەیە کە بەسوودن بۆ دەستنیشانکردن.

- تێستی پاراسایتی مایکرۆسکۆپی نەخۆش (دڵۆپێك خوێن Wright, Giemsa یان Field) ڕەنگ کرابێت بە تەواوی تایبەتمەندی هەر جۆرێك دەناسرێتەوە جا گرنگ نییە لەهەر کاتێکدا خوێنەکە وەرگیرابێت !

**ڕێرەوی مەلاریا**

لەزۆربەی بارەکاندا باشەو نەخۆش لەژێر چارەسەرکردندا چاکدەبێتەوە، وەلێ لەجۆری فالسیپارەمی هەڵچوودا لە 40-60٪ ی نەخۆشەکان دەمرێت.

**چارەسەرکردن**

- پێویستە نەخۆش لەنەخۆشخانەدا بمێنێتەوەو لەوێشدا چارەسەربکرێت.
- لەباری فالسیپارەمی کوتوپڕ یان هەڵچوودا پێویستە نەخۆش لەبەشی فریاگوزاریدا بەخێرایی چارەسەربکرێت.
- دژی تا دەرمانی وەك پاراسیتامۆل و ئەسپیرین بدرێت بەنەخۆش.
- چارەسەرکردنی نیشانەکانی ترو ڕێکخستنەوەی شلەی لەدەستچوو و میزکردن.
- ناوبەناو پشکنینی خوێنی نەخۆش بۆ دۆزینەوەی پلاسمۆدیۆمی فالسیپارەم (لەماوەی 6 هەفتەدا پاراسیتەکە لە خوێندا نامێنێت) ئەوسا چارەسەرکردن رادەگیرێت.

**دەرمانی دژ بەمەلاریا**

دەرمان بەپێی جۆری سووڕی پلاسمۆدیۆمەکە ئەمانەن:

1- سپۆرۆزۆیت کوژەکان، بریتین لە (primaquine, proguanil)
2- گامێت کوژەکان، بریتین لە (primaquine, primetanina, chloroquine)
3- شیزۆنێن کوژەکان، بریتین لە (chloroquine, chinina, primetamina).

لەم سالانەی دواییدا ژمارەیەکی دی لە دژە مەلاریای بازرگانی کەوتوونەتە بەردەست.

**شێوەی چارەسەرکردن**

1- **چارەسەرکردنی پلاسمۆدیۆمی ڤیڤاکس، مەلاریاو ئۆڤالێ.**

- ماوەی 3 رۆژ (کلۆرۆکۆین) دەدرێت بەگەورە، پاشان ماوەی 14 رۆژ (پریماکیون)ش دەدرێت بە (گەورە) دەرمانی سەرەکی کە (کلۆرۆکۆین) بەم شێوەیە دەدرێت بەنەخۆش:
- یەکەم ژەم 600 ملگم/ کگم بۆ گەورەو 10ملگم/کگم بۆ منداڵ.
- دووەم ژەم (پاش 6 کاژێر) 300 ملگم/کگم بۆ گەورەو 5 ملگم/ کگم بۆ منداڵ.
- سێیەم ژەم (پاش 24 کاژێر) 300ملگم/کگم بۆ گەورەو 5 ملگم/کگم بۆ منداڵ.
- چوارەم ژەم (پاش 48 کاژێر) 300ملگم/کگم بۆ گەورەو 5 ملگم/کگم بۆ منداڵ.

2- **چارەسەرکردنی پلاسمۆدیۆمی فالسیپارەم**

- بەو شێوەیەی سەرەوە (کلۆرۆکینە) دەدرێت بە نەخۆش (گەورە، منداڵ) تەنیا بۆ شەش هەفتە.
- یان تێکەڵکردنی 3 حەب لە(سولفادۆکسینە + پیریمیتامینە)، بۆ نەمێشتنی هەڵدانەوە دەتوانرێت 3 حەبی فانسیدار لە 2 هەفتەداو بۆ ماوەی 6 هەفتە بدرێت بەنەخۆش.
- گەر فالسیپارەم بەرگریی دژی کلۆرۆکیۆن پەیداکردبوو ئەوا بەم شێوەیە بەکاردەهێنرێت.

هەروەها ڕۆژانە 10 ملگم/کگم (کینینە) بۆ 10 رۆژ دەدرێت بە نەخۆش.

لەساڵی 1997 دا پزیشکانی ئەمێریکاو کەنەدا رایانگەیاند کە 15 ملگم/کگم کاژێر دەرمانی Quinidine پاشتر 7.5 ملگم/کگم کێش، لەهەشت کاژێردا (لەمەلاریای سەختدا) ئەنجامی باشی بەدەستەوەداوە.

**خۆپاراستن**

– گیروگرفتی خۆپاراستن لەمەلاریا هێشتا چارەسەرنەکراوەو تا ئەمڕۆ گیروگرفتی زۆری لەرێگادایە. ساڵانە نزیکەی 200–250 ملیۆن کەس تووشی مەلاریا دەبن، زیاتر لە ملیۆنێکیان لێدەمرێت.

– بەکارهێنانی دەرمانی DDT دژی مێشوولەی ئەنۆفیلس.

– پاکژکردنەوەی فڕۆکەو کەشتی یان خەڵکی کاتێك لەو وڵاتانەوە دێن کەمێشوولەکە یان مەلاریای تێدا بڵاوە. رێکخراوی تەندروستیی جیهانی پرۆگرامێکی خۆپاراستنی هەبوو، بەڵام سەرنەکەوت چونکە:

* خەرجیی زۆر دەویست.

* نەبوونی کوتانێك دژی مەلاریا.

* مێشوولەی ئەنۆفیلس بەرگریی دژی دەرمانی DDT پەیداکردووە.

هەرچەندە ناوبەناو چۆنێتی چارەسەرکردن (تێکەڵکردنی دەرمانەکان) دەگۆڕێت تاکو بەرتەکی لاوەکی دەرمانی دژە بەمەلاریا کەم بکرێتەوە.

بەڵام پێویستە دەرمانی تر بدۆزرێتەوە بۆ لەناوبردنی مێشوولەی ئەنۆفیلس کەهۆی سەرەکیی گواستنەوەی مەلاریایە.

تێبینی: لەکاتی خۆپاراستن دژی مەلاریادا خەپلەی فۆسفات کلۆرۆکوین زیان نادات بەناولەمە (لەکاتی سکپڕیدا).

**کوتان** (33)

ژمارەیەکی زۆر لە کۆمپانیاو ئینیستیتوتی توێژینەوە سەرقاڵی دروستکردنی کوتانێکن دژی مەلاریا .تا ئەمڕۆ توانراوە کوتانێك درووست بکرێت و ماوەی 18 مانگان مرۆ لە مەلاریا بپارێزرێت .

**سەرچاوەکان**


**References**

1.Simona Radulescu, Ernest A. Meyer. Medical Parasitology. All Deition 1994; 127-150.
2.Abram S. Beneson. Control of communicable diseases in Men. Ed a 75th Amer Publ Health ass 1990.
3.Bruce-Chwatt L. Et al. Malaria inU. K. Brit med J. 1974. 2. 707
4.Marin GH. Coisulescu. Infectious Diseases. Medical Ed. vol 2. Bucurest 1991: 723-750
5.Benenson, A. Control of Communicable Diseases in Men Ed a 14 a Amer Publ Health Ass 1985
6.Donald J. Krogstad, Malaria. In: Principles and Practice of Infectious Diseases. 1995. 2415-2428
7.CDC, MMWR. 1989. 64, 249.
8.Brayer. Gamham PCC: Life cycle of primare Malaria parasites Br Med Bull. 1982: 38.117
9.WHO. Malaria Action programme. Servere and Complicated Malaria Trans R Soc Trop Med Hyg 80 (suppl): 1: 1986.
10.Thurnwood C. M et al. Parasitology 1988; 96: 579.
11.Playfair J. H. et al. Parasitology today 1990: 11: 25.
12.James J. Plorde and Nicholas White. Malaria. In: Harisson. 1991 782-789
13.MMWR, 1988, 37, 277. Recommendations for the Preventive of Malaria in Travelers.
14.Anonymous, World malaria situation in 1990. WHO Stat Q. 1992. 45 257-66
15.Ruth S. Nussenzweig. Malaria vaccine based on a sporozoite antigen. New Eng J Med. 1997; 128-129
16.Miller J. Telford SR. 111. Placenta Malaria. New Eng Med 1996. 335 98
17.White N J. The Treatment of Malaria New Eng J Med 1996; 335 800-6
18.Bull WHO 1990: 68:775.
19.Bull WHO 1990; 66:575.
20.Ludovic Paun. Malaria, In: Infectious Diseases, Didactic and Pedagogic eds, Buchrest 1980
21.WHO. Malaria A Manual of community health workers Geneva 1996
22.H. M. Gilles Management of severe and complicated Malaria. A practical handbook. WHO Geneva 1994.
23.The biology of Malaria parasitis, Report of a WHO Scientific Group WHO Technical Report Series. No 743. 1989.
24.Basic Malaria microscopy. part I: Learners guide. Part II Tutors guide. Geneva. WHO. 1991.
25.WHO Technical Report Series. No 805 (practical chemotherapy of malaria recept of a WHO Scientific Group) 1990.

26.World Health, The magazine of the world health organization No 1, Jan. February, 1997
27.Weekly Epidemiological Record, No 5, 2 February 1996.
28.Ted Lankester. Setting Up Community Health Programmes. UK 1992.
29.Malaria. A manual for community health Workers, WHO. Geneva 1996.
30.HIV/AIDS,Tb and Malaria cluster major recent achivements , WHO, 2003 p. 16.
31.WHO, Communicable disease profile, Iraq, updated 19 mars 2003 WHO/CDS/2003,P.172-188, Malaria,
32.International Society for infectious Diseases, www.promedmail..org, subject PRO/EDR Malaria-Pakistan (sindh)
33.www.dm.se © 051118

## جیاردیا

**یەکێکە لە نەخۆشییە پاراسایتە (جۆری قامچیدارە) بڵاوەکان کە تووشی ریخۆڵە باریکەی مرۆڤ دەبێت.**

### مێژوو

ئەوەی شایانی باسە (Antony van Leenwenhock) ی میکرۆسکۆپ دروستکەری هۆڵەندی لە سالی 1723-1624 دا ژیاوە یەکەم کەس بوو لە ژێر میکرۆسکۆپی یەك زەرەبینیدا قامچیدارەکەی لە پیساییەکەی خۆی دا دۆزییەوە ، پاشتر باسەکەی پێشکەش بە کۆمەڵەی زانستی The Royal Society ی کرد و ئەمانیش لە 1681 دا وێنەکانییان بلاوکردەوە .
زۆر کەس قامچیدارەکەی لە بیر نەما تا جارێکی دی توێژیاری چیکی (dr.Viem Dusan Fedorovic Lambl) قامچیدارەکەی ناونا جیاردیا . لە سالی 1888 دا 2 توێژیاری دی بە درێژی باسی قامچیدارەکەیان کرد .

### هۆزانی

پاراسایتێکی قامچیدارە بەناوی جیاردیا لامبلیا (Giardia Lamblia) کە دوو جۆرن:

– **ترۆفۆزۆیت** (جۆری جوڵاوە)، چالاکەو درێژی لەنێوان 10–25 مایکرۆندایە، شێوەی نیوە هەرمێی هەیە. ئەم جۆرە 4 قامچیی هەیەو بەهۆیانەوە لە ریخۆڵەدا دەجوڵێتەوە، لەباری کوتوپڕی نەخۆشییەکەدا قامچیدارەکە لینجە خانەکانی دوانزەگرێ تووشی داڕزان و گۆڕانکاریو سووتانەوە دەکات، تەنیا لە کاتی سکچوونی توندا لەگەڵ پیسایی نەخۆشدا دێتە دەرەوە.

– **توورەکە** (کیس کردوو)، درێژیی لەنێوان 8–12 مایکرۆندایە، جیاردیا تورەکەیەکی شێوە هێلکەیی بۆ خۆی دروست دەکات کە 2 یان 4 ناوکو 4 جووت قامچی پێوەیە. لە تاقیگادا جۆری توورەکە زیاتر دەبینرێت کە هۆی نەخۆشییەکەیە.

### پەتازانی

جیاردیا قامچیدارێکی مشەخۆرەو لەهەموو جیهاندا بڵاوە، وەلێ رێژەی بڵاویی لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر جیاوازە.

لەو ناوچانەدا کە جەنجاڵ و پیسی زۆر بڵاوە جیاردیا زیاتر دەبینرێت. لەبەر ئەم هۆیەشە لە کۆچڕەوی 1991دا ژمارەیەکی زۆر لەکۆچڕەوان تووشی جیاردیا بوون و تا ئەم ساڵانەی دوایی بە ئاسانی لەباشووری کوردستاندا دەبینرا. تا ئەمڕۆش بە رێژەیەکی گۆردراو دەبینرێت. سەرچاوەی سەرەکی قامچیدارەکە مرۆڤی هەڵگری جیاردیای بێنیشانەیە. لە 7٪ی گەورەساڵان لەئەمریکا هەڵگری ئەم قامچیدارەن.

### رێگاکانی گواستنەوە

رێگای پیسایی– دەم، بەتایبەتی لەرێگای خواردنەوەی ئاوی پیس و خۆراکی پیسبوو بەقامچیدارەوە، دەستی پیسبوو بە پیساییەك کە توورەکەی جیاردیای تیادابێت.

**تێبینی**: توورەکەکان ماوەی 3 مانگ لەئاودا دەژین.

**نیشانەکان**

زۆرجا مرۆڤ نیشانەی وای نییە تا هەست بکات یان گومان لە نەخۆشییەکەی بکەین لە 20-40٪ی هەڵگرانی قامچیدارەکە بێنیشانەن. هەر کاتێك سۆکە کوتوپڕتر بوو ئەوسا نیشانەکان دەردەکەون.

ماوەی کڕکەوتنی قامچیدارەکە لە نێوان 14-15 رۆژدایە، لەوانەشە لە نێوان 1-3 هەفتەدا بێت.

قۆناخی کوتوپڕ، لەپڕ مرۆ تووشی 5-6 سکچوونی بێ کێم و خوێن، گرژبوونەوەی ماسوولکە، بێهێزی، سووکە لەرزوتایەك دەبێت بەگشتی سکچوون، بێهێزی، لاوازبوون، ژانەسك، هێڵنج، پیسایی گازاوی، رشانەوەو تای لەگەڵدایە. نیشانەکان نزیکەی چەند مانگێك دەخایەنن بێئەوەی قامچیدارەکە زیان بەلەش بگەیەنێت.

**دەستنیشانکردن**

- نیشانەکانی پێشوو بەتایبەتی سکچوونی چەور (چەند مانگ خایەنراو).
- تێستی ڕاستەوخۆی پیسایی لە ژێر میکرۆسکۆپدا (پاش رەنگکردنیان بەیۆد) جۆری توورەکە قامچیدارەکەمان بۆ دەردەکەوێت.
- تێستی Immunofluorescens زۆر ئەنجامی باشی بەدەستەوەداوە.
- چەشنی ترۆفۆزۆیت تەنیا لە سکچوونی کوتوپڕدا دەردەکەوێت.
- لەم ساڵانەی دواییدا بەهۆی تێستی ELISAـەوە دەتوانرێت دژە تەنی تایبەتی IgM لەبارە کوتوپڕەکەدا دەستنیشانبکرێت، بەڵام دژەتەنی IgG بەدرێژایی ژیان هەیە.

**چارەسەرکردن**

ئەوەی راستی بێت چەند دەرمانێك بۆ چارەسەرکردنی جیاردیا هەن و بەکاردەهێنرێت، وەلێ هەندێکیان نیشانەی لاوەکییان وەك لەوانی تر زیاترە، لەبەرئەوەیە کەم بەکارن، بەڵام باشترن و کاریگەرترینیان بریتییە لە میترۆنیدازۆڵ.

**گەورە**: رۆژانە 3 جار 250 ملگم بۆ 5 رۆژ (پاش نانخواردن) دەدرێت بەنەخۆش، پاش 2 هەفتە هەما ن شێوە دووبارەدەکرێتەوە

**منداڵ**: رۆژانە 50ملگم/کگم کێشی لەش بۆ ماوەی 7 رۆژ دەدرێت بەمنداڵ.

**یان**: رۆژی 4 جار 240 ملگم بۆ ماوەی 3 رۆژ لە 100٪ ئەنجامی باشی هەبووە. هەروەها 2 گم یەك ژەمی ئەنجامی باشی بەدەستەوە داوە. منداڵ رۆژانە 50 ملگم/ کگم منداڵی گچکە پاش خۆراك خواردن رۆژی 30 ملگم/کگمی بۆ 5-7 رۆژ دەدرێتێ.

**تێبینی**: گەر ژنی دووگیان تووشی جیاردیا ببێت ئەوا نابێت بە هیچ جۆرێك دەرمانی میترۆنیدازۆڵی بدرێتێ!

* دەرمانی مێپاکرین و فورازۆلیدۆن یش بەکاردەهێنرێت و ئەنجامی باشیان هەبووە.
* لە کاتی هەوکردن و پێستهەڵدانادا 250 ملگم/کگم لە10 رۆژدا دەدرێت بە گەورە.
* بۆ منداڵی (ژێر 4 ساڵ) چارەکێکی ژەمی گەورەی دەدرێتێ.
* بۆ منداڵی تەمەن 4-8 ساڵ نیوەی ژەمی گەورەی دەدرێتێ.

**خۆپاراستن**

- هۆشیارکردنەوەی دانیشتووان لەربارەی رێگاکانی گواستنەوەی جیاردیا.
- پیسنەکردنی ئاوی گشتی بە قامچیدارەکە، پاکژکردنەوەی ئاوی قەمچیداراوی.
- بایەخدان بەپاکوخاوێنیو پاکژکردنی ئاوی خواردنەوە.
- خۆپزگارکردنێکی زانستییانە لەپیسایی و ئاوی زێرابەکان.
- بایەخدان بە پاکوخاوێنی تاکو کۆمەڵ.

**سەرچاوەکان**

References
1.Simona Radulescu and Ernest A Meyer Medical Parasitology. All Edi. 1994
2.MarinVoiculescu, Infectious Diseases. Didactic and Pedagogic Ed. Bucurest 1980.
3.Thompson RCA, et al. Giardia and Giardiasis, Adv Parasitol 1993; 32. 70-160.
4.Burke JA. Giardiasis and childhood. Am J Dis 1975; 129: 1304-10.
5.Brodsky. R Giardiasisin American travellers, J Infect dis. 1974; 130. 319.
6.Meyer. E Culture of Giardia lamblia, Lancet. 1984; 11, 527.
7.### Giardiasis. MMWR, 1975; 25. 366.
8.M. Schaechter. Gerald M and Barry I. Eisenstein. Mechanism Microbial Disease, Williams & Wilkins, 1993.
9.Barbara A. B. Nrman T. Begg and Stephen H. Gillespie. Infectius Dis, Blakwell Science 1996, pp 370-374.

## دیزانتری ئەمیبیایی

یەکێکە لە هەوکردنە گرنگەکانی کۆئەندامی هەرس کە لە کوردستاندا زۆر بڵاوە، پاراسایتەکە لە ریخۆڵە ئەستورەدا نیشتەجێ دەبێت و پاشتر دەبێتە هۆی سکچوونی دیزانتریی. بە پێی راپۆرتی وەزارەتی تەندروستی ئێراق بۆ ر ت ج لە ساڵی 2001 دا ژمارەی تووشبوانی تۆمارکراو لە ئێراقدا 652,314 کەس بووە .(14)

**هۆزانی**

پرۆتۆزۆرێکە لەکۆمەڵی ریزۆپۆد جۆری Entamoeba histolytica ، تەنیا جۆرێکە دەبێتە هۆی نەخۆشی لەمرۆڤدا.

**ئەمیش دوو جۆرن:**

- جۆری ماگنە، لە نێوان 20–40 میکرۆندایە، زۆر بزێوە و لەپڕدا دەر دەکەوێت.
- جۆری مینوتە، لەنێوان 15–20 میکرۆندایە، نا بزێوە و هێواش دەر دەکەوێت و تورەکەکە 4 ناووکی تیادایە و نزیکەی 15 میکرۆنە. پرۆتۆزۆرەکە لە دەمەوە لەگەڵ خۆراکدا دەچێتە نێو گەدەوە و پاشتریش شلەی پەنکریاس ، دیواری دەرەوەی کیسەکە دەتوێنێتەوە و پرۆتۆزۆرەکە دێتە دەرەوە و پاشتر بە ئاسانی دەگاتە ریخۆڵە ئەستوورە.

**پەتازانی**

نەخۆشییەکە لە وڵاتە گەرمەکان ، شێدارەکان بە تایبەتی لە ناوچە ئیستیوایەکان و نیمچە ئیستیوایەکاندا دەردەکەوێت. لە 10٪ ی بارەکاندا سۆکە دەگاتە دەرەوەی ریخۆڵەکان.

هەروەها بەرێژەیەکی نادیار خەڵکی تووشی دیزانتری (جار جار خوێناوی) دەکات. لە هەندێك وڵاتدا سۆکە لە مانگی یولیۆ دا کە گەرمەو هەندێکی دی لە جەنیوەری دا زۆر بڵاوە.

**رێگاکانی گواستنەوە:**

- پەیوەندی راستەوخۆ: پیس بوونی دەست یان خواردن بە تورەکەی ئەمیبیاکەوەیە.
- پەیوەندی ناڕاستەوخۆ: خواردنەوەی ئاو، خواردنی میوە و سەوزەمەنی یان میوەی نەگەیوەوە دەبێت.
- مێش لەکاتی نیشتنەوەی دا بەسەر پیساییەوە ئەمیبیاکە دەگوێزێتەوە بۆ مرۆڤی لەش ساغ لەوانەیە ماوەی درمێتی ئەم دیزانترییە مانگێك بێت و لەوانەشە ساڵێك بێت.

**نیشانەکان**

ماوەی کڕکەوتنی ئەمیبیا کە لە نێوان 1-4 هەفتەدایە.

لەماوەی دەرکەوتندا: ماوەی کڕکەوتنی ئەمیبیاکە لەنێوان 1-2 هەفتەدایە. سەرەتا هێدی هێدی مرۆڤ بێهێز و لاواز و خەواڵو دەبێت ، کەمێ سکچوون و سوکە تای لە گەڵدایە. لەپڕ مرۆڤ تایەکی مامناوەندی لێدێت، ژانە سك، سکچوون، (سەرەتا پیسایی لەگەڵدایە) و پێویستە مرۆڤ زۆر هێز لەخۆی بکات تا پیسایی بکات، پاشتر پیسایی خوێنی لەگەڵدایە.

سکچوون لە 1-2 هەفتەدا دەردەکەوێت: ژانە سك و ژانە سەر، هێڵنجدان و رشانەوە دەردەکەوێت مرۆڤ هەست دەکات پیسایی دێت بەڵام هیچ نایەت واتە (کۆمە جوزەی دەبێت).

پاشتر ژمارەی سکچوونەکان زێد دەکات و نەخۆش بەلەفیرێی پێدەکەوێت. لە 24 کاژێردا 10-15 جار سکی دەچێت و هاوکات کێشی لەش کەم دەبێتەوە ، پێست هیشك دەبێتەوە ، ئارەزووی خواردنی نامێنێت ، لاوازی و بێهێزی و کەمخوێنی لەنەخۆشدا دەردەکەوێت. هەندێکجار ئەمیبیاکە دەبێتە هۆی کونبوون و خوێنبەربوونی ریخۆڵە و هەوکردنی پەردەی هەناو. هەندێکجاری دی ئەمیبیاکە دەداتە جگەر و مرۆڤ تووشی (تا، ماندوویی، کەمبوونەوەی کێشی لەش، ژانی نێوان پەراسوەکان، ژانکردنی شانی راست و گەورەبوونی جگەر و کێمکردن) دەکات.

هەندێکجاریش رێرەوی نەخۆشییەکە بەرەودرێژخایەنی دەڕوات ، جا پرۆتۆزۆرەکە یان خۆی حەشار دەدات یان بەهۆی چارەکردنی ناڕێکەوە وندەبێت و لە نەخۆش وایە چاکبۆتەوە وەلێ پاش ماوەیەك سۆکە دەردەکەوێتەوە ، ئەو کەسانەش کە گومان دەکەن هەڵگری ئەمیبیاکەن بێئەوەی پێ بزانن کەسانی دی تووشی ئەمیبیاکە دەکەن.

**جۆرەکانی دیزانتری :**

- جۆری ئاسایی. - جۆری کوتوپڕ. - جۆری هەڵچوو.
- جۆری بەردەوام. - جۆری مامناوەندی - جۆری بێنیشانە.

هەندێك جار لە 20٪ ی بارەکان دا ئەمیبیاکە دەچێتە دەرەوەی ریخۆڵە و ئەندامەکانی دی ئەسووتێنێتەوە و دەبێتە هۆی زەردوویی کوتوپڕ، زەردوویی تولانی ئەمیبیایی ، ئاشینی ئەمیبیایی سییەکان و ئاشینی سپڵ و مەژی.

**دەستنیشانکردن**

- نیشانەکانی سەرەوە.
- تێستی پاراسیتی بۆ جوداکردنەوە و ناسینەوەی جۆرەکانی هێلکە یان ئەمیبیا، بە هۆی (تێستی ڕاستەوخۆ) ی تاقیگاوە دەبێت.
- چاندن ، سیرۆزانی .
- بەرزبونەوەی خرۆکەی سپی .
- سەیرکردنی کۆم و ریخۆڵە بە هۆی (کولونبین ، رێکەبین) ڕێڕەوی نەخۆشییەکە بە گشتی باشە و لە ژێر پارێز و دەرماندا چارەسەری نەخۆشییەکە دەکرێت.

**چارەسەرکردن**

- پاکوخاوێنی زۆر گرنگە تا هۆی دیزانتریەکە نەگوێزرێتەوە.
- باشترین دەرمان بۆ لەناوبردنی ئەمیبیاکە بریتییە لە میترۆنیدازۆڵ.

میترۆنیدازۆڵ بەم شێوەیە بەکاردەهێنرێت: پێویستە بۆ یەك کگم کێشی لەش 30-40 ملگم میترۆنیدازۆڵ رۆژی 3 جاران ، بۆ ماوەی 5 رۆژان بدرێت بە نەخۆش.

یان

یەك ژەمی 750 ملگم میترۆنیدازۆڵ بۆ ماوەی 3 رۆژان دەدرێت بە نەخۆش. پاش 2-3 مانگ پێویستە جارێکی دی تێستی پیسایی نەخۆش دووبارە (بۆ دڵنیابوون لە نەمانی ئەمیبیا) بکرێتەوە. لە کاتی ئەمیبیای دەرەوەی ریخۆڵەدا پێویستە نەخۆش 750 ملگم میترۆنیدازۆڵ بۆ 5-10 رۆژان لەگەڵ 600 ملگم Idoquinol بۆ هەمان ماوە وەربگرێت. لەم ساڵانەی دوایدا 3 ژەمی 500 ملگم دەرمانی Furamide=Diloxanidfuroat بۆ گەورە ساڵان و 20 ملگم / کگم / رۆژانە دابەش دەکرێت بە 3 ژەمدا بۆ 10 رۆژان بدرێت بەنەخۆش. ئەو کەسانەی کە هەڵگری ئەمیبیاکەن پێویستە ماوەی 10 رۆژان بەهەمان دەرمان چارە سەربکرێن.

**خۆپاراستن**

- شتنەوەی میوە و سەوزە پێش خواردنیان.
- قەلاچۆکردنی مێش تا لەخۆراك نزیك نەبێتەوە یان بەسەر خۆراکەوە نەنیشێتەوە.

**جیاوازی نێوان دیزانتری بەکتریایی و ئەمیبیایی**

| بنەماکان | بەکتریا | ئەمیبیا |
|---|---|---|
| بە گشتی | نەخۆشییەکی کوتوپڕە و بڵاودەبێتەوە. | نادرێژخایەنەوجاروبار دەردەکەوێت. |
| کرکەوتن | نزیکەی 7 رۆژە. | 20-90 رۆژان دەخایەنێت. |
| سەرەتا | لەپڕنەخۆشییەکە دەردەکەوێت. | هێدی هێدی دەردەکەوێت. |
| باری نەخۆش | خراپە (هەندێك جار ژەهراویە). | بە گشتی باشە. |
| تالیهاتن | نەگۆڕە. | بەبێ ئاڵۆزکارییەکان بێ تایە. |
| ئاڵۆزکارییەکان | جومگەسوی زۆر جومگە. | ئاشینی جگەر. |
| ڕێڕەوی درمەکە | رۆژێك - هەفتەدەخایەنێت | جاری وا یە ساڵ دەخایەنێت. |
| ئازاری سك | نەگۆڕە و نێو سك دەگرێتەوە. | لەوانەیە ئازار دەرنەکەوێت. |
| پیسایی | ژمارەیان زۆرە . رەنگیان سوری گەشە | پیسایی کەمە و ژمارەیان زۆرە، رەنگیان |

| | |
|---|---|
| بێ بۆنە. | تاریکە ریشاڵی خوێنی لەگەڵدایە، بۆنی خوێنی لێدێ. |
| بەرتەکی تلتە. | بەرتەکی ترشە. |
| نەبوونی ئیۆزینۆفیل و کریستاڵی Charco-Leyden. | بوونی ئیۆزینۆفیل و کریستاڵی Charco-Leyden. |

### سەرچاوەکان


1.Simona Radulescu and Ernest A. Meyer, Medical Parasitology. All Edition Bucharest 1994; 9-21.
2.Leonescu, M. In: Infectious Diseases, Didactic and Pedagogic Ed, Bucurest-1980
3.Marin GH. Voiculescu, Infectious Diseases, Medical Ed, Vol 2 Bucurest-1990; 521-531
4.Benenson, A. Control of Communicable Diseases in Men, Ed. A 14-a Amer. Publ. Health Ass., 1985.
5.Jonathan I,. et al., Amebiasis. In: Principles and Practice of Infectious Diseases, 1995;2395-2408.
6.Shiga K. Observations on the epidermiologiy of desentery in Japan. Philippine J Sci. 1906; 1: 485.
7.Select Committee. Amebiasis outbreak in Chicago: Report of a special committee JAMA 1994.
8.Hardy A, and Watt J. The acute diarrheal diseases. JAMA. 1994. 124 1173
9.Abram S. Benenson, Control of Communicable Diseases in Men. Ed a 75th Amer Publ. Health Ass., 1990.
10.Getting HS. Bacillary dysentery. Trans Soc Trop Med Hyg (Lond) 1915; 8:111.
11.Paul H. The Control of Diseases. 2nd ed. Baltimore: Williams & wilkins, 1964, 293.
12.Adems EB. Macleod in: Invasive amibeasis. Medicine 56: 315. 1977
13.Ulf Bronner; Terapi-rekommendation, parasit sjukdommer. Karolinska sjukhus, Handledning, samanställning ,stockhom 2000.
14. Communicable Disease Profile IRAQ, updated 19 mars 2003. WHO/CDS/2003.17


## سۆی تۆکسۆپلاسما

**نەخۆشییەکی پاراسیتی قورس و ترسناکی مرۆڤ و ئاژەڵە.**

### هۆزانی

پرۆتۆزۆرێکی گرنگە بەناوی (Toxoplasma Gondii)، لەجۆری Coccida لە پۆلی Sporozoareیە زۆر لەجۆری Isospora وە نزیکە، وەك زیندەوەرێکی یەك خانەیی پەیدادەبێت و بەمانای تۆکسۆ (کەوانە) و پلاسما (شێوە)، واتە شێوەکەوانەیی دێت، لەپێشەوە تیژو لەپشتەوە بازنەییە. تۆکسۆپلاسما لە ڕێی کۆنۆیدەوە خۆی بەخانەخوێ (ژێرماڵە) دەنووسێنێت. یەکەمجار لە ساڵی 1908 لەجۆرە مشکێکی ئەفریقاییدا دۆزرایەوەو پاشتر لەباڵندەو شیردەرەکاندا دۆزراوەتەوە. قۆناخی زاووزێ و سووڕی ژیانی لەناو پشیلەی ماڵی و کێوی دایە وەلێ قۆناخی نازایەندی لە لەشی مرۆڤ و سەگدا بەسەردەبات.

### شێوەکانی سووڕی ژیانی

1- شێوەی خێرازێ، لەم شێوەیەدا زۆر خێرا دابەش دەبێت و گەندەتوورەکە دروست دەکات و بەهەزاران ترۆفۆزۆیتی شێوە مۆزی تیادایە.

2- سستەژێ، لەم بارەدا لەسەرخۆ دابەش دەبێت و (بەپێچەوانە خێرازێوە) توورەکەیەکی ڕاستەقینە دروست دەکات.

3- شێوەی ترۆفۆزۆیت، لەشێوەی هەیڤدایەو نزیکەی 1-6 سم دەبێت (لێرەوە نیشانە توندەکانی سۆکەن).

4- شێوە گەمیت، بەکرداری گەمیتە زۆر دەبێت.

5- توورەکە گەرا، سپۆرۆزۆیتەکانی تیادایەو لەدەرەوەی لەشی دواخانەخوێندا دابەش دەبن (لێرسراوی بەردەوامیی سۆکەن).

**شێوەی نەخۆشییەکە لەمرۆڤدا**

- جۆری زگماکی یان تووشبوو لەدایکەوە، دەبێتە هۆی لەناوبردنی کۆئەندامی دەمار.

- جۆری وەرگیراو، جۆری لیمفە گرێکان، پیسبوونی خوێن.

**پەتازانی**

تۆکسۆپلاسما تووشی خانەخوێی گیاخۆر، گۆشتخۆرو باڵندەش دەبێتو زۆربەی جیهانی گرتووەتەوە. نزیکەی 60 ملیۆن ئەمێریکی هەڵگری تۆکسۆپلاسمان بەڵام تەنیا ژمارەیەکی کەمیان نیشانەدارن لەبەرئەوەی کۆئەندامی بەرگری ناهێڵێت نیشانەکان دەربکەون . هاوکات نەخۆشییەکە زۆر لە فەرەنسادا بڵاوە چونکە فەرەنساییەکان حەز لەخواردنی گۆشتی بەرکوڵو خاو دەکەن. سەرچاوەی نەخۆشییەکە پیسایی پشیلەیە بۆیە زۆر پێویستە خێرا شوێنی پیساییەکە پاك بکرێتەوە.

**رێگاکانی گواستنەوە**

**1- زگماکی**

لەم بارەدا تۆکسۆپلاسما لە وێڵاشەوە دەپەڕێتەوەو لەزاماڵدا ئاولەمە تووش دەکات. ئەوەی شایانی باسە ئەم شێوە زگماکییە بەناو کۆئەندامی ناوەندیی دەمار، چاو، دڵ. سییەکان گلاندی سەرگورچیلەدا بڵاودەبێتەوە. گەر ساوا ژیا ئەوا پرۆتۆزۆرەکە لە لەشدا وندەبێت وەلێ لەکۆئەندامی دەمارو تۆڕەی چاودا هەر دەمێنێت. لم بارەدا رووبەرێکی گەورەی مێشك کلس دەکاتو لەناودەبات. لەکاتی گواستنەوەی راستەوخۆدا زیندەوەرەکە لیمفە گرێکان. سپڵ جگەرو ماسولکەکانی ناوپۆشی دڵ دەگرێتەوە.

**نیشانەکان**

بە گشتی لەکاتی سکپڕیدا ئەم جۆرە بێنیشانەیەو لەدایکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ئاولەمە.

ساڵانە لە 1000 نەخۆشدا تەنیا 2-3 دایك ئاولەمەکانیان تووشی تۆکسۆپلاسما دەکەنو نەخۆش 3 نیشانەی سەرەکی هەیە کە ئەمانەن:

- ئاوبەنگی مێشك. - کلس بوونی ناو مێشك. - سۆی تۆڕەی چاو.

لە گەڵ ئەم نیشانانەدا کەللەو چاو گچکەیی، گەشکەو نیشانەی سۆی مەننگو مێشك دەردەکەون. هەندێکجار پاش لە دایکبوون هەفتە - مانگ نیشانەکانی وەك گێلیو گیروگرفتی دەروونی منداڵ دەردەکەون. لەبارە سەختەکاندا منداڵ تادارەو گەدەو جگەرسۆی هەیە و سپڵیش گەورە دەبێت. تۆکسۆپلاسمای زگماکی نەخۆشییەکی سەختەو لەگەڵ ژیاندا ناگونجێت بۆیە زۆرجار دەبێتە هۆی مردنی کۆرپەلە. لەم بارەدا ژن تەنیا یەك جار تووشی ئاولەمە لەباربردن دەبێت.

**2- راستەوخۆ (وەرگیراو)**

بە هۆی خواردنی گۆشتی کاڵ یان بەرکوڵ کەتوورەکەکەی تیادا بێت، یان بەرێکەوت توورەکە گەراکان لەگەڵ پیسایی پشیلەدا کراونەتە دەرەوەو بخورێن. هەروەها لەکاتی گواستنەوەی خوێندا یان چاندنی ئەندامێکی لەشی نەخۆش لەیەکێکی ساخدا دەگوێزرێتەوە. سۆکە زیاتر لەمنداڵو لاودا دەردەکەوێت (لە فەرەنسا تا تەمەنی 30 ساڵدا رێژەیەکی زۆر لە دانیشتووان تووشی تۆکسۆپلاسما بوون) ماوەی

کرکەوتنی تۆکسۆپلاسما دیار نییە وەلێ قەبڵێنراوە لە نێوان 10-21 ڕۆژدایە. گەر لەئەنجامی خواردنی گۆشتی تووشبووەوە بێت ئەوا لە 5-25 ڕۆژدا کرِدەکەوێت.

نیشانەکان بریتین لە:

* لە جۆری کوتوپڕدا: لیمفە گرێکان (پشتی مل و لامل و ژێر بن باخەڵ و ناوگەڵ) گەورەدەبن. گرێکان نەرمن دەجوڵێن بێئازارن و سۆیان نەکردووە، هێدی هێدی لەچەند مانگێکدا گەورەدەبن. ماندوویی لە رووخساری نەخۆشدا دەردەکەوێت و ئارەزووی خواردنی نامێنێت.

هەندێکجار تالێهاتن، ژانی جومگەو لەش داهێزران و ژانەسەرو مەرازەو ئالۆش دەردەکەوێت. هەندێکجاری تر سییەسۆ،سۆی پەردەی ناوەوەی دڵ، جگەر زەردههەڵگەڕانی نەخۆش و گەورەبوونی سپڵیشی لەگەڵدایە. هەرچەندە تا نزمە وەلێ سەرچاوەی نازانرێت و لەوانەیە نەخۆشییەکە هەفتە یان مانگ بخایەنێت. زۆرجار تۆڕەی چاو برینداردەبێت، خوێنی لێدێت و دەبێتە هۆی ئاوساوی و سووربوونەوەی سپێنەی چاو.

* لەجۆری تولانیدا: لەم بارەدا نەخۆشییەکە لەزۆر شێوەدا دەردەکەوێت وەك ژێر تالێهاتن، ژانی جومگەکان، گۆڕانکاریی دەروونی، سۆی هێلکەدانی سکپڕو دووبارە لەناوچوونی ئاولەمە.

* جۆری دەرنەکەوتوو: لەهەموو جۆرەکان زیاتر دەردەکەوێت.

* تۆکسۆپلاسما لەلەشی ناتەواودا: لە 50٪ی بارەکاندا مێشکەسۆ،سۆی پەردەی ناوەوەی دڵ و مردنی خانەکانی دڵ، سییەسۆ دەردەکەوێت. نەخۆش باری باش نییە و ڕێڕەوی نەخۆشییەکە ڕووەو هەڵچوون دەچێت و زۆرجاریش نەخۆش دەمرێت. نابێت ئەو ڕاستییەش لەیادبکەین کەزۆرجار وەك نەخۆشییەکی تێکەڵ لەئایدزداردا دەردەکەوێت. لەئایدزداردا، لە ئەنجامی چالاکبوونەوەی تۆکسۆپلاسمای ناو مێشکەوە دەردەکەوێت، زۆرجار دەبێتە هۆی سۆی مەژی و لەم بارەدا نەخۆش بیر لەدەست دەدات. نەخۆش بێخولق دەبێت شتی لێتێکدەچێت، جاری وایە نەخۆش تووشی نیوە ئیفلیجی یان شەپلەداری دەمارەکانی کەللەی سەر دەبێت.

تێبینی: لەم ساڵانەی دواییدا زۆرجار ئەیدزدار تۆکسۆپلاسمای وەك سۆیەکی هەلپەرست تووش دەبێت و زۆرجاریش دەبێتە هۆی مردنی ئەیدزدار.

**ڕێڕەوی نەخۆشییەکە**

بەگشتی باشە، لەمنداڵیشدا ڕێژەی مردن زۆرکەمە، هەروەها ڕێڕەوی نەخۆشییەکە لەسەر تەمەن و باری لەشساخی مرۆڤ بەندە. تۆکسۆپلاسما لە منداڵی ژێر دووساڵدا زۆر ترسناکەو منداڵ تووشی کەمخۆراکی و گێژی دەکات.

**دەستنیشانکردن**

بە گشتی دەستنیشانکردنی تۆکسۆپلاسما سەختەو زۆرجار وەك لەجۆری زگماکیدا بەو سێ نیشانەیەی سەرەوەدا دەناسرێتەوە.

- جیاکردنەوەی پاراسایتەکە (لەوانەیە لەباری توندی نەخۆشییەکەدا ڕاستەوخۆ پاراسیتەکە لەناو شلەی ڕاکێشراوی ناو لووە لیمفاوییەکاندا یان شلەی مۆخدا پاش ڕەنگکردنیان بە Gimsa یان Wright بناسرێتەوە).
- گۆڕانکارییەکانی مێشك بەهۆی تۆمۆگرافی کۆمپیوتەرییەوە دەستنیشان دەکرێت.
- تێستی IFA (indirect fluresecnt antibody) بۆ پێوانەکردنی دژەتەنی IgM.

- تێستی Sabin-Feldman dye test زۆر هەستدارە بەباشی IgG دەپێوێت.

**چارەسەرکردن**

- لەکاتی تادا حەوانەوە بە سوودە، پێویستە هەمیشە هەوای ژووری نەخۆش بگۆڕرێت.
- پاکوخاوێنی کەلوپەل‌و خاولی‌و پێخەف زۆر گرنگە.
- خۆراك وخواردنەوە زۆر پێویستە بۆ نەخۆش (بۆ پڕکردنەوەی ئاوی لە کیسچوو بە هۆی رشانەوەو سکچوونەوە) بەتایبەتی شیر، ئاوی کانزایی، میوەو شۆربا.
- تەنیا لەباری گراندا نەخۆش لەنەخۆشخانە دەمێنێتەوە.

**دەرمان**

* ئەسپرین‌و پاراسیتۆڵ دژ بە تا. دەرمانی دژی رشانەوە ، کۆکەو تف‌و گرونسك.
* لەکاتی ئاڵۆزبوونی نەخۆشییەکەدا ڤالیۆم‌و ڤیتامین C و B12 زۆر بەسوودن.
* زۆربەی پزیشکەکان تێکەڵکردنی دوو دەرمانی Pyrimethamine, Sulfadiazine لەدەمەوە نزیکەی 200–100 ملگم یەکەم ژەم، پاشتر 1 ملگم/کگم، نابێت لە 25 ملگم/کگم لەش (لە 2–3 رۆژی یەکەمدا) تێپەڕبێت، بۆ ماوەی 3–4 رۆژ پێشنیارەکەن بدرێت بە نەخۆش.

**تێبینی**: زۆرجار پرێپامین دەبێتەهۆی کەمبوونەوەی خڕۆکەی سوورو سپی‌و کەمخوێنیی نەخۆش.

- رۆژانە 300 ملگم دۆکسیسیلین لە خوێنهێنەرەوە بە 3 ژەم دەدرێت بەنەخۆش.
- ئەمێریکاییەکان رۆژانە 600 ملگم Clindamycin لە 6 کاژێردا (لەدەمە یان لەخوێنهێنەرەوە یان لەماسولکە) دەدەن بە نەخۆش. لەخوێنهێنەرەوە دەتوانین تا 1.2 گم لە 6 کاژێردا بدرێت بەنەخۆش.

**چارەسەرکردنی تۆکسۆپلاسما لە ئەیدزداردا:**

- خەپلەی Sulfadiazin 1 گم × 4 جار بۆ ماوەی 6 هەفتە لەگەڵ Pyrimethamine 200 ملگم (یەکەمجار) پاشتر رۆژانە 50 ملگم لەگەڵ 45 ملگم Folinsyra دەدرێت بە نەخۆش.

**خۆپاراستن**

پێویستە پەیڕەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکرێت:

- کوڵاندنی گۆشت لە 60 پلەدا تا تورەکەکان لەناوبچن.
- پێویستە پێش‌و پاش دەستبردن بۆ گۆشت یان میوەو سەوزەخواردن دەست بشۆررێت.
- خوێنی وەرگیراو لەخوێندەر تێست بکرێت بۆ پاراسایتەکە ئەوسا بەکاربهێنرێت.
- تێستکردنی خوێن، ئەندامی بەخشراو بەنیازی چاندن بۆ دڵنیابوون لەساغی.
- پێویستە سکپڕ خۆی لەپشیلە دووربخاتەوەو لەماڵ‌و کێڵگەدا دەستکێش بەکاربهێنرێت.

**سەرچاوەکان**

References
1.Simona Radulescu and Emest A. Meyer Medical Parasitology. All Edition, 1994: 110-
2.Andersson S. E. J Exp Med. 1974. 139. 1154.
3.Lambotte. R. Toxoplasmosis congenitalic H Gynee Obstre Biol, 1976. 5, 265.
4.Jacobs. L Toxoplasam and Toxoplasmosis, Anm Rev Microbiology. 1964, 17. 429-450.
5.Elliot DL et al. Pet associated illness N Eng J Med 1985, 313-985.

# کرمەکان

بریتین لەو نەخۆشییانەی کە بە هۆی پاراسیتەوە (کرم) مرۆتووشی چەندین جۆرە هەوکردن دەبێت .

جۆرەکانی کرمەکان:

**کرمە دەزوویەکان (نێماتۆدەکان ): بریتین لە :**

**Enterobius vermicularis**, Ascaris Lumbricoides. Trichuris Trichiura, Toxocariasis.

**کرمە پانەکان (سێستۆدەرەکان): بریتین لە :**

**Echinococcus granulosus**, Taenia saginata. Taenia Solium. Diphylliobothrium latum.

**کرمە درێژەکان (ترێماتۆدەکان): بریتین لە :**

**Schistosoma haematobium**, Schistosoma Mansoni. Schistosoma Japonicum.

ئەوەی شایانی باسە پاراسیتەکان چەند کۆمەڵێک دەگرنەوە یەکێکیان کرمەکانن کە بەشێکی گەورەی نەخۆشیداری نەخۆشییە هەوکردنەکان پێکدەهێنن لەبەرئەوەی بەشێکی زۆری دانیشتوانی جیهان تووشی نەخۆشی دەکەن . هۆی سەرەکی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بایەخنەدان و فەرامۆشکردنی باری تەندروستی و کۆمەلایەتی هەر کۆمەڵگایەک کە گیروگرفتی گەورەیان لە رووی ئابووری ، رۆشنبیری ، پلە و ئاستی ژیانی دانیشتوانەوە هەیە . ئەوەی راستی بێت لێرەدا دەمەوێت تەنیا ئاماژە بۆ ئەو کرمانە بکەم کە زێدەتر لە کوردستاندا هەن و دەستنیشانکراون . هەرچەندە ژمارەی کرمەکان کەمن بەلام گرنگییەکی تایبەتیان لە نەخۆشیداریەتی دانیشتوانی کوردستاندا هەیە . لە جیهاندا نزیکەی نیوملیۆن جۆر تەنیا (نێماتۆد) هەیە وەلێ تەنیا چەند کرمێکیان مرۆ تووشی نەخۆشی دەکەن . بە گشتی کرمەکان باریکن و درێژییان لە نێوان چەند ملیمەترێک تا 30 سم دایە .

گەر بەراوردێک لە گەڵ ولاتانی ئاسیاو ئەفریقا دا بکرێت ئەم کرمانە لە ولاتە پێشکەوتوە ئەوروپایەکاندا زۆر کەمترن . هەروەها زۆربەی زۆری ئەم کرمانە لە کاتی گەشت و گوزاردا پاش ئەوەی مرۆ تووش دەبێت وەک نەخۆشییەکی هێنراو دەهێنرێتە نێوولاتە ئەوروپایەکان . ئەوەی راستی بێت کرم و هێلکە و بەچەی کرمەکان (لارڤاکان) دەبنە هۆی دەرکەوتنی بەرتەکی بەرگریزانی . ئەوەی لێرەدا پێویستە باسیان لێوە بکەم تەنیا دوو کرمی گرنگ و بلاوی نێو کوردستانن کە بە رێژەی جیاواز دانیشتوان تووشی نەخۆشی دەکەن . زۆرجاران ئەو کوردانەی دانیشتوانی ئەوروپان و سەردانی کوردستان دەکەن پاش گەرانەوەیان ئەو دوو جۆرە کرمە دەهێننەوە ئەوروپا . جاری وا هەیە نەخۆش هەر لە کوردستان نیشانەکانی لێدەردەکەوێت و جاری واش هەیە نیشانەکان پاشتر دەردەکەون .

# كرمی ئەسكاریس

ئەسكاریس یەكێكە لەو كرمانەی لە هەموو جیهاندا بڵاوە و لە كوردستاندا بە ڕێژەی گۆردراو دەبینرێت ، بەڵام كرمەكە لە وڵاتی سویددا زۆر بە دەگمەن دەبینرێت . هۆی سەرەكی بوون و بڵاوی كرمەكە لە كوردستاندا دەگەڕێتەوە بۆ نەبوون یان نزمی پلەی ڕۆشنبیری دانیشتوان ، نەبوون و بڵاونەكردنەوەی زانیاری پێویست لە لایەن دەستگاكانی تەندروستییەوە ، هەروەها بایەخ نەدان بە چۆنیەتی خۆپاراستن لە كرمەكە و كەمتەرخەمی لە پاكوخاوێنیدا

**هۆزانی**

هۆی سەرەكی هەوكردنەكە كرمێكە بە ناوی Ascaris lumbricoides .

**شێوەی كرمەكە**

كرمی ئەسكاریس یەكێكە لەو كرمانەی لە ڕیخۆڵە باریكەدا دەژی . مێیە گەورەترە لە نێرە و درێژی لە نێوان 15-30 سم داین ، مێیەكان ژمارەیەكی زۆر هێلكە دادەنێن ، پاش ئەوەی هێلكەكان لە خاكدا هەڵدێن و گەورە دەبن توانای ئەوەیان هەیە تا ساڵێك بەرگەی شلەی نێوریخۆڵە بگرن و بژین . كرمی ئەسكاریس وەك نێماتۆدەكانی دی كۆئەندامی هەرسی تەواو (دەم و 3 لێو و كوونی پیسایی) یان هەیە .

**ڕێگاكانی گواستنەوە**

بە هۆی ناتەواوی و گوێنەدان بە پاكوخاوێنیەوە هێلكەكان زەوی ، ئاو، سەوزە و میوە پیس دەكەن . پاشتریش مرۆ لە ڕێگای خواردنەوەی ئاوی پیس یان خواردنی سەوزە و میوەی پیس بوو بە هێلكەكان تووشی كرمەكە دەبێت . ماوەی قووتدانی هێلكەكە تا دەركەوتنی كرمێكی تەواو دەگاتە 2 مانگ . كرمێكی تەواو نزیكەی 1-2 ساڵان دەتوانێت لە نێو ڕیخۆڵەدا بژێت .

**نیشانەكان**

ئەوەی شایانی باسە نیشانەكانی هەوكردنەكە بەندە لەسەر جۆر، قۆناخ و كوتوپڕی هەوكردنەكە و بەرتەكی خانەخۆێ .

## ئەسكاریسی سییەكان

گرنگترین نیشانەی سەرجێگەیی ئەسكاریسی سییەكان بریتییە لە :

هیشكە نەرمە كۆكە ، تەنگەنەفەسی ، ژانكردنی قەفەزەی سنگ لە كاتی كۆكیندا . ئەوەی راستی بێت نەخۆش (تا) یەكی مامناوەندی لێدێت و تف و بەڵغەم خوێناویە و گۆڕانكاریەكانی پێستیش دەبینرێت . وێنەی تیشكی سنگ زۆر گرنگە لەبەرئەوەی پاش چەند ڕۆژێك گۆڕانكاریەكانی سەر وێنەی تیشكی سییەكان نامێنن . ئەم نیشانانە نزیكەی 1-2 هەفتە دەخایەنێت و پاشتر نیشانەكان دەرەوێنەوە . ئەم جۆرە ئەسكاریسە لەو شوێنانەدا دەبینرێت كە ژمارەی دانیشتوان زۆرە و چڕە . لەم جۆرە هەوكردنەدا بوونی لارڤا و ئیوزینۆفیلی لە بەڵغەمی نەخۆشدا دەستنیشانی پاراسیتە دەكات .

## ئەسکاریسی ریخۆڵە

لەم جۆرە ئەسکاریسەدا نیشانەکان بەندن لە سەر ژمارەی کرمەکە لە نێو ریخۆڵەدا . نیشانە گرنگەکان بریتین لە : نەمانی ئیشتهای خۆراك خواردن ، ژانە سەر ، هێڵنجدان و هەستکردن بە رشانەوە ، سکچوون یان قەبزی (گیران) کرمە گەورەکان دەتوانن بگەنە نێو زراو و پەنکریاس و پاشتر دووبارە دەتوانن خۆیان بگەیەننەوە نێو ریخۆڵە

### دەستنیشانکردن

دەستنیشانکردنی کرمەکە یان هێلکەی کرمەکە (بە رێگەی چاندن) پیسایی نەخۆش زۆر ئاسانە و هاوکات دەتوانرێت هێلکەی تروکاو لە نەتروکاو جودا بکرێتەوە .

### رێرەوی نەخۆشییەکە

لە کاتی هەوکردنی ریخۆڵەدا هەکردنەکە باشە بە مەرجێ زوو دەستنیشان بکرێت و پاشتر چارەسەر بکرێت .

### چارەسەرکردن

ئەوەی شایانی باسە حەبی (Mebendazol=Vermox) رۆژانە 2 جاران 200 ملگم بۆ ماوەی 3 رۆژان ئەنجامی زۆر باشی داوە بە دەستەوە

### خۆپاراستن

پێویستە بە باشی سەوزە و میوە بشۆردرێتەوە ، ئەو سەوزانەی کە بە پیسایی دانیشتوان ئاودێردەکرێن دەبێت باش بکولێنرێت پێش ئەوەی بکرێت بە چێشت .

تێبینی:مێیەی ئەسکاریس رۆژانە نزیکەی 240 هەزار هێلکە دادەنێت

## کرمە دەزوویەکان

ئەم کۆمەڵە کرمە یەکێکە لەو کرمانەی لە جیهاندا بڵاوە ر. ت . ج تووشبوانی بە 200 ملیۆن کەس مەزندە کردووە ، لەمانە نزیکەی 30- 40 ملیۆنیان لە وڵاتە یەککرتووەکانی ئەمێریکادا دەژین . لە کوردەواریدا لەبەر باریکییان بە کرمە دەزوویەکان ناسراون .

### هۆزانی

هۆی هەوکردنەکە کرمێکە بە نێوی Enterobius vermicularis .

### شێوەی کرمەکە

درێژی مێیە نزیکەی 10 ملم وکۆتاییەکەی تیژە ، نێرە گچکەترە و تەنیا 3 ملم دەبێت و کۆتاییەکەی چەماوەتەوە کرمەکە لە سەر خۆراك و شلەی نێو ریخۆڵە باریکە دەژی ، بەڵام ژیانیان کورتە . نێرە 2–7 هەفتە دەژی وەلێ مێیە 40–90 رۆژ دەژی . مێیەی کرمەکە لە کۆلۆنە وە دێتە نزیك کۆم (کونی پیسایی) و لەوێدا دەمرن. هەندێکجار مێیە دێتە دەرەوەی کۆم وشەوانە هێلکەکانی دادەنێت و دەبێتە هۆی ئالۆش . خوراندن و سووربونەوەی لێوارەکانی کونی پیسایی و نەخۆش نارەحەت دەکات .

**نیشانەکان**

زۆرجاران هەکردنەکە بێنیشانەیە . بەڵام کرمەکە بە ڕێژەی 20-30٪ لە منداڵی باخچەی منداڵدا دەبینرێت . لە گەورەدا لە بەر باریکی کرمەکە لە قوڵایی ڕیخۆڵەدا خۆیان مەڵاس دەدەن . زۆرجاران نیشانەی گرنگ و سەرەکی کرمەکە بریتییە لە خوراندنێکی توند کە دەبێتە هۆی خەو زراندنی زارۆك. کاتێك ژمارەی کرمەکان زێد دەکەن ئەوسا وەك تۆپەڵە دەزوویەك دێنە دەرەوە .

هەندێکجاری دی بە دەگمەن کرمەکە دەگاتە میزدۆشەکان .

**دەستنیشانکردن**

ئەوەی ڕاستی بێت بەرەبەیان باشترین کاتە بۆ دەستنیشانکردنی ئەم کرمانە تا لە ئاستی کۆمدا کرمەکان بگرین و بکرێتە شووشەیەکەوە و بنێردرێ بۆ تاقیگای پاراسیتی بۆ ئەوەی لە ژێر میکرۆسکۆپدا بناسرێتەوە . هەروەها دەتوانرێت بە چیلکەیەکی پاکی تاقیگایی کە سەرێکی لۆکەداری پێوەیە بە ئاستی کۆم و کونی پیسایدا بهێنرێت و ڕاستەوخۆ بکرێتە شووشەیەکەوە و بنێردرێ بۆ تاقیگا . گەر پێویست بکات ئەوا لە ماوەی 2 ڕۆژدا ئەمَ کردارە دووبارە بکرێتەوە تا کرمەکان دەست دەکەوێت .

**چارەسەرکردن**

گەر کۆمی منداڵ بخورێت ئەوا پێویستە ئەندامەکانی خێزانەکە حەبی 100 ملگم ی Mebendazol=Vermox بخوات ، لە هەردوو بارەکەدا پێویستە یەك ژەمی 3 حەبی بدرێت بە نەخۆش بە مەرجێ پاش 2 هەفتە سەر لە نوێ هەموو ئەندامەکانی خێزانەکە هەمان یەك ژەمی دیکە بخۆن . هەروەها دەتوانین دەرمانی Pyrantelpamoat =Vanquin نزیکەی 5 ملگم کگم کێشی لەش بە یەك ژەم بدرێت بە نەخۆش .

**خۆپاراستن**

پێویستە چەرچەف و دەرپێ و کراس و بیجامەی شەوانەی ئەندامانی خێزان بگۆردرێت و بە شێوەیەکی ڕێکوپێك بشۆردرێت و پاشتریش ئوتو بکرێت تا مەترسی دەرکەوتنەوەی کرمەکە نەهێڵدرێت .

**سەرچاوەکان**

Referenser

1 Masksjukdomar, kap.29. , från Iwarsson –Norrby, infektionsmedicin, klinik och terapi, Säve Förlag 1998. 536-51.

2.Abram S. Benenson,editor, Control of Communicable Diseases in men, 15 th edition, 1990, 50-52.

3.Iwarsson-Norrby, Infektionmedicin, klinik och terapi, Sverige 2004.

4.www.netdoktor.se © 050125

## (کەڕووە سۆ) سۆکەڕووەکان

ئەوەی شایانی باسە زۆربەی شارەزایانی کەڕووە سۆکان دەبێژن:
نزیکەی 50- 100 هەزار جۆر کەڕوو هەیە، زۆربەی زۆریان بێمەترسین تەنیا 60 جۆریان دەبنە هۆی نەخۆشی لەمرۆڤدا. سۆ لەمرۆڤی لەشساخدا تەنیا لەسەر پێست ، نێوپۆش یان نینۆکدا دەبینرێت. زۆرجاران پێویستە بەهۆی چارەسەرکردنی گشتییەوە (رۆژانە) نەخۆش چارەسەر بکرێت ، هەندێکجار چارەسەرکردنی شوێنی سۆکە چاکناکاتەوە لەبەرئەوەی پاشتر دەردەکەونەوە .
ئەوەی راستی بێت لە 10 ٪ی کشتوکاڵی سەر زەوی بەهۆی کەڕووەوە لەنێو دەچێ. لە بواری پیشەسازی دەرمان دروستکردندا سودێکی زۆری لێوەرگیراوە ، بۆ نمونە: دەرمانی پەنسیلین و هی تریشی لێدروست دەکرێت.
نابێت ئەو راستییەشمان لەیاد بچێت لە ڕووی پێکهاتنەوە فونگ زۆر لە بەکتریا جیاوازە . کەڕوو بریتییە لە خانەیەکی هێلکەیی چەماوە لەگەڵ سایتۆپلاسمایەکی ئاڵۆزدا کە ناوکە خانەی هەیە، لەبەرئەوەی کلۆرۆفیل (رەنگی سەوز)ی نییە بۆیە وەك مشەخۆر دەژێت. بە واتایەکی دی کەڕوو پشت بەماددەی ئامادەکراوی وەك گیانەوەران و ڕووەکە زیندووەکان دەبەستن. کەڕووە قووڵەکان و کۆئەندامییەکان بەگشتی کەمن یان هەر نین وەلێ لە وڵاتانی هێڵی ئیستوادا دەبینرێن و دەبنە هۆی نەخۆشی جودا.
مشەخۆر:
ئەو گیاندارەیە کە لە سەر ماددە گەنیوەکان دەژێت یان گەندە خۆر دەبێت. زۆربەی زۆری ئەو کەڕووانەی مرۆ تووشی نەخۆشی دەکەن بەرێگای نازایەندی زێدەبن وەلێ ئەو کەڕووانەی دەبنە هۆی ئاڵۆش و خوراندن بە رێگای زایەندی زێد دەکەن.
رێگاکانی گواستنەوە
رێگاکانی گواستنەوەی کەڕووەکان زۆرن لەبەرئەوەی هەموو کاتێك مرۆ پێی لەسەر زەویە جاگرنگ نییە لەماڵەوە بێت یان لەدەرەوە. هاوکات لەم ساڵانەی دوایدا چیمەنتۆ و خشتی کاشی کە خشت ڕێژی زۆربەی ماڵان و مەلەوانگاکانی پێدەکرێت هۆکارێکی لەبارو گرنگە بۆ هەڵگرتن و مانەوەی کەڕوو، پاشتر گواستنەوەی بۆ مرۆ. هاوکات پێڵاوی تەسك و گۆرەوی نارەقاوی یان هیشکنەکراوە و شێدار لەبارترین هۆکاری گواستنەوەی کەڕوون. لەبەرئەوە کەڕووی پێ بەئاسانی لە نێوان وەرزشزان و مەلەوانزاناندا دەبینرێت ، هاوکات مۆڵگەی سەربازی شوێنێکی لەباری ترە بۆ ئەوەی مرۆڤ تووشی کەڕوو ببێت. نابێت ئەو راستییەشمان لەیاد بچێت کە زۆرجاران لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناڤیندا مرۆ لەئاژەڵەوە (مانگا، پشیلە و سەگ) تووشی سۆکە دەبێت .
ئەوەی شایانی باسە هۆی سەرەکی کەڕووە سۆکان دەگەڕێتەوە بۆ :
1- کەڕووە بەرزەکان.
2- کەڕووەکان.

# کەڕووە بەرزەکان

ئەوەی راستی بێت ئەم جۆرە سۆزیە نێوی (Dermatolytoser) یان (Tinea) یان لێنراوە. بەپێی شوێنی سۆکەیان بریتین لە :

- پێست ،
- نینۆك ،
- سەلکی (بنکە) موو.

هەموو کەڕووە سۆکان بە تەواوی چارەسەر ناکرێن لەبەرئەوەی زۆرجاران کەمتەرخەمی نەخۆش لە چارەسەرکردنیاندا دەبێتە هۆی دەرکەوتنەوەی سۆکە .

## جۆرەکانی کەڕووە بەرزەکان

A– جۆری (Tinea Capitis)

ئەم جۆرە دەداتە پێستی سەرو دەبێتە هۆی سووربوونەوەو رووتانەوەی مووی سەرو پەیدابوونی پەڵەی جیاواز . بە زۆری لە ئەفریقاو ئاسیاو رۆژهەڵاتی ئەوروپادا دەبیرنێت.

هەندێکجار سۆکە دەداتە بنکەی موومەکانی ریش و ئەبرۆ. زۆرجاران پزیشك هەوکردنی باکتریایی و کەڕووی شوێنە ناوبراوەکانی بە ئاسانی لەیەکتر بۆ جوداناکرێتەوە چونکە سۆکان زۆر لەیەك دەچن.

**چارەسەرکردن**

گەورە رۆژانە یەك خەچلەی خەپلەی 250 ملگم (Terbinafine) بۆ ماوەی 2 هەفتە دەدرێتێ . دەرمانی (Griseofulrin) لە 3 مانگدا یان (Itraconazole) لەنزیکەی 4– 6 هەفتەدا چارەسەری ئەم جۆرە سۆیە دەکات . هەروەها دەتوانرێت چارەسەری شوێنی سۆکە (بە هەتوان) بکرێت

B– جۆری (Tinea Corporis)

ئەم جۆرە دەداتە پێست و پەلەکان (رانولاق)؛ لەهەموو جیهاندا بڵاوە بەتایبەتی لە ناوچەکانی هێڵی ئیستیواو ژێرهێڵەکەدا دەبینرێت. سۆکە زیاتر لە وەرزی هاویندا دەردەکەوێت بەگشتی پەڵەکان کەمێ سورباوی هێشکی بازنەیی کەمێك نارێکن، شوێنەکەیان زۆر دەخورێت زۆرجاران رووخسار، باڵەکان، بەژێر ملی منداڵەوە دەبینرێن جۆری (Trichopyton) و (Microsporum) بە ئاسانی دەبینرێن.

ئەوەی شایانی باسە لەم جۆرە سۆیەدا پەڵەکان سووری شێوە بازنەیی یەك لەنێو یەکدان یان وەك پەڵەی سووری سنوردار دەبینرێت. هەندێکجار رێژەیی سووری ناوەراستی پەڵەکان زۆر لەچێوەکانی (دەرەوە) تۆخترە ئەم شێوانە لەو جۆرانەن کەمرۆ لەگیانەوەرەوە بەتایبەتی لەمانگاوە دەیانگرێتەوە، پاشتر پەڵە سوورە بازنەییەکان هێدی هێدی تەشەنە دەکەن.

هەندێکجار لە نێوەندیاندا بلۆقی زۆر گچکە دروست دەبێت . هەندێکجاری دی پەڵە سوورەکان ئاسایین وەلی خوراندن نەخۆش بێزاردەکات. ئەو سۆکردنانە لەسەگو پشیلەوە وەردەگیرێن زۆر بەهێز تر (تۆختر) سوور دەبنەوەو لەماوەیەکی کەمدا هەموو ئەندامەکانی خێزانەکە تووش دەکەن.

**چارەسەرکردن**

دەرمانی (Terbinafine) لەماوەی 4-6 هەفتەدا یان رۆژانە 100 ملگم (Itraconazole) بۆ 2 هەفتەچارەسەری ئەم جۆرەیان دەکات. زیۆجاران هەتوانی (Im dazo) بۆ هەفتە ئەنجامی باشی هەیووە .

C- جۆری (Tinea Cruris)

ئەوەی شایانی باسە ئەم جۆرە زیاتر لەنێردا دەبینرێت و دەداتە نێو گەڵ (ئەم لاولای گونەکان)و بەشی ناوەوەی ران. هۆی سەرەکی سۆکردنەکە دەگەڕێتەوە بۆ (Epidermophyton floccosum) . هەندێکجار پەڵەسورەکە بڵۆقی وردی سووریاوی تیادا دەردەکەوێت.

زۆرجاران خواراندنی ناوگەڵ نەخۆش بێزار دەکات. سۆکە بەهۆی خاولی و کورسی ژووری جل گۆڕینی مەلەوانگاو گەرماوەوە دەگوێزرێتەوە. هۆکاری سۆکەش دەگەڕێتەوە بۆ ئارەقەکردنەوەی ناوگەڵ و گەرمی شوێنەکە ، ئەمجۆرە زیاتر لە وەرزی پاییزدا دەردەکەوێت .

**چارەسەرکردن**

رۆژانە 250 ملگم (Terbinafine) یان (Naftifine) لەماوەی 2-6 هەفتەدا یان رۆژانە (Itraconazole) بەڕێژەی 100 ملگم بۆ 2-4 هەفتە چارەسەری ئەم جۆرە دەکات. یان هەفتانە 150ملگم (Flukonazol) بۆ 3-4 هەفتە زۆر بەسوودە .

D- جۆری (Tinea Pedis)

لە کوردەواریدا ئەم جۆرە بە پەنجەبڕە ناو دەبرێت، ئەم جۆرە دەداتە پێ و نێوان پەنجەکان یان پاژنەی پێ و نزیک پەنجە گەورە دەگرێتەوە و لەهەموو جیهاندا بڵاوە. نیشانەی سەرەکی سۆکە بریتیە لە تەنکبوونەوەی پێستی نێوان پەنجەکان و هێدی هێدی هەڵدەدەن بەئاسانی لێکدەبنەوە . مەلەوانگا شوێنێکی لەبارە بۆ بڵاوبونەوەی ئەم جۆرەیان.

نابێت ئەو راستییەشمان لەیاد بچێت کە زۆربەی وەرزشوانان جارێك لە جاران لەبەر ئارەقەکردنەوەی پێیان تووشی ئەم جۆرەیان دەبن لەم جۆرەدا بەدەگمەن بڵقی گچکە دەبینرێت، پێستی نێوان پەنجەکان زۆر ناسك دەبنەوەو دەردەکەونەوە، زۆرجاران نینۆکی پێ دەگرنەوە کە بە (Tinea Rubrum) دەناسرێت. هەندێکجاری دی بەهۆی لەباری شوێنەکەیەوە سۆکردنەکە هەڵدەداتەوەو نەخۆش زۆر نارەحەت دەکات. هەندێکجار سۆکە دەگاتە سەر رەگی نینۆك. لەراستیدا ئەم جۆرەیان (بەتایبەتی) کاتێك (T. Pedis) لەسەر خشتی کاشی نێو ماڵ و مەلەوانگایە بەئاسانی لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی دی دەگوێزرێتەوە .

**چارەسەرکردن**

رۆژانە دەرمانی (Terbinafine) ژەمی 250 ملگ لەماوەی 2-4 هەفتەدا یان رۆژانە (Itraconazole) بەڕێژەی 100ملگم بۆ 4 هەفتەیەك یان 200 ملگم بۆ ماوەی 2 هەفتە چارەسەری ئەم جۆرەیان دەکات.

E- جۆری (Tinea Manuum)

ئەم جۆرەیان دەداتە لەپی دەست و نینۆکی پەنجەکانی دەست کەشێوەیەکی ناشیرین دەداتە ئەو شوێنە. زۆرجاران دەستی ڕاست دەگرێتەوە . کەڕووەکە لەهەموو جیهاندا بڵاوە .. هەندێکجار لەشێوەی ئیکسیمدا (بیرۆ) دەبینرێت، هەندێکجاری دی شێوەی بڵۆق وەردەگرێت کەشلەیەکی تێدایە، هاوکات خواراندنی لەگەڵدایە . هۆی سەرەکی سۆ کە بریتیە لە (T. Rubrum).

بەڵام هەندێکجار جۆری (T. Pedis) ش تێکەڵ دەبێت واتە لەیەك کاتدا دوو جۆر کەرووی جودا دەبینرێت. سۆکە تەنیا یەك دەست دەگرێتەوە وەلێ هەندێکجار نینۆکەکانیش دەگرێتەوە.

**چارەسەرکردن**

رۆژانە دەرمانی (Terbinafine) ژەمی 250 ملگم لەماوەی 2-4 هەفتەدا یان رۆژانە (Itraconazole) بە رێژەی 200- 400 ملگم بۆ هەفتەیەك چارەسەری ئەم جۆرەش دەکات .

**F- جۆری (Tinea Unguium)**

ئەم جۆرە دەداتە پەنجەکان و نینۆکی پەنجەکانی پێ، زۆرجاران لەگەڵ سۆیەکی هیشکی (T.pedis) دا تێکەڵ دەبن. لەم بارەدا نینۆك زەرد هەڵدەگەرێت و زۆرجاران نینۆك وا نەرم دەبێتەوە تا نیوەی نینۆك خوارو خێچ و دەبێت و نیوەی پێشەوەی نامێنێت پاشتر ناشیرین دەردەکەوێت. هەندێکجار نینۆك رەنگی زەردو سپی یان زەردێکی بۆرتر دەنوێنێت.

زۆرجاران لە ژێر نینۆکدا پیشاڵی کێراتینی دەردەکەوێت . بەشێکی زۆری نینۆك بەتایبەتی بەشی پێشەوەی دەشکێت، بەدەگمەن هەموو نینۆکەکان تووشی ئەم جۆرە گۆڕانکاریە دەبن.

**چارەسەرکردن**

لە گەورە ساڵاندا 250 ملگم دەرمانی (Terbinafine) لەماوەی 2- 3 مانگدا ئەنجامی باشی داوە بە دەستەوە وەڵ سۆی پەنجەکانی پێ تەنیا نیوەیان بە تەواوی چاکدەبنەوە . یان رۆژانە (Itraconazole) رێژەی 400 ملگم بۆ 1- 4 هەفتە پاشتر رێژەی 200 ملگم بۆ 3 مانگان ئەنجامی باشی هەبووە. لە کاتی سۆی نینۆکی منداڵدا دەرمانی (Criseofulvin) ئەنجامی باشی داوە بەدەستەوە .

## کەڕووەکان

ناسراوترینیان بریتیە لە (Pityriasis versicolor). زۆرجاران سۆی مالاسیزیاشی (malassiziainfections) پێدەگوترێت ، سۆکە زیاتر لەوەرزی هاویندا دەردەکەوێت. ئەم جۆرە دەبێتە هۆی ناشیرین بوونی پێستی لەش و بە دەگمەن شوێنەکەی دەخورێت . لەم بارەدا لە قۆناخی ناسایییەوە پەڵەکان دەچنە قۆناخی گۆڕانکارییەوە. ئەوەی راستی بێت پەڵەکان پێستی سنگ و مل و پشت و باڵەکان دەگرێتەوە رەنگیان کەمێك سوورباوە، هەندێکیان گەورەن و هەندێکی تریان گچکەن. گۆڕانکارییەکانی پێست دەبێتە هۆی گیروگرفتی دەروونی بۆ نەخۆش و هۆیەکە بۆئەوەی رووخۆی بگەیەنێتە لای پزیشك .

**چارەسەرکردن**

باشترین چارەسەرکردن بریتییە لە شامپۆی (ketoconazole) ئەنجامی باشی هەبووە . هاوکات رۆژانە دەرمانی ketoconazole بەرێژەی 200 ملگم بۆهەفتەیەك یان رۆژانە (Itaconazole) بە رێژەی 200 ملگم بۆهەفتەیەك ئەنجامی باشییان هەبووە .

## کاندیدەکان

ئەوەی راستی بێت نزیکەی 100 جۆر کاندیدە هەیە،وەلێ (Candida albicans) لە هەموویان ناسراوترە . لە رۆربەی زۆری بارەکاندا کاندیدە لە نیوپۆشی دەمو ریخۆلە وگولینک (ڤاجین) ی ژندا دەبینریت . هەندێکجاری دی بە پێست و پۆپەی کێرەوە دەبینرێت و دەبێتە هۆی خواردن و هاوکات کزانەوە .

زۆرجاران کاندیدەوەك سۆیەکی هەلپەرستوپاش تیکچوونی باری تەندروستی نەخۆش دەردەکەویت ئەوسا بە نەخۆشی هەلپەرست نێودەبریت . هەندێکجاری دی لەگەل گۆرانکاری نێو لەشدا دەردەکەویت . کاندیدە بە ئاسانی لەکاتی سۆی نیوپۆشی نیودەم ، سورینچك و نەخۆشی ئەیدزدا دەبینریت .

ئەم کەسانەی زێدتر مەترسی تووشبونیان لێدەکرێت :

- منداڵی شیرەخۆرە .
- ئەو کەسانەی تاقمیان لە دەمدایە و لەقە .
- ئەو کەسانەی ماوەیەکی زۆر ئەنتیبایۆتیك بەکار دەهێنن .
- شەکرەدار .
- بەرهەنگدار ، کاتێك بە سپرای هەڵمژین چارەسەری خۆیان دەکەن .
- مرۆی کەمخۆر .
- ئەیدزدار .
- ئەو کەسانەی ناتەواوی لە بەرگری لەشیاندا هەیە .

**جۆرەکانی کاندیدە**

**- کاندیدەی نیوپۆشی دەم،**

نیودەم بەزمانیشە بەڵخێکی سپی دەگرێت کە دەبێتە هۆی کزانەوە لەکاتی خۆراك جوینوقوتداندا . ئەم جۆرە زێدتر تووشی منداڵی شیرەخۆرە دەبێت و بە ئاسانی چارەسەردەکرێت بەلام باشتروایە نمونەیەکی بەڵخەسپییەکە وەربگیرێت و بنێردرێ بۆ تاقیگاو پاش 4 هەفتە وەلامەکەی دێتەوە هەندێکجار بەکتریاش دەستنیشاندەکرێت .

**- کاندیدەی نێو گولینك ،**

ئەوەی شایانی باسە زۆرجاران کچ یان ژن تووشی کاندیدەی گولینك دەبن ، گرنگترین نیشانەکان بریتین لە هاتنە دەرەوەی شلەیەکی سپی کرێماوەی لە گولینك ، خوراندن ، کزانەوە و ئازاری کاتی زایەندی .

**- کاندیدەی پێست،**

پێست سوردەبێتەوە . شلەیەکی زەردباو لەژێر پێستەوە دێتە دەرەوەوەك لە سۆی دەوروپشتی نینۆکدا دەبینرێت . هەندێکجار ئەو شوێنانەی باسیان لێوەکرا تووشی سۆی بەکتریاییو هاوکات کاندیدەی پێست دەبێت ، ئەوسا پێویستە پزیشك دوو چاندنی جودا بۆ هەردووسۆکەوەربگرێتوپاشتر بەپێی ئەنجامی چاندنەکە چارەسەربدات بەنەخۆش .

**خۆپاراستن**

هەمووان دەزانن کە خۆپاراستن زۆرلەچارەسەرکردن باشترە . باشترین خۆپاراستنیش بریتییە لەپاکوخاوێنی نێوان پەنجەکانی پێ.

زۆر پێویسته مرۆڤ به پێی پەتی به هەموو شوێنێکدا نەروات به تایبەتی به شوێنه تەرو شێدارەکانداوەك ژووری جلگۆڕینی گەرماو، گۆمی مەلە ...تاد. لەبەرئەوە پێویسته هەمیشه مرۆ پێلاو یان سەرپێ لەپێ بکات .

هاوکات پێویسته پاش وەرزشکردن یان مەلەکردن نێوان پەنجەکانی پێ زۆر باش هیشك بکاتەوە، پێلاو گۆرەویەکان هەڵبخرێن تاهیشك ببنەوە . لەکاتی نارەقەکردندا پێویسته مرۆ سپرای دژی نارەقه بەکار بهێنێت و پاشتر رۆژانه گۆرەوی و خاولی لەپلەی 60 ی سەدی دا بکولێنرێن یان به ماکینەی جلشتن لەسەر 60 پله بشۆردرێت تا کاندیدەکان بمرن .

**چارەسەرکردن**

بەپێی جۆری کاندیده چارەسەرەکردنەکه دەگۆردرێت . ئەوەی شایانی باسه ئەمرۆ دەرمانی بەکار هەیه بۆ لەناوبردنی کاندیده و ناسراوترینیان بریتییه له (fluconazol) واته (Diflucan) بۆ چارەسەرکردنی کاندیده بەکاره .

- دەرمانی (mycostatin) به شێوەی شلەدایه و زۆر له مێژه بۆ منداڵ و گەورەسالانیش بەکاردەهێنرێت .
- حەبی مژین بۆ هەمان مەبەستیش هەیه .
- یەك کەپسولی 50 ملگم (fluconazol) بۆ ماوەی 7-14 رۆژ ئەنجامی باشی هەیه .

بۆ چارەسەرکردنی کاندیدەی نێوگولینك یەك کەپسولی 150 گرامی (fluconazol) نافرەت له کاندیده رزگاردەکات .

**تێبینی:** مەترسی ئەوه دەکرێت که دووبارەی و سێ باره (له کاتی سکپڕی دا) سۆکه دەربکەوێتەوه .

**سەرچاوەکان**

1- د . زاهیر سوران ، هەوکردنی قارچك ، بەشی 1-3 رۆژنامەی میدیا . ژ .139 و 140 و 141 ، ل10 هەولێر- کوردستان ، 2003 .

1. Malmcolm D.Richardson and Elisabeth M.Johanson. the poket guide to Fungal infection، pffizer. First published 2000.UK.
2. Hans Rorsman، A.Bjornberg، A Vahlquist، Dermatologi Venerologi، Satte uplagen، Studentilitterature، Sweden، 2000p. 173-189.
3. Johan Landgreen. Hundinfektioner، By Bristol-Myers Squibb، Sweden 2000.
4. Andres Frithz، VAd ar svamp? Diagnos och behandiling، Sweden 2000.
5. A.Wisdom & D A Hawkins، diagnosis in color STD، Second edition، England 1997.
6. Information, från läkemedelsverket-Sverige، årgång 14.Nr.6 Nov. 2004.: 10-30

## بڵاوکراوەکانی نووسەر

1- نەخۆشییە درمییە زایەندییەکان ، زانیاری گشتی ، گۆڤاری دیدار ژ 1، ل 10 و 17 ستۆکهۆلم 1992.

2- نەخۆشییە درمییە زایەندییەکان ، سیفلیس ، گۆڤاری دیدار، ژ 2 ، ستۆکهۆلم . 1992.

3- نەخۆشییە درمییە زایەندییەکان ، سوزەنك ، گۆڤاری دیدار ، ژ 3، ل 27. 1992.

4- نەخۆشییە درمییە زایەندییەکان، تامیسك و کلامیدیا ، گۆڤاری دیدار ، ژ 6، ل 27. 1992.

5- خۆپاراستن لە هەوکردن بە ڤایرۆسیHIV و نەخۆشی ئەیدز ، گۆڤاری بەربانگ . ژ. 10 ی 1992 .

6- هەوکردن بە ڤایرۆسی HIV و نەخۆشی ئەیدز ، رۆژنامەی برایەتی ، ژ . 1785 1993.

7- نەخۆشییە درمییە زایەندییەکان ، کۆندیلۆم ، گۆڤاری دیدار ، ل 23 . 1993.

8- ڤایرۆسی HIV-0 دەبێتە هۆی نەخۆشی ئەیدز . گۆڤاری دڵانپار ، ژ . 3 ل . 25-27 ، هێلسینکی 1994 .

9- نەخۆشییە درمییە زایەندییەکان STD ، زەردوویی B ، گۆڤاری دیدار، ژ 7-8 ، 1994 .

10- نەخۆشییە درمییە زایەندییەکان ، زانیاری گشتی ، گۆڤاری دیدار، ژ 12-13 ، ل .26 . 1994.

11- ژن و ژنی دووگیان . ڤایرۆسیHIV و نەخۆشی ئەیدز ، گۆڤاری دڵانپار ، ژ .3 ، ل 33- 35 ، 1995 ,

12- هەوکردن بە ڤایرۆسیHIV و نەخۆشی ئەیدز . گۆڤاری Armanc ، ژ .157 ستۆکهۆلم 1995..

13- ئەیدز و نەخۆشییە هەلپەرستەکان ، گۆڤاری دڵانپار ، ژ.3 .ل .18-19 . هێلسینکی 1995.

14- پەنگکێشی لە نێوکوردەکاندا ، زانیاری گشتی ،ژ .15 . ل 12-13 گۆڤاری دیدار , 1995.

15- هۆمۆرەگەزبازی ،HIV/AIDS لە نێوکوردەکاندا، ژ 16 گۆڤار دیدار . 1995 .

16- یەکی دیسەمبەر ، رۆژی جیهانی ئەیدز ، گۆڤاری دیدار ، ژ .17-18 ، 1996 .

17- دەتوانین چی دژی HIV/AIDS بکەین ؟ گۆڤاری دیدار .ژ.28 . ل.16 ، ل 26 و 29 ، 1996 .

18- چەند راستییەك دەرباری ئەیدز . گۆڤاری مامۆستای کورد . ژ .28 .ل 57-64 ، ستۆکهۆلم 1996.

19- هەوکردن بە ڤایرۆسیHIV و ئافرەتە سۆزانییەکان . گۆڤاری دیدار . ژ.19 . ل .26-27 . 1996 .

20- چەند راستییەك دەربارەی نەخۆشی ئەیدز خەبات ، زمانی عارەبی ، ژ. 205 ، 4 1997 . .

21- هەوکردنی قارچك ، بەشی 1-3 میدیا ، ژ .139 و 140 و 141 . ل 10 ساڵی 2003 .

22- چارەسەری درمە ڤایرۆسەکان ، ژ 12 ل.12-18 هەتوان 2003 .

23- بەڵێ ئەیدز لە کوردستاندا هەبوە و هەیە. رۆژنامەی هاووڵاتی ژ.، 149 ساڵی 2004.

24- دەرمانی دژ درمە ڤایرۆسییەکان ، ژ .2 ی هەتوان . 2004 .

25- ئافرەت وهەوکردن بە ڤایرۆسی HIV و ئەیدز ، رێوان ، ژ 65 . ل 7 ، 2004.

26- بالوکە رێوان ، ژ 69 . ساڵی 2004 .

27- لایەنێکی گرنگی تەندروستی لە کوردستاندا، میدیا ، ژ . 166 ، 2004 .

28- ئەیدز لە کوردستان و جیهاندا ، میدیا ، ژ . 168 ،15 ئۆگوست 2004 .

29- کۆنفرانسێك بۆ قەڵەوی ، رێوان ، ژ 88 ، ل 7 ی 2004 .

30- کوتوپڕ مردنی کۆرپەی ساوا ، رێوان. ژ . 91 .فێبرەوەری 2005 .

31- لە دایکبوونی یەکەم منداڵی لەشساغ و کەمبوونەوەی تووشبوون بە HIV . رێوان. ژ . 92 . 2005 .

32- کاریگەری مەی لەسەر مرۆ، خاك ، ژ .93 ، 2005 .

33- زیپکە ، رێوان . ژ .98. ل 7 2005

34- ئەسپرین ، خاك .ژ .94 ، ساڵی شەشەم 2005 .

35- کەمخوێنی ، رێوان. ژ . 102 . ل .7، 2005

36- لەوانەیە قەڵەوی مرۆ بکوژێت ، خاك ، ژ 96 ،2004 .

37- پشت ئێشە ، خاك ، ژ 97 ساڵی 2004 .

38- چارەسەرکردنی نەخۆشی شەکرە ، خاك ، ژ 98 ، 2004 .

39- چارەسەرێکی نوێی ئەیدز ، خاك ، ژ 99 ، 2004

40- برینی سەر گەدەو دوانزەگرێ ، خاك ، ژ 99، 2004

41- قەدەغەکردنی جگەرە کێشان لە کوردستاندا ، میدیا ، ژ 197 ، 2005 .

42- ئەنفلوەنزای باڵندە ، رۆژنامەی خەبات ، ژ 1952 ، ل 10 ی 2005 .

43- چۆن خۆتان لە ئەنفلوەنزای باڵندە دەپارێزن ، گۆڤاری خاك، ژ 100 ی 2005 .

44- دان بە خۆداگرتن مەترسی تووشبوون کەمدەکاتەوە . کوردستانی نوێ ، ژ 3820 ل . 9 . 2005.

45- وێنە دەگمەنەکانی ڤایرۆسی H5N1 ، خاك ، ژ 101 ، 2005 .

46- تیراوێ ، خاك ، ژ 101 ، ساڵی 2005 .

47- سووربوونەوەی میزەڕۆکانی سەروو خواروو، رێوان ، ژ 112 نۆڤەمبەری 2005 .

48- سییەسۆکان ، رێوان ، ژ 114 ، 2006 .

49- پرۆستاتەسۆ و شێرپەنجەی پرۆستات ، خاك ، ژ 102 دیسەمبەری 2005 .

50- دەروونزانی (1) ، پێکەنین ، خاك ، ژمارە 1031 ، ساڵی 2006 .

51- ئەمە یەکەم ڤایرۆسە ، ئەبێت دووەم و سێهەم چی بکات ؟ هەفتەنامەی میدیا ، ژ 226 ، ل 15 ، 2006 .

52- دەروونزانی (2) خەو ، خاك ، ژ 104 ی ساڵی 2006 .

53- دەروونزانی (3) نائارامی، خاك ، ژ 105 ی ساڵی 2006 .

54- تکایە چی دی نۆڤالژجین بەکارمەهێنن ، هەتوان ، ژ 4 ی ساڵی 2006 .

55- تکایە چی دی نۆڤالژجین بەکارمەهێنن، خەبات ، ژ 2099 ی ساڵی 2006 .

56- دەروونزانی (4) خەمۆکی ، خاك ، ژ 106 ی ساڵی 2006 .

**57- کاریگەری مەی لەسەر مرۆ ، لە ساڵی 2005 دا وەك پرۆگرامی خوێندنی کوردی لە بەشی زمانەکانی بێگانەی زانکۆی مێریلاندی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمێریکا پەسەند کراوە .**

60.Evidence for tuberculos infection in Rumanian HIV-Positive children by enzyme-linked immunosorbent assay. paediatric AIDS & HIV infection. No 2. vol 7, may. USA. 1996.


## چاپکراوەکانی نووسەر

1- هەوکردن بە ڤایرۆسیHIV و نەخۆشی ئەیدز . نامیلکەیەکی 58 لاپەڕەیە ساڵی 1993 بە زمانی کوردی لە ستۆکهۆڵم لە چاپدراوە .

2- هەوکردن بە ڤایرۆسیHIV و نەخۆشی ئەیدز . نامیلکەیەکی 58 لاپەڕەیە ساڵی 1993بە زمانی رۆمانی لە بوخارێست لە چاپدراوە .

3- نەخۆشییە درمییە زایەندییەکان ، ئامۆژگاری و خۆپاراستن :60 لاپەڕە ، لە سەر ئەرکی یەکێتی لاوانی کورد ساڵی 1995 لە سوێد چاپکراوە

4- جگەرو زەردووییە توندە ڤایرۆسییەکان ، نامیلکەیەکی 36 لاپەڕەیە لە ساڵی 1996 لە سوێد لە چاپدراوە .

5- هەوکردن بە ڤایرۆسی HIV و نەخۆشی ئەیدز ،چاپی دووەم ، ل.61 .لەسەرئەرکی وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان- هەولێر لە چاپدراوە .

6- نەخۆشییە درمەکان ، چاپی یەکەم ، کتێبێکی مامناوەندییە نزیکەی 415 لاپەڕەیە و ژمارەیەکی زۆر نەخۆشی لە خۆگرتووە ، سلێمانی . سالی 2004 .

سیمینارەکان

- یەکەم سیمینار لەسەرڤایرۆسی HIV ونەخۆشی ئەیدز بۆ کوردەکانی شاری ستۆکهۆڵم ، هاوینی 1992 .

- یەکەم سیمینار لەسەرڤایرۆسی HIV ونەخۆشی ئەیدز بۆ پزیشك و مامۆستایانی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی سلێمانی ، ئەیلولی 1993.

- یەکەم سیمینار لەسەرڤایرۆسیHIV ونەخۆشی ئەیدز بۆ پزیشك و قوتابیانی کۆلێژی پزیشکی نەخۆشخانەی د. ڤیکۆربابش ی نەخۆشییە درمەکان و نەخۆشییەکانی هێڵی ئیستیوا لە بوخاریست ، مانگی مای 1993.

- یەکەم سیمینار لەسەر چۆنیەتی خۆپاراستن لە ڤایرۆسیHIV ونەخۆشی ئەیدز پزیشك و مامۆستایانی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی سەلاحەدین ، ئەیلولی 1997

- یەکەم سیمینار لەسەر چۆنیەتی خۆپاراستن لە ڤایرۆسیHIV ونەخۆشی ئەیدز بۆ تاقیگاکانی کۆلێژی پزیشکی و تەندروستی شاری هەولێر، ئەیلولی 1997

- یەکەم سیمینار لەسەر چۆنیەتی خۆپاراستن لە ڤایرۆسی HIV و نەخۆشی ئەیدز بۆ خوێندکارانی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی سەلاحەدین ، ئەیلولی 1997

- یەکەم سیمینار لەسەر چۆنیەتی خۆپاراستن لە ڤایرۆسی HIV و نەخۆشی ئەیدز پزیشك و مامۆستایانی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی سەلاحەدین ،ئەیلولی 1997

- یەکەم سیمینار لەسەرچۆنیەتی خۆپاراستن لە ڤایرۆسی HIV و نەخۆشی ئەیدز بۆ قوتابیانی فێرگەی تەندروستی هەولێر، ئەیلولی 1997

- یەکەم سیمینار لەسەر چۆنیەتی خۆپاراستن لە ڤایرۆسی HIV و نەخۆشی ئەیدز بۆ پزیشك و مامۆستایانی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی دهۆك ، ئەیلولی 1997

- لە ساڵی 2000-2003 بەڕێوەبردنی 6 سیمینار بۆ کوردەکانی شاری کارلستاد و دەوروبەری - سوید .

**www.tendrust.net**

لە رۆژی 11 ی ئەیلولی 2004 ەوە ماڵپەری



کە تایبەتە بە تەندروستی گشتی لە ئینتەرنێتدا بەڕێوە دەبات .

## Publication

Published more than **(60) articles** on HIV/AIDS/STD/different Diseases in Kurdish periodicals and newspapers, among them are:

-**Mamostay Kurd,** Published in Sweden, No.28.feb.1996.
-**Armanc**, Published in Sweden.No.157.feb.1995.
-**Didar,** published by the Kurdish Youth Association, Sweden.
-**Berbang**, published by Kurdish Federation in Sweden.
-**Brayty**, Kurdish daily newspapers from Hewler-Kurdistan.
-**Dlanpar**, Published by the Kurdish Committee in Finland.
-**Xabat**, Kurdish daily newspapers from Hewler-Kurdistan.
-**Mydia**, Kurdish weekly newspapers from Hewler-Kurdistan.
-**Hawlaty**, Kurdish weekly newspapers from Sulaymani-Kurdistan.
-**Rewan**, Kurdish weekly newspapers from Sulaymani-Kurdistan.
-**Hatwan**, Kurdish monthly journal from Sulaymani-Kurdistan.
-**Khak,** Kurdish monthly journal from Sulaymani-Kurdistan.
-**Emro**, Kurdish weekly newspapers from Sulaymani-Kurdistan.

¤ . Evidence for tuberculosis infection in Rumanian HIV-Positive children by enzyme-linked immunosorbent assay, paediatric AIDS & HIV infection, No 2, vol. 7, may. USA. 1996.

## Booklets and books:

1. **HIV-infection and Aids**, first edition. 1993. **Sweden**. "**Published by author**".
2. **HIV-infection and Aids**. first edition. 1993 "**Romanian Language**". Sweden. "**Published by author**".
3. **Liver and Acute Hepatitis**,1996. Sweden."**Published by author**"
4. **Sexually transmitted diseases, Advices and prevention**, first edition.1995."**Published by Kurdish Youth Association, Sweden**".
5. **HIV-infection and Aids**, Second edition.1998.Hewler Kurdiatan. "**Published by Information Ministry in Hewler**".
6. **Infectious Diseases**. first edition. 2004.**Sulaymania**.

**This book** contents **11 Chapter** and has **420 pages**, is the first book in Kurdish adapted only to the education for Doctors, Specialist in Infectious diseases and student in the Medicine College in Kurdistan.

The book is published by author and **donated** to the Library of Medicine College of Sulaymani, Sallahandin, Duhok university, Kurdish Doctors association in Kerkuk, Health Ministry of Hewler many library and persons.

**All the booklets** have been donated to hospital and University staff, student, teachers and journalists, but also for ordinary person who interested in medicine.

## With articles and books I want and try:

-To prevent the spread of HIV/AIDS by spreading information in Kurdish, on what HIV/AIDS really is how it is transmitted and how to protect our self against it.
-To fight misunderstandings and prejudice connected with the disease.
-To provide ounselling among Kurds on sex in a wider perspective to prevent the spread of the diseases.

The **booklets** are adapted to the education. mentality and culture in the different regions of Kurdistan, religion, politics and propaganda affecting Kurds. I explain for example that HIV-positive and AIDS sick must not "**punished**" but should be treated equally with other patients in society.

## Abbreviations

**What does "AIDS" means?**
A- **Acquired** means "to get".
I- **Immune** means "protected".
D- **Deficiency** means "a lack of".
S- **Syndrome** means "a group of different signs of a disease".

## Glossary

**Absolute CD4+ Cell Count** (CD count):
The number of T helper cells (lymphocytes) in a cubic millimeter of blood. Normal range for adults is 800-1200.
The CD4+ cell count is significantly lower in people whose immunity system has been affected by HIV.
**Asymptomatic**: without symptoms
**Antibiotic**: a substance that kills or inhibits the growth of organisms and is used to combat disease and infection.
**Antigen:** a substance which, when introduced into the body, is capable of inducing the production of a specific antibody.
**Antibody:** an immunoglobulin molecule with a specific amino acid sequence evoked in man or other animals by an antigen, and characterized by reacting specifically with the antigen in some demonstrable way, antibody and antigen each being defined in terms of the other.
**ARC**: (AIDS Related Complex): An outmoded term to describe patients with some HIV-related symptoms but no AIDS-defining diagnoses.
**ARV:** AIDS -Related Virus
**Assay:** a test used to detect the presence and concentration of a drug, substance or microorganism in the blood and other body fluids or tissues.
**Bacteremia:** the abnormal presence of bacteria in the blood.
**BCG:** abbreviation for *Bacilli bilie de Calmette-Guerin*, an attenuated strain of *Mycobacterium bovis*, which causes tuberculosis
**B lymphocytes:** that is not thymus-dependent, is of short life, and presumable the bursa-derived lymphocyte of brides in that is responsible for the production for imunoglobuline. It does not play a direct role in cell-mediated immunity.
**Biopsy** :removal and laboratory examination of tissue from the living body.
**Capsid:** Protein converging
**CDC:**Centers for Disease Control and prevention.
**CNS:** central nervous system
**CMV:** Cytomegalovirus
**Compliment:** a group of proteins in normal blood serum and plasma that that respond in specific and nonspecific immune responses. By coating foreign matter, complement proteins trigger defense cell attacks.
**Cytokines:** A chemical messenger protein released by certain white blood cells, including macrophages, monocytes or lymphocytes.
**Cytotoxic:** capable of producing a specific toxic reaction against cells.
**Co-factors:** substances, microorganisms, or characteristics of individuals which may influence the progression of a disease or the likelihood of becoming ill.
**Culture:** the growth of microorganisms or living tissue in the laboratory, in solutions that promote their growth.
**DNA:**Dezoxyribo-nucleic acid
**Endemic:** continuous presence of a disease in a community or a among a group of people.
**Envelope:** the outer covering of a virus. The HIV envelope contains 2 protein units called gp120 and gp41; gp120 is the part of HIV that attaches itself to the surface protein (CD4)

# Contents

**Zahir Suran, M.D.**

# Infectious Diseases

## Symptoms, Diagnosis, Prevention

## &

## Therapy

**Second Edition**
**2006**